رۆمان

ENDESE

# ئێوارەی پەروانە

بەختیار عەلی



ناوەندی ڕۆشنبیریی و هونەریی ئەندێشە
بەڕێوەبەری چاپ و بڵاوکردنەوە: دانا مەلا حەسەن
بەڕێوەبەری هونەری: باسم ڕەسام
ENDESE

ناوی کتێب: ئێوارەی پەروانە
ناوی نووسەر: بەختیار عەلی
بابەت: ڕۆمان
نۆبەتی چاپ: شەشەم ٢٠١٤
"تەنیا ئەو چاپانە ئەژمارکراون کە بە سەرپەرشتی نووسەر بوون"
چاپخانە: رجایی/ تاران
تیراژ: (٢٠٠٠) دانە
نرخ: (١٠٠٠٠) دینار
ژمارەی سپاردن: لە بەڕێوەبەرایەتی گشتی کتێبخانە گشتییەکان
ژمارە (٢٢٢٣)ـی ساڵی (٢٠١٣)ـی پێدراوە.
ISBN: 978-1-63068-944-5



ناوەندی ڕۆشنبیریی و هونەریی ئەندێشە/ ئەندێشە بۆ چاپ و بڵاوکردنەوە
سلێمانی–شەقامی مەولەوی–تەلاری سیروانی نوێ–نهۆمی چوارەم
www.endeshe.org ● andesha.library@yahoo.com
http//www.facebook.com/Andeshacenter
07501026400

## ١

من «خەندانی چکۆلە» چەندین ساڵ لەمەوبەر هەموو ئەو ڕووداوە سەیرانە ژیام کە دواجار ئەستەم بوو تا کەمێک گەورە نەبم بتوانم لە هەموو ماناکانیان تێبگەم و بیاننووسمەوە، ئەو ڕووداوانەی ئێستا وەکو یەکەیەکی لەیەک نەترازاو لێیان دەڕوانم، نەک تەنها لەبەرئەوەی هەموو ئەو شتانەی کە ڕوویانداو پەیوەندییەکی گەورەیان بەیەکەوە هەبوو، بەڵکو لەبەرئەوەی واتێدەگەم قەدەری مرۆڤەکانیش بە ئاسانی لەیەکدی جیاناکرێنەوە. «نەسرەدینی بۆنخۆش» ئێستاش پێمدەڵێت: «پەلەمەکە»، فەتانەش لەو باوەڕەدایە کە هێشتا ناتوانین لە ڕاستی ئەو ڕۆژانە و ئەو ڕووداوانە تێبگەین... هەردووکیان گومانیان هەیە ئەم چیرۆکە چیرۆکێکی تەواو بێت، نەوەک تەنها لەبەرئەوەی ئەوانەی کە لەو ڕۆژە سەیرانەدا ژیان، ئەمڕۆ مردوون یان سەفەریانکردوە یاخود لە لوچێکی ئەم وڵاتە ماندووەدا ونبوون، بەڵکو لەبەرئەوەی زۆربەی ئەو جێگایانەش کە من و پەروانە «هەریەک بە جیا» ئەو ڕۆژگارانەمان تیا بردەسەر شوێنەواریشیان نەماوە. لەگەڵ ئەوەشدا وەسواسێکی نەزانراو و تاریک پاڵم پێوەدەنێت ئەو چیرۆکە بگێڕمەوە، ڕەنگە ئەوە وەسواسی تێڕامانی ئینسان بێت لەو جیهانانەی کە تیایاندا ژیاوە و نەیتوانیوە تێیانبگات، وەسواسی تێڕامانی ئینسان بێت لەو ڕۆژانەی بەجێماندەهێڵن و دواجار لە ڕێگەی چیرۆکەکانەوە نەبێت بۆمان ناگێڕدرێنەوە، وەسواسی

بەخشینەوەی شێوەیەک بێت بەو مەملەکەتانەی کە وەکو سەراب یان غوبار تەماشامانکردون، بەڵام لەگەڵ هەموو ئەو وەسواسانەشدا من بە ڕوونی هەموو شتەکانم لەیادە. ئەو شەوە دوور و درێژانەی لەگەڵ مەعسومەدا لە قوتابخانەی «خوشکە تۆبەکارەکان» بردمەسەر، گەلێ نهێنی قووڵیان دەربارەی دواهەمین ڕۆژەکانی ژیانی «پەروانە» بۆ ئاشکراکردم. ڕاستە ئەمڕۆ مەعسومە مردووە، بەر لە مردنی بە منی گووت کە ئەو هەموو ئەو شتانەی بینیوە کە مرۆڤێک دەبێت بیبینێت و دواتریش هیچی دیکە نەماوە شایستەی بینین بێت، بەڵام ئەو دەبایە ئاوەها زوو نەمردایە تا شاهیدی ڕاست و دروستی ئەم چیرۆکە بێت، جگە لە مەعسومەش دۆزینەوەی ئەو سەرپۆشە سپییەی «میدیای غەمگین»، ئەو سەرپۆشەی پڕبوو لە هەموو دەستنوسەکانی میدیا لەو جەنگەڵی نائومێدییەدا، هاندەرێکی سەیربوو تا سەرلەنوێ بیر لە گێڕانەوەی چارەنوسی خۆمان بکەمەوە، کە هەڵبەت بە ئەندازەیەک بێڕەحمانە و تاریکبوو بۆ وچانێکی چکۆلانەش لێمان نەگەڕا تا دواجار بەناو ئاگر و غوبار و دەستخەڕۆبووندا ئێمەی گەیاندە ئەو ئێوارە غەمگینەی کە ئێستا بە حەسرەتەوە پێیدەڵێین «ئێوارەی پەروانە».

هێشتا زووە باس لە ئێوارەیەکی سارد و بەفراوی بکەم لە ناو ئەو چیا عاسیانەدا... چونکی ڕیشەی ڕووداوەکانی ئەو ئێوارێیە دەگەڕێتەوە بۆ چەند وەرز پێشتر، هەموو شتەکان لەو ئێوارە فێنکەی بەهارەوە دەستیان پێکرد کە من «خەندانی چکۆلانە» و «پەروانە» دەبووایە لەسەر سینییەکی گەورە گۆشتی ئەو قوربانییەمان ببەشیایەتەوە کە ساڵانە بابم بەر لە «قوربان» دەیبەشییەوە. ئێستاش هەموو شتێکم لەبیرە، سەرەتای گەڕانەوەی ڕۆژە سەوز و پڕ لە شادییەکانی ساڵ بوو، خەڵکی لە هەموو کون و قوژبنێکی شاردا قوربانییان سەردەبڕی. پێدەچوو دەمێک ساڵ بێت وەکو ئەم قوربانە نێچیر بەو زۆرییە نەخرابێت،

پۆلە باڵندەکان بە کۆ لە باشوورەوە دەگەڕانەوە و بە مەستی بەسەر ئەو کەرنەڤالی خوێنەدا دەفڕین کە لەو بەهارەدا شاری وەجۆشهێنابوو، ئاخر زۆرجار ترس یاخود خوێن بە زمانێکی نهێنی نێچیرەکانی خۆیان بانگدەکەن. لەو ڕۆژانەشدا کوچە و کۆڵان و شەقامەکانی شار هەمووی بۆنی خوێنیان لێ هەڵدەستا، ماوەیەکیش بوو پەروانە بە پێچەوانەی عادەتی هەمیشەیی خۆیەوە مەیلێکی سەیری بەلای بینینی قوربانییەکاندا پەیداکردبوو، من لەوەوبەر پەروانەم وەها نەدیبوو، پەروانەم نەدیبوو بە سەعات لەبەر ئەو پەنجەرەیەدا ڕاوەستێت و چاو لەو مەیدانە نەتروکێنێ کە پیاوانی زەبەلاح گای قەترانیان بۆ دەهێنا، پێکیشەوە دەمانبینی کە کڕیارە سادە و ساویلکەکان بە نەشارەزایی خۆیان بەناویان دەکەوتن و دواجار لە دەرگایەکی چکۆلانەی تەختەوە کێشمەکێش «گا» یەکیان ڕادەکێشایە دەرێ و کۆڵانەو کۆڵانە بەو شاری تەپوتۆزەدا، تا بەر دەرگاکانی خۆیان دەیانبرد.

ئێمە دەمێ ساڵ بوو لەوێ دەژیاین، بەرابەری باڵەخانەکەمان مەیدانی جەڵەبچی و چێوار و قەسابان بوو، بەڵام ئەمە یەکەمین ساڵ بوو بەر لە «قوربان» بەو جۆرە مەیدان وەها گڕبستێنێ و بازاڕی بێتەفرۆش. چەندین ڕۆژ بوو شار یەکپارچە خوێن بوو... هەر جێگایەک دەچوویت، هەر خوێن بوو... هەر کوچەیەک دەچوویت، هەر خوێن بوو... بۆنی خوێن لە گەورە و بچوکی ئەو شارە هەڵدەستا. من و پەروانە کە دەچووین بۆ قوتابخانە حاڵمان گەلێ خراپ بوو، لەبەر دەرگای ماڵەوە تا ناو پۆلەکانی خوێندن، گومیچکە لە دوای گومیچکە و جۆگەلە بەدوای جۆگەلە خوێنمان دەبینی. من دەمگووت «تەحا، ئەو هەموو خوێنە چییە؟»، پەروانە سەیری نەدەکردم و هەر دەڕۆیشت، بەڵام کە من ئەو ڕستەیەم چەند جارێ لەسەر یەک دووبارەدەکردەوە،

دەیگووت: «بێدەنگبە و ئاگاداربە خوێناوی نەبیت». ئاگاداربووم ئەو لەو دووبارەکردنەوە بێوچانەی من بۆ ئەو ڕستەیە تەواو بێزاربوو.

ئەو ڕۆژە کە دەستمانکرد بە بەشینەوەی بەشە قوربانییەکان، پێدەچوو لە هەموو ڕۆژەکانی دیکە قوربانی زیاتر سەربڕدرابێت، ئەو ئێوارەیە من گووتم شار خوێن دەییات، من گووتم گایان لەسەر عەرد نەهێشتووە، هەموویان کردۆتە قوربانی. من گووتم جارێکی دی ئەو خوێنە لە دار و دیوارەکانی ئەم شارە نابێتەوە، بەڵام پەروانە دەیگووت: «هەموو شتەکان کاتین، هەموو شتەکان تەنها بۆ ساتێک عومریان هەیە و بەسەردەچن و لەیاددەچنەوە، هەموو شتەکان هەر بۆ چەندانێک ئاوا دیار و بەرجەستە دەبینرێن، ئەگینا دواتر شت نییە نەبێتە تەپوتۆز... هەموو شتەکان دەبنە تەپوتۆز»...

پەروانە خۆی سینی قوربانییەکەی لەسەر سەری هەڵگرتبوو، بەڵام خوێن بە جۆرێ گومیچکەی بەستبوو، نەماندەزانی چۆن لە نێویدا بڕۆین و بازبازێن بکەین... هەنگاوێ دەڕۆیشتین و پۆنگاوێکی دیکەی خوێنمان دەبینی، لاماندەکردەوە کۆڵانەکانی دیش هەموو هەر دەریاچەی چکۆڵانەی خوێن بوون. ئەوەی من و پەروانەی توڕەدەکرد دیمەنی ئەو منداڵانە بوو کە دەستیان دەخستە خوێنەکەوە و دەیاندا لە دارو دیوارەکان، دەیاندا لە لەش و دەموچاوی خۆیان یان لە لەش و دەموچاوی هاوڕێکانیان، من بە دیمەنی ئەو کۆلارە خۆیناوییانەش کە هەموو ئاسمانیان سوورکردبوو تەواو پەستبووبووم. پەروانەش هەروەکو ڕۆژانی پێشوو، دەیویست تکەیە خوێن چییە بەرگیانی نەکەوێت. ئەگەرچی گەلێ شەرمی بە حاڵی خۆی دەهات کە دەبایە لە ژێر فشاری باوکدا و بەبێویستی خۆی لەم ئێوارە ڕوناک و فێنکەی بەهاردا بە سینییەکەوە بەش بەش گۆشت بە ماڵاندا دابەشبکات، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا هەر سووربوو تکەیەک خوێنی لێنەکەوێت، ئەو خوێنەی خەڵکی بێباکانە تێیدەکەوتن و پیادەڕۆیشتن،

ئـەو خوێنـەی بـە پێڵاو و جلەکانـی خۆیانـەوە کێشیاندەکردە نـاو هەمـوو شـوێنەکانی دیکـەی ژیـان، کێشـیاندەکردە نـاو ماڵەکانـی خۆیـان، نـاو دارسـتانە پاکـەکان، نـاو گازینـۆ و سینەما و سـەیرانگا چکۆلەکانـی شـار.

ئێوارەیەکـی فێنکـی بەهـار بـوو، بـەڵام ئـەو گۆشـتە هێشـتا بۆنـی هاڵاوێکـی ترسـناکی ژیانـی لـێ هەڵدەسـتا، بۆنـی هەناسـەیەکی جێمـاوی دوای مـەرگ، مـن تـا ماوەیەکـی زۆر درەنـگ دوای ئـەو ڕۆژەش دیمەنـی ئـەو پیاوانـەم لەیادبوو کـە لـە حەوشـەکەدا، لـە ناوەڕاستی چیمەنەکـەدا ئـەو گا زەبەلاحەیـان دەگوریـی، دیمەنـی ئـەو شـۆقە شـکاو و زمانـە ڕەش و درێـژە لەتـەک حەسرەتی خەمێکـدا کـە لـە چاوە دەرپەڕیوەکانـی ئـەو گیانـدارەدا بوو، گەلـێ ترسـناک بـوو. بابـم سـەرتاپای خوێـن بـوو، براکانـم سـەرتاپایان خوێن، قەسابە چکۆلانەکـەش کـە جارجـار وەکـو منداڵێـک پێدەکەنـی هەموو گیانـی لـە خوێنـدا شـەڵاڵ بـوو. لـەو دەقیقەیەوە کـە گاکەیان سـەربڕی، دایکم کـە ئافرەتێکـی کـەڕولاڵ و چکۆلانـە و نەخـۆش بـوو، لـە جێگاکـەی خۆیـدا بـەو دەنگـە ترسـناکە، دەنگـی مەخلوقێکـی تـوڕە و نەخـۆش، مەخلوقێـک کـە ناتوانێـت بدوێـت، دەیقیژانـد. پەروانـەش سـرەوتی نەبـوو، لـە پەنجەرەکـەوە دەیڕوانـی، دەچـووە ژووری خەوتنەکـە و دەگەڕایـەوە بـەر پەنجەرەکـە، دەچـوو بـەلای نرکـە غەمبارەکانـی دایکمـەوە و دووبـارە دەگەڕایـەوە بـەر پەنجەرەکـە، قاپەکانـی ئامادەدەکـرد و چاوێکـی لەسـەر ئـەو خوێنـەش بـوو. دواجـار بـە حەسـرەتێکی کوتوپـڕەوە گووتـی: «خەندانـی چکۆلـە، دەزانیـت مـن جەژنێکـی دیکـە لێـرە نابـم؟».

باوکـم قوربانییەکانـی دابەشـکرد، مـن و ئـەو سـێنی خێراتـی ئـەو وەرزەمـان خسـتە سەرسـەرمان و پێکـەوە لەمـاڵ دەرچوویـن، لـە سـەفەری سـێهەمدا بـوو لـە کۆڵانێکـی دووردا، کۆڵانێـک لەوەوبـەر نەماندیبـوو، لـە کوچەیەکـی کـپ و داخـراودا، کوچەیـەک بۆنـی بەهـاری لێدەهـات، کوچەیـەک لـە نـاکاو لـەو بەحـری خوێنـەدا پڕبووبـوو لـە پەپولـە، کوچەیـەک کـە جیـا

لە هەموو کۆڵانەکانی تری ئەو شارە لەو بەرەجەژنانە سەیرەدا خوێنی تیانەبوو، کوچەیەکی پاک و ئاسایی، لەوێ لە دەرگایەکی قوبەدار و گەورەماندا، دەرگایەک یەک پارچە بە مێروولە داپۆشرابوو... چەندین جار لە ئەڵقەرێزێکی کۆن و لە زەنگی پاڵ قاپییەکەمان دا، پاش تۆزێک گەنجێکی باریک دەرگاکەی لێکردینەوە، نیمچە سەرسام و حەپەساو گوتی: «چاوەڕوانم دەکردن»، زەردەخەنەیەکی ماندووی گرت و سەریلەقاند و بە دەنگێکی غەمگین گوتی: «خۆشهاتن، خۆشهاتن... ئەها، سەرەتای وەرزی قوربانییە، من لەیادمچووبووەوە، هەر لەخەیاڵدا نەبووم کە سەرەتای وەرزی قوربانییە...». ئەوە «فەرەیدونی مەلەک» بوو کە دواتر من تەنها لە شەوزەنگ و بەربەیان و تەپوتۆزە سپییەکاندا دەیبینم.

# ٢

دوای مردنی پورم و دوای ئەو گۆڕانکارییە سەیرانەی کە ژیان و جەنگ و نیشتمانی هەژاند، ڕۆژێک من و فەتانە و مەعسوم لە دەرگای ئاسنینی قوتابخانەی ئەو خوشکە ئیماندارانە هاتینە دەرێ و ئیتر هەرگیز نەگەڕاینەوە، مەعسومە کە ترسێکی کوشندەی لە خودا و باڵندەکان تیادروستبووبوو کەوتە کارگەیەکی درومانکردنەوە... من ئەو کات براکانم سەفەریانکردبوو، بابیشم و دایکیشم لە مێژبوو مردبوون، دەبایە بە تەنها لەو ماڵە چۆڵ و هۆڵ و گەورەیەدا بژیم و هەر لەوێدا ئەو ژیان و زیندەگییە سەیرانە پێکەوەبنێمەوە کە لە ساڵانی ترس و تەنهایمدا، بە شێوەیەکی سەیر هەموو بەرەو کارەسات و تاریکی داگەڕابوون، میدیاش بە هەمان شێوە لە خولیای دروستکردنی چیرۆکێکی بێکۆتاییدا بوو... «مەعسومە» کە چەندین ساڵ ئەو نهێنییەی بۆ من پاراستبوو، هەر خۆی بە گومانەوە دەیگووت کە «فەتانە» حکایەتخوانێکی باشترە، بەڵام «فەتانە» تەنها حکایەتخوانێکی زارەکی بوو... من بە نائومێدییەوە سەیری مەعسومەم دەکرد و دەمگووت: «دەبێت هەموو حکایەتەکان بچنەسەر کاغەز، ئەگینا دەمرن»، دەمگووت: «بۆ من ئەم چیرۆکە چیرۆکێک نییە و بەس، بەڵکو هێنانەوەی پەروانەیە بۆ ئەم جیهانە». ئاخر کەس نەیدەزانی مەرگ لای پەروانە لەیادکردنی خۆشەویستەکانی بوو بۆ ئەو. من وێنەکانی پەروانەم نیشاندەدا، ئەو وێنانەی هەندێکیانی

پێشکەش بە خۆشەویستە بێشومارەکانی کردبوو و هەمیشەش لە پشتەکەی نوسیبوو: «بۆ تۆ، بەمەرجێ دوای مەرگ لەیادم نەکەیت». من دەمزانی تەنها لە ڕێگای ئەو چیرۆکەوە پەروانە دەهێنمەوە بۆ ئەم جیهانە، پەروانە دەکەمە مەخلوقێکی ڕاستەقینە، بەڵام فەتانە بە تورەییەوە دەیگووت: «تۆ دووبارە دەیکوژیتەوە، دەیکوژیت... پاڵەوانی چیرۆکەکان جگە لە سێبەرێکی تاریک جگە لە تارماییەکی سەرابی هیچی تر نین». بەڵام من ڕۆژ لە دوای ڕۆژ زیاتر فشارم بۆ مەعسومە دەهێنا، بە تەنها ئەو دەیتوانی ببێتە دەلیلی من بۆ ناسینی ئەو پیاوە... دواجاریش هەر ئەو «نەسرەدینی بۆنخۆش»ی پێناساندم، کە لە دوای ئێوارەی پەروانەوە گەڕابووەوە شار و لە دونیای وێنەی ئەو کیژە شۆخانەدا دەژیا کە لە ئاهەنگەکاندا لەسەر ئیقاعی ئەو مۆسیقا خێرایانە هەڵدەپەڕین. «بۆنخۆش» پیاوی زەردەخەنە شەرمن و کچانەکان، دوای ئەوەی لە سوپا هاتبووەدەرێ، گەڕابووەوە بۆ ژیان، لە ناو شەراب و شەوقی فلاش و تاریکی سووربابوی لابورەکاندا، نیوەی ژیانی خەریکی شتنەوەی ئەو فلیمە سەیرانە بوو کە وەکو خۆی دەیگووت: «وەکو سەفەری گەیشتن بە حەقیقەت وەهایە، سەرەتا لە تاریکییەکی تەواوەوە دەست پێدەکات، دواتر وەکو جامێکی لێڵ و دواتریش بە نیگارێکی ڕەنگاوڕەنگ و قەشەنگ دوایدێت». ئەوەی منی لەگەڵ ئەو پیاوەدا تووشی دەردکرد ئەو سەیرکردنە سەیرەی بوو بۆ ژیان و ئەوین و مەرگ، ئەو هەموو شتەکانی لە شێوەی شتنەوەی فلیمێکدا دەبینی، لە هەموو شتێکدا بۆ سەرەتایەکی تاریک دەگەڕا و بۆ کۆتاییەک عەودالبوو کە وەکو ئەو وێنانەی خۆی ڕوون و ساف و بریقەداربێت، هەر ئەوەش وای لێدەکرد نەتوانێت بیر لەو تەلیسمە گەورانە بکاتەوە کە لەو کۆتاییە ترسناک و سەیرەی فەرەیدونی مەلەک و پەروانەدا دەرکەوتن، ئەو دەیگووت: «حەقیقەت ئەگەر وەکو وێنەیەکی قەشەنگ ڕوون و بێخەوش

نەبێت، حەقیقەت نییە».

منیش هەر لە یاداشتەکانی میدیادا ئەو دێڕانەی پەروانەم بۆ دەخوێندەوە کە دەیگووت: «ژیان غوبارێکە، ڕاستیش بە یەکەوەنانی گەردە وردەکانی ئەو غوبارەیە»... من ئەو دێڕەم بۆ دەخوێندەوە و بێووچان و بێسەبر دەمگووت: «بەڵام کوا، کوا گەردەکانی ئەو غوبارە؟ کوا ئێمە هەموویمان بۆ دەگیرێت، ئێمە دەتوانین چی بزانین؟ لە چی دڵنیابین؟ نا، ئێمە هەرگیز ناگەینە دڵنیایەک، کە مایەی ئارامیی دەرون بێت، لەبەرئەوە دەبێت بەو وێنە نیوە ناچڵانە ڕازیبین کە هەمیشە بۆشاییەکی ترسناکی بۆ گومان و دوودڵی تیا دەمێنێتەوە».

ئەو بەردەوام بەو پاڵتۆ درێژەوە، بەو نیگا شەرمنەیەوە کە سیمای نێرەموکێکی نازکی پێدەبەخشی، لە ژیانی ئافرەتەکانی شاردا دەردەکەوت، یەکەم شەو کە لەگەڵیدا دوام لە ئاهەنگی شووکردنی کچێکی هاوڕێمدا بوو. «مەعسومە» کە پشتیکردبووە درەختەکانی باغچەکە «نەبا باڵندەکان بیبینن»، نەیدەویست ئاوڕیداتەوە و پێمبڵێ: «ئەوە خۆیەتی، ئەوە نەسرەدینی بۆنخۆشە»، بەڵکو بە وەسفێکی سادە پێیگووتم: «پیاوێکە بە کامیرایەکی کۆنەوە لە دەستی جلی کوردی شینکیدا». من کە لە ناو هەرا و بەحری بێسەروبنی هەڵپەڕکێکەراندا بینیمەوە، لەگەڵ چەپکێک کچی ئێجگار نازکدا سەرقاڵی قسە و پێکەنین بوو، یەک یەک لەگەڵیاندا دەدوا و کارتی چکۆلانەی بۆ وەرگرتنەوەی وێنەکانیان دەدانێ، بە هەرحاڵ من لە نیگا و سەرنج و پەیوەندی و پێکەنینەکانیدا وامهەستکرد پیاوێکی بەختیارە. بۆنی ئەو عەترە بۆنخۆشانەش کە لە خۆیەدا پتر کچان و ژنانی مەستدەکرد و وایدەکرد زیاتر ئاپۆرەی لێببەستن، بەڵام من تێنەدەگەیشتم کە ئەو بەو نیگا ژنانە و نیگارە نەرمین و بۆشناخییە کچانەیەی خۆیەوە، چۆن ساڵانێک لەو چیا سەختانە، وەکو جەنگاوەرێکی ئازا ناوبانگی دەرکردبوو. کە

لێـی نزیکبوومـەوە، ئۆرگەکـە بـە جـۆرێ باغچەکـەی هێنابـووە سـەما، کـەس گوێـی لـە دەنگـی ئـەوی دی نەبـوو. مەعسـومە دەیگـووت: «لـەو ژاوەژاو و هەیاهـوی شـەهوەتەدا، هیچـت لێتێنـاگات». مـن دەمگووتـەوە «هەیاهوی شـەهوەت... هەیاهـوی شـەهوەت»، ئـەوە ڕسـتەی خـۆی نەبـوو، بەڵکـو پاشـماوەی وشـەکانی زەینەبـی کوێسـتانی بـوو کـە سـاڵانێکی درێـژ ئێمـەی لـە «هەیاهـوی شـەهوەتەکانمان» پاکدەکـردەوە. کـە نەسـرەدینی بۆنخـۆش منـی بینـی دەسـتی درێژکـرد و گووتـی: «ڕێـز و حورمەتـی زۆرم بـۆ ئێـوە خاتوونـی ئازیـز»، بـەڵام کـە پێمگـووت : «مـن خەندانـم، خەندانـی چکۆلانـە... ئـەو کچـەی بـە درۆ دەڵێـن گوایـە دەتوانـێ ڕەشـەبا دروستبکات» ڕەنگـی تێکچوو، دەیویسـت خـۆی وابخاتـەڕوو کـە نامناسـێت. مـن دەمزانـی کـە «مەعسـومە» هەمـوو شـتێکی بـۆ گێڕاوەتـەوە... ئـەو کاتـەی کـە شـەپۆلێکی هەڵپەڕکـێ لـە یەکتـری دوورخسـتینەوە و بردینـی، ئـەو بـە پەشـۆکاوی تەماشـایدەکردم، لەوسـەرەوە دوور لـە دەنگـی ئۆرگەکـە و دوور لـە فزوڵـی هەنـدێ تەماشـاکەر یەکتریمـان گرتـەوە، پێمگـووت: «مـن خوشـکی پەروانـەم... پەروانـە»، ئـەو بـە سەرسـامییەوە سـەیریکردم و زیاتـر شـڵەژا و پرسـی:«تۆ نابیتـە گـەرد؟». مـن گووتـم: «گوێبگـرە، مـن نابمـە گـەرد، بـەڵام پێویسـتیم پێتـە». ئـەو هیچـی نەگـووت، لێـوی نەبزوانـد، بـە هێمنـی پشـتی تێکـردم و لـە نـاو قەرەباڵغییەکـەدا ونبـوو، بێئـەوەی لـەو شـەوەدا جارێکـی دی لـەو ئاهەنگـەدا دووبـارە دەربکەوێتـەوە.

بـۆ ڕۆژی دواتـر لـە بـەردەم سـتۆدیۆکەی خۆیـدا گرتـم، دنیـا بـاران و شەسـتەیەکی سـەیربوو، لـە نـاکاو هـەوا بـە جۆرێکـی شـێتانە وەرگەڕابـوو، ئـەو لـە ژێـر چەترێکـی گـەورەدا خـۆی گرمۆڵـە کردبوو، نەبا ڕێژنـە و باران و ڕەشـەباکان بۆنـی عەترەکانـی بفڕێنـن، کـە منـی بینییـەوە، جارێکـی دی پەشـۆکا و ویسـتی بەلامـدا تێپەڕێـت و هیـچ نەڵێـت. دواتـر بـە ئاشـکرا گووتـی: «خەندانـی چکۆلـە لێمگـەڕێ... مـن چیتـر بیـر لـە ڕابـوردوو

ناکەمەوە». ڕابوردوو بۆ ئەو دنیایەک بوو تێینەدەگەیشت، ژیانی لەو چیا و بەفر و زەوییە عاسییانەدا، لەو ئێوارە ساردەی پەروانەوە کۆتایی هاتبوو، ئەو چیتر ژیانێکی تر دەژیا، لەزەتی لە شتنەوەی وێنەی کچەکانی شار وەردەگرت، لەزەتی لە شتنەوەی وێنەی یاریکەرەکانی شار وەردەگرت، ئێوارانیش لە چایخانەیەکی تاریک و چکۆلەدا لەگەڵ سەرۆک تیپەکاندا، جگە لە باسی ژیانی ناو یاریگا و ژیانی ناو ژوورەکانی خەوتن، هیچی دیکەی باس نەدەکرد. من درەنگ زانیم کە ئەو لە ژێر ئازارێکی ویژدانی قووڵدا دەینالاند، درەنگ تێگەیشتم لە سێبەری چ غەمێک هەڵدێت، بە درێژایی ئەو ساڵانە ئەو لە ژێر وەحشەتی ئەو هەستە سەیرانەدا ژیابوو کە مردنی پەروانە لە ئەستۆی ئەوە، گوناهی ئەوە فەرەیدون لەو خەرەندەوە گلا، گوناهی ئەوە عەشقەکان کاڵبوونەوە. بەڵێ، کە لە نزیکەوە ناسیم، ئەو کات ئەو غەمە سەیرەم تیا بینی کە بەردەوام فرێیدەدایە دنیای ئەو ئاهەنگە جەنجاڵ و یاریگا ساردانەوە، خەمێکی شاردراوە و نهێنی کە نەسرەدین هەموو ژیانی بۆ ونکردن و داپۆشین و یادبردنەوەی تەرخانکردبوو. ڕۆژێک گووتی:«من بە درێژایی ژیانم هەڵەبووم و هیچ یەکێ لەو شوێنانە دونیای ڕاستەقینەی من نین». ستۆدیۆکەی پڕبوو لە چرا و پرۆجێکتەر و گڵۆپی ڕەنگاوڕەنگ، لە پشتیشەوە وێنە ئافرەت و یاریکەران، دیوارەکانیان داپۆشیبوو. ئەو ڕەنگە سەیرانەی لە ستۆدیۆکەدا تێکەڵبوویبوون موچڕکێکی سەیریان بە جەستەمدا دەهێنا، بۆ ساتێکیش کە چاوانی ناسک و کچانەی ئەوم بێرتووش بینی و تەماشای ئەو دنیایەی دەوروبەریم کرد، خەریک بوو جانتاکەم هەڵگرم و دووبارە بگەڕێمەوە و واز لە هەموو ئەم حکایەتە بهێنم. بۆ کەمێک ئەو پەنجە باریک و درێژ و ژنانەی ئەوم، وەکو پەنجەی پیانۆ ژەنێکی شەیتانی هاتە بەرچاو، بەڵام نەسرەدین بە خێرایی و نیمچە توڕەییەوە پرۆجێکتەر و چراکانی هەموو داگیرسان و گووتی:

«خەندانی چکۆلە چیت دەوێت؟» . ڕاستەوڕاست بۆ ئەمسەروسەر گووتم: «دەفتەری یاداشتەکانی میدیای غەمگینم دەوێت» .

هەڵبەت نەسرەدینی بۆنخۆش ئەو کات منی باش نەدەناسی، وەکو غەریبەیەک سەیریدەکردم، ڕازیش نەبوو هەروا ئاسان ئەو دەفتەرانەم بخاتە بەردەست کە دەیگووت «بەحرێکن لە نهێنی ترسناک» . نەسرەدین خۆی پاش هەوڵ و ماندوبوونێکی چەندین ساڵە، دەفتەرەکانی لە کەسێکی «پیرموسای خەزانناس» وەرگرتبووەوە . من دەبایە هەموو زیندەگی خۆمی ڕۆژ بە ڕۆژ لائاشکرابکەم... هەموو ئازارەکانی خۆمی بۆبگێڕمەوە . من چەندەها ڕۆژ بەیانیان لەگەڵ خۆرهەڵهاتندا دەچوومە ستۆدیۆکەی و لەسەر تێکەڵاوبوونی چارەنوسەکان قسەمدەکرد، لەسەر لەیەکترنجانی قەدەرەکان دەدوام... من لەو ڕۆژانەدا پێمدەگووت کە تاریکییەکانی ناو زیندەگی من، وێرانبوونی ژیانم لەسەر دەستی ئەو ژنە تۆبەکارانەدا هەمووی درێژکراوەی هەمان قەدەرە کە لە عەشقەکانی پەروانەوە دەست پێدەکات. دەمگووت سەربوردی من و ئەو یەک سەربوردە، جیهانەکانمان یەک جیهانن، هەمیشەش من لە ساڵانی گۆشەگیری قووڵی خۆمدا جگە لە بیرکردنەوە لە پەروانە خولیای ترم نەبووە. دەمگووت هەموو ژیانی من سزای عاشقە ناکامەکانی ئەوە، هەموو دۆزەخی من سووتانێکە لە بری ئەو. دەمگووت ئەگەر ئەو نەڕۆیشتبایە من دەڕۆیشتم، ئەگەر منیش نەکەوتبامایە ناو ئەو چارەنوسەوە کە تێیکەوتم ئەو دەکەوت. دەمگووت ژیانی من و ئەو ئەندازەیەکی ئاڵۆزە، هێندە هەیە کە من ساڵانێک درەنگتر لە دایکبووم، چکۆلانەتر و درێژوتر بووم، من ئەو سێبەرە پەپولەئاسایەی ئەوم لەسەر دڵی پیاوان نەبوو، بەڵام ئارەزووەکانم هەمیشە لە ئارەزووەکانی ئەو خراپتربوون. دەمگووت من چەندین ساڵ لە بری ئەو هەموو ئازارەکانم قبوڵکرد، چونکە ئەو زیندەگییە ڕاستەقینەی ئەو هەر زیندەگی من بووە، بەڵام بە خەیاڵ، من هەمان ژیانی ئەو

ژیاوم، بەڵام بە وەهم. دەمگووت ئەگەر یاری قەدەر و چارەنوس نەبێت، دەتوانیت لەبری من پەروانە فڕێبدەیتە ناو ئەو خوشکە تۆبەکارانە و منیش فڕێبدەیتە ناو ئەو خەرەندە.

«نەسرەدین» لە ناو ڕەنگی پڕۆجێکتەرەکاندا سەرییادەدا و دەیگووت: «هەرگیز... هەرگیز... تازە پەروانە مردووە... ئەو مردووە». ئەو دەیزانی من و ئەو چارەنوسمان بە جۆرێکی سەیر پێکەوەگرێدراوە... دەیزانی ژیانی من جگە لە سێبەرێکی ژیانی ئەو زیاتر هیچی تر نییە، دەیزانی من بێگوناهم لەو گوناهانەی کە دەمەوێت بیدەمە پاڵ خۆم، بەڵام دەشیزانی کە من و چەندەها کیژی غەمگینی دیکەی وەکو من، حەزدەکەین لەبری خۆمان، لەبری ئەم ڕۆحە جڵەوکراوەی خۆمان، ژیان و مەرگی ئەو بژیابایینایە و بمردبایینایە.

دواتر کە دەفتەرەکانی لەو لەچکە سپییەدا نیشاندام، دەیزانی نهێنی حکایەتێکم دەخاتە بەردەست کە پاڵەوانەکانی یان مردوون یان سەفەریانکردوە یان لە شوێنێکی ئەم وڵاتەدا خۆیان شاردۆتەوە... دەیزانی من پەلاماری نوسینەوەی قەدەرێکم داوە کە بەبێ ئەو و بەبێ ئەم دەفتەرانە و بەبێ ئەو گێڕانەوە ترسناک و تاڵانەی مەعسوم هەرگیز نابێتە چیرۆک. من پێمدەگووت: «لەیادت نەچێت، دواجار ئەمە چیرۆکی شەترەنجی ئەو ژیانە سەیرەی منیشە... من کە دەمەوێت بەر لە مردن تێبگەم، ئەوە چ ژیانێک بوو ئێمە ژیاین... من کە لەو ماڵە خاڵی و پەتییەدا جگە لەم چیرۆکە هیچی دیکەم نییە بۆی بژیم... هیچی دیکە...». ئەو پشتیدەکردە وێنەی یاریکەرە بە هەیبەتەکانی شار، پشتیدەکردە نیگار و زەردەخەنەی ئەو کچە عەیارانەی ژیانیان پڕکردبوو لە بزەی کاغەزین... دەفتەرەکانی دەدایە دەستم و دەیگووت: ئەو حکایەتەی تۆ دەتەوێت بیگێڕیتەوە، پارچەیەکی لەم دەفتەرانەدایە... پارچەیەکی تری لە ژیان و شکست و تەنهایی مندایە. چاوی دەنووقاند

و پشتیدەکردە ئەو دنیا سەیرەی، مەستانە تیا وێڵبووبوو و دەیگووت: «لە یادت نەچێت کە منیش ژیانی خۆمم داناوە، پاشەڕۆژی خۆم دۆڕاندوە، ماڵاوایم لە بیروباوەڕەکانم کردوە». من دەستم دەخستە سەر دەفتەرەکان و دەمزانی ئەو حکایەتە، چیرۆکی ئاڵۆزکانی قەدەرە دوور و لەیەکجوداکانمانە، حکایەتی پارچە شکاوەکانی عومری خۆمە، کۆکردنەوەی چارەنوسە پەنهان و ترسناکەکانی هەموومانە، چیرۆکێکە بە قەدەری تاریکی ئەو خانمانەشەوە بەستراوە کە ژیانیان لە زوڵمەتی تۆبەکردندا بردەسەر، هەروەک چۆن پابەندی ژیانی بەباچووی هەموو ئەو کەسانەشە کە شەوێکی بەفر لە جەنگەڵێکی تاریک هاتنەدەرێ و بە زەویدا پەخشبوونەوە و ئیدی ئاسەوارێکیان دوای خۆیان جێنەهێشت. بەڵام گرنگ ئەوەیە ئێستا من ئەو حکایەتە دەخەمە سەر کاغەز نەوەکو «فەتانە».
من دڵنیام «فەتانە» ئەم چیرۆکە بەجۆرێکی سیحراویتر و کاریگەرتر دەگێڕێتەوە، بەڵام من ساڵانێکی دوور و درێژ نەمدەهێشت مەعسومە ناونیشانی بۆنخۆش لای فەتانە ئاشکرابکات کە تاکە کلیلی گەیشتن بوو بە سەرچاوە تاریک و ئاڵۆزەکانی ئەم چیرۆکە... ئەگەرچی فەتانە هەموو فێڵ و تەڵەکە نازکەکانی خۆی دەخستەکار تا بگاتە سەر شوێنەواری ڕاستەقینەی ئەم سەربوردە، سەربوردێک کە قەدەری من و چارەنوسی من بوو بیگێڕمەوە. من لە قووڵایی دەرونیشما هەستم بە گوناهێکی گەورە دەکرد دەرهەق بەو کچە نەشمیلەیەی بەردەوام خۆی ماندوودەکرد حکایەتی قەشەنگم بۆبگێڕێتەوە، خۆی ماندوودەکرد دیوارەکانی ترس و وەحشەتی ئەو قوتابخانەیەم بە چیرۆکە درێژەکانی بۆ بشکێنێت، کاتێ پێکیشەوە لە گروهی خوشکە ئیمانداراکان هاتینەدەرێ، ئەو بە شەوقەوە بۆ پاشماوەکانی ئەو خوشکەی دەگەڕا کە دەیگووت: «شەوێک لە شەوان بەدوای مانگدا عەوداڵ بوو، وەکو شێت لە ماڵ چووەدەرێ، بەڵام لە بری مانگ، کتێبێکی دۆزییەوە و ئەو کتێبەش نەخۆشی خست».

٣

لـه کۆتایـی ئـەو وەرزەدا کـە فەرەیدونـی مەلـەک یەکەمیـن نامـەی بـۆ پەروانـە نوسـی «ئەگەرچـی سـەرەتای وەرزی خەیـاڵات بـوو»، بـەڵام دڵتەنگییەکـی کوشـندە باڵـی بەسـەر ژیانـی هەردووکمانـدا کێشـابوو. پەروانـە بـەردەوام دەگریـا و دەیگـووت «سـەفەردەکەم»، نەمدەزانـی دەیەوێـت بچێـت بـۆ کـوێ، بـەڵام لـە مێژبـوو مـن دەمزانـی، بازنـەی پەیوەندییەکانـی بـە جۆرێکـی سـەیر گـەورە دەبێـت. ئێـواران کەمجـار لەگـەڵ منـدا لـە قوتابخانـە دەگەڕایـەوە، لـە پاسەکانیشـدا بـەو کراسـە شینەی قوتابخانـە و بـەو بلوسـە سپییە ملدار و قردێلـە کەتانـەوە بەجیـا و زۆر جاریش دوور لـە مـن دادەنیشـت، بـەردەوام سـەیری دەرەوەی دەکـرد و خەیـاڵ دەیبـردەوە، کەمجـار ئـاوڕی لـە مـن دەدایـەوە. هەندێجـار تـکای لێدەکـردم لەگەڵیـدا نـەڕۆم، حەزیدەکـرد هەمیشـە دوور لـە چاوانـی مـن و بـە تەنهـا بـڕوات. مـن دەمزانـی لـە ڕێـگای گەڕانەوەیـدا لـە قوتابخانـە دەچێـت بـۆ جێـگای دیکـە، دەمزانی دەچێـت بـۆ کـۆگا و قەیسـەرییەکان، دەچێـت بـۆ لای ئـەو بەرگدروانـەی دەیانناسـێت، یـان لەگـەڵ یەکێکـدا لـەو عاشـقانە دەڕوات بـۆ پیاسـەیەکی قـەراغ شـار. بـەڵام دواجـار هەمووشـی لەو بێزارییـەوە هەڵدەقـوڵا کـە هێـدی هێـدی ژیانـی وێراندەکـرد. هەمووشـتێکی لـە بێزارییـەوە بـوو، هەندێـک ڕۆژ بـە جـۆرێ خـۆی دەگـۆڕی هەیبەتـی

شازنێکی هەبوو، شازنێک هیچ پیاوێک بە ئاسانی جورئەت ناکات لێی نزیکببێتەوە، بە ئەندازەیەک مامۆستاکانیش لە قوتابخانە زمانیان لە ئاستیدا دەگیرا. دەبێت بڵێم ئەو هەمیشە قوتابییەکی زیرەک بوو، بە ئەندازەیەک زیرەک بوو مامۆستاکان نەیاندەتوانی چاوپۆشی لە هەڵەکانی نەکەن. ئەو ڕۆژەش کە نامەی ئەو پیرەمێردە دەوڵەمەندەی پێگیرا کە لە سەرێکەوە هاوڕێی باوکم و لە سەرێکی دیشەوە دۆستێکی ناسراوی لێپرسراوە باڵاکانی دەوڵەت بوو، کەس لە پەروانەی نەپرسییەوە و کەسیش بە وشەیەک چییە برینداری نەکرد. ئێستا کە بیردەکەمەوە، دەزانم «پەروانە» لە بازنەی ئەو ژیانە تاریکەیدا بەردەوام بۆ تیشک دەگەڕا، ئەو تونێلە ڕەشەی ژوورە تاریکەکان و ڕاڕەوە درێژ و ترسناکەکانی ماڵەوە دروستیاندەکرد، ژیانی گۆڕیبووە سەر گەڕان و عەوداڵییەکی بێکۆتایی لە دوای ڕوناکییەکی نهێنی و نەزانراو، دواتر ئەو کۆڵانە درێژ و پڕ لە باراناو و لیتە ڕەشانەی زستان، ئەو ڕەشەبا هەمیشەییەی کە هەرگیز خۆشی نەدەکردەوە، ئەو گەرما ترسناکەی هەتاوی هاوینان، ئەو لیکەی براکان لەسەر جێگاکان جێیاندەهێشت، زریکە و هاوارەکانی دایک کە بە شتەکانی ئەو ماڵەوە نووسابوو... هەموویان باعیسی ئەو بێزارییە کوشندەیە بوون کە پەروانەیان لە ڕۆحەوە هەڵتەکاند. لەو ساڵەوەی کە بۆ یەکەمجار کەوتە ناو جیهان و گێژەنی پەیوەندییە جۆرا و جۆرەکانەوە، جگە لە شەوان، جگە لەو کاتانەی گڵۆپەکانمان دەکوژانەوە و لە ژێر جێگاکەوە دەکەوتینە چرپەچرپ هەستم بە سۆزە گەرم و خوشکایەتییە پاکەکەی نەدەکرد، هەستمنەدەکرد کە دەمناسێت و خۆشییدەوێم و بە خوشکم حسێبدەکات. بەیانیانیش کە خۆرهەڵدەهات بە خێرایی هەڵدەستاین و خۆمان دەگۆڕی، حەرفێک چییە لەگەڵ یەکدیدا نەماندەگۆڕییەوە، لە قوتابخانەش بەردەوام لەگەڵ

ئەو کچە جوانانەدا دەسوڕایەوە کە پێکەوە دەستەیەک لە جوانترین، لە خۆباییترین و ڕێکپۆشترین کچانی شاریان دروستدەکرد، ئەو کچانەی تێکەڵەیەک بوون لە نازکی و غرور، لە دڵڕەقی و تەماحکاری، ئارەزوویەکی سەیریان هەبوو بۆ پەلاماردانی ژیان و خۆنوواندن، لەگەڵ حەزێکی سوتێنەر بۆ داگیرساندنی عەشق و حەسودی و دڵەڕاوکێی پیاوان و جۆشدانی گومان و ئێرەیی یەکتر، هەریەکەشیان تێکەڵ بە دەیەها چیرۆکی بەیەکداچووی سیاسەت و عەشق و سامان بووبوون. من دەمزانی هەر ئەو کچانە کەناڵی پەیوەندی پەروانەن، بە برێکی زۆری ئەو گەنجانەوە کە دەیانناسێت، هەر ئەو کچانەش ڕاوکەری بێڕەحمی ئەو بوون، هەریەکەیان بە شێوەی خۆی و بە ڕێگای خۆی و بۆ کەسی خۆی ڕاویدەکرد، ئەویش دوای هەموو داوەکان دەکەوت، هەموو ژەهرەکانی دەخواردەوە، لە یەککاتدا دەچووە ناو دەیەها پەیوەندییەوە کە خۆی سەروبنی لە یەکدی جیانەدەکردەوە. دڵنیاشبوو کە هیچ یەکێ لەو پیاوانەی لەو ڕێگایەوە دەیانناسێت نە پیاوی خەونەکان و نە پیاوی چارەنوسیشین، بەڵام دواجار هەر کەسێکی ناسیبێت، داوای ئەوەی لێکردوە، دەربیکات و بیبات بۆ وڵاتێکی دوور، بیبات بۆ زەویەکی تر و لەم شارە بیفڕێنێ... بازنەی پەیوەندییەکانی لەو گەنجە منداڵکار و نەفامانەی قوتابخانەوە تیایدابوو کە بوون و ژیانی خۆیان تەنها لە ڕێگای عەشقی ڕاگوزەرەوە دەسەلماند، تا ئەو دەوڵەمەندانەی دەیانویست کچێکی وەکو پەروانە بخەنە سەر ژمارەی عاشقەکانیان و شانازی پێوەبکەن لە بەردەم مەعشوق و دۆست و ناحەزانیاندا. بەڵام لە هەرکەس زیاتر خۆی دەیزانی لە چ بازنەیەکی پوچدا دەسوڕێتەوە. شەوان درەنگ لە جێگاکەدا دەگریا و چیرۆکی جیاواز جیاوازی بۆ دەگێڕامەوە، من هەموو ساتەکانی ترس و گومان و گریانی لەگەڵدا

دەژیام... هەر لەو شەوانەشدا هەستمکرد، قەدەری من بە جۆرێکی سەیر و بێمانا بە ژیانی پەروانەوە گرێدراوە.

من پێمدەگووت: «دەتکوژن... دەتکوژن، بۆ وادەکەیت، خۆ تۆ سۆزانی نیت». دەیگووت: «نازانم، بەڵام ترسی ئەوەی لەم شارەدا، لەم ژیانە وێرانەدا بە زیندوویی زیندەبەچاڵ ببم، دەمکوژێت»... دەمگووت: «بۆ کورێکت خۆشناوێت و تەواو... بۆ خۆت دەخەیتە گێژاوی ئاوەها شەیتانییەوە». فرمێسکەکانی دەسڕی و بە زەردەخەنەیەکەوە کە سیمای پەپولەیەکی بێگوناهی پێدەبەخشی دەیگووت: «خەندانی بچۆلە، لەبیرت نەچێت، من لە تۆ ناچم، من لە کەس ناچم، من یەکێکی ترم». هەندێ شەو جانتاکەی دەپێچایەوە و جلەکانی ئامادەدەکرد و دەیگووت:«زۆری نەماوە... دەڕۆم... دەڕۆم». من لەسەر لێواری جێگاکەی خۆم دادەنیشتم و سەیرمدەکرد، هەمووشتێکی دەپێچایەوە، وێنەکان، قوتوی مەکیاجەکەی، قردێلە سەیرەکانی، یادگاری ئەو کوڕە بێوەفایانەی ژیانیان گەمارۆدابوو، دەفتەری چکۆلانەی یاداشتەکانی، هەندێ پارچە ئاڵتونی چکۆلانە، هەندێ وردەشتی خۆی کە هەریەکەیان حکایەتێکی هەبوو، وەکو گوڵە بچوکەکانی یەخە، مەمکدانە شیفۆنەکان، چەند پەڕێکی سپی کۆتر، تاڵی قژی چەند کوڕێک و هەندێ شتی دیکە.

هەندێجار نیوەشەوان هەڵدەستام و دەمبینی خەریکی کۆکردنەوەی شتەکانیتی، ئاورێکی دەدایەوە و دەیگووت: «خەندان دەمبوریت لەوانەیە بڕۆم، دەبێت خۆم ئامادەبکەم». هەندێجار من دەگریام و دەمگووت: «پەروانە دەبێت لەگەڵ خۆتدا بمبەیت، پەروانە من لێرە چیبکەم». هەندێجار وەڵامی نەدەدامەوە و هەندێجاریش دەستی بە سەرمدا دەهێنا و دەیگووت: لەگەڵ مندا دەفەوتێیت، تۆ بەختەوەریت، تۆ وەکو من

نیت، بەڵام سوێندم بۆ بخۆ گەر چووم بۆ وڵاتێکی دوور، یان گەر مردم لەیادم ناکەیت». وەکو شێت بە هەموو ئەوانەی دەورروپشتی خۆی دەگووت: «کە مردم لەیادم نەکەیت». وەکو بایەکی خێرا بەناو ژیانی دەیەها خەڵکدا هەڵیدەکرد و دەڕۆیشت و تاکە وتەشی کە دوای خۆی جێیدەهێشت ئەوەبوو کە دەیگووت: «کە مردم لەیادم نەکەیت».
من باوەشم پیادەکرد و دەمگووت: «هەرگیز یادت ناکەم، هەرگیز». بەڵام دەترسا سەیری چاوی دەکردم و گومانێکی قووڵی هەبوو، خۆی دەدا بەسەر ئەو قەنەفە کۆنەدا، سەری دەخستە سەر ئەو مێزە بچوکەی لەسەر فەرشە فارسییە گوڵدارەکە دانرابوو و دەیگووت: «چەندە لە سەرمای مردن دەترسم...». من پێمدەگووت: «کێ دەڵێت، مردن ساردە... کێ دەڵێت؟» سەری بەرزدەکردەوە و بە هەمان ئەو گومانە سەیرەوە دەیڕوانییە هەوای پونگخواردو و سەنگینی ژوورەکە و دەیگووت: «دەکەوێتە سەر ئەوەی لە کوێدا دەتنێژن». بەڵام دواجار ئومێدی هەبوو بڕوات بۆ دنیایەکی گەرمتر و پڕ لە زیندەگیتر. هەموو جارێک دوای کۆکردنەوەی شتەکان، چەندین شەو بە بێدەنگی و لە چاوەڕوانیدا دەژیا، هیچی نەدەگووت، بە بێدەنگ سەیری من و چواردەوری خۆی دەکرد و هیچی نەدەگووت، هەندێک شەو، کتێبێکی بەدزییەوە لە جانتاکەی دەردەهێنا و دەیخوێندەوە، هەندێک شەو زۆر دەیخوێندەوە، من سەرسام دەبووم کە چۆن دەتوانێت نەخەوێت و هەر بخوێنێتەوە و بخوێنێتەوە. هەندێ جار دیاربوو دەیویست خۆی لەیادکات، هەندێ جاری دیکەش کتێبەکان لەگەڵ خۆیاندا دەیانبرد و هەستمدەکرد کە ئەو زۆر بە قووڵی تێدەفکرێت و ڕادەمێنێت، نەمدەزانی ئایا بیر لە ناوەڕۆکی کتێبەکان دەکاتەوە، یان بیر لە شتی دیکە دەکاتەوە؟ بەڵام هەمیشە گومان و چاوەڕوانی و نائومێدییەکی قووڵم تیادەبینی.

زۆر درەنگ باوەڕیکرد هەموو ئەو پیاوانەی نێو ژیانی دەیخەڵەتێنن، سەرەتا ئومێدی وابوو لەگەڵ سەعاتچییەکی دەوڵەمەنددا بڕوات و نەگەڕێتەوە، ئەو پیاوەی کە بە فەنتازیا و خەیاڵەکانی خۆی سوێندی بۆ خواردبوو کە دەتوانێت کاتژمێرەکانی دونیا پاش و پێشبخات، دەتوانێت بەرەو زەمەنە دێرینەکان بیرفێنێ، بیباتەوە بۆ ڕۆژگاری ئیمارەتەکان و لەویادا دوور لە کارەساتەکان پێکەوەبژین. پەروانە دەیگووت: «دەڕۆم بۆ جێگایەک نیشانەیەک و هیمایەکی ئەم دونیایەی تیا نەبێت... بۆ شارێکی بچوک لە ژێر هەتاوێکی ئەبەدیدا، شارێک ئادەمیزادەکان دەتوانن بە ئازادی لە کێڵگەکانیدا بژین». «کێڵگەکان» ئەو وشەیە زرینگەیەکی زۆر سیحراوی هەبوو لە دەنگیدا، خۆیشی زرینگەی ئەفسوناوی ئەو جۆرە وشانەی دەناسی و پێیان مەستدەبوو. ئەو شەوە لە هەموو شەوێ دڵشادتربوو، دەستیکردە ملم و گووتی: «باوەڕبکە خەندان، ئەو دەتوانێت یاری بە زەمەن بکات». من بە ئەسپایی پێمدەگووت: «پەروانە لەگەڵ خۆتدا بمبە»، ئەو دەیگووت: «نا، نا، تا ئێستا نازانم چی دەبێت... نازانم». چەندین شەو چاوەڕوانیکرد، نەدەخەوت، بەردەوام لەو بالکۆنەوە تەماشای مەیدان و شەقامەکانی دەوروبەری دەکرد، بەلام جگە لەو چەرچی و چێوار و پیرەمێردانەی دوای مەلابانگدان دەردەکەوتن کەسی تر دیارنەبوو. دوای هەفتەیەک هات و هەموو گیانی دەلەرزی، گووتی: «خەندان، خەندان، خۆی کوشتووە... خۆی کوشتووە». ئەو کوڕە سەعاتچییە نیوەشەو چووبووە باغچەکەی خۆیان و لە بن توویەکی پیردا بە گوللەیەک مالاوایی لە هەموو شتێک کردبوو. لە ڕۆژی داهاتوودا من و پەروانە خۆمانگۆڕی و چووین بۆ پرسەکەی، هەموو دار و دیوارەکان بۆنی خوێنی ئەو کوڕەیان لێدەهات، سەدەها سەعاتیش بە دیوارەکانەوە هەموو لەو

ساتەوەی ئەو خۆی کوشتبوو وەستابوون، پەروانە بە جۆرێکی زۆر منداڵانە سەیری سەعاتەکانی دەکرد، بەڵام نەیدەتوانی زۆر بەرگەی ئەو بۆنی خوێنە بگرێت کە لە تووەکەوە بەنێو ئەو ماڵەدا پەخشدەبووەوە. پەروانە نەگریا، بەڵام خەم و تەنهایی و ترس بە شێوەیەکی ترسناک بەسیمایەوە دیاربوو. دوای خۆکوشتنی سەعاتچییەکە، لە بازنەی ژیانی پەروانەدا کەسانی سەیرتر دەرکەوتن، ئەو پیاوە دەرکەوت کە شەوێک وێنەکەی نیشاندام، «پەروانە» باوەڕی وابوو بەردەوام شەبەنگێکی نوور بەسەر سەریەوەیەتی، دەیگووت کە توانای هەیە لەگەڵ پێغەمبەرەکاندا قسەبکات، لەگەڵ ڕۆحیانەتی مردووەکاندا نامە بگۆڕێتەوە. دواتریش ئەو گەنجە شەرمنە دەرکەوت کە دەیتوانی ڕەشەباکان ڕاوەستێنێ و بە چواردەوری خۆیدا بازنەیەکی هێمن بەرقەراربکات، ئەو بازرگانە دەرکەوت کە هێندە بەرەو خۆرهەڵات و خوارووی خۆرهەڵاتی ئاسیا سەفەریکردبوو سیمای ڕەبەنێکی بودی وەرگرتبوو، ئەو گەنجە کە تەنها دوای هەفتەیەک لە ناسینی پەروانە گوللەیەکی وێڵ لە ناوەڕاستی بازاڕدا کوشتی. شەوێک من پێمگووت: «ئەو جانتایە فرێدە... واز لەو جانتایە بهێنە، تۆ هەرگیز سەفەرناکەیت». ئەو شەوە ماکسییەکی نیللی لەبەردابوو، بە ئەسپایی گووتی: «بەڵام ڕۆحم وام پێناڵێت، هەستدەکەم سەفەردەکەم و ئیدی هەرگیزیش ناگەڕێمەوە». ئەو بازنەیەی گەمارۆی ژیانی پەروانەی دەدا تا دەهات بچوکتردەبووەوە. ئەو کچانەی لەگەڵ پەروانەدا شۆخترین کچانی قوتابخانەیان پێکدەهێنا، هێدی هێدی سەفەریاندەکرد و دەڕۆیشتن، ئێواران بە سیمایەکی ماندوو و حەپەساوەوە دەهاتەوە بۆ ماڵ و بەچرپەوە پێیدەگووتم: «خەندان، نەزاکەتی چاوشین ڕۆی و سەفەریکرد... خەندان، مەندانە ئێستا لە ئەستێرەیەکی ترە... خەندان، پورهان ڕۆی، خەندان فریشتە

ڕۆی... خەنـدان... خەنـدان... خەنـدان». چیرۆکـی کۆچـی ئـەو کچانـە دوایـی نەدەهـات کـە بـە شـێوەیەکی کوتوپـڕ و ناوەخـت لـە سـاڵۆنەکانی قوتابخانـەدا وندەبـوون و نەماندەبینینـەوە... بـەڵام لەگـەڵ ئەوەشـدا لـە ئاسـۆکانی ژیانـی پەروانـەدا هیـچ کۆچێکـی کوتوپـڕ دیارنەبـوو. مـن ئەمـڕۆ کـە بیـر لـە سـەرجەمی ئـەو بەسـەرهاتە سـەیرانە دەکەمـەوە، دەڵێـم: گـەر پەروانـە لـە فەرەیدونـی مەلەکدا هەمـان ئـەو خەونـە ئەفسانەییەی نەبینیایە بـۆ سـەفەر لەوانەبـوو ئەویـش هـەر ڕۆحێکـی ڕاگـوزەر و تێپەڕبووایـە لـە ژیانیـدا، ئەویـش هـەر تەنها قەترەیەکـی دیکـەی نائومێدی بووایـە، بـەڵام کـێ چووزانێـت؟... بەهەرحـاڵ دوای ئـەم چیرۆکـە غەمگینانـە دەتوانیـن بڵێیـن ئـەو سـەفەرانەی لـە خاڵێکـەوە دەسـت پێدەکـەن، چەنـدە هاوڕێـگا و هاودەمـەکان لەیەکدی نزیکبن، مـەرج نییـە پێکـەوە و لـە یـەک جێـگادا کۆتاییـان پێبێـت.

## ٤

نیوەشەوێکی فێنکی بەهاربوو کە دواجار خەونی هەڵهاتنی پەروانە بوو بەڕاست، هەفتەیەک بوو شەوان نەدەنووست، بێخەوییەکی گەورە و ترسێکی کوتوپڕ هەموو ژیانی داگرتبوو، چەند ڕۆژێک لەوەوبەر منی برد و گووتی: «خەندانی چکۆلە، لەگەڵما وەرە ئەمڕۆ دەچین و کۆتایی بەم ئازار و نیگەرانییە گەورەیە دەهێنین و هەمووشتێ دەبڕێنینەوە». من لەوەوبەر چەند جارێک لە چەند ئێوارەیەکی تاریک و چەند بەرەبەیانێکی تەماویدا فەرەیدونی مەلەکم بینیبوو، بەڵام هەرگیز لەگەڵیدا نەدوابووم، ئەو کات لە نانەواخانەیەکی گەورەدا کاریدەکرد. من و پەروانە لە کۆڵانێکی تەسکدا لە دەرگای ماڵێکی داڕوخاوماندا و بە ڕاڕەوێکی چکۆلانە و تاریکدا چووینەژوورێ و بە حەوشێکی پڕ لە قیرەقیری قاز و قەلەموندا ڕۆیشتین و لە بەرهەیوانێکدا لەسەر کورسییەکی شکاو و شپرزە دانیشتین. لە ژوورێکی ئەو دیودا کە بەسەر نانەواخانەکەدا دەکرایەوە، فەرەیدون بە جلە ئاردوایەکانییەوە هاتەدەرێ و بە سیمایەکی غەمگینەوە ئامێزی بە پەروانەدا کرد. پیاوێکی ئاسایی دیاربوو، سیحرێکی چکۆلانە لە چاویدا بوو، بەڵام جیاوازییەکی ئەوتۆی لەگەڵ ئەو پیاوانەی تردا نەبوو کە من لە کۆڵان و شەقامەکاندا دەمبینین، بەڵام ئەو ڕۆژە لە ناو ئەو تەپوتۆزە سپییەدا کە لە دەوری خۆی دەیخولقاند، ترسێکی سەیرم لە نیگاکانیدا بینی... ئەو وەرزە سەرەتای ئەو ڕەشەکوژییە ترسناکانەبوو کە دەوڵەت ڕۆژ دوای ڕۆژ بارنەکانی

گەورەتر و خوێناویتر دەکرد. بەیانیان هەڵدەستاین و شەقامەکان هەمووی خوێن و شوشەی شکاو و پاشماوەی ئاگریوون. ڕۆژی پێشتر دوو هاوڕێی فەرەیدون، بە دەستی مەفرەزەکانی دەوڵەت تیربارانکرابوون. ڕۆژگارێکی سەیربوو، هەموو بە شێوەیەکی بێمانا و نائاسایی دەترساین، هەتا من کە شتێکم نەبوو لێی بترسم دەترسام. لەگەڵ ئەو هەموو ترسەشدا نەسرەدینی بۆنخۆش تا ئەمڕۆ سەیری لە هەموو ڕووداوەکان دێت، چونکە فەرەیدونی مەلەک ئەگەرچی لە ڕۆژگارێکی پڕ لە گێژاودا ژیابوو، بەڵام هەرگیز بە حەرفێک باسی لە سیاسەت و خەبات نەکردبوو. تاکە خولیای ئەو سەفەر بوو لەو دەشتە کاکی بەکاکیانەدا کە دەیگووت: «جگە لە خۆم و پەپولەکان، جگە لە خۆم و دەریای بێپەیی جوانییەکان، ئازادە لە هەر ئازار و خولیا و خەیاڵێک». من لەبیرمە ئەو ڕۆژە فەرەیدون بە جلە ئاردوایەکانییەوە بە هەیوانەکەدا دەگەڕا و نائومێدانە دەستی بەرزدەکردەوە و دەیگووت: «هاوڕێکانم لە دوو مەقامبێژی مەست زیاتر هیچی تر نەبوون».

ئەو ئێوارەیە من چووبوومە ناو کورسیەکە و بە شەرمەوە سەیری ئەو دوو عاشقەم دەکرد کە بوونی منیان لەیادکردبوو، کە فەرەیدون باسی مەرگی هاوڕێکانی دەکرد پەروانە تیادەپاڕایەوە کە بڕۆن، دەیگووت: «ئەو ڕۆژەی کە دەگەنە سەر تۆش و دەتکوژن نزیکە ... من دڵم دەلیلمە، فەرەیدون من لەگەڵتام تا ئەوسەری دونیا». فەرەیدون سەری بەرزدەکردەوە و دەیگووت: «هیچ کەس ناتوانێت تا ئەوسەر لەگەڵمدابێت، من خۆم هەموو شتەکانم لەپێشچاوە، لەپێشچاومە کە تەنها دەمێنمەوە». ئەو ئێوارەیە فەرەیدون چەند جار ئەو ڕستەیەی دووبارەکردەوە و هەموو جارێکیش پەروانە بە جۆرێ تەماشایدەکرد وەکو گوێی لێ نەبووبێت... هەموو جارێک بە شێوەیەکی سەیر ئاڕاستەی قسەکانی دەگۆڕی، سەیری جێگایەکی دیکەی دەکرد، بەشتی دیکەوە خۆی سەرقاڵدەکرد. کە فەرەیدونمان بەجێهێشت، پەروانە لە غەمدا خەریکبوو دەمرد، بەدرێژایی هەفتەکەش حاڵێکی پەرێشانی

هەبوو، بەڵام من لە مێژبوو بەو هەفتە و مانگ و ساڵە درێژانەی چاوەڕوانی و پەرێشانی ئەو ڕاهاتبووم، هەستم نەکرد شتێکی ترسناک بەڕێوەیە.

هەر لەو هەفتەیەدا بوو کە لە لادێیەکی دوورەوە شۆفێرێکی پیر ئەو نامەیەی نەسرەدین بۆنخۆشی گەیاندە فەرەیدونی مەلەک، ئەو نامەیەی هەموو ژیانمانی سەرلەبەر ئاوەژووکردەوە... ئەمرۆ نەسرەدینی بۆنخۆش ئەو نامەیە بە سەرەتای هەموو گوناهەکانی خۆی دەزانێت، بەڵام ئەو کات پێیوابوو هاوڕێیەک لە میحنەت و عەشقێک لە دۆزەخ ئازاددەکات. بەڵام ئەمرۆ کە باس لەو ڕۆژگارانە دەکات، شەرمێکی قووڵ لە چاوانیایەتی. کە دواجاریش پێکەوە ئەو نامەیەمان لە نابەینی کۆمەڵێ نامەی کۆنی دیکەی فەرەیدونندا دۆزییەوە، ئەو بە پەشیمانییەکی قووڵەوە گووتی: «هەموو شتەکان لەم نامەیەوە دەستیپێکرد، کە شەوێکی بەهار لە ژێر چادرێکی پێشمەرگانەدا لە ناو ئەو چیا ساردانەدا نوسیم و بەگەمژیی خۆم پێم وابوو عاشقێک ڕزگاردەکەم».

«پەروانە» و «فەرەیدون» دواجار لە شەوێک لە شەوە قەشەنگەکانی بەهاردا بڕیاریاندا بڕۆن. پەروانە وەک هەمیشە جانتاکەی ئامادەکردبوو، من دەمویست دواجار شتێکی بۆ بکەم، شتێک بۆ ئەو کچە بکەم کە وەکو تارمایی لە تەنیشتمەوە دەژیا و وەکو سێبەرێکی نازک بەناو ماڵدا هاتوچۆی دەکرد و وەڕزیی ژیان لە نێو چوار دیوارەکانی ماڵدا پاڵی پێوەدەنا، ڕقی لە بۆنی ئەو خواردنانەش بێت کە ڕۆژانە دەبایە سەر سفرەی باوک و براکانی پێبڕاژاندایەتەوە. ئەو لە مێژبوو نەهاتبووە سەر سفرەکان، ئەو سفرەیەی من و باوک و براکانم لەدەوری کۆدەبووینەوە و بێئەوەی کەسمان سەیری ئەوی دیکەمان بکات نانمان دەخوارد. ئەو دوور لە هەموومان بە تەنها دادەنیشت، هەتا دوور لە دایکیشم کە وەکو جانەوەرێکی دەرکراو لە کونجێکدا خواردنەکەی بە دەوری خۆیدا دەڕشت و

بە چاوێکی دڵڕەقانە سەیری هەموومانی دەکرد و دەیقیژاند... ئەو شەوە کە جانتاکەی کۆکردەوە و گووتی: «ئیدی ئەمجارە دەڕۆم». شەوێک بوو ڕوناکتر و ئارامتر لە شەوەکانی تر، باغچەکەمان قووڵتر لە هەر کاتێکی تر خەوتبوو. دیوارەکانَ لە هەرکاتێکی دی بێدەنگتربوون، پرخەی برا و باوکان نەبێت کە لەرەیەکی چکۆلەیان لە هەوای تاساوی ئەو ماڵەدا دروستدەکرد، شتەکانی دی هەمووی کپ و خامۆشبوون. من ئەو خامۆشییەم دەگێڕایەوە بۆ نەبوونی هیچ پەیوەندییەک لە نێوان پەروانە و ئەو شتانەی نزیکماندا، لە نێوان پەروانە و ئەم ماڵەدا، پەروانە و ئەم ژوور و ڕاڕەو و هەیوان و باغانەدا. ئەو بە حەسرەتەوە شتەکانی دەپێچایەوە و دەیگووت: «پەپولەکان موڵکی هیچ جێگایەک نین». تا هەتا دایکیشم لەسەر دەنگی هاتوچۆکانی پەروانە بەئاگانەهاتەوە، بە درێژایی ئەو شەوە پەروانە بە خۆی و پێڵاوەکانییەوە بەناو ماڵەکەدا دەهات و دەچوو، دەچووە بەر باڵکۆنەکە و سەیری ئەو شەقامە خامۆشانەی دەکرد کە دەبایە فەرەیدون دەمەوبەیان بهاتایە و لە ماشێنی هاوڕێیەکیدا هەڵیبگرتبایە و بەرەو نادیار بڕۆیشتبانایە.

شەو تەواو ئارام و هێمن بوو، جار جار دەنگی تێپەڕینی کامیۆنێکی سەربازی یان وەڕینی سەگێکی وێڵگەڕ یان مردنی نەیزەکێک شتەکانی کەمێک ڕادەچڵەکاند... بەڵام هەستمکرد، هەموو شتەکان خەوتوون... ئاسمان و خودا و شتە بچوکەکانیش خەوتوون... هەتا بۆ ساتێکیش لەو ڕاستییە کەوتمە گومان کە ئایا دەبێت من خۆم وریا بم یان خەوتوو؟. من لە تاریکی ژوورەکەدا لەسەر کورسیەک نائارام و ترساو دانیشتبووم و سەیری ئەوم دەکرد کە لەبەر باڵکۆنەکەدا تەماشای دونیای دەکرد، تەماشای ئەو چرا کز و ئارام و سەیرانەی شاری دەکرد، ئەگەرچی دونیا بۆ خۆی ساردنەبوو من هەستم بە سەرمایەکی کوشندە دەکرد، هەموو شتەکان بێدەنگ و بێباک بوون، شتێک لە ڕۆحمدا دەیگووت: «ئەو بە ئاسانی دەربازنابێت». کێشەی گەورەی پەروانە ئەوەبوو نەیدەزانی ئەو

جیهانەی چواردەوری تا چ ئەندازەیەک تەنراوە، زووزوو تەماشای سەعاتەکەی دەکرد و بزەیەکی نهێنی دەکەوتە سەر نیگای، بزەیەکی تاڵ و تەلیسماوی، هەستمدەکرد ئەویش سەرمایەتی «بەڵام دونیا خۆی سارد نەبوو». نەمدەزانی بۆ ئەو بێدەنگییە سەنگینەی گەردون، ئەو ئارامییە قووڵەی ئینجانەکان، ئەو خەونە ترسناک و بێباک و بێسنوورەی گوڵەکانی باغ، بەو جۆرە دەیانترسانم؟ ئەو شەوە پەروانە کراسێکی ڕەش و تەنوورەیەکی خۆڵەمێشی لەبەردابوو، قژی بە پەڕۆیەکی سپی باریک لە دواوە گرێدابوو، هەر زووزوو دەگەڕایەوە ژووری و دەیگووت: «دڵنیام دێت... هێشتا زووە، وانییە؟»، هەر جارێکیش کە دەهاتە ژووری بە نازکی باوەش پێدا دەکردم و دەیگووت: «وەعدم بەرێ عاقڵ دەبیت، وەعدم بەرێ ئەگەر نامەم بۆ نوسیت وەڵامدەدەیتەوە، وەعدم بەرێ کە هەواڵی هاورێکانم بۆ بنێریت، وەعدم بەرێ ئەگەر مردم لەیادم نەکەیت». من بە بێدەنگ سەرم دەلەقاند و بە دڵێکی پڕ لە گریانەوە دەمگووت: «وەعد... وەعد». ئەو بەیانییە دەمزانی دەڕوات، دڵنیاشبووم شتەکان چاوی لێخافڵدەکەن تا بڕوات... باوک چاوی لێخافڵدەکات تا بڕوات... ئەستێرەکان خۆیان لە ئاساییترین شێوە و هێمنترین نیگادا دەردەخەن تا بڕوات... باغچە خۆی دەکات بە خەوتوو تا بڕوات... هەموو دەیانەوێت چۆن پەپولەیەک لە باغێک دەفڕێت و فڕینی هیچ لە یەکانگیری گەردون تێکنادات، ئاوا بفڕێت... بەڵام من لە دڵەوە دەمگووت: «ناکرێت مرۆڤێک وەکو پەپولەیەک تەماشابکەین... ناکرێت». ئەو لەو کاتانەدا دەهاتە ژووری و وەکو هەموو ترس و نائومێدییەکانی من بخوێنێتەوە زەردەخەنەیەکی سەیری دەگرت و دەیگووت: «خەندان... منت لەیادنەچێت، پەروانەت لەیادنەچێت... بزانە، من پەروانەم، پەروانە». ئەو بە درێژایی ژیانی، لەو کاتانەدا کە هەموو شتەکان لەبەرچاوی من وەکو تەلیسمیان لێدەهات، بەو ڕستە تەلیسماوییە وەڵامیدەدامەوە... ئەو هەتا لە مەرگیشدا بەو ڕستە پڕ نهێنی و سەیرە وەڵامیدامەوە، بە جۆرێ من

نەمدەزانی سنوورەکانی مرۆڤ و سنوورەکانی پەپولە لە ژیان و قەدەری ئەودا چۆن چۆنی تێکەڵاوبووە. ئەو تەماشایدەکردم و دەیگووت: «بیر لە چی دەکەیتەوە؟»، من دەگریام و دەمگووت: «بیر لە بەیانیانی زستان دەکەمەوە کە بە پەلە پێکەوە چایەکمان دەخواردەوە و دەچووین بۆ قوتابخانە، بیر لەو عومرە دەکەمەوە کە لە تەنیشت یەکترەوە ژیاین، بیر لە پێکەنینەکانت دەکەمەوە لەگەڵ هاورێکانتدا لە قوتابخانە، بیر لە سێبەرەکەت دەکەمەوە لە ناو ئەم ژوورانەدا». ئەو سەری دەخستە نێوان دەستەکانییەوە و پێدەکەنی و دەیگووت: «خەندان... چەندە منداڵیت... چەندە منداڵیت».

بەریەیان دەهات و لەناکاو فەرەیدونی مەلەک لە نزیک مەیدانەکەوە دەردەکەوت، پەروانە کە جانتا چکۆلانەکەی بە دەستی فەرەیدونەوە دەبینی دەپەشۆکا و خەریکبوو لەیادیدەچوو ماڵاوایم لێبکات، هەستم نەکرد کە زۆر زۆر دڵشادە، بەڵام دەیویست بڕوات، مەسەلەکە تەنها کامەرانی نەبوو، تەنها ئازادیش نەبوو، بەڵکو خۆفڕێدانە ناو خەوێک بوو. «فەرەیدون» لە بولیلیێ ئەو بەیانییەدا سیمایەکی سەیری هەبوو... سیمای ڕێبوارێکی ڕاستەقینە. من تا بەر دەرگا جانتاکەم لەگەڵ پەروانەدا هەڵگرت، سەیر بوو کە کەس بەئاگا نەهاتەوە، کەس نەیگووت: «پەروانە مەڕۆ»، بە بێدەنگی لە بەردەرگاکەدا ماچیکردم و من گریام، سەدەها جار ماچیکردم و من گریام. دواجار گووتی: «هەر دەبایە بڕۆیشتمایە... هەر دەبایە»، بە هێمنی سەیری باغەکەی کرد و دەستی بۆ ناو ماڵ درێژکرد و گووتی: «جەهەنەمە...». دڵنیابووم دەیویست شتی دیکە بڵێت، دڵنیابووم دەیویست چەندەها ڕستەی خنکاوی ناو ڕۆحی ئازادبکات و قسەبکات، بەڵام کات گەلێ درەنگ بوو... ئیدی ڕۆیشت و هیچی تری نەگووت... هیچی تر.

# ٥

شار چەشنێکە لە گەمارۆ، هەر بۆیە چوونە دەرەوە لە هیچ شارێکی ئەم دونیایە ئاسان نییە. کاتێ لە ئێوارەی ڕۆژی دواتردا نامەکەی پەروانەم پێگەیشت بەرلەوەی بیکەمەوە تێگەیشتم کە پەروانە هێشتا لێرەیە و نەیتوانیوە ئەو گەمارۆیە بشکێنێت. من دەمزانی شکاندنی ئەو بازنەیەی دەوڵەت بە ئاقاری شارەکاندا کێشاویەتی ئاسان نییە، پەروانە لە پارچە کاغەزێکی چکۆلانەدا نوسیبووی: «خەندانی چکۆلە مەترسە، من هێشتا لێرەم... لە ڕۆژانی داهاتوودا هەوڵدەدەین دەربازبین». من لە بەیانییەوە هەستمدەکرد کە هێشتا لێرەیە، لە نێو گوڵەکاندا هەستم پێدەکرد، لە نزیک ئینجانەکانەوە هەستم پێدەکرد، کە دەچوومە بەر پەنجەرەکە و شنەباکان هەڵیاندەکرد لە هەوا و ئاسمان و هەتاوەکاندا دەمبینی، نەمدەزانی ئەو هەستە لە چییەوە هەڵدەقوڵێت، بەڵام دڵنیابووم پەیوەندییەکی قووڵی بە پەروانەوە هەیە. ئەو هەستە بە نزیکی پەروانە ماوەیەکی زۆر جورئەتێکی زۆری دەدامێ بۆ ژیان، دوای مردنی پەروانەش، ساڵان و مانگانێکی بێشوومار ملکەچ و بێخەون ژیام... لە دوای نەمانی پەروانە باعیسێکم نەمابوو بۆ شەڕکردن، ئەمڕۆش کە سەر لەنوێ بەسەر ساتەکانی ئەم چیرۆکەدا دەچمەوە، دەمەوێت بۆ هەتاهەتایە و بە یەکجار پەروانە زیندووبکەمەوە و سەر لەنوێ ئیلهامی ژیانێکی دی لێوەرگرمەوە.

ئەو ڕۆژە تا ئێوارێ کەس لە ماڵ نەیزانی پەروانە ڕۆیشتووە. «باوک» وەک هەمیشە لە بازاڕی زەرەنگەرەکاندا سەرقاڵی بازن و ئەنگوستیلە و لاگیرەکانی خۆی بوو، براکانم بەیانی خۆیان گۆڕی و ڕۆیشتنە دەرەوە، کەس نەیپرسی «پەروانە کوا؟»... لە ئێوارێدا کە گەڕانەوە، یەکەمجار بابم پرسی «پەروانە لە کوێیە؟»، من گووتم: «ئەمڕۆ نەمبینیوە، بەیانی هەستام و ئەو لە جێگاکەیدا نەبوو، ئیتر نەمبینیوە»... هەر ئەو شەوە «باوک» بەدەم گریانەوە هەموو پەنجەرەکانی شکاند، دەرگاکانی شکاند، هەموو شتە جوان و ئەنتیکەکانی ماڵی ورد و خاشکرد. براکانم منیان بە قژ کێشکردە ژێرزەمینەکە، بە پلەکاندا ڕایانکێشام و وەک شێت کەوتنە لێدان و وێرانکردنم، ساڵانێکی درێژ خوێنی ئەو ئێوارەیەی من بە دیوارەکانی ژێرزەمینەکەوە بوو، خوێنی ئەو دەستە ماندووانەم کە ویستبووم خۆم بە دیوارەکانەوە بگرمەوە، خوێنی ئەو ددانە زامدارانەم کە بە قووڵپ دەڕژایە نابەینی سندوقەکان و سەر ئەوفەردە و نوێنە کۆنانەی بە جۆرێکی نارێک لەو ژێرزەمینەدا هەڵچنرابوون. ئێستاش هەرکاتێک دەچمە ئەو ژێرزەمینە، گوێم لە قریشکەکانی خۆمە، گوێم لەو هاوارە زەلیلانەیە کە بە ناکامی بەر ئەو ئاسمانە ژەنگگرتووەی مێژووی ماڵ دەکەون، مێژوویەک کە لەسەر خوسان و پڕنۆل پڕنۆڵبوون و هەڵوەرینی ژیانمان نوسراوەتەوە. باوک دەگریا و براکانم لە منیان دەدا و دەیانگووت: «چوو بۆ کوێ؟». گریانی باوک سەیرترین شتی ژیانی ئێمە بوو، ئەو لە هەموو ساتە نازکەکانی ژیانیدا جگە لە گریان و بەسەرخۆدا کێشان و شت شکاندن هیچی تری نەدەکرد، بە کڵاوێکی پڕ لە نەخش و نیگارەوە لەو نێوەدا دەسوڕایەوە بەسەری خۆیدا دەکێشا و دەگریا. هەندێ جار ئەو سوڕخواردنە سەیرەی ئەو، ئەو سەرکوتانەی بە دیوارەکاندا براکانمی گێژدەکرد و ئەوانیش دەکەوتنە شەقهەڵدان لە کورسی و مێزەکان، دەکەوتنە بۆکسدان لە دیوارەکان، بەڵام ئەو بە

هیچ ئارام نەدەبووەوە. ئەو کینە و نا ئارامی ناو ڕۆحی خۆی بەسەر خۆیدا خاڵیدەکردەوە. هەندێک بەیانی بە بیجامە خەت خەت و کڵاوەکەی سەریەوە دەچووە باغچەکە و بێ هۆیەکی دیاریکراو دەکەوتە مستکوتان بە سەر و سینەی خۆیدا. هەستم نەدەکرد ئەو کەسمانی خۆشبوێت، زۆرجار دڵم بەو تەنهاییە گەورەیەی دەسووتا، ئەو لە هەموو ژیانیدا هاوڕێیەکی ڕاستەقینەی نەبوو. ڕۆژگارێک کەلێ تەنهابوو، بە خۆی و مراخانییە شۆڕەکەیەوە بە کوچە و بازاڕەکاندا دەگەڕایەوە و هیچ کەسێک نەبوو سڵاوێکی لێبکات. تا دواجار پورم، خوشکە سۆفیلکەکەی خۆی، کە لە ژێرەوەڕا جیهانی هەموو خاتوونە ئیماندارەکانی شاری بەڕێوەدەبرد، ڕووەو جیهانی پیاوانی مزگەوت پاڵیپێوەنا، ئێستا ساڵانێک بوو لە جیهانی ئەو مزگەوتە جەنجاڵ و عارەقاویانەدا چەند هاوڕێیەکی چکۆلانەی هەبوو کە هەموو بە ملکەچی و شەرم و ترسەوە گوێیان لە یەکتر دەگرت، سەریان بۆ یەکتر دەلەقاند. بەردەوام شەوان چەند سەعاتێک بە نەعلە ئیسفەنجەکەیەوە لە بەردەرگا، لە ژێر مانگەشەودا، لە ژێر باراندا، لە ناو ڕەشەباکاندا دەوەستا و قسەی لەگەڵ ئەو هاوڕێ چکۆلانانەدا دەکرد، هەندێ شەو کە دەهاتە ژوورێ سەرتاپای تەڕبوو، یاخود لە سەرماندا هەڵدەلەرزی، بەڵام گوێینەدەدایە هیچ شتێ... ئەمشەویش ونبوونی پەروانەی بەو ئابڕوچوونە ترسناکە دەزانی کە لە مێژبوو لێی دەترسا، ئابڕوچوونێک دەشیا دووبارە فڕێیبداتەوە نێو تەنهاییە ترسناکەکەی جارانی خۆی.

دەبێت ئەوە بڵێم کە ساڵانێکی درێژ کەس سەرنجی ئەو ژیانە سەیر و وێرانەی پەروانەی نەدا. ساڵانێکی درێژ ئەو وەکو تارماییەکی بێدەنگ ئیشی ئەوەبوو دیوار و حەوش و فەرشەکان پاکبکاتەوە، ئەو کرمانە کۆبکاتەوە کە دایک لە ژێر خۆیدا هەڵیدەهێنان، ئەو سفرانە بڕازێنێتەوە

کە خۆی لەسەری نەدەخواردن، ئەو ژوورانە بۆنخۆشبکات کە ڕزینی دایک لە کونجە تاریکەکەی خۆیدا بۆنەکەی دەشێواندن. عومرێک کەس پەروانەی نەدەبینی کە ڕۆژ لە دوای ڕۆژ ژیانی دەبووە ئەو گەردە وردە «گەردی پەپولەکان»، ئەو گەردەی من دەمێک ساڵ بوو دەمبینی، لەسەر جێگای خەوتنەکەی دەمبینی، لەنزیک ئەو گوڵانەوە دەمبینی کە ئاویدەدان... بەڵام هەرگیز باسم نەدەکرد. لێم نەدەپرسی «ئەو گەردی پەروانانە چییە کە جارجار لە دەورت دەیبینم؟»، ئەویش هیچی نەدەگووت... ئەو دەیزانی ئەوەی کە هەڵدەوەرێت ژیانی خۆیەتی، ئەوەی دەبێتە گەرد سات و کاتژمێرە ناکامەکانی تەمەنی خۆیەتی، بۆیە بۆ ژیانێک و بۆ شێوەیەکی خۆگرتر و نەگۆڕتر دەگەڕا، هەر لە دوای ئەو خەونەش دەیویست ئابلۆقەی ئاسنینی ئەو شارە بشکێنێت کە ناوی دەنا شاری «خوێن وئاین و تەپوتۆز»... لەو ئێوارەیەوە کە هەڵهاتنی فەرەیدونی مەلەک لەگەڵ پەروانەدا ئاشکرابوو، هەموو شتێک لە ژیانی مندا گۆڕا. ئەو شەوە دوای ئەوەی براکانم نائومێدبوون لە لێدانم، خەڵتان لە خوێن و ئازاردا، لە ناو ئامێرە شکاو و قەرەوێڵە کۆن و کورسییە هەڵوەشاوەکانی ژێرزەمینەکەدا جێیانهێشتم. من کاتێکی دوور و درێژ لە نێوان هۆشیاری و بێهۆشیدا لە هاتوچووندا بووم... لە ناو مۆتەکە و خولیا ڕەشەکانی بێهۆشیدا وێنەیەکی دووبارەبووەوەی پەروانەم دەبینی کە لەسەر زنجیرەیەک دەرگای ڕەش و داخراو دەردەکەوت و ئاوادەبوو... پەروانەم دەبینی لەسەر ئەسپێکی خوێناوی بە ئاسمانێکی ئاسنیندا دەفڕی... لە ناو باغێکی سووتاودا بە خەوتوویی دەردەکەوت و دوکەڵ و کڵپەکان دایاندەپۆشی و لە چاوان وندەبوو. کە بە ئاگاش دەهاتمەوە دەمزانی ئەم خولیایانە خولیای ترس و ئازار و بێهۆشییە. نیوەشەو زانیم کە باوکم لەوپەڕی نائومێدیدا پەنایبردۆتە بەر خوشکە سۆفیلکەکەی تا پەروانەی بۆ بدۆزێتەوە، ئەو بەو شەوە تاریکە بە

فرمێسکە خوێناوییەکانی خۆیەوە لە بەرقاپی ئەو خوشکەدا کەوتبوو، دەستەکانی بەرزکردبووە و گووتبووی: «فریامکەوە، خوشکم فریامکەوە، بە هیمەتی شەیتان بووە یا بە هیمەتی خودا، فریامکەوە». پورم بە چرپەیەک کە چرپەی ترس و وەحشەتێکی قووڵ و خودایی بوو گووتبووی: « هەر دەمزانی شەوێک لەوماڵەی تۆدا شەیتان بەرەڵادەبێت... دەمزانی کار لە کار دەترازێت و ئەو کچە هەموومان بەرەو دۆزەخ و وێرانی و کوفر رادەکێشێت». هەر ئەو شەوە ژنە دەفبەدەستەکان کۆبوونەوە... ئەو ژنانەی پور لە تاریکترین و ترسناکترین شەویشدا دەیتوانی کۆیانبکاتەوە، هەموو وەکو پۆلێ لە عەباپۆشی بێدەنگ، بە هێمنی تێکەڵاوی شەو دەبوون و بە کوچەکانی شاردا دەرگا بە دەرگا لە قاپی یەکتریان دەدا، بە دەفەکانیانەوە بەرەو لای یەکدی دەکشان. ژنانی هەمەڕەنگ... ژنانی کەڵەگەت و ئەسمەر، ژنانی چکۆلانە و نەخۆش، ژنانی لاواز و زەردهەڵگەڕاو، ژنانی گۆشتن و داکەوتوو. شەوێکی زۆر درەنگ بوو کە هەموو لەگەڵ پورمدا دابەزینە ژێرزەمینەکەوە و لە دەورم ئاپۆرەیان بەست. من لەوەوبەر دیمەنی لەو جۆرەم نەبینیبوو، ساتی لەو چەشنە نەژیابووم... سیماکان هەموویان درێژتر و باریکتر لە حەقیقەتی خۆیان دەهاتنە پێشچاوم، دەنگەکان دوورتر و نزمتر، ڕەنگەکان کاڵتر و خۆڵەمێشیتر. سەرەتا تەنها دۆعایاندەکرد و سورەتی جیاوازجیاوازیان دەخوێند، دواتر پورمم بینی بەو چاوە سارد و تیژانەی خۆیەوە بەو قامەتە درێژ و ئەستورەیەوە بەو پرچە درێژ و لولداراو و ڕەشانەیەوە، بە هێمنی لێمنزیکبووەوە و دەیگووت: «پەروانە کوا؟ پەروانە لە کوێیە؟... ئەو شەیتانە زینابازە لەکوێیە؟».

من بڕیارمدابوو هیچ نەڵێم، دەمزانی بیدۆزنەوە دەیکوژن، دەمزانی چارەنوسی پەروانە ئێستا لە دەستی مندایە. لەو ساتەدا بەجیا لەو ئازارەی کە دەمچەشت، خۆشییەکی سەیر بە هەموو گیانمدا دەگەڕا، بەختیاربووم کە قەدەری من بەو جۆرە بە قەدەری ئەوەوە گرێدراوە...

ئاگاداربـووم لــە دەورم هەڵدەسـوڕان و ئایەتــە قورئانییەکانیــان دووبارەدەکـردەوە، لـە خـۆم نەدەترسـام، بـەڵام دەمزانـی ئـەو ژنـە تۆڕێکـی تاریـک و شـەیتانی لـە هەمـوو کۆڵانێکـی شـاردا هەیـە، دەمزانـی ئـەو ژنـە پەیامهێنـی تایبەتـی خـۆی لـە هەمـوو سـوچێکی ئـەم شـارەدا بڵاوکردۆتـەوە. ئـەوان چەندیـن سـەعات باسـی گەورەیـی ئـەو گوناهەیـان بۆکـردم، باسـی ئـەو ئاسـمانەیان بـۆ کـردم کـە بەسـەرماندا دەڕوخێـت، باسـی ئـەو کـوورە ترسـناکانەی ئاگریـان بـۆ کـردم کـە لـە هەمـوو کونجێکـی زەوییـەوە هەڵدەقووڵێـت، باسـی ئـەو ئەسـتێرە پـڕ لـە ئافاتەیـان بـۆ کـردم کـە دەکەوێتـە خـوار و زەوی لەگـەڵ خۆیـدا نغـرۆ دەکات... بـەڵام مـن هیچـم نەگـووت تەنهـا لـە کونجێکدا دەسـتم گرتبـوو بـەو خوێنـەوەی کـە لـە لێـوم دەهاتـەدەرێ و دەگریـام. نـە تیایانـدا پاڕامـەوە، نـە شـەڕم لەگـەڵ کـردن، بەڵکـو لـە ڕاسـتیدا لـە پشـت پـەردەی جیهانێکـی تـرەوە دەمبینیـن، چاوانـم هێنـدە لێڵبـوون زۆرجـار تەنهـا سـێبەرەکەیانم دەهاتـە پێشـچاو، تەنهـا ئـەو بۆنـە کوشـندەیەیان دەگەیشـتە مـن، بۆنـی بوغـرد و شـەو، بۆنـی بەرمـاڵ و خوێـن، ئیـدی دوای چەنـد سـەعاتێک بـە خۆیـان و دەفەکانیانـەوە ماڵیـان بەجێهێشـت. دیاربـوو لـە چەنـد سـەعاتێکدا هەمـوو شـار لـە بەسـەرهاتی پەروانـە ئاگاداردەکەنـەوە، دەمزانـی ئەمـڕۆ هەمـوو ئـەم مەملەکەتـە هەڵدەگێڕنـەوە تـا دەیدۆزنـەوە. مـن ڕۆژی دواتـر، دوای ئـەو شـەوی مۆتەکـە و حەقیقەتـە ساردانە. دوای ئـەوەی چەندیـن سـەعات گوێـم لـەو بێدەنگییـە ترسـناکە گـرت کـە باڵـی بەسـەر ماڵـدا کێشـابوو، ئێوارەیەکـی درەنـگ بـە بریندارێ و خوێنـاوی بـە پلەکەکانـدا سـەرکەوتمەوە، مـاڵ چـۆڵ و هـۆڵ بـوو، دایـک نەبێـت کـە لـە سـوچی مردنـی خۆیـدا هاواریدەکـرد، هەمـوو شـتێکی دی ئـارام بـوو. ئـەو ئێوارەیـە لەسـەر جێگاکـەی پەروانـە دانیشـتم و هەسـتم بـەو بۆشـاییە گەورەیـە دەکـرد کـە لـە دەورم گـەورە دەبـوو، هەڵدەسـتام و ئـەو فرمێسـک و خوێنـەم دەشـت بـە گۆنـا و لێومـەوە، بـەڵام نائارامییەکـی

قووڵ و بێسنوور، ترسێکی گەورە لە هەموو ئەو ڕۆژانەی کە بەڕێوەن دایگرتم. هەر زووش دەرکەوت کە ترسەکانم تەنها خەیاڵاتی کچێکی ترسنۆک و منداڵکار نین. دەنگێکی نهێنی لە ڕۆحمدا پێیدەگووتم ئەو ژنانە وازناهێنن، چەند دووربکەونەوە، دووبارە دەگەڕێنەوە... من لە مێژبوو ئەو ئەزموونە لەگەڵ پورمدا دەژیام کە بەردەوام بە شێوەیەکی کوتوپڕ وندەبوو و لەناکاو دەردەکەوتەوە و هەموو جارێکیش منی تووشی بەشێوەیەکی گەورە دەکرد. نا، من ئەو ئێوارەیە پێشبینی ئەو شەوی ترس و بارانەم نەدەکرد، بەڵام شتەکان بە خێراییەکی لە ئەندازە بەدەر ڕوویاندا. بەر لە خۆرئاوابوون ژنە دەفبەدەستەکان بە جۆرێکی سەیر و کوتوپڕ دەرکەوتنەوە... وەکو ئەوەی ئێرە ماڵی ڕاستەقینەی خۆیان بێت، بێپرس لە حەوشە، هەیوان، ناو ژوور و باڵکۆنەکاندا کەوتنە هاتوچۆ، ئێستا ژمارەیان زۆر زیاتربوو. من لە نزیک ئینجانەکانەوە خۆم نووساندبوو بە دیوارەکەوە و نەمدەزانی چی بەڕێوەیە؟ نەمدەزانی ئاخۆ پەروانە پەرپووەتەوە و ڕزگاری بووە یان هەر لە شاردایە؟ ژنە دەفبەدەستەکان بەلامدا ڕادەبووردن و سەیریان نەدەکردم... من لە تەنیشت ئینجانە ژاکاوەکانەوە وەستابووم، کەس نەیدەبینیم، تێنەدەگەیشتم ئاخۆ سەیرم ناکەن یاخود نامبینن. لە ناو ئەو جەنجاڵییەدا کە لە ناکاو دونیای ماڵی پڕکردەوە، باوکم و براکانم بە پرتاو دەرکەوتن و تێکەڵ بەو هەموو ژنانە بوون کە بۆنی جیهانێکی دوور و نەناسراویان، لە ناو ژوور و ڕاڕەو و هەیوانەکاندا بڵاودەکردەوە. من بە هێمنی... وەکو مەخلوقێکی نەبینراو بەدوایاندا دەڕۆیشتم، هەموویان توورە، تێکشکاو و دەستەپاچە دیاربوون، براکانم بینی کە بوخچەکانیان کردەوە و ئەو خەنجەرانەیان دەرهێنا کە لە مێژبوو لە نێو جلەکاندا خەوتبوون. بینینی خەنجەرەکان بەس بوو بۆ ئەوەی تێبگەم دەیانەوێت پەروانە بکوژن، من بە ناو ئەو ژنانەدا وەکو شێت ڕامکرد و خۆم گەیاندە بەر ئەو باڵکۆنە،

خەریکبوو بگریم... لە باڵکۆنەکەوە ئەو گردبوونەوە سەیرەم بینی کە تا ئەو کات نەمدیبوو، سەدەها کەسانی نەناسراو و سەیر لەبەر دەرگای ماڵدا وەستابوون و چاوەڕێی شتێکیان دەکرد... من دەمویست تێبگەم، کە گوێم لێبوو پورم دەیگووت: «ئەو منداڵە لە کوێیە؟... کەس ئەو منداڵەی بینیوە؟». من توندتر خۆم دەنا بە سوچی ئەو بالکۆنەوە و نەمدەویست دەربکەوم. پورم بە براکانمی دەگووت: «ئەو فاجیرەیە لە نانەواخانەیەکدایە... ئەو فاجیرەیە لە ناو گەنم و ئارد و زەخیرەی نانەواخانەیەکدا خۆی شاردۆتەوە». گوێم لێبوو بە باوکم دەڵێت: «هەموو مەلاکان، هەموو شێخەکان، هەموو دەروێش، سۆفی و ئیماندارەکان فەتوای پاکێتیت دەدەن». سیمای پیر و ماندووی باوکم دەبینی لە ژێر زەبری وشەکانی ئەودا هێندەی تر تێکدەشکێت. ئەو دەگەڕایەوە ناو خوشکە دەفبەدەستەکان. لە ماوەیەکی کورتدا سەرجەمی ئەو ماڵە دەکەوتە جموجۆڵێکی سەیر، من کە سەیری چواردەوری خۆمم دەکرد، نەمدەتوانی بە یەکجار لەو هەموو ڕاکەڕاکە و شپرزەییە تێبگەم کە ناو ماڵی پڕکردبوو. ئەو هاواریدەکرد: «ئەو منداڵە لە کوێیە؟». من دەمویست لە شوێنێکدا خۆم بشارمەوە، بەڵام لە چاوتروکانێکدا ژنە دەفبەدەستەکان گەیشتنە سەرم و وەکو داهۆڵێک منیان بەرزکردەوە. گوێم لێبوو ئەو لە ناو هات و هاوارێکی گەورەدا، لە ناو ژاوەژاوێکی ترسناکدا دەنگی بەرزکردەوە: «ئەو منداڵە بگۆڕن». ئاگاداربووم یەکێک هەڵیدەگرتم و چەندان دەستی دیکەش بەرەو ڕووم درێژ دەبوون، سیمایانم نەدەبینی، بەڵام یاری پەنجە و نینۆکەکانیانم هەست پێدەکرد. ئاگاداربووم دەستەکان دەگۆڕا، دەنگەکان دەگۆڕا، بەڵام ئەو بەردەوام دەیگووت: «بیهێنن... بیهێنن... بیهێنن». دواجار من، ئەو و سێ دەفژەنی پیر لەو ژوورەدا خۆمانبینییەوە، بە پەلە دەرگاکانیان داخست و پەردەکانیان دادایەوە و بەرامبەرم وەستان. ئەو دەیگووت: «کراسێکی ڕەشی قەترانی

لەبەریکەن». لە چاوتروکانێکدا ڕووتیانکردمەوە، ڕووت و قووت لە ناو ئەو ژنانەدا وەکو باڵندەیەکی نەخۆش و ترساو وەستام، دەمویست خۆم بە متیلێکی سپی داپۆشم، نەیانهێشت هەر خۆیان بە خێرایی جلیان لەبەرکردم و لە کراسێکی قەترانیان هەڵکێشام. من وەک ڕوحلەبەرێکی تەختە، وەک پارچەیەک لە دار جوڵەم نەکرد، هیچم نەگووت. بە نیگایەکی ساردەوە سەیری چاوانی پورمم کرد کە پەلی گرتم بۆ ناو ئەو قەرەباڵغییە... بۆ بەرەو ئەو بەردەرگایەی کە باوکان و براکانم بە خەنجەرەکانیانەوە وەستابوون، ژنە دەفبەدەستەکان بەو دەفە گەورانەوە چاوەڕوانیاندەکرد، ئەو شارەش بە هاوار و دەنگە دەنگ و لەعنەتەکانیانەوە دەیڕوانی. «پور» لە گەرمەی دەفژەنینەکاندا هاواریدەکرد: «خوداتان لەگەڵدایە... فریشتەکانتان لەگەڵدایە... ئەسحابە و پیاوچاکانتان لەگەڵدایە». خەڵکی دەرگاکانیان دەکردەوە و سەیری ئێمەیان دەکرد، سەیری ئەو خێزانەیان دەکرد کە لە پشتی ئەم کەژاوەی تۆڵەیەوە بۆ کڕینەوەی شەرەفی خۆی دەگەڕا، سەیری ئەو ژنە دەفبەدەستەیان دەکرد کە«لا الـه الا اللـه» یان دەخوێند و زیکریاندەکرد، سەیری ئەو منداڵانەی شاریان دەکرد کە هاتبوون کون و قوژبن و ڕێگاکان بگرن و نەهێڵن ئەو دوو عاشقە دەربازبن. من ئەو کات لە هیچ تێنەدەگەیشتم، دەمپرسی: «چییە؟» بەڵام کەس وەڵامی نەدەدامەوە. دەبایە پێش ئەو ڕەوە سەیرە بکەوم، براکانم بە خۆیان و خەنجەرە ڕووتەکانیانەوە لە چواردەورم وەستابوون، ئەوانیش هیچیان نەدەگووت، من سەیری ئاسمانم دەکرد، سەیری بەرپێی خۆمم دەکرد و دەمگووت: «بۆ کوێ؟». باوک پەلی کێشدەکردم و دەیگووت: «بڕۆ». من ئاوڕمدەدایەوە و لە ناو ڕیزی ئەو لەشکرە سەیرەدا سیمای خزمان و کوڕە داخ لەدڵەکانیانم دەبینی کە لە مێژبوو هەموو بە ئاواتەوە بوون پەروانە بە مردوویی ببینن، ئەو عاشقە دێرینانەم دەبینی کە هاتبوون و

حەزیاندەکرد دواهەمین ساتەکانی چارەنوسی ئەو کچە ببینن کە ڕۆژێ لە ڕۆژان خۆشیانویستبوو. لە ساتێکدا وام هەستمکرد هەموو ئەو شارە لە پشتمانەوە دەڕوات، هەموو ئەو شارە لە دەنگی هاواری ئەو ژنانە و لە دەنگی دەفەکانیان وریابۆتەوە و هاتۆتەدەرێ. گوێم لێبوو لە بڵندگۆی مزگەوتەکانەوە جاڕدەدەن، لەسەر باڵەخانە بەرزەکانەوە هاواردەکەن. ئێمەش بە حەماسەوە بە شەقامەکانی شاردا دەهاتینەخوار، بە کۆڵانە تەسک و باریکەکاندا دەڕۆیشتین، ئەو شارە سەراپای تۆزێکی سەیر و کۆنی لێ هەڵدەستا. هەستمدەکرد ئەو پەنجەرانەی کە دەیەها ساڵە نەکراونەتەوە ئێستا دەکرێنەوە، ئەو پەردانەی دەیەها ساڵە لانەبراون ئێستا لادەبرێن، لە پشت هەموو پەنجەرە و دەلاقەیەکیشەوە سیمای پیر و ماندوو و تووڕە سەریان دەردەهێنا و دەیانگووت: «بیاندۆزنەوە». گوێم لێبوو ئەو پیرێژنانەی نیو سەدەیە بە بێددان قەپ لە شتەکان دەگرن، بەو لەفزە بریندارەی خۆیانەوە دەیانگووت: «بیانلۆزنەوە». پیرەمێردەکان بە گۆچان، مراخانی شل و سەبیلی کوژاوەوە لەبەردەرگاکان دەردەکەوتن و گۆپاڵەکانیان حەوادەدا. لە هەموو کۆڵانێکیشدا خاتوونێکی دی، کچێکی لەچکپۆش، کوڕێکی خەنجەر بەدەست دەهاتە ڕیزەکانەوە. کە لەو نانەواخانەیە نزیکبووینەوە دەفژەنەکان بازنەیەکی گەورەیان دروستکرد، باوک و براکان و دەیەها خەنجەر بەدەستی تر کە من پێشتر نەمدیبوون خۆیان کرد بە ناو نانەواخانەکەدا، من نەخشەی نانەواخانەکەم دەهێنایە پێشچاوی خۆم، دەمزانی بە ئاقاری تەنورەکاندا دەڕۆن، دەچنە ژووری هەویرشێلانەکەوە، دەچنە ناو فەردە ئاردەکان، لەویادا لە هەیوانی خانوەکەی پشتەوەدا کێشیاندەکەنە دەرێ و بە هەیاهوویەکی ترسناک، لە ژێر یەکێ لە درەختەکانی ئەم شەقامەدا سەریاندەبڕن. دیمەنی پەروانە بە سەربڕاوی، دیمەنی ئەو بە کوژراوی گێژیدەکردم. دەمویست شتەکان نەبینم، بەڵام دەمبینی. دەنگی دەفەکان و حەی ئەڵای پیرەکان تا

دەهات بەرزدەبووەوە، لە نێوان تەکانی ئەواندا بۆ ناو نانەواخانەکە و هاتنەدەرەوەیاندا من جگە لە پەروانە هیچی دیکەم نەدەبینی، جگە لە چاوە ماندوو و خەواڵوەکانی پەروانە هیچی دیکەم نەدەبینی. بۆ یەک ساتی چکۆلانە ئاوڕمدەدایەوە هەستمدەکرد کە پەنجەی دەفژەنەکان سستدەبێت، هەستمدەکرد هاوار و خوداخودایان هێمنتردەبێتەوە. گوێم لێبوو دەنگێک بە چرپەوە پێمدەڵێت: «خەندان، خەندانی چکۆلانە مەترسە»، من ئاوڕدەدەمەوە ببینم کێیە، بەڵام کەس نابینم، لە هەمان کاتدا باوکم دیارە کە بە شکستی و کەساسی دێتەدەرێ و دەڵێت: «ڕۆیشتوون، کەسی لێنیە». دەنگێکی تر لەدواوە دەڵێت: «یەکێکی تر پێش ئێمە ئاگاداریکردونەتەوە، یەکێک فریای زیناکەران کەوتووە و ڕزگاریکردون». ئەو پیاوە مەست و ژنە بێهۆشانە بێدەنگ دەبن، نەعرەتەی دەفەکان بێدەنگ دەبێت، خامۆشییەکی کوتوپڕ و تێپەڕ باڵ بەسەر ئەو شەقامەدا دەکێشێت، هەستدەکەم شتەکان بۆ ساتێک کرژدەبنەوە و دەچنەوە ناو خۆیان، بۆ ساتێک ئاسمانیش ئارام دەبێتەوە، پورم کە لە ناوەڕاستی ژنە دەفبەدەستەکاندا وەستاوە سەیری من دەکات، یەکێک دەڵێت: «نائومێدمەبن، ئەمشەو دەیاندۆزینەوە». ئەو ژنانە دووبارە بە خۆیان و دەفەکانیانەوە دەکەونەوە هاوارکردن، دەکەونەوە بانگکردنەوەی خودا، دەکەونەوە خواستنی هیمەتی پێغەمبەرەکان، منیش بەو کراسە ڕەشەوە لە ناوەڕاستیاندا وەستاوم، نازانم دەیانەوێت چیبکەن، نا... من لە قووڵایی ڕۆحمدا شادومانم، سەیری ئەو قەرەباڵغییە دەکەم و دڵنیام هەر ئەو دەنگە هێمنەی کە چپاندی بە گوێمدا: «خەندان مەترسە»، هەر ئەو دەنگە پەروانەی ڕزگارکردوە. بەڵام کێ بوو؟... نەمدەزانی. شەو تاریک دادەهات دەمزانی ئەو ژنانە بە ئاسانی دەستبەردارنابن، لە ناکاو ڕەنگی ئاسمانیش دەگۆڕا و بارانێکی ناوەخت دایدەکرد، دەنگی بارانەکە لەسەر دەفەکان ئیقاعێکی سامناکتر، سەیرتر

و گەرمتری لە پەنجەی ئەو ژنانە دەخولقاند. بەو شەقامە تەڕانەدا دووبارە منیان دەدایەوە پێش خۆیان. باران تک تک لە پرچم دەتکا، من دەڕۆیشتم و دیسان ئەو حەشاماتە لە دووم دەڕۆیشت، وردە وردە ئەو کراسە تەڕە زیاتر و زیاتر بە جەستەمەوە دەنووسا، تا دەهاتیش پتر چکۆلانە دەبوومەوە... بۆ یەکەمجار هەستمدەکرد ئەو کراسە زۆر گەورەیە بەبەرم، بەڵام تەکان و گوژمی شێتانەی ئەو مەحشەرگەلە خێراتر بەرەو خوار دەیبردم و کاتم نەدەما بیریکەمەوە، کاتم نەدەما سەیری خۆم بکەم، ئەو پیاوانەی کە دیاربوو هەستیان بە شەرەف ئێجگار نازکبۆتەوە، دەگریان... ئەوانی دیش بە لێشاو لە ناو دەنگی باران، بانگی یەزدان و هەڕەشەکردندا دەهاتنەپێش. من وەکو هێمای ئەو بەشە لە شەرەفی خێزان کە لکە ناگرێت دەبووایە هەمیشە لە پێشەوە بڕۆیشتبامایە، وەکو هێمای ئەو پاکییەی کە دەبێت لە بەرامبەر گوناهەکانی پەروانەدا دابنرێت، دەبووایە لە پێش هەموانەوە بوومایە. کە گەیشتینە مەیدانی گەورەترین مزگەوتی شار، باران هەموومانی تا سەر ئێسقان تەڕکردبوو، شەویش بەرەو نەخشکردنی ڕەشترین تۆنەکانی خۆی دەڕۆیشت، بەڵام ئەو ژنانە ئێستا لەو مەیدانەدا بێسرەوتترین ساتەکانی خۆیان دەژیان. باران و شەو و دیمەنی منارەکان جۆرە جورئەتێکی درندانەی تیا دروستکردبوون، منیان دەدایە پێش خۆیان تا نوێژبکەین، من سەرم بەرزدەکردەوە و ئاسمانم لە ڕەنگێکی ترسناکدا دەبینی، پێشتر ئاسمانم بەو جۆرە نەبینیبوو. نزیکی منارەکان ترسێکی سەیریان خستبووە دڵم، لەوەوبەر لە ژیانمدا بەمجۆرە لە هیچ منارەیەک نزیک نەکەوتبوومەوە... لە ناو حەوشی مزگەوتەکەدا سێبەرەکان، دەنگەکان و سیماکان شێوەیەکی ڕەقتر و بەردینییان هەبوو، دەروێشەکانیش، ئەوانەی دەنگی بروسکەکان و دەنگی ئەو هەموو مرۆڤە تووڕەیەی ئەو ئێوارەیە پشووی لێتێکدابوون، پێدەچوو لە دەریایەکی شینەوە هاتبێتنە دەرێ. من لە ژیانمدا حەوشی

بەو جۆرە گەورەم نەبینیبوو. ڕۆحلەبەرەکانی دەورووبەرم ئێستا زرنگەیەکی فەلەزییان لێدەهات، باڵندەکانی ناو مزگەوت زرینگەی میتاڵێکی نازکیان هەبوو، ئەو ماسییە بچوکانەی ناو حەوزی مزگەوتیش وەکو مەخلوقاتگەلێک لە میتاڵی شین دەهاتنە پێشچاوم. پورم کە سیمای وەکو چرایەکی شینی کاڵ، کاڵتر لە هەموو ڕەنگەکانی دیکەی ئەو ئێوارەیە دەدرەوشایەوە، لە ناو ژنە دەفبەدەستەکاندا دەوەستا و دەنگی بەسەر بروسکە و دەف و چۆڕاوگەکاندا بڵنددەکردەوە و دەیگووت: «نوێژبکەن تا دەیاندۆزینەوە، نوێژبکەن تا ئەم ئابڕوومان پاکدەکەینەوە». دەوەستاین و ئەو ڕەوە سەیرە لە مەخلوقاتی نەناسراو، ئەو هەزارەها دەست و چاو و لێوەی لەناکاو ڕژابوونە ناو ژیانمانەوە بە هەموولایەکی ئەو مزگەوتەدا دابەشدەبوون، هەموو بە یەک شەپۆلی سەیر لە ژێر کۆڵەکەکاندا، لە ژێر منارەکاندا، لە ژێر چەتری دەروێشەکاندا، لە ڕاڕەوی نێوان هۆڵەکانی پرسە و ساڵۆنی نوێژە دەستە جەمعییەکاندا بڵاودەبوونەوە. پورم بە دەنگێکی وەکو ئەوەی لە گەرووی ئەو گومەزە گەورانەوە بێتە دەرێ هاواریدەکرد: «نوێژی پاکبوونەوە بخوێنن، دۆعایەک بخوێنن، خودا یارمەتیمانبدات گرێکوێرەی شەیتانەکان بکەینەوە». ئەو وای دەگووت و دەریایەک لە مەخلوقات پێکڕا دادەنەوین و نوێژیاندەکرد، ژنێک کە سیمایەکی چویتی هەبوو بە ڕقەوە پەلیگرتم و بردمیە ژێر هەیوانێکی گەورە، من ئاوێکی ڕەش لە جەستەم دەڕۆی، هەستمدەکرد هەرچی ڕەشێتییە لە قژمدا بارانەکە شتوێتییەوە و بە لەشمدا دێتەخوارێ، وەکو پارچە خەلۆزێکی تەڕ دەوەستام، ژنەکە لە نزیک پایەیەکەوە و لەسەر بەرماڵێک دایدەنام و فەرمانی پێدەکردم نوێژبکەم. من لەو پەنایەی خۆمەوە یەکەمجار سەیری ئاسمانم دەکرد کە وەکو لە خشتی شین چنرابێت تاریک و نزم دەهاتە بەرچاوم، سەیری قەراغی ئەو هەورە نزیکانەم دەکرد کە ڕووناکییەکی ئێجگار دووری مانگ قەراغی هەندێکیانی

ڕۆشنکردبووەوە، سەیری سووتانی هەندێک پەڵەهەورم دەکرد کە بە گڕی بروسکەکانەوە بەسەر ئاسمانی مزگەوتەکەدا بە خێرایی دەفڕین، بە ترسەوە سەرم دەخستە سەر بەرماڵەکە و نوێژمدەکرد، بەڵام لە قووڵایی ڕۆحمدا دەنگێک دەیگووت: «بڕۆ پەروانە، بڕۆ بەرەو جێگایەک نەتدۆزنەوە». ئەو شەوە من یەک لە دوای یەک نوێژمدەکرد، دوای هەموو نوێژێکیش هەڵدەستام و سەیری ئەو ئاگرەم دەکرد کە هەستمدەکرد لە ئاسمان، لەپشت هەورەکانەوە دەسووتێت. ئێستا ئەوانەی دەورووبەرم بەرماڵەکانیان کۆکردبووەوە و بە چیچکانەوە لەنێوان شێلمان، پایە، سەکۆ، قادرمە، حەوز و منارەکاندا دانیشتبوون، هەندێکیان هیچ چەترێکیان بەسەرەوە نەبوو و بەردەوام باران لێی دەدان، هەموویان سەیری منیان دەکرد. من چاوم دەنووقاند و لە ناو گووتنەوەی توتیئاسای ئەو حەرفانەدا کە هیچی تێنەدەگەیشتم خۆم کەنەفتەدەکرد، دەمویست نە گوێم لە دەنگی بروسکەکان بێت، نە گوێم لە چرپەچرپی ئەو ژنانە بێت کە بە پسکەپسک باسی ژیانی من و پەروانەیان دەکرد، دەمویست گوێم لە دەنگی ئەو چۆڕاوگانە نەبێت کە بەر کانزای تاریکی شەو دەکەوتن و خورپەیەکی ئاسنینیان دروستدەکرد، هەتا دەنگی دڵی خۆم کە ترس و بێهۆشی و تێنەگەیشتن دەیگوشی وەکو دەنگی مەعدەنێکی شکاو دەهاتە گوێم. هەندێجار چاوم بەرزدەکردەوە و چەندەها باڵداری خەیاڵیم لەسەر منارەکان دەبینی، باڵداری ئەوتۆ کە تێکەڵەیەک بوون لە سێبەری گومەزەکان، دانەوینی هەورەکان و شینایی شەو... هەندێجار لەنزیکمەوە دەفژەنەکان دەستیاندەکرد بە کووتانی دەفەکانیان و دەروێشەکان لە ژێر چەترەکەدا دەستیاندەکردە سەمایەکی ئاگراوی، بەڵام هەموو شتەکان گەلێک دوور دەهاتنە بەر چاوی من... لەسەر ئەو بەرماڵە سەرم دەخستە نابەینی ئەژنۆکانم و بیرم لە پەروانە دەکردەوە. پور بە چرایەکەوە ناو حەشاماتەکە دەگەڕا، چرایەک وەکو هەموو ڕوناکی

و تاریکییەکانی ئەو شەوە ڕەنگێکی شینی هەبوو، یەکەیەکە تەماشای دەموچاوەکانی دەکرد، یەکەیەکە سەیری ئەو کچ و ئافرەتانەی دەکرد کە بۆ پاککردنەوەی گوناهێکی نەزانراوی خۆیان، بەشداری تۆڵەی ئەم شەوە تاریکەیان دەکرد. دواجار منی لەپاڵ ئەو پایەیەدا دەدۆزییەوە و لە پشتمەوە دەوەستا. ئەوان چاوەڕوانی شتێکیان دەکرد، چاوەڕوانی هەواڵێکیان دەکرد... شەو ڕادەکشا و هیچ دەنگێک نەبوو، کەس لە دەرگای ئەو مزگەوتە نەدەهات بەمدیودا، باوکم لە ژێر منارەکاندا دەهاتودەچوو، براکانم بەڕیز لە ژێر یەکێک لە قوبە شینە گەورەکاندا ڕیزبووبوون، لە ئێوارێوە خەنجەرەکان لە مستیاندا بوو. بەدرێژای شەو باران لەو خەنجەرانەی دەدا، بروسکەکان ڕوناکیدەکردنەوە، لەپاڵ براکانیشمدا سەدەها خەنجەر بەدەستی دیکە بە بێدەنگ بەناو پایە و شێلمانەکاندا دەسوڕانەوە، هەندێ جار یەکێک خەنجەرەکەی دەدا لە شێلمانێک و زرینگەیەکی سەیر هەمووماني ڕادەچڵەکاند، یەکێک لە مەلاکان هەموو جارێک دەنگی بەرزدەکردەوە و دەیگووت: «ئاگاتان لە پایەکان بێت». تا دەمەوبەیان پور وەکو چاوەدێری زیندانییەک بکات، لە پشتمەوە وەستابوو... ئەگەرچی شەو تێدەپەڕی، بەڵام دونیا تۆزێکیش چییە ڕوناک نەدەبوووەوە. دەمەوبەیان ژنێکی ڕەشپۆش لە دەرگای مزگەوتەکە هات بەمدیودا و بە ئەسپایی بەناو پیاوەکاندا تێپەڕی و لە ژێر چەتری دەروێشەکاندا هەندێ وەستا و کەمێک ئەو عەبایەی ڕاوەشاند کە دیاربوو بە درێژایی شەو باران لێی داوە و دواجار بەرەو ڕووی ئێمە هات... لە ناو ژنەکاندا چەند پرسیارێکیکرد و دواجار ڕووی کردە پورم، ژنێکی ڕەشپۆشی کەڵەگەت بوو. لە پشت منەوە وەستا و چەند شتێکی چپاند بە گوێی پورمدا، من جورئەتم نەکرد ئاوڕبدەمەوە... هەستمکرد هەورەکان بە گەواڵەی گەورە گەورە بەرەو زەوی بەردەبنەوە، هەستمکرد پورم و هەموو ژنەکانی دیکە دەوەستن و سەیری ئەو هەورانە دەکەن،

بەڵام ئەو بە هێمنی هەڵدەستا و بە بەردەمی مندا تێدەپەڕی، یەکەیەکە شتێکی بە گوێی ژنە دەفبەدەستەکاندا دەچرپاند و ئەوانیش بە دەنگێکی نزم دەیانگووت: «شوکر بۆ خوا». دەچووە ژێر بارانەکە و باوکمی بانگدەکرد، ئەویش براکانمی بانگدەکرد، ئەوانیش خەنجەر بەدەستەکانیان بانگدەکرد، ئەوانیش ئەو پیاوانەی لە نێوان شێلمان و منارەکاندا چاوەڕوانیاندەکرد. لە ناکاو دەنگی زیکر و حەیتەلایەکی گەورە لە پشتمانەوە بەرزدەبووەوە، سەر لەنوێ دەفەکان دەکەوتنەوە ژەنین. من بە بێدەنگ خۆم لەسەر بەرماڵەکەم گرمۆڵەدەکرد، دوای سێ شەو نەخەوتن، حەزمدەکرد بمرم... حەزمدەکرد لە ژێر ئەو بارانەدا و لە ناو شینایی ئەو شەوەدا نوقمی ناو تاریکی و بیرچوونەوە ببم، بەڵام باوکم دەبینی بەو مراخانییە تەڕەی خۆیەوە بەرەو ڕووم دەهات، بێئەوەی پرسم پێبکات بێڕەحمانە بە حەوشەکەدا کێشیدەکردم، من دەکەوتم و سەرئەژنۆکانم دەدڕان، دەکەوتم و وردە زیخی سەر ڕێگاکان زامداریاندەکردم، وەکو بوکەشوشەیەکی شکاو هەڵیاندەگرتمەوە و بەناو ئەو باران و شینابیە ترسناکەی بەربەیاندا ڕایاندەکێشام. دەنگەدەنگێکی گەورە لە هەموو لایەکەوە بەرزدەبووەوە، لێشاوێکی سەیر لە مەخلوقات بە خێراییەکی گەورە بەرەو دەرگاکان دەکشان، مەخلوقاتی نەبینراو لە گومەزەکانەوە بە پەیژەی درێژ درێژ دادەبەزینە خوارێ... لەناکاو من دەستم لە دەستی باوکم بەردەبوو، دەکەوتمە ناو مەلا کوێرەکان کە بە خۆیان و گۆچانەکانیانەوە دوای ئەو گەلە تورەیە کەوتبوون، ئەو گەلەی کە خیزەیەکی سەیر و پڕ لە ژان لە سینەیەوە دەهات. خۆم لە بازنەی ئەو گۆچان و کەواو مێزەرە ئاڵۆزکاوانە ئازاددەکرد و شەپۆلی بەیەکداچووی خەڵک کە کێبڕکێیاندەکرد لە دەرگاکان بچن بەودیودا، دەیبردم... تێکەڵ بە سواڵکەرەکان دەبووم کە لەو بەرەبەیانە تەڕوتوشەی بەهاردا پاڵەپەستۆیەکی گەورەیان لە بەردەرگاکان دروستکردبوو... سوڕمدەخوارد

و تێکەڵ بەو ژنە پەچەپۆشە تازانە دەبووم کە بە لێشاو لە قسنەکان دەهاتنەدەرێ... بارانێکی قایم دایدەکرد، دووبارە هەستمدەکرد باران هەموو ڕەشێتی قژم بەسەر جەستەمدا دەشواتەوە. خەریکبوو دەکەوتم، خەریکبوو ڕەنگی ئاڵتونی و لەناکاوی ئەو بروسکانە کوێریدەکردم کە لە ناو ئەو دەنگەدەنگ و باران و بروسکەیەدا دەنگێکی هێمن چپاندی بەگوێمدا و گووتی: «خەندان، مەترسە من ڕزگاریاندەکەم»... دەنگێک بوو بە خێرایی هات و تێپەڕی، ئاوڕمدایەوە، بەڵام نەمبینی، هیچ شتێکم چاونەکرد دارشەقەکەی نەبێت. پیاوێکی دارشەق بەدەست بوو لە قەمسەڵەیەکی ڕەشدا، بەدەنگێکی نامۆ ئەو وشانەی چرپاند بەگوێمدا و تێپەڕی و لێشاوی تاریکی و باران بە خێرایی بردی. من لە ناو حەشاماتەکەدا... لە نزیک تەقەی ئەو گۆچان بەدەستانەوە کە بەئەنقەست دەیانکێشا بە دەرگاکانی مزگەوتەکەدا هاوارمکرد: «بڕۆ پێشکەوە... پێشکەوە، فریایانکەوە». نەمزانی گوێی لێم بوو یاخود نا. کەدواتر پێکەوە لەگەڵ خاوەنی ئەو دەنگە غەمگینەدا لە شەربەتخانە گەورەکەی خۆیدا بەدیار پەرداخێک شەربەتەوە دانیشتین، بەحەسرەتەوە لێم پرسی: «ئایا ئەو شەوە گوێت لە هاوارەکەم بوو؟». ئەو بە ئارامی وەڵامیدامەوە و گووتی: «نەوەک تەنیا گوێم لێبوو، بەڵکو تا چەندەها ساڵ ئەو هاوارە لە گوێمدا دەزرنگایەوە». هێشتا هاوارەکە لە گەروودابوو کە دەستێکی دیکە ڕایکێشام و لەو لێشاوە هێنامییەدەرێ و گووتی: «کچم تۆ خۆت پێشکەوە... خۆت، پاشەڕۆژی تۆ لەسەر ئەمشەو وەستاوە». ئەوە دەستی «مەلا کەوسەری باغەوان» بوو کە دواتر زۆرشتی ترسناکی لە دونیا و چارەنوسی مندا دیاریکرد... ئەو دەستانە بە ئەندازەیەک ساردبوون لەگەڵ ساردی شەو، ساردی باران و ساردی گەردەلولەکاندا بەراورد نەدەکرا. من تووشی کۆکەیەکی لە ناکاو بووبووم، جارجار دەبووایە یەکێکی دیکەش پەلم ڕابکێشێت تا بتوانم بڕۆم، لە هەر

جێگایەکیش بوەستابامایە پوورم لە نزیکمەوە دەوەستا و بەو چاوە سەیرانەی تەماشایدەکردم. سەرلەنوێ بە کۆڵانەکانی شاردا تێپەڕینەوە، سەرلەنوێ دەفڕەنەکان دونیایان بە دەنگی زیکرەکانیان ئاوەدانکردەوە، بەڵام دەنگەکان کپتر و بێدەنگتر دەهاتنەگوێم... دەڕۆیشتین و شەو دەرگاکانی خۆی زیاتر و زیاتر دەکردەوە، لەناکاو گەیشتینەوە سەر ئەو شەقامەی کە من گەلێک ئاشنایبووم، ئەو شەقامەی ڕێگەی گەڕانەوەی من و پەروانە بوو لە قوتابخانەوە بۆ ماڵ... لەویادا بۆنی درەختەکان، بۆنی ئاسمان، بۆنی دیوارەکان هەمووی دۆستی من بوون. سەیرم لێدەهات و دەمگووت: «دەبێت ئەم ڕەوە چ کاریان بەم شەقامە هەبێت... کە لە هەر شەقامێکی دیکەی دونیا جوانترە». بەڵام لەناکاو لەبەردەم کتێبفرۆشییەکدا وەستاین... پوورم خۆی دەستی بەرزکردەوە و گووتی: «لێرەن... ئەو دوو زیناکەرە لە ناو ئەم کتێبە شەیتانیانەدان». بە خێرایی و بە شێوەیەکی سەیر ئابلۆقەی کتێبفرۆشییەکەیاندا، دەنگەکان هاواریاندەکرد: « وەرنە دەرێ!» بەڵام هیچ دەنگ نەبوو. یەکەمجار قفڵی دەرابەکەیان شکاند و هەڵیاندایەوە، من دڵم وەکو کۆترێک لە ناو گێژەڵووکەیەکدا دەلەرزی، ئاگاداربووم هەموو لە دەرگای ئەو کتێبفرۆشییەوە نزیکدەبنەوە، هەموو لەپێش دەم ئەو دەرابەیەدا ئاپوورە دەبەستن، من لە سوچێکدا خۆم گرمۆڵەدەکرد و سەرم دەخستە ناو دەستمەوە و گوێچکەکانم دەگرت، نەمدەویست هیچ ببینم و هیچ ببیستم، دەمویست هەمووشتەکان بە مۆتەکەیەک بشوبهێنم کە دواجار دەڕوات و بەئاگادێمەوە، بەڵام شتەکان بە جۆرێکی ترسناک درێژەیان دەکێشا، گوێم لێبوو شوشەی کتێبفرۆشییەکەیان دەشکاند، بە لێشاو بە دەم بانگکردنی خوداوە، بەدەم هاواربردنەوە بۆ پیاوچاکەکان هورووژمیاندەبردە ژوورێ، بەڵام جگە لە ڕەفتەیەکی چکۆلانەی پەروانە و تاکێ دەستکێشی کۆنی فەرەیدون هیچیان نەدەدۆزیەوە. لە ناو ئەو هەرا و هەیاهوە سامناکەدا

چاومدەکردەوە و هاوارمدەکرد: «سوپاس... سوپاس»، بەڵام سیما گرژ و تورەکانیان دەیترساندم و دووبارە چاوم لێکدەنایەوە. پورم ڕەفتەکەی هەڵدەگرت و یەکێکی نەناسراویش دەستکێشەکەی دەبرد بۆ خۆی. «مەلا کەوسەری باغەوان» سەری دەلەقاند و بە دەنگێکی پڕ لە حیکمەت دەیگووت: «ئەوە نیشانەی ئەوەیە وەکو دوو جانەوەری بریندار ڕایانکردوە... وەکو دوو جانەوەری خەتاکار و بریندار». بەڵام دەنگی مەلا کەوسەر لە ناو هات و هاواری ژنە دەفبەدەستەکاندا دەخنکا کە لە گەرمەی نائومێدیاندا، دەفەکانیان دادەنا و دەکەوتنە پەلاماردان و توڕدانی کتێبەکانی کتێبفرۆشییەکە... سەفتە سەفتە کتێبەکانیان دەهێنایە دەرێ و توڕەیاندەدایە ناو بارانەکە، ڕیز لە دوای ڕیز کتێبەکانیان کەڵەکەدەکرد، جارجار مەلاکەوسەر و چەند فەقێیەکی چکۆلانەی تێکەڵاو بە مەحشەرگەلەکە، کتێبێکیان هەڵدەگرت و ئەمدیوەودیویان دەکرد و فڕێیاندەدایەوە سەر کتێبەکانی دی. ئەو شتانەی کە کێش نەدەکرایە دەرەوە، لە ناوەوە ئاگریاندەدا، لە چاوتروکانێکدا هەمووشتێک بڵێسەی سەند. من لەو سوچی تەنهاییەدا تەماشامدەکرد سەرمایەکی کوتوپڕ و لە ناکاو، لەرزێکی ناوەخت دایدەگرتم، بەڵام کەمێک دڵنیاتر بە چاوێکی ماندوو و ڕۆحێکی تا سەر ئێسقان کوژاوەوە سەیری ئەو ئاگرەم دەکرد کە بە خێرایی پاڵی بە ئیماندارەکانەوە دەنا بۆ دەرەوە. ئیماندارەکان هەندێکیان ڕیز دوای ڕیز کتێبیان دەهێنایەدەرێ و لەسەر شۆستەکانی ئەو شەقامە کەڵەکەیاندەکرد و دەیانسووتان، بۆ یەکەمجار من هەستمدەکرد پێویستیم بە گەرمییەکی زۆرە، ئاگرەکەش بەو شەوقە سەیر و ئەفسانەییەی خۆی بانگیدەکردم. هێدی هێدی دونیا ڕوناکدەبووەوە، هێدی هێدی ئەو بارانە بێوچانەی شەو ڕادەوەستا، من هەڵدەستام و بە زەردەخەنەیەکی سەیرەوە لەو ئاگرە نزیکدەبوومەوە، هەڵدەستام و لە بەردەم ئەو مەشخەڵانە سەیرەدا دەوەستام، ئەو هەڵمە سەنگینەی کە

لە جلەکانم هەڵدەستا منی دەکردە پارچەیەک غوباری چڕ، بەڵام من دەستم خستبووە بنهەنگڵمەوە و سەیری سووتانی کتێبەکانم دەکرد کە ئاگر و شەماڵی دەمەویەیان پێکەوە یاری پێدەکردن، خودایە... ئەوان کتێبەکانیان دەهێنا و توڕیاندەدایە سەر ئەو ئاگرە، من لەو کڵپانە رادەمام و پەپولەی چکۆلانەم دەبینی لە ناو ئاگرەکەدا دەسووتێت، کتێبەکانیان فڕێدەدا و لە نێو پەڕەکاندا پەپولەم دەبینی هەڵدەوەرێت و دەکەوێتە ناو ئەو ئاگرە و دەبێتە تۆز... پەپولەی زۆر، پەپولەی گەورە گەورە کە لە نێو کتێبەکاندا دەهاتنەدەرێ و وەکو بیانەوێت بفڕن کەمێک بەرزدەبوونەوە و خێرا کڵپەکان دەیانخواردن. لە ساتێکدا هەستمدەکرد ئەو بەیانییە لە بری خۆڵەمێش، گەردی ئەو پەپولە سووتاوانە بە با دەکات... هەستمدەکرد کە پەپولەکان دێن و بە سووتاوی لەسەر سیمام دەنیشنەوە، بەگڕەوە لەسەر سەرم دەوەستن و خۆیاندەدەن بە سینەمدا، منیش تا دەهات زیاتر چاوم لەو بڵێسە گەورانە دەبڕی و زەردەخەنەم دەگرت... ئاوڕمدەدایەوە و ئەو سێبەرە خامۆشەی بەیانی نەبێت کە لە پشتمەوە بە هێمنی دەکشا، هیچی دیکەم نەدەبینی، بەڵام لە ژوورەوە، نزیک لە کڵپەی ترسناکی ئەو ئاگرە، باوکم و پورم هەردووکیان بەترسەوە دەهاتن و سەیری ئەو زەردەخەنە و پێکەنینە لەناکاوەی منیان دەکرد، دەمبینی بە جووتە هێدی هێدی بەدەوری ئاگرەکەدا پێچدەکەنەوە و بە ترسەوە لەو زەردەخەنەیە رادەمێنن کە لە ناو هەڵم و دوکەڵ و بارانی ئەو بەیانییەوە سات لە دوای سات بە شێوەیەکی سەیر، بە شێوەیەک کە چیدی لە ژێر دەسەڵاتی مندا نەبوو، لەسەر سیمام گەورەتر و گەورەتر دەبوو، زەردەخەنەیەک تاماوەیەکی درێژ لەگەڵمدا دەبێت و تەنها دوای حەسرەتی سووتانێکی دیکە جێمدەهێڵێت.

## ٦

ئەستەمبوو دوای ڕووداوەکانی ئەو شەوە، ژیانی هێمنی و لەسەرەخۆی جاران دەستپێبکەمەوە، هەر ئەو شەوە، دوای ئەوەی باوکم ئەو زەردەخەنەیەی لەسەرلێوم بینی، ئەو زەردەخەنەیەی تێکەڵ بە هەڵم، ئاگر، باران و تەنهایی ئەو بەیانییە بوویوو بە پورمی گووت: «ئەو کچە ببە بۆ خۆت... لەگەڵ کچەکانی خۆتدا گەورەیبکە و فێری هەموو ئەو شتانەی بکە کە دەبێت ژنێکی باش بیزانێت». ئێستا دەبێت بڵێم، من ئەو کاتیش دەمزانی کە تازە گەلێ درەنگە، چونکە چیتر جورئەتێکی منداڵانەم تیا دروستبووبوو، ئیدی دەمتوانی کەمێک تەماشابکەم و زەردەخەنەبگرم... بە تورەیی سەیری تاریکی و زوڵمەت، ئاگر و ڕوناکی بکەم و زەردەخەنەبگرم... سەیری دڵڕەقی، ترس و تێکچوونەکان بکەم و زەردەخەنەبگرم، بەڵام درەنگ تێگەیشتم کە ئەو بزە بچوک و نهێنی و ماناداره تا چ ئەندازەیەک دەتوانێت پیاوان و یاساکان و ئارامی دونیا تێکبدات و سیستمی ژیان و حیکمەتەکانی برینداربکات.

«ببیە بۆ خۆت»... دەمزانی ئەو وشەیە چی دەگەیەنێت... دەمزانی ئیدی دەبێت چی بکەم و دەکەومە چ دونیایەکەوە. هەر ئەو بەیانییە کە لە ئاگرەکە دووریانخستمەوە، کەم تا زۆر شێوەی ئەو ژیانە تازەیەم لەبەرچاویوو... پورم و مەملەکەتی دەفە سامناکەکان... شانشینی زیکرە بێکۆتاییەکان... نوقمبوون لە بۆنی هەتاهەتایی بوغردەکاندا، مەسەلەکە

تەنها دەنگی دەفەکان و بێهۆشبوون و حاڵ لە خۆهێنانی ناو زیکرەکان نەبوو، بەڵکو ئەو ترسە سەیرەش بوو لە نیگاکانی ئەو ژنە کە بە جەستە ئافرەتێکی نیمچە کەتە و بەسەر مەخلوقێکی چکۆلانەبوو. هەرگیز باریکی دەموچاوی لەگەڵ ئەو لەشولارە گەورە و ترسناکەیدا نەدەگونجا، گەورەیی و بێڕەحمی چاوەکانیشی لەگەڵ لاغریی دەموچاویدا تەبا نەدەهاتەوە ئەمە جگە لەوەی کە هەمیشە ترسێکی گەورەم لەو ددانە سەدەفییە وردانەی هەبوو کە لچێکی ئێجگار باریک دایدەپۆشین. لەوەوبەر یادم نییە کە من و پەروانە زۆر قسەمان لەگەڵدا کردبێت، ئەو بەردەوام بەو چاوە عاجباتی و لەچکە سپی و تەزبیحە درێژەیەوە دەیترساندین. ئەو بە چیرۆکی دڵدارییە بێشومارەکانی پەروانەی دەزانی، ئاگاداریش بوو پەروانە چەندە بێباک تەماشایدەکات، من لە منداڵییەکی زووەوە ئەو شەڕی بوغزاندنە سەیرەی نێوان پەروانە و ئەو ئافرەتەم دەبینی... کە ئەو دەهات، پەروانە بێحیشمەتترین جلی خۆی لەبەردەکرد، وەکو خراپترین ئافرەت مکیاجیدەکرد، بە غرورترین شێوە سەری بەرزدەکردەوە و لێی دەڕوانی، بەڵام ئەو خاتوونە سەبرێکی بێوێنەی نیشاندەدا و ئارامییەکی زیاتر لە توانای خۆی دەردەخست. پەروانە دەیەویست ئەم ژنە لە ژیانمان دوورکەوێتەوە و تێکەڵاوی زیندەگیمان نەبێت، ئاگاداریش بوو ئەو ژنە چیتر دەستی لەوە شتووە، پەروانە کێشبکاتە دونیاکەی خۆیەوە، لەبەرئەوە تەماحی گەورەی لە من بوو، ئەو لە سەرەتاوە دەیویست من نەکەومە ناو دونیای پەروانەوە... دەیویست من لە ژێر سێبەری گوناهەکانی پەروانەدا گەورەنەبم. هەر لە سەرەتاوە شەڕێکی ژێرەوانکێ و نادیار لەنێوان ئەو ژنە و پەروانەدا لەسەر من هەبوو، کە ئەو دەهات پەروانە بە پەلکێشی دەکردمە ژوورەکەی خۆمان، دەرگاکەی لەسەر قفڵدەکردم و دەیگووت: «لێرە نەجولێیت، خەندان... تۆ نازانیت ئەم ژنە چەندە ترسناکە... نازانیت». من دەمزانی ئەو ژنە چۆن

تەماشـامدەکات، دەمزانـی چ هێزێکـی ئەفسـانەیی بەکاردەهێنێـت تـا مـن وەکـو پەروانــە دەرنەچـم، چ هێزێکـی لـە بنەهاتــوو دەخاتەگـەڕ تـا مـن بەرەو ئـەو جۆرە زیندەگییـەی خـۆی ڕاکێشـێت، ئێسـتاش دوای ئـەو شـەوی بـاران و ئاگـرە مـن لەبەردەسـتیدا بـووم... زۆر بـە ئاسـانی لەبەردەسـتیدا بـووم.

ڕۆژانــی داهاتــوو لــە تەنهــا خۆشــییەکی ژیانـم کــە قوتابخانەیــە مەحرومدەکرێم، بـەڵام ئـەو هیوایـەی کـە پەروانـە لـە بازنـەی ئـەو ئابڵۆقەیـە دەربازبووبێـت خۆشـییەکی سـەیرم تیـا دروسـتدەکات، پـورم لـەوە دڵنیایـە کـە منیـش مەخلوقێکم لـە جنسـی ئـەو خوشـکە نەفـرەت لێکـراوەم. بـەڵام وەک سـەرەتا هیــچ ناڵێــت، بەڵکـو لێدەگەڕێـت ئـەو ڕسـتەیەی «بـاوک» زیاتـر و زیاتـر لـە ژیانمـدا بزرنگێتـەوە و لـە ماناکانـی تێبگـەم «بیبـەن بـۆ خۆتـان». شـتەکان وا ڕوویانـدا کـە لـە هەمـان بەیانـی و بـە هەمـان ئـەو کراسـە ڕەشـەوە، منیـان برد بـۆ ماڵـی پـورم. مـن لەوەوبـەر چەند جارێکـی کـەم ئـەو ماڵـەم بینیبوو، بـەڵام ئەمڕۆ لـە دوای ئـەو دوو شـەوە ترسـناکەی پێشـوو، دەمتوانـی دونیـا بـە شـێوەیەکی تـازە ببینـم، دەمتوانـی بـە دوو چاوی دیکـەوە لـەو زوڵمـەت و ئاگـر و بارانـەی بەریەیـان بڕوانـم، بۆیـە هـەر کـە چـاوم بـە دیمەنـی ئـەو ژوورە تاریـک و داخراوانـە کـەوت، کـە چـاوم بـەو دەف، شمشـێر، تەزبیـح و پرچـە بڕاوانـە کـەوت کـە بـە شـێوەیەکی سـەیر لـە هەمـوو جێگایەکـدا هەڵواسـرابوون، ترسـێکی کوشـندە دایگرتـم. ماڵەکـە لـە شـەبەقێکی چکۆلانـەوە نەبێـت کـە دەکەوتـە نێـوان پەنجـەرەی یەکێـک لـە ژوورەکان و دیـواری پشـتەوەی خانوەکـەوە لـە هیـچ جێگایەکـی تـرەوە خـۆری تێنەدەکـەوت. لـە پشـتەوە بەسـەر کۆڵانێکـی بەرهـووت و غەمگینـدا دەیڕوانـی کـە خۆڵێکـی زەردی وەکـو خۆڵـی بیابـان دایپۆشـیبوو، مزگەوتێکـی چکۆلانـەش لـە ناوەڕاسـتی ماڵەکانـدا بـوو، لەپشتیشـەوە دەچـووە سـەر کێڵگەیەکـی خاڵـی، بـەڵام پـڕ لـە پاشـماوەی ماشـێنی کـۆن و

ئاسنی ژەنگگرتوو. لە یەکەم ڕۆژەوە هەستمکرد ئەو چاوانەی دەورروبەرم نیگایەکی تیا نییە کەمێ دۆستانە سەیرمبکات. پور کە هەشت کچی هەبوو و لە ژیانیشیدا نێرینەیەکی نەخستبووەوە، بێوەژنێکی توندوتیژ بوو، ئەو دەسەڵاتە گەورەیەشی کە لە ناو ژنە سۆفیەکانی شاردا هەیبوو، شەوقێکی تەلیسماوی لە ناو کچە شەرمن و ترسنۆکەکاندا بۆ دروستکردبوو، ئەو کچانەی هەر هەشتیان شەوان جێگاکانی خۆیان تەڕدەکرد و هەندێکیان لاڵ بوون و هیچیان جگە لە هەندێ وانەی مزگەوت نەبێت، سەردانی جێگایەکی تری ئەم دونیا گەورەیەیان نەکردبوو، هەموو لە زوڵمەتی ئەو خانووەدا لەدایکبووبوون و لەویادا گەورە بووبوون و دەشیانویست لەویادا بمرن.

«پەروانە» بەر لە من یەکجار ئەم جیهانەی تاقیکردبووەوە... هەر ئەو ماوە کورت و دۆزەخییەش ئەو پەیوەندییە سەیر و تاریکەی لەنێوان ئەو و پورمدا دروستکردبوو، ئەو کات «پەروانە» دوای ئاشکرابوونی یەکێ لە دڵدارییەکانی نێردرابوو تا لە مەملەکەتی پوردا و لە ناو کیژە خواناسەکانیدا ببێتەوە بە مرۆڤێکی ئاسایی. بەڵام پور دوودڵ لەو ڕۆحە سەرکەشەی پەروانە، دوودڵ لەو خەونە سەیرانەی پەروانە لە خەیاڵی کچەکانیدا چاندبووی، بە باوکمی گوتبوو: «شەیتانێک لە قووڵایی ڕۆحی ئەم کچەدایە، بە هیچ دەروێش و وەلی و پێغەمبەرێک دەستەمۆ ناکرێت». من درەنگ زانیم شەیتان لە وشەکانی ئەودا و لە تێگەیشتنی ئەودا مانایەکی مەجازی نییە، بەڵکو تەواو مەبەستی لە شەیتانە، مەبەستی لە خودی شەیتان خۆیەتی بە هەمان ئەو شێوەیەی کە لە بەهەشت دەرکراوە. پورم لەو باوەڕەدا بوو کە من ماوەیەکی زۆر درێژ لەگەڵ شەیتاندا ژیاوم، ئەو شەوەش کە هەڵهاتنی پەروانە ئاشکرابوو کە هەموو دەفبەدەستەکانی هاوڕێی و هەموو خەلیفەکانی شاری ئاگادارکردەوە، هەر بەو زمانە قسەیکردبوو کە شەیتان لە هەموو

پێوەند و زنجیرەکانی خۆی بەرەڵابووە و دەبێت بگیرێتەوە. «گرتنەوەی شەیتان» لەو شەوەوە بووبووە خولیای گەورەی ئەو، توانایەکی گەورەشی هەبوو کە مەلاکان، خەلیفەکان و دەروێشەکان بانگبکاتە ناو ئەو ماراسۆنە سەیرەوە بۆ گرتنەوەی شەیتان... بەبێئەوەی بە خۆمان بزانین، ئێمەش ساڵانێکی درێژ کەوتینە ناو بازنەی گەمەکەیەوە. من بە حوکمی ئەوەی عومرێکی درێژ لە تەنیشت شەیتانەوە هەستابووم و دانیشتبووم، دەبایە زیاتر لە هەرکەسێکی دی نرخی ئەو وەدووکەوتنە بێوچانەی شەیتان بدەم، بەتایبەتی من وەکو پەروانە جەستەیەکی سەرکەش و غرورێکی کچانە و رۆحێکی یاخیم نەبوو دەلیلمبێت بۆ دەرەوەی ئەم دونیایە. من لە شەوی یەکەمەوە کە جیهانی ئەو پیرێژن و کچ و ژنە سەیرانەم بینی کە بە کۆمەڵ دەهاتنە ئەو ماڵە، هەستم بە گەورەیی ئەو بازنەیە کرد کە چواردەوری منی لە هەموولایەکەوە تەنیوە، بڕیارمدا ملکەچی ئەو گەمەیە بم. بە هەرحاڵ من رێگایەکی ترم نەبوو پیایدا دەربازبم. لە یەکەم شەودا پورم چەند سەعاتێ قسەی لەگەڵدا کردم، باسی گەورەیی ئەو گوناهەی پەروانەی کرد، باسی ئەو ژنە ئیماندارانەی کرد کە لەم شارەدا پارێزگاری ئیمان دەکەن، باسی ئاهەنگە ئاینییەکان و خەتم و زیکر و فیستیڤاڵی نوێژە گەورەکانی هەینی کرد کە رۆحەکان لەیەکدی نزیکدەکەنەوە و پێکەوە گرێیاندەدەن. بە دەنگێکی هێمن دەدوا، بەڵام ساردی و دڵڕەقییەکی قووڵ لە نیگاکانیدا بوو، بە جۆرێکی سەیر خۆی بەهەق دەزانی. دواجار گوتی: «هەموو موسڵمانێک بەرپرسیارە لە هەموان، من چەندین ساڵە بەدەست پەروانەوە دەناڵێنم، من دەمەوێت رزگارتبکەم، من لەبەردەم خودادا لێتان بەرپرسیارم، من بەتایبەت لەبەردەم خودادا لە تۆ بەرپرسیام.»... دواهەمین رستەی بە جۆرێکی هێندە توند و سەیر دووبارەکردەوە کە ئیدی ئاشکرابوو تا قیامەت بەدوامەوە دەبێت.

لەو شەوەدا من بە خەندەیەکی نهێنی و داپۆشراو تەماشامدەکرد، لەو ساتەدا کە ئەو دەیگووت: «من لە تۆ بەرپرسیارم»، بزەیەکی تاریک دەموچاومی ڕوناکدەکردەوە. ئەو قسەیدەکرد، بەلام دەمزانی خەیالی لای ئەو بزەیەی سەرلێومە، لەگەل ئەوەشدا هیچی نەدرکاند، وا خۆی دەرنەخست ئەو خەندەیە سەرنجی ڕادەکێشێت، بەلام دلنیابووم دەزانێت کە قەدەری پەیوەندی من و ئەو، پەیوەندی من و شتەکان، پەیوەندی من و خودا بەو بزەیەدا تێدەپەڕێت. بۆ ڕۆژی دوایی جلکێکی وەکو کیژەکانی خۆی لەبەرکردم و لەگەل دەستەیەک لە کچە مندالە دەفبەدەستەکاندا بردمی بۆ پرسەیەکی گەورە... ئەوە لای ئەو شەرەفێک بوو بە ئاسانی بە کەسی نەدەبەخشی، چەندەها سال بوو نەیهێشتبوو کچەکانی خۆی پێبخەنە ناو جیهانی زیکر، خەتم، نوێژی هەینی و فیستیڤالە ئاینییەکان، من زوو تێگەیشتم کە هۆی ئەو حالەتە دەگەڕێتەوە بۆ زمانی لالی ئەو کچە ترسنۆکانە و بۆ ئەو بۆن میزە کوشندەیەی لێیان دەهات، بەلام ئەو بۆ ئەوەی ئارەزووی کچەکان بمرێنێت دەیگووت: «بالاترین پلەی ئیمان، عیبادەتی بەردەوامی خودا نییە، بەلکو دوورەپەرێزییە لە جیهان». لەگەل ئەوەشدا عەشقی ئەو بۆ ئەو جیهانە سەیرەی لە کچەکانی حەرامدەکرد، عەشقێکی کەم نەبوو... من لە یەکەم ڕۆژی زیکرەوە لەو پرسە گەورەیەدا هەستمکرد کە پەیوەندی ئەو بە دەنگی ئەو دەفە سەیرانەوە، خالی نییە لە شەهوەت، بەلام شەهوەتێک هەرگیز دان بە حەقیقەتی خۆیدا نانێت.

ئەو ژیانە کورتەی من وەکو کچێکی دەفبەدەست، ژیانێکی سەیربوو. بڕیارمدابوو هەموو ئەو شتانە جێبەجێبکەم کە ئەو پێم دەسپێرێت. لەگەل هەموو ئەو ژنە دەفبەدەستانەدا دەچووینە پرسەکان، دەچووینە خەتمەکان، لەوێدا هەموو مەملەکەتە بەرینەکانی لاواندنەوە، لەخۆدان، خۆڕنینەوە و حال لەخۆهێنانم بینی. چەندەها شەو دەگەڕامەوە و

قریشکەی ئەو ژنانە لە گوێمدا دەزرنگایەوە... وێنەی ئەو مردووانە لە خەیاڵمدا سەمایاندەکرد، بەڵام لەگەڵ هەموو ئەو خەمە گەورەیەدا بەردەوام ئەو زەردەخەنەیە لەگەڵمدابوو، لە ریزی کچە چکۆلە دەفبەدەستەکاندا دادەنیشتم و سەیری مەوجی ئەو تەعزێکەرانەم دەکرد کە وەکو شێت لەخۆیاندەدا و ئەو زەردەخەنەیەش لەسەر لێوم بوو، سەیری ئەو شێوەنکەرانەم دەکرد و خەندەم دەهاتێ، وایلێهات شەوان لە خەویشدا ئەو خەندەیە لێم جیانەدەبووەوە. بەیانیان هەڵدەستام و ئەو خەندەیە وازی لێنەدەهێنام. پورم دەیزانی کە هەتا ئەو زەردەخەنەیەش بمێنێت، من رۆحلەبەرێکی مەملەکەتەکانی پەروانەم... ئەو بەلامەدا رادەبورد و هیچی نەدەگووت بەڵام رۆژ دوای رۆژ پتر کێشیدەکردمە ناو ئەو دنیایەی کە تیا دەژیا. لە کلاسە تایبەتییەکانی قورئان و تەفسیرەوە بۆ ئەو وانە سەیرانەی مەلایەکی نیمچە موزمەعیل لەسەر قیامەت دەیگووتەوە، لەوێشەوە بۆ فێربوونی نهێنیەکانی حەرام و حەڵاڵ، لەوێوە بۆ موعجیزەی سۆفییەکان و دواتر بۆ خوێندنی سزاکانی عەشق و زینا. هەندێک بەیانی کچەکانیشی هەڵدەستان و بە کۆمەڵ دەچوونە ئەو مزگەوتە سپییە کە لە ناوەراستی کۆڵانەکەدا بوو، ئەوە دوورترین جێگایەک بوو کچەکان بتوانن رووی تێبکەن، هەموویان جوانترین لەچکی خۆیان دەبەست و بە بێدەنگییەکی سەیرەوە ئەو ماوە کورتەیان لەنێوان دەرگای ماڵ و دەرگای مزگەوتەکەدا دەبری. ئەو ماوەیەش لای ئەوان، لە سەفەرێکی ئێجگار درێژ و ئەفسووناوی گرنگتربوو. ئەو ماوەیە نە من حەرفێکم لەگەڵ ئەو کچە شەرمن و دڵرەقانەدا دەگۆریەوە و نە ئەوان، هەر وەخت بمویستبایە قسەیان لەگەڵ بکەم، هەر هەشتیان سەریان دەنا بە سەری یەکترەوە و دەکەوتنە پسکەپسک، زۆرجار بێئەوەی هیچ بڵێم، لەناکاو هەر هەشتیان بەرامبەرم دادەنیشتن و بە جۆرێکی سەیر و بێرەحمانە پێدەکەنین، منیش بەو زەردەخەنە شەیتانییەوە تەماشامدەکردن و هیچم نەدەگووت...

ژووری خەوتنی من لەگەڵ ژووری خەوتنی چوار کچە گەورەکەیدا بوو کە دەبێت بڵێم نەمدەتوانی گەورە و بچوک لە ناویاندا جیابکەمەوە، هەموویان باڵایان بە ئەندازەی یەک و قەوارە و شێوەشیان وەکو یەک بوو. هەر چواریشیان شەوان موشەمایەکیان لەسەر نوێنەکانیان ڕادەخست تا بەردەوام دۆشەکەکان تەڕنەکەن، پێشیان سەیربوو من پێویستیم بەو موشەمایە نییە و میز ناکەم بە خۆمدا، بەیانیانیش هەر هەشتیان بەڕیز بەدیار ئەو جوڕنە چکۆلەیەی حەمامەکەوە دەوەستان تا جلکەکانی ژێرەوەیان بشۆن.

ئەوان هەمیشە شەوان زوو دەخەوتن، ژیان لای ئەوان لە هەشتی ئێوارەدا تەواودەبوو، منیش بۆ ئەوەی ماوەیەکی زۆرتر لەگەڵ خۆمدا بژیم و بیربکەمەوە، هەر زوو لە چاوەکانی پور هەڵدەهاتم و دەچوومە ژێر جێگا. شەو تەنیا کاتێک بوو بتوانم بیربکەمەوە. من هەردەم ئەو شەوانە بیرم لە چارەنوسی پەروانە دەکردەوە، دەمزانی کە ماوە و دەژی، ئەو شەوانە زۆر بیرم لە منداڵیمان دەکردەوە، بیرم لە قاقاکانی دەکردەوە لە ناو کچە شۆخەکانی هاوڕێیدا، بیرم لەو بێدەنگی و غەمە کوتوپڕ و سەیرانە دەکردەوە کە دایدەگرت، هەستیشمدەکرد تا زیاتر بیهێنمە پێش چاوی خۆم زیاتر ئەو پەیمانە دەهێنمەدی کە گووتبووم: «هەرگیز لەیادتناکەم». هەر لەو شەو سەیرانەشدا من نهێنی گەورەی ئەو ماڵەم دۆزییەوە، نهێنییەک کە نەدەبایە بمزانییایە. من لە شەوی یەکەمەوە فێربووبووم کە هەستم و لەسەرنوکی پێکانم بڕۆم و کەس هەستم پێنەکات... لەو شەوە درێژانەدا من تارمایی ئەو پیاوانەم بینی کە پورم لەو ژوورە ترسناکەی پشتەوەدا دەیشاردنەوە. یەکەمین پیاو لە شەوێکی باراناوی ئەنگوستەچاودا هات، لەگەڵ دوو ژنی دیکەدا بوو کە نەمزانی کێن، پورم دەرگای ئەو تاکە ژوورەی پشتەوەی بۆ کردەوە و لەویادا حەشاریدا. من لە چرپەچرپی پورم و ئەو ژنانە وا تێگەیشتم

کە ئەو پیاوە ژنەکەی خۆی سەربڕیوە و لە ترسی تۆڵە پێویستی بە حەشارگەیەک هەیە... شەوانی دواتر ئاگاداربووم کە ئەو دەڕوات و پیاوانی دیکە دێن. ئەو خۆی بە دەستی خۆی خواردن و ئاوی بۆ دەبردن و بە ڕۆژیش کەس دەرگاکانی نەدەکردەوە. من لە چاوانی ئەو هەشت کچەدا دەمخوێندەوە کە هەموویان بە حکایەتی ئەو پیاوە غەریبانە دەزانن کە لەمماڵەدا دەخەون. زۆر شەو، کاتێ لەو ژوورە خنکاوە دەهاتنەدەرێ و لە حەوشەکەدا کەمێک هەوایان هەڵدەمژی، من نەوەک تەنها هەستم پێدەکردن، بەڵکو لە دوورەوە بۆنی جەستەیانم دەکرد، لە دوورەوە بۆنی ئەو خەو و عارەقەیانم دەکرد. ئیدی بەردەوام یەک لە دوای یەک ئەو پیاوە شەونشینە سەیرانە دەردەکەوتن و چەند شەوێک لەوێدا دەمانەوە و پاشماوەیەک دەڕۆیشتن و ئیدی سەروشوێنیان نەدەما. هەندێکیان ژنەکانی خۆیان کوشتبوو، هەندێکیان خوشکەکانی خۆیان سەربڕیبوو، کەسانێکیان تێزابیان کردبوو بە کچانی قوتابخانەدا، یاخود فتوایەکی مەلاکانیان لە کوشتنی زەندیقێک یان زیناکەرێکدا جێبەجێکردبوو. هەر هەفتەیە و یەکێک دەردەکەوت. هەرکات هەستم بە ونبوون و ڕۆیشتنی یەکێک دەکرد دڵنیابووم قافڵەکە بێکۆتاییە و یەکێکی دیش لە بەری ئەو دەگات... شەوان گوێمدەنا بە دەرگاکانەوە و گوێم لێبوو، لەگەڵ ئەو ژن و کچە لەچکپۆشانەی تردا لە ناو دەف، موفەڕک و پرچی خەلیفە مردووەکاندا باسیان لە کوشتنی کیژێکی زیناکەر یان کوڕێکی خراپەکار دەکرد، باسیان لە سووتانی ماڵی یەکێک دەکرد، کە بۆتە کولانەی بەدکاری. لەو شەوە درێژانەدا هەستمکرد وردە وردە ئەو هەوا ڕزیو و نەگۆڕادراوەی ئەم ماڵ و مزگەوت و پرسانە دەمخنکێنن، بۆنی ئەو ژنە دەفبەدەستانە تووشی گێژی و گەمژەییەکی گەورەم دەکەن. ئەو چەند مانگە درێژەش دوور لە هەر هەواڵێکی پەروانە ئێجگار پەرێشانبووم. لەگەڵ دەفژەنەکاندا دەچوومە پرسەکان،

پاش ماوەیەک هەستمکرد هێدی هێدی منیش وەکو ئەوانی دیکە ئەو هەڵچوون و ترسەی ناو ناخم لەو دەفانەدا خاڵیدەکەمەوە، لەزەتێکی گەورەشم لەو گەمەکردنەدا دەبینی بە دەفەکان. لە پشت دەفەکان و لە دوورەوە هاورێکانی قوتابخانەم دەبینی، بەڵام نەیاندەناسیمەوە. دەمزانی بە جۆرێکی کوشندە لەو دونیایە دوورکەوتومەتەوە. لەگەڵ ئەوەشدا هیچ یەکێ لەو خاتوون و کچە دەفبەدەستانەی تر کە شێتانە دەفەکانیان لێدەدا و یاریان بە پرچیان دەکرد، قسەیان لەگەڵ نەدەکردم... دەمزانی بەهۆی ئەو زردەخەنەیەی سەرسیمامەوە، وەکو شەریکێکی هەتاهەتایی شەیتان سەیرمدەکەن. ڕۆژێکیان یەکێ لەو کچانە پێیگوتم: «تا کەی دەبێت شەیتانێکی گڵاوی وەک تۆ لە ناوماندابێت». منیش ڕۆژ دوای ڕۆژ پتر هەستم بەو شەیتانە دەکرد لە ڕۆحمدا گەورە دەبێت، پتر بۆنی ئەو پیاوانە لە تاریکیدا ڕایدەکێشام، بۆنی ئەو پیاوە غەریبانەی بۆ هەڵمژینی هەوایەک لە شەوان و مانگەشەو و ڕەشەبادا دەهاتنەدەرێ، من لەو شەوە گەرمانەی ئەو هاوینەدا، لە تاریکییەکەدا گوێم لە هەناسەیان دەگرت، خیزەی سینگیان وەکو جانەوەرێکی بریندار ئەو حەوشەیەی پڕدەکرد، بەڵام ماڵ بە ئەندازەیەک تاریکبوو چاو چاوی نەدەبینی. من لەو شەوەزەنگەدا هەڵدەستام و دەمزانی ئەو کیژانەی تریش لە ژێر جێگاکانیانەوە بەخەبەرن و بیر لە هەناسەی ئەو پیاوە غەریبانە دەکەنەوە کە شەو لەو حەوشە چکۆلانەیەدا، خۆیاندەدا بەسەر ئەو دیوارەدا و چاویان دەبڕییە ئەو زوڵمەتە هەتاهەتاییەی گەردون، دەمزانی هەموو بەخەبەرن و خۆیان لە جێگاکاندا قایمکردوە و گوێ لەو هەناسانە دەگرن کە هەوای ڕزیوی ماڵیان دەهێنایەجۆش. ئارەزوویەکی شەیتانی منی هەڵدەگرت و هەڵدەستام، زۆرجار لە شەوانی مانگەشەودا لە درزی پەردەکانەوە تارماییەکەیانم دەبینی کە سەیری ئەو دەشتاییە گەورەیەیان دەکرد، جگەرەیان دەکێشا، غەمێکی قووڵ و تاریکیان دەدایە بەر ئەو

بای زوڵمەتە. پێشتر سەدەها جار بیرم لێکردبووەوە کە ئێستا دەتوانم بڕۆم، دەتوانم دەفەکەم فڕێبدەم و بڵێم: «ها تۆ، ژنە بە شەرەفەکە، ئەگەر دەست لە یەخەم بەرنەدەیت، بەجەهەنم، ئابڕوتدەبەم. دەست لە یەخەم بەرنەدەی چیرۆکی ئەو پیاوانە ئاشکرادەکەم کە لەو ژوورەدا دەیانشاریتەوە، چیرۆکی ئەو غەریبانە دەگێڕمەوە کە داڵدەیان دەدەیت». بەڵام لە قووڵایی ڕۆحمدا شتێک ڕێگای لێدەگرتم، کە بێگومان هەر هەمان ئەو شەیتانە بوو کە هەستمدەکرد لە لەشمدا هەڵدەستێتە سەرپێ. دوای چەندەها شەوی بێخەوی، شەوێکیان ئەو هات، ئەو پیاوەی بۆنی ڕێحانەی لێدەهات. لە هەمان زوڵمەت و هەمان بێدەنگی و هەمان نهێنییەوە پێچرابوو، بەڵام تەنها تێپەڕینی بە ژوورەکاندا ماڵی پڕکرد لەو بۆن ڕێحانەیە. ئەویش وەکو پیاوەکانی تر تەنها شەوان کە زوڵمەت دەگاتە ڕەشترین و چڕترین پلەی خۆی بۆی هەبوو بێتەدەرێ. بەڵام لە شەوی یەکەمەوە هەستمکرد کە پیاوێکی بزێوتر و ڕامنەکراوترە، ئەو کێ بوو، چی بوو، ناوی چی بوو، ڕەنگی لە چی دەچوو؟... نازانم. هێندە هەیە پیاوێک بوو لە زوڵمەت، پارچەیەک تاریکی بوو و دەجوڵایەوە، بەشێک بوو لە خودی ئەو شەوەزەنگە ترسناکە، جیادەبووەوە و دەستی لە شتەکان ئەدا و دەگەڕایەوە بۆ ناو زوڵمەت. یەکەم پیاو بوو ببینم جورئەتبکات بێتە ناو تاریکی ئەو ماڵە، بێت لە هەمان ئەو مەرکانەیە ئاو بخواتەوە کە لە هۆڵی کیژە خەوتووەکاندا بوو، بێت دەست بکێشێت و دەست لەو دەفانە بدات کە بە دیوارەکانەوە بوو، بەو پێپلکە چکۆلانەیەدا سەرکەوێت و لە هەورەبانەکەوە سەیری مانگ بکات، سەری سندوقی بەفرەکە هەڵبداتەوە و کلۆ بەفر بخاتە دەمیەوە و خۆی فێنکبکاتەوە. زۆر شەو بەئارامی دەهات و بەناو ئەو جێگایانەدا تێدەپەڕی کە یەک لە تەنیشت یەکەوە لەسەر زەویەکە ڕامانخستبوون. لەسەرسەرمان دەوەستا، لەو زوڵمەتە قووڵەدا ماوەیەکی زۆر لێمان

ڕادەما و هێدی هێدی دووردەکەوتەوە. هەندێ شەویش گوێم لێبوو بەناو ماڵەکەدا دەهات و دەچوو، ئاهی زۆر قووڵی هەڵدەکێشا. لە یەکێک لەو شەوانەدابوو، لە ناو زوڵمەتدا وەستام و چاوەڕوانمکرد. ئەو شەوە دونیا بە ئەندازەیەک تاریک بوو تا نەگەیشتە نزیکم هەستم پێنەکرد. پێدەچوو خۆی سووسەی شتێکی کردبێت، بەرلەوەی بگاتە بەردەمم بە چەند هەنگاوێک وەستا، گوێم لێبوو دڵی خێراتر لێی دەدا، هەناسەکانی خێراتر و قورستر دەبوون. منیش لەو تاریکییەدا زەردەخەنەم بۆ ئەو مەخلوقە ڕەشە دەگرت، زەردەخەنەیەک کە دڵنیابووم دەیبینێت. بینیم هەنگاو بە هەنگاو لێم نزیکدەبێتەوە، بەڵام دوای هەموو هەنگاوێک ماوەیەک دەوەستا، دواجار گەیشتە بەردەمم. بە دەستێک کە بۆنی ڕێحانەی لێدەهات ئامێزی پیاکردم، ئەوە یەکەمین بەرکەوتنی من بوو لەگەڵ پیاوێکدا... چپاندی بە گوێمدا: «تۆ لە کوێیت». نەمزانی بە کێم تێدەگات، نەمزانی لەگەڵ منێتی یان لەگەڵ ئافرەتێکی خەیاڵی ناو خەون و ئارەزووەکانێتی. دەمزانی ئەو تاریکییە هێندە چڕە کە نامبینێت، دەمزانی گەر لەم ماڵەش چووەدەرێ نازانێت لەگەڵ کێدا خەوتووە. بەڵام یەک لەسەریەک دەیگووت و دەیگووتەوە: «تۆ لەکوێیت... لەکوێ؟»، بە چپەکانی، بە بۆنی، بە هەناسەکانی زۆری بۆدەهێنام، تا لە ئاستێکدا تەواو هەموو شتەکان هەرەسیانهێنا و تەواو کەوتمە ئامێزی. من لەو تاریکییە ئەبەدییەی ماڵدا لە ناو دەفەکاندا و لە ژێر پرچی ئەو خەلیفە مردووانەدا کۆتاییم بە ژیانێک دەهێنا و دەچوومە ژیانێکی تر.

نەمزانی ئەو شەوە لە خۆیدا چەندە درێژە، بەڵام بۆ من بە بەرتەقای هەموو عومرم بوو. ئەو پیاوە کێ بوو؟ لە کێ دەچوو؟... نازانم. هێندە دەزانم بەشێک بوو لە ڕەنگی ڕەش و بێسنووری شەو. بەشێک بوو لە خودی زوڵمەت، جگە لە تاریکی ڕەنگی تری نەبوو، جگە لە بۆنی ئەو ڕێحانە ڕەشانەی کە دیاربوو هەمان شێوە لە زوڵمەتدا گەورەبوون

بۆنی تری لێنەدەهات، جگە لەو سروە کز و ترسناکەی شەو کزەیەکی دی لە لەشی هەڵنەدەستا، بەڵام پیاوێکی ڕاستەقینە بوو، لەگەڵ خۆیدا هەموو ئەو جیهانەی دەجوولاند کە دیاربوو بە چەندەها پەتی نهێنی پێوەی بەستراوەتەوە. هەستمدەکرد لەگەڵ جوولانەوەی جەستەیدا هەموو دنیا لەپشت خۆیەوە دەجولێنێ... دیوارەکان... هەوا... ئەستێرەکان... ئەو شارە خەوتووانەی دوور... منارەکان... حوجرەکان... مزگەوتەکان... چیاکان... دەریا... مەلەکوت. دواجاریش بەر لەوەی ئەو جیهانەی کە وەکو بێشکەیەکی ڕەش دەلەرییەوە ئارامبێتەوە، سەری نا بەو دیوارەوە و هەناسەیەکی قووڵی هەڵکێشا، هەناسەیەک پێدەچوو لە تاریکترین جێگای ناو ڕۆحی ئەو مەخلوقەوە بێتەدەرێ کە ئێستا بێدەنگ دەستی خستبووە سەر دیوارەکە و بەئارامی تێکەڵ بەو تاریکییە ڕەها و بێسنورەی شەو دەبووەوە.

من نەمزانی کەی گەڕاومەتەوە ناو جێگاکەم و کەی خەوتووم... بەڵام بەیانی کە هەستام بۆنێکی سەیرم لێدەهات. نەمدەزانی ئایا پور بە بەسەرهاتەکانی شەو دەزانێت یاخود نە؟ بەڵام بەشێوەیەکی سەیر تەماشایدەکردم، کیژەکانیشی یەک لە دوای یەک لە حەمامەکە دەهاتنەدەرێ و جلەکانی ژێرەوەیان دەگووشی و دەیانتەکاند و بە تەنافەکەدا هەڵیاندەواسی و بەردەوامیش بەو چاوە پڕ لە گومان، کینە و حەسودییەوە سەیریاندەکردم. من بێئەوەی هیچ بکەم خۆم بەو دەفە چکۆلانەیەوە سەرقاڵکردبوو کە پڵپڵەکانی، وەکو زەنگەکانی قاپی دۆزەخ دەزرینگان و دەلەرزین. تا زیاتر سەیریان بکردبامایە، زیاتر بۆنی ڕێحانەم لێدەهات. پورم لە هەیوانەکەدا گەنمی هەڵدەخست و کشەی لەو پاساریانە دەکرد کە لە گەنمەکەیان دەخوارد، بەڵام بەردەوام بەو چاوە بێڕەحمانە سەیری ئەو گەمەیەی منی دەکرد بە دەفەکە و هیچی نەدەگووت. لەناکاو شتەکان بۆنی بێدەنگییەکی ترسناکیان دەگرت، منیش

بەو خەندەیەوە هەڵدەستام، دەفەکەم هەڵدەواسییەوە و لەچکەکەم لە گەردنمدا شلدەکردەوە و تاڵە قژەکانم لە ژێرەوە دەردەهێنا و دەمگووت: «گەرمە، ئەم بەیانییە ئێجگار گەرمە». ئەوە یەکەمجاربوو لە بەیانیانی ئەوماڵەدا دەنگ بەرزبکەمەوە و شتێک بڵێم، هەستمدەکرد ئامێزی ئەو پیاوە جورئەتێکی گەورەی پێبەخشیووم، پرچی خەلیفەکانم دەگرت و دەمگووت: «خوایە چەندە گەرمە... ئاه، ئەم گەرمایە لە کوێوە دێت، تۆ لە کوێوە دێیت ئەی گەرما، تۆ لە کوێوە دێیت؟». دەستەکانی ئەو پیاوە پاڵیان پێوەدەنام بەرەو جێگایەکی فێنکتر بڕۆم. پور کشەی لە پاسارییەکان دەکرد و عاجباتی لەقسەکانم دەهات، بە کچە پورەکانمم دەگووت: «بۆ ئەو جلە زستانە ئەستورانە لەبەردەکەن... ئێستا هاوینە؟» کەوام دەگووت شتێک بە خێرا لە هەوا، لە ئاسمان و لە ڕۆحمدا دەجولایەوە، دەمزانی ئەوە سەرەتای ڕەشەبایەکی گەورەیە، من زیاتر خەندەم دەگرت و زیاتر بە کچە پورەکانم دەگووت: «بۆ لە هاویندا دەبێت جلی زستانە لەبەربکەن...؟ جلی هاوین هەمیشە تەنکترە... جلی زستان پیاو دەخنکێنێ، ئێوە جلی هاوینەتان هەیە؟...». لەگەڵ هەموو ڕستەیەکیشدا ئیقاعی جولانەوەی هەوا و ئاسمان دەگۆڕدرا. باکە یەکەمجار پەڕەی ئەو قورئانە جۆرا و جۆرانەی هەڵدەدایەوە کە بە شێوەیەکی ئەندازەیی سەیر لەسەر دەیەها ڕەفەی جیاواز دانرابوون، تا زیاتر قسەمدەکرد زیاتر گوێم لە دەنگی هەڵدانەوەی پەڕەکان دەبوو. ئەوان هەموو سەراسیمە وەستابوون و گوێیاندەگرت، لە یەک کاتدا بایەک دەهات و هەموو قورئانەکانی پێکەوەهەڵدەدایەوە، هەموو پڵپڵەی دەفەکانی دەلەراندەوە، یاری بە هەموو پرچەکان دەکرد، پەڕۆی موفرکەکانی دەخستە شەکاندنەوە. من ئاوڕمدەدایەوە ئەو بایە قایمتردەبوو، ئیدی بە لێشاو ئەو گەنمە هەڵخراوەی دەهێنا و دەیدا بە دەموچاوماندا، پەرداخە موبارەکەکانی دەخستە خوارەوە، کچە پورەکانی دەدا بە دیوارەکاندا، ئەو

ڕەفتە نازک و شلەی لەسەری من دەکردەوە و قرژم ئازادانە لەو بایەدا دەکەوتە فڕین، من لە ناو بایەکەدا دەمقیژاند: «چ جوانییەکی تیایە لەم هاوینەدا بەو جلانەوە بژین...». لەگەڵ هاوارەکانی مندا گێژەڵووکەکە زیاتر بەرەو قووڵایی ژوورەکان دەکشا. پوورمم دەبینی لەنێوان لێشاوی ئەو گەنمە فڕیوانەدا دەستیگرتووە بە لەچکەکەیەوە و بەو چاوە ترسناکانەی سەیرمدەکات. سات دوای سات ڕەشەباکە شێوەی ترسناکتری بەخۆیەوە دەگرت، قورئانەکان وەکو هێزێکی بێدین و ئەهریمەنئاسا پەڕەپەڕەیانبکات هەڵدەوەرین و پەڕەکانیان لەو گەردەلوولەدا با دەیبرد، پوورم و کیژەکانی دەیانویست ئەو دەرگایانە دابخەن کە گەردەلوولەکە وەکو هێزێکی شەڕانی دەیکردەوە، بەڵام نەیاندەتوانی. قورئانەکان با دەیبردن... ئەو قورئانە پیرۆزانەی نوسخەی ناوازەی ئەولیا و شێخە گەورەکان بوون، ئەو نوسخانە بوون کە پوور و هاوڕێکانی ساڵەهای ساڵ کۆیانکردبووەوە. نوسخەی «شێخ مارفی نۆدێ»، نوسخەی «کاک ئەحمەدی بچکۆلە»، نوسخەی «شێخی سیراجەدین»، نوسخەی «شێخ محەمەدی عەوالان». باکە لەناکاو پرچی دەسککراوی خەلیفەکانیشی برد و لە دەرگای پشتەوەیماڵەوە بەرەو دەشتاییەکان فڕاندنی. دەفەکان بە دەیەها لە ناو هەوای تورە و یاخیبووی ماڵدا سەمایاندەکرد، بەریەکدی دەکەوتن و پارچەپارچەدەبوون. پوورم دەیقیژاند، منیش دەمبینی باکە خەریکە دەمرفێنێ، دەستمدەگرت بە دەرگاکەوە و دەمقیژاند: «بۆ بەم هاوینە گەرمە واز لەو کیژانە ناهێنیت؟ بۆ لێناگەڕێیت حەزیان لە چییە بیپۆشن؟ تاکەی لێرەدا دانیشن و بمرن؟». پوورم وەکو پەلاماری شەیتان بدات دەیویست شاڵاوم بۆبهێنێت، بەڵام باکە دەیگێڕایەوە، دەیویست لەو ڕەشەبا کوشندەیەدا دەستبەرێت و کتێبە پارچەپارچەکان، دەفە فڕیوەکان، پرچە لوول و کاکۆڵە پەرشوبڵاو و تێکەڵاوەکان بگرێتەوە. لە ساتێکدا وێرانبوونی ئەو شانشینەی بەچاوی خۆی دەبینی، هەرەسی

ئەو مەملەکەتانەی دەبینی کە ژیانی لە دروستکردنیدا سەرفکردبوو. کیژەکانی «ئەوانەیان کە لاڵ نەبوون» دەیانقیژاند: «ئاە دایە بورجی ئەو شەیتانەیە... بورجی ئەو شەیتانەیە»،«دایە ئەو ئاگرتێبەربووەت بۆ دەرنەکرد»، «دایە نەتدەزانی ئەو شەیتانە بە تۆ دەستەمۆ نابێت، نەتدەزانی ئەو نایەوێت پاکبێتەوە؟ ». من لەو بایەدا گوێم لەو هاوارانە دەبوو و تەزووی خۆشییەکی گەورە باڵی پێدەگرتم، خۆشی بەرەڵابوونی کینەیەکی گەورە، خۆشی ئازادکردنی ڕقێکی بێسنوور. هاوارمدەکرد: «ئۆە، خودای گەورە... با... با. ئەی ڕەشەبا خێرا و بێسرەوتەکان ئارام مەبنەوە... ئارام مەبنەوە»

ئاشکرابوو ئەو ڕەشەبایە تا هەموو ئەو ماڵە بەسەریەکدا تێکنەدات، ئارام نابێتەوە. من سەراسیمە و شادومان لە ناو ئەو دەف و کتێب و تەزبیحە فڕیوانەدا پێدەکەنیم. هەستیشمدەکرد تا ئەو جیهانە زیاتر خاپووربێت، باکەش زیاتر خاودەبێتەوە، لەگەڵ هەموو ئارامبوونەوەیەکی زیاتری گێژەڵووکەکەشدا پتر قریشکەی ئەو کچە پورانە دەگەیشتە گوێم کە با لەچکەکانی فڕاندبوون و بە قژی بژ و ئاڵۆزکاو و هەرگیز شانە نەکراوەوە لە بۆ ڕەفتەکانیان دەگەڕان.

بایەکی لەناکاو بوو، بایەک بوو لەوسەری دونیاوە دەهات، بارەشێک بوو ئەو هەرگیز حسابی بۆنەکردبوو، وایزانیبوو ئەو دیوار و پەنجەرانە دەیپارێزێت، وایزانیبوو ئەو تاریکییە دەیپارێزێت، بەڵام ئەوەتا باکان دەتوانن بێنە ژوورەوە و لە دەرگاکانیش بچن بەودیوا. من شادومان بەو قژە پەشۆکا و ئاڵۆزکاوە کە پڕبوو لە خۆڵ و دەنکە گەنم، لەویادا بە خەندەیەکەوە وەستابووم، پور بە غەمگینییەوە سەیریدەکردم و دەیگووت: تۆ خوشکی شەیتانیت... خوشکی شەیتانیت.

# ٧

من بەرپرسیار نیم لەو ڕەشەبایە، من هەمیشە ڕقم لە ڕەشەباکان بووە، بەڵام دەزانم لە منداڵییەوە ئەوانەی دەورووبەرم دەیانەوێت پەیوەندییەکی سەیر لەنێوان من و باکاندا بدۆزنەوە. ئەو حکایەتەش کە دەڵێت لە ڕۆژی لەدایکبوونمدا ڕەشەبا نیوەی شاری وێرانکردوە جگە لە خورافەتێک زیاتر هیچی تر نییە، درۆیەکە دروستیانکردوە تا پەیوەندیەکی قووڵتر و نهێنیتر لە نێوان من و پەروانە و شەیتاندا دروستبکەن.

بەڵام دەبێت دانی پیادابنێم کە حکایەتەکان هەموویان سەرلەبەر درۆنین، پەروانە هەندێ جار پێی دەگووتم «تۆش بێبەرینیت لە چاکە و فەزڵی شەیتانەکان»، ئەو باسی ئەو ڕۆژانەی شیرەخۆری منی دەگێڕایەوە کە دوای وەرگرتنە بێبەهانەکانی من، باکان ماڵی ئێمەیان بەسەریەکدا هەڵگێڕاوەتەوە. خۆشم هەندێ شتی سەیرم لەیادە، لەیادمە لە پۆلی پێنجی سەرەتاییدا بووم کە مامۆستایەک بە ناهەق لەبەرچاوی هەزار قوتابییدا بەتۆمەتی دزییەک کە ئاگام لێنەبوو منی فەلاقەکرد، ڕاستەوخۆ دوای ئەوە بایەکی ترسناک نیوەی قوتابخانەی وێرانکرد، بایەکی تووڕە و لەناکاو کە پەردەی هەموو پەنجەرەکان و وێنە و دروشمی هەڵواسراوی سەر هەموو دیوارەکانی برد و پارچەپارچەیکردن. لە شەشی سەرەتاییشدا کاتێک تاقیکردنەوەی بەکەلۆریم دەدا، بێئەوەی لە شوێنی خۆم فزەمکردبێت، بێئەوەی سەرم هەڵبڕیبێت، مامۆستایەکی

پیر و بوغزاوی بە خۆی و چاویلکەیەکی ژەنگاوییەوە لە خۆڕا منی لە سالۆنەکە کردەدەرێ، لەیادمە هێشتا قاچم نەخستبووە ئەو دیو سالۆنەکە، ئەو ناوە بووە مەیدانی گێژەلۆکەیەکی تووڕە و ترسناک، با هەموو دەفتەرەکانی تاقیکردنەوە و هەموو پرسیارەکانی فڕاند و تەنورەی سەدەها کچ و دەیەها مامۆستای بە جۆرێکی حەیابەر هەڵدایەوە. لە هیچ یەکێ لەو جارانەشدا من بەرپرسیار نەبووم، ئەم شارە خۆی شارێکی ترسناکە، شارێکە باکان تیا خۆشناکاتەوە، بەڵام من بەرپرسیار نیم. ئەوانەی دەوروبەرم دەڵێن کە من ڕەشەباکان دروستدەکەم، بەڵام من هیچ کات هەستم نەکردوە پەیوەندییەک لە نێوان من و باکاندا هەبووبێت، من هەردەم کچی هێمنییەکان بووم.

ڕووداوەکان دوای ئەو ڕەشەبایەی ناو ماڵی پووریش، سەیر و فرمێسکاوی کەوتنەوە، دوای وێرانبوونی مەملەکەتەکانی پور، دوای ئارامبوونەوەی ئەو بایە، دوای دادڕاندنی متیلەکان و دروستکردنی لەچکی تازە بۆ ئەو هەشت کچە، پورم نەهیکرد لەوەی کەس پەنجەم تێوەبدات، نەوەک لەبەرئەوەی من بێگوناهم، بەڵکو لەبەرئەوەی دەترسا ئەو شەیتانە ڕاپەڕیوەی ناو ڕۆحم، جارێکی دیش پەلاماریانبداتەوە. لەو بەیانییەوە پورم ئیدی دڵنیابوو کە شەڕی ئەو لە گەڵ شەیتانێکی خەوتوو و ڕاستەقینەی ناو ڕۆحمدایە. پورم زۆر نائومێدانە لە ئێوارەی هەمان ڕۆژدا دامیە پێش خۆی و گێڕامییەوە بۆ لای باوک، گێڕامییەوە بۆ ئەو ماڵەی سێ مانگ پتربوو نەمدیبوو، گێڕامییەوە بۆ ئەو حەوشە و باغە چکۆلانە و ژاکاوەی لە دووری پەروانە سیسبووبوون. لە ڕێگا هیچی نەگووت ئەوە نەبێت کە وازناهێنێت لە شەڕکردن لەگەڵ ئەو شەیتانانەدا کە دەیانەوێت بنەماڵەکەی گلاوبکەن، منیش هیچم نەگووت ئەوە نەبێت گووتم: «وازمەهێنە، کێ دەڵێت وازبهێنە. وازهێنانی چی؟» دواتر نەمزانی ئەو چۆن چۆنی چیرۆکەکانی بۆ باوکم گێڕاوەتەوە؟ ئایا

باسی ئەو پیاوەی بۆ کردبوو کە شەو لەگەڵیدا خەوتبووم یان تەنها باسی ئەو بارەشەی بۆکرد کە لەوباوەڕەدابوو شەیتانەکانی نێو دڵی من دروستیانکردوە؟

گەڕانەوەم بۆ ماڵ بێدەنگ و ساردوسڕ بوو، تەنها خۆشییەک بینیبێتم زەردەخەنە و شەوقێک و قریشکەیەک بوو لە دایکمەوە کە وەکو هەمیشە لە کونجی ڕزینی خۆیدا هەڵدەوەری و دەبووە کرمی ورد. باوکم بە حەرفێک چییە لەگەڵمدا نەدوا، براکانیشم لەیەکەم شەوەوە کەوتنە دووبارەکردنەوەی ئەو فەرمان و داواکاریانەی جاران پەروانە بۆی جێبەجێدەکردن. ناوهێنانی «پەروانە» قەدەغەبوو، نەشمدەزانی کە دەبێت چی لێهاتبێت؟. ئاسان نەبوو دوای ئەو وەرزە دوور و درێژەی ناو ماڵی پور وەکو جاران بژیم. شەوێک بەڕێکەوت لە دەنگەدەنگی نێوان باوک و براکانم تێگەیشتم ئێستاش بۆ «پەروانە» دەگەڕێن. لەگەڵ گەڕانەوەمدا بۆ ماڵ، دەبایە خۆم بە شتێکەوە سەرقاڵبکەم، بۆیە دەستمکرد بە پاککردنەوەی ماڵ، بە سپیکردنەوەی دیوارەکان، بە ئاودانی گوڵەکان، بە شتنی حەوشە و هەیوان، بە بایەخدان بەو چرپا چکۆلانانەی سەربان کە براکانم لە هاویندا لەسەری دەخەوتن. من بە پێچەوانەی پەروانەوە لەزەتێکی زۆرم لەو خۆ سەرقاڵکردنە دەبینی بە شتەکانی ماڵەوە... هەموو ڕۆژێ سەرتاپای ئەو پەرداخانەم دەشت، سەرتاپای ئەو قاپ، بەلەم و کەوگیرە کۆنانەم دەردەهێنا و پاکمدەکردنەوە، دڵنیاشبووم هەندێکیان دە ساڵ زیاترە کەس نانی تیانەخواردوون. کاتێکی زۆرم لەگەڵ پاککردنەوەی دایکدا دەبردەسەر. ئەو چەندین ساڵ بوو لەو ژوورە نەچووبووە دەرێ. من تەمەنم شەش ساڵ بوو کە ئەو کەوتەخوارێ و ئیفلیجبوو و زمانی شکا، جگە لەو قورسکە سەیرانەی دەنگی نەما. بەخۆی و سەتڵێکی پڕ لە جلەوە لەو سەر پەیژە بڵندە بەربووەوە... من ئێستاش لەیادمە، سەتڵێک بوو پڕ لە شەڕواڵەکانی باوک، دەرپێکانی برا

و کراسە کورتەکانی من و پەروانە. ساڵانێک لەمەوبەر ویستمان بیکوژین، بەڵێ هەموومان ڕێکەوتین کە بیکوژین، لەیادمە کە کێشیانکردە دەرەوەی ژوورەکە. من و پەروانە هەردووکمان تەماشاماندەکرد... هیچمان نەکرد، نەمانگووت مەیبەن، نەمانگووت مەیکوژن، لە بەرپەنجەرەکەدا وەستاین تا لە دەرگاکەوە بردیانەدەرێ، من و پەروانە دەمانزانی دەیکوژن کەچی بۆی نەگریاین، غەممان بۆی نەخوارد. دوای سەعاتێک هێنایانەوە و لە ناو یەکتردا جنێویان بە یەکدی دەدا. کەسیان غیرەتیان نەکردبوو بێدەنگیبکەن، هەموویان دەستیان کەوتبووە لەرزین، دواجار وەکو پارچە پەڕۆیەک کێشیانکردەوە و فڕێیاندایەوە کونجەکەی خۆی. من لە دوای گەڕانەوەم پتر هەستم بە مانای هاوار و قریشکەکانی ئەو مەخلوقە سەیرە دەکرد، پتر سۆزم بۆی دەجولا. بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا مرد و نەمتوانی وەکو دایکێک خزمەتیبکەم.

ئەو ماوە کورتەی کە لە ماڵەوە ژیام، کەم کەم خۆم لەگەڵ شتەکاندا دەگونجاند، بەڵام ئەو هێمنییە کوشندەی ماڵ بەبێ پەروانە قورس بوو... زۆر قورس بوو بەبێ پەروانە بژیت و بخەویت و لەبەر پەنجەرەکەدا بوەستیت و سەیری باغچەکە بکەیت. ئێواران کورسییەکم دەبردە ئەو باڵکۆنە و لەوێوە سەیری ئەو مەیدانی جەلەبەم دەکرد، سەیری ئەو شەقامە نیمچە هێمنانەی دەورروبەرم دەکرد، سەیری ئەو ڕێبوارە غەمگینانەم دەکرد کە زۆربەی کات بە تەنها بەو ڕێگایانەدا دەڕۆیشتن، چەندەها سەعات دادەنیشتم و بێدەنگ سەیری جوڵەی باکان و پەپولەکانم دەکرد، گوێم لە دەنگی هێمنی ئەو هەوایە دەگرت کە خرۆشانێکی سەیری تیابوو. هەندێجار وامدەزانی ئەو فاسیلەیەی من لەو ساڵانەی پەروانە و ئەو ڕۆژە سەیر و کپانەی ماڵی پور دووردەخاتەوە گەلێ درێژە، دەشمگووت لەوانەیە ژیان تا هەتا هەتایە بەو کپی و هێمنییە بمێنێتەوە. کە دادەنیشتم، هەردەم پەرداخێ چام لەبەردەم

خۆمدا دادەنا و بیرم لە ڕابوردوو دەکردەوە، هەرگیز پەروانەم فەرامۆش نەکرد، بەڵام پەیوەندیم بە ئەندازەیەک بە دنیاوە پچڕابوو کەسێک نەبوو هەواڵی ئەوی لێبپرسم، کەس هەواڵی پەروانەی نەدەزانی، کەس نەیدەزانی پەروانە لە کوێیە. من لەو شەوەوە کە باوکم سپاردمی بەو ژنە دەفژەنانە لە هەموو دونیا دابڕابووم، هەتا هاوڕێ نزیکەکانیشم وایاندەزانی من سەفەرمکردوە بۆ شارێکی دوور، منیش نەمدەزانی چۆن پەیوەندییان پێوەبکەم، دواجاریش بۆ ئەوەی خۆم لە هەموو گێرمە و کێشەیەک ئازادبکەم، وازم لە هەموو ئومێدێک هێنا و ئێوارە فێنک و دڵڕفێنەکانی هاوینم بە چا خوارنەوە لەو باڵکۆنە بچوکەدا دەبردەسەر... تا ئێوارەیەک لە ئێوارەکان «شیرین» دەرکەوت.

شیرین تاکە کچێک بوو لە گروهی ئەو کیژە جوانانەدا کە نە وەکو ئەوان جوان، نە وەکو ئەوان هەوا بەرز، نە وەکو ئەوان پەیوەندی دڵدارییانەی زۆربوو. لەگەڵ ئەوەشدا بەشێوەیەکی سەیر و بێهۆیەکی دیاریکراو لە یانەی ئەو کچە شۆخانەدا جێگای بوبووەوە. ئێوارەیەکی درەنگ لە دەرگایدا، من لەو باغەدا چووبوومە سەر تەپڵەکێک تا کەمێ لەو هەنجیرە گەیوانە لێبکەمەوە کە هەردەم دەوەری و کەس نەیدەخوارد. کاتێک دەرگام لێکردەوە و بۆنی ئەو هەنجیرە تازانە چوو بە سەریدا، گووتی: «خوایە، کتومت وەکو خەوەکە دەتبینم، دوو مانگ پێشتر خەوم پێوەبینی بە کراسێکی سپییەوە لە باغێکی گەورەدا هەنجیرت دەچنی». باوەشی پیاکردم و گووتی: «تۆ لەکوێیت، جنۆکە؟». بێئەوەی ئارامبگرم باوەشم پیاکردەوە و گووتم: «حیکاتێکی دوور و درێژە... وەرە ژوورێ». شیرین ئەڵقەکەی نیشاندام و گووتی: «شوومکردوە، مەیمون. نەتزانیوە؟ سەیرمکە، بوکێکی جوانم؟». بێگومان نەمزانیوە لە کوێوە بزانم، من لەو تاریکستانە قووڵانەدا چ خەبەرێکم لە دونیا نەمابوو، شیرین پێیوابوو کە هەموو دونیا بە حکایەتی ئەفسانەیی شووکردنەکەی دەزانێت. من

پێمگووت: «من جیام، من لە جێگایەکی تر بووم... گەلێ دوور». ئەو بە چپەوە پێکەنی و گووتی: «هەواڵی پەروانەم پێیە؟». خودایە ئەو زەردەخەنە و چپە چکۆلانەیە بەس بوو بۆئەوەی سەر لەنوێ هەموو ئەو ئارامییەی کە چەندین ڕۆژبوو بە کارکردن و چاخوارنەوەی ئێوارانی باڵکۆنەکە بۆ خۆم دروستکردبوو بڕمێت و هەستێکی قووڵی پەشۆکان جێگای بگرێتەوە. شیرین جانتاکەی لەسەر کورسییەکە دانا و گووتی: «خەندان، هەواڵی پەروانەم پێیە... هەواڵی ئەو». هەستمکرد ناوەکەی میوەکان ڕادەچڵەکێنێ، ئەو پاسارییە چکۆلانانەی سەر درەختەکان وریادەکاتەوە... ئەو پەپولانەی باغ لە خەو هەڵدەستێنێت کە پێکەوە هەموو لە گەڵا و گوڵەکان هەڵفڕین. شیرین لە خۆشیدا خەریکبوو دەفڕی، دەیگووت: «شرشێت دەزانیت لە کوێ دەژین... دەزانیت؟ لە دارستانێکدا، لە دۆڵێکی چڕدا، لە جێگایەکی سەیر». دەستیبرد و هەنجیرێکی لەو قاپە حەپەساوە هەڵگرت. کچێکی زۆر بزێو و زیندوو بوو بێئەوەی وچانبدات گووتی: «حەیاتچێت... تۆ لە کوێی؟ لە کوێی؟». ئەو وایزانیبوو مردووم، من بەو زەردەخەنە ماندووەی خۆمەوە گووتم: «لێرە بووم، لەم باڵکۆنەدا... ئێواران هەمیشە لێرەدا دادەنیشم و سەیری ئاسمان دەکەم». باوەشی پیاکردم و گووتی: «خەندان، لە جەنگەڵێکی سەیردان، جەنگەڵێکی دووردەست و عاسی، بەڵام کەس بەتەواوی نازانێت ئەو جەنگەڵە دەکەوێتە کوێوە... کەسیش نازانێت ئەوان لەوێن». بە نائومێدییەکی گەورەوە گووتم: «چیدەکەن لە جەنگەڵا، جەنگەڵی چی، تۆ باسی چیم بۆ دەکەیت؟».

شیرین ئەو ئێوارەیە قاتێکی سەرتاپا سپی لەبەردابوو، جووتێ پێڵاوی سپی لەپێکردبوو و ڕەفتەیەکی ڕەشی دابوو بە شانیدا، جانتاکەشی دیاربوو جانتای ئەو بوکە تازانەیە کە دەبێت هەموو ئێوارەیەکی هاوین پیاسەبکەن. لەو جانتا نازکەی بوکێنیدا کە بۆنی عەتر و مەکیاجی

گرانبەهای لێبەرزدەبووەوە ئەو پەیکەرە چکۆلانەیەی دەرهێنا، پەیکەرێکی تەختە، پەیکەری دوو عاشقی بەختیار... پەیکەرەکەی دایە دەستم و گووتی: «سەیرکە، ئەو بە دەستی خۆی ئەوەی بۆ ناردویت». ئینجا بە دڵنەوایی و بەزەییەوە سەیریکردم و گووتی: «غەمگین مەبە، گرنگ ئەوەیە هەواڵمان زانی... وانییە؟». لە ژێر پەیکەرەکەدا پەروانە ناوی خۆی بە وردی هەڵکەندبوو، من خەتە ورد و نازکەکەیم ناسییەوە، خەتی کچێکی غەمگین لە گۆشەیەکی دوورەدەستی دونیادا. ئەو پەیکەرە لە ڕێگای گەنجێکی وردەواڵەفرۆشەوە گەیشتبووە دەست شیرین، هەر ئەو گەنجەش ئەو هەواڵانەی بەو ڕاگەیاندبوو. من پەیکەرەکەم هەڵگرت و تێیڕامام، پەیکەرێکی چکۆلە و قەشەنگ بوو، بەڵام ساڵانێکی دوور و درێژ چاوەڕوانمکرد تا لە حکایەتی ڕاستەقینەکەی تێگەیشتم. وردەواڵەفرۆشەکە گووتبووی کە بەرلەوەی جارێکی تر بگەڕێتەوە و هەواڵی ئێمە بەپەروانە بگەیەنێت، سەفەرێکی درێژ دەکات و بە چەندەها هەرێم و زەوی جیاجیادا دەگەڕێت. ئەو ئێوارەیە من و شیرین خۆشحاڵانە بڕیارماندا کە چاوەڕێی ئەو گەنجە بکەین، بڕیارماندا کە نامەی درێژ بۆ پەروانە بنوسین، هەندێ شتی بۆ بنێرین... کە شیرینیش بە خۆشحاڵی هەستا و جارێکی تر باوەشی پیاکردمەوە، دەستی گووشیم و گووتی: «مەترسە، ناهێڵین لە هیچ یەکی بکەوێت».

ئەمڕۆ کە بیر لە خۆشی و کامەرانی ئەو ئێوارەیە دەکەمەوە، کە بیر لەو بەختەوەرییە لەناکاوە دەکەمەوە کە من و شیرینی داگرتبوو، غەمێکی قووڵ دامدەگرێت... چونکە لە ڕۆژانی داهاتوودا ڕووداوەکان بە جۆرێکی هێندە سەیر چوونەپێشێ کە ئیدی من و شیرین جارێکی دیکە یەکترمان نەبینییەوە. دوای ساڵانێکی درێژ کە دەرفەتم بۆ ڕەخسا و توانیم هەواڵی بپرسمەوە، زانیم ئەو لە باشووری دونیا، لە شارێکی چکۆلانەی ئێجگار ئێجگار دووری خوارووی ئوستراليا دەژی. بەڵام شیرین ئەو ئێوارەیە کە بە

جلە قەشەنگەکانییەوە جێیهێشتم، جلی تازەبوکێکی ڕێکپۆش، نەمدەزانی جارێکی تر نایبینمەوە، نەمدەزانی کە ئەو هەنجیرە دوا هەنجیری هاوڕێتییە کە لەگەڵ هاوڕێیەکی ڕۆژانی قوتابخانەدا دەیخۆم. ئێستاش دوای ئەو هەموو ساڵە کە ئەو پەیکەرە چکۆلانەیە دەگرم بە دەستمەوە، سیمای هەموو ئەو ئێوارە فێنک و سەیرانەی تەنهایم دێتەوەیاد... ئەو ئێوارانەی کە دواهەمین ئێوارەی ژیانی من بوو وەکو مرۆڤێکی ئاسایی، بەرلەوەی کە ئەو ساڵە دوور و درێژانەی سزا بمبات. ئەمڕۆ من جگە لەو پەیکەرە هیچی دیکەم بۆ نەماوەتەوە، تەنها شتێک لەو ڕابوردووە درێژە مابێتەوە ئەو پەیکەرە چکۆلانەیەیە کە هەمیشە پەنجەکانی فەرەیدون و پەروانە و زەردەخەنە پاکەکەی «شیرین»م دەهێنێتەوەیاد... من ئەو ماوە دوور و درێژەی کە دوور لە ماڵ ژیام، لەو باوەڕەدا نەبووم ئەو پەیکەرە لە ناو ئەو هەموو کارەسات و گۆڕانکارییەدا مابێتەوە، من دەمزانی کە هەموو کەلوپەل و شت و مەکەکانی من و پەروانە سووتێنراون و تورڕدراون، بەڵام دواجار کە گەیشتمەوە ئەو ماڵە چۆڵ و هۆڵە، کە گەیشتمەوە ئەو ماڵەی کە نە پرسەی دایکم و نە پرسەی باوکمی تیاکرا، کە گەیشتمەوە ئەو ماڵەی براکان دەرگاکانیان کلیلکردبوو و سەفەریانکردبوو، ڕاڕەوەکان چۆڵبوون، ژوورەکان چۆڵ، لە ناو ئەو هەموو چۆڵەوانییەدا تەنها ئینجانەیەکی چکۆلە بەجێمابوو، ئینجانەیەکی مردوو، کە ئینجانەکەم لابرد لە پشتییەوە ئەو پەیکەرە چکۆلەیەم دۆزییەوە... پەیکەرێکی تۆزاوی کە دیاربوو دەستێکی ماندوو و تورە فڕێیداوەتە ئەم کونجەوە... ئەمڕۆش جگە لەو پەیکەرە هیچی دیکەم نییە، هیچی دیکە... کە بە تەنها لە پیشانگایەکی چکۆلەدا لە ژوور سەری خۆمەوە هەڵمگرتووە و هەمیشەش جگە لە بۆنی ئەو جانتا عەتراوییەی شیرین، بۆنی جەنگەڵ و عەشق و مردن و تەنهایی بە ژیانی مندا پەخشدەکاتەوە.

# ٨

شار پڕبوو لە عەشقی نامورادە، شار بە عەشقی ناکام قاندرابوو. لە ناو ئەو شارە چکۆلانە و تاریکەدا نەسرەدینی بۆنخۆش بە کۆڵانەکاندا دەڕۆیشت و دەیگووت: «ئۆە خوایە، ئەم هەموو عەشقە ناکامە چییە؟ ئەم هەموو عەشقە بێئامانجە چییە؟». ئەو بەر لەوەی هەست بەم ناکامییە بکات، پیاوێکی فزوڵی زۆر ئاسایی بوو... پیاوێک، لەوانەی حەزدەکەن هەمووشتێ دەربارەی ژیانی کچە ناسراو و دیارەکانی شار بزانن، هەر ئەو فزوڵە کوشندەیەش کردی بە وێنەگرێکی گەڕۆک، چونکە تەنها وێنەگرێکی گەڕۆک دەتوانێت بچێتە ئەو جێگایانەی کە خەڵکانی دی بە ئاسانی ناتوانن بیگەنێ... ئەو بەهۆی ئەو کامێرا گەورەیەی ملیەوە، ژیانێکی سەیر دەژیا، دەچووە هەموو ئاهەنگەکان، دەچووە هەموو قوتابخانەکان، دەچووە هەموو یاریگاکان... لەناکاو بۆ ڕێپێوانە دەوڵەتییەکانیش بانگیاندەکرد، بۆ کۆبوونەوە نهێنییەکانیش دەیانناردن بەدوایدا، خۆشی وەکو جنۆکەیەکی شەرمن بەو زەردەخەنە ژنانە و نیگاکردنە نێرەموکئاسایەیەوە لە هەموو شوێنێکدا ئامادەبوو، لە کۆڕەکاندا، لە سەیرانگاکاندا، لە هاوینەهەوارەکاندا وێنەیدەگرت، جگە لەوەی هاوینان هەموو نیوەڕۆیەک لەسەر قەراغە کاشیکراوەکانی ئەو حەوزی مەلەیەی شاردا بە شۆرت و کامیراکەیەوە دەردەکەوت. ئەو فزوڵە نائاساییەی وای لێدەکرد بچێتە بنج و بناوانی سەربوردە

سەیر و تاریکەکانی ژیانی شار... گرێکوێرەی دەیەها عەشقی کردەوە. بە کچانی دەگووت: «ئەها، تۆ فلانی، دەزانی کێ شەیدات بووە؟... دەزانی کێ شەو لەتاوت ناخەوێ؟... ئەی... تۆ فیساری ئاگات لێنیە کێ بۆت دەسوتێت... ئاگات لێنیە کێ خەریکە بۆت دەمرێت؟ ئەی تۆ خەبەردارنیت کێ مەراقی لێداویت، کێ لەسەر ڕێگا بۆت دەوەستێت؟»، دەچووە ناو مەلەوان، یاریکەر و شاعیرە گەنجەکانی شار یەکەیەکە پێیدەگووتن: «کابرا گەمژە بە، من دڵنیام فلانە کچ شێتت بووە»... «ئەی تۆ بۆ خەوتویت، بۆ نیگاکانی ئەو خانمە ناخوێنیتەوە؟» «تورەمەبە، ژنی مێرداریش بێت حەزی لێتە... دەزانی حەزی لێتە یانی چی؟»... ساڵانێکی درێژ، ژیانی نەسرەدینی بۆنخۆش لە ناو ئەو بازنانەدا دەسوڕایەوە، تا ڕۆژێک هەستیکرد لەبری ئەو فزوڵە سەیرەی جاران بۆ دۆزینەوە و ئاشکراکردنی چیرۆکەکانی عەشق هەیبوو، ئێستا سۆزێکی گەورەی بۆ ڕزگارکردنی ئەو عەشقە ناکامانە لا دروستبووە.

تا ڕۆژێک ئەو لە شار دەژیا، شتەکان بەجۆرێکی ئاسایی و بێ هیچ نەفەسێکی ئەفسانەیی دەچوونەپێشێ، زۆرجار خۆی نامەی عاشقانی لەنێوان قوتابخانەکانی کچان و کوڕاندا دەگوازتەوە، زۆرجار ستۆدیۆ چکۆلانەکەی خۆی دەکرد بە جێگای ژوانی ئەو قوتابییە ناکامانەی شوێنێکیان نەبوو لەم مەملەکەتەدا یەکتری تیا ببینن. هەمیشە بۆ هەمووان پێدەکەنی و بە ئارامی دڵنەوایی هەموانی دەدایەوە.

«نەسرین» لە قەراغ ئەو حەوزی مەلەیەدا «گۆڤەندی مەلەوان»ی بەهۆی «فەرەیدونی مەلەکەوە» ناسی. «گۆڤەند» کوڕی ئاسنگەرێکی پیر بوو نیوەی ژیانی لە بازاڕی ئاسنگەراندا بردبووەسەر. سەرەتای ژیانی بە شێوەیەکی نەخۆشانە خولیای دابووە یاری ئاسن، دواتر وەرگەڕابووە سەر مەلەکردن، بەڵام دواجار ئێواران لە پەنجەرەکانی ئەو یانە وەرزشییە بچکۆلانەیەوە دەبینرا، لەگەڵ «مامۆستا ئیسماعیل»، پیرتین

شەترەنجبازی شار، نوقم لە بیرکردنەوەیەکی قووڵدا شەترەنجی دەکرد.
«گۆڤەند» کوڕێکی کەڵەگەت بوو کە هەر لە زگی دایکییەوە بە قژێکی ماش و برنجەوە هاتبووە دنیا، خۆی ئەو قژە درێژەی بە نیشانەیەکی پێغەمبەرایەتی دەزانی. دایکی سەردەمانێ بە فشاری دایکانەی خۆی، مانگانە لەسەر کورسییەک دایدەنا و بە جووتێ دەستکێشی نایلۆنەوە قژی بۆ ڕەشدەکردەوە. بەڵام لەو هاوینەوە کە چووە پەیمانگای هونەری لە پایتەخت هەموو شتەکان گۆڕدران. لەو ساڵەوە ئیدی بەو قژە ماشوبرنجییە درێژەوە، لەسەر شەقام، لە چایخانە و لە لێواری حەوزی مەلەکردنەکەدا دەردەکەوت، لە هەموو جێگایەکیش شەوقی شکۆیەکی سەیری پەخشدەکردەوە. ساڵانی خوێندن لە پایتەخت فێریانکرد وەکو هەموو هونەرمەندەکانی دیکە مەی زۆر بخواتەوە، بە دەنگی بەرز قسەبکات، بەبێترس باسی ئافرەت و هونەر بکات، لە بازاڕەکاندا بوتڵ بهاوێت، فێڵ لە ساقییەکان بکات و هەندێ شەویش لەسەر جادەکان بخەوێت. بەڵام لەپاڵ ئەوەشدا ئەو چوار ساڵ ژیانەی پەیمانگا، فێری زۆر لە نهێنییەکانی پەیکەرتاشینیان کرد.

دەبێت بڵێین کە «گۆڤەندی مەلەوان» و «فەرەیدونی مەلەک» یەکەمجار، لە ناو درەختەکانی یەکێ لە باغچەکانی قەراغ شاردا بەیەکدی گەیشتن. گۆڤەند دوای هاتنەوەی لە پایتەخت مەیلێکی سەیری تیا دروستبووبوو لە ناو دار و درەختەکاندا بە تەنها دابنیشێت و تا ڕادەی بێهۆشبوون بخواتەوە. ئەگەرچی ئەو وەکو شێت وەرزش و مەلە و شەترەنجی دەکرد، بەڵام دەبایە هەموو کۆتایی هەفتەیەک بەو شێوەیە خۆی مەستبکات. یەکەمجار فەرەیدون «گۆڤەند»ی لە حالەتێکی لەو جۆرەدا بینی... ئێوارەیەکی درەنگی هاوین بوو، فەرەیدون لەو باغەدا بۆ پەپولەکان دەگەڕا، بەڵام لەبری پەپولەکان گۆڤەندی بە سەرخۆشی لە نێوان دوو سنەوبەری بەرزدا دۆزییەوە. یەکەمجار وایدەزانی دەرویشێکی

کوژراوە، چونکە قژی بە جۆرێ هاتبووە سەر دەموچاوی ، ڕووخساری نەدەبینرا، بەڵام کاتێک فەرەیدون قژەی لەسەر چاوی لادا و ئەو سیما گەنج و سمێڵە ئەستوورە قەترانیانەی دیت خەیاڵی بۆ غەریبەیەک چوو کە بە مەستی لە جێگایەکی دوورەوە هاتبێت. «گۆڤەند» بە جۆرێکی سەیر لە ناو گەڵا و گزگڵی سنەوبەرەکاندا کەوتبوو، بەڵام فەرەیدون دڵنیابوو ئەگەر تا چەند سەعاتێکی دیکە بەو جۆرە بمێنێتەوە، هێزە تایبەتییەکانی دەوڵەت کە بۆ بۆسەنانەوەی ئێواران دەچنە ئەو جێگایە، دەگەنەسەری و دەیپێچنەوە و دوورنییە تووشی موسیبەتێکی گەورەی بکەن. «فەرەیدون» لە یەکەم دەقیقەوە بە جۆرێکی سەیر گیرۆدەی سیحری دیوانەئاسای گۆڤەند بوو، بە ماندووبوونێکی گەورە کێشیکردە سەر شەقامەکە و لە ماشینێکدا گەیاندییە ماڵی خۆیان، ماڵی فەرەیدونی مەلەک... ئەو شەوەش یەکەمین شەوی یەکترناسینی گۆڤەند و فەرەیدون بوو.

گۆڤەند ئەو کات سەرقاڵی دروستکردنی وەرشەیەک بوو لە ژێرزەمینی ماڵی باوکە ئاسنگەرەکەیدا، وەرشەیەک بۆ ئەو کارە هونەریانەی لە خەیاڵیدا بوون. بەڵام جگە لەوە مەراقێکی دیکەی سامناک لە ژیانیدا هەبوو. ڕاستە هەموو ئەوانەی، ئێواران لە پەنجەرەی یانەکەوە دەیانبینی بە قووڵی لەو ڕوقعە کۆنەی شەترەنج ڕادەمێنێت، بە پیاوێکی بەختیاریان دەزانی، بەڵام دەبێت بڵێین کە ماوەیەکی درێژبوو گۆڤەند تەنها لەبەر یاری ئاسن و شەترەنج ڕووی لەو یانەیە نەدەکرد، بەڵکو بە کورتی شەیدای ئەو کچە باریکەلەیە بووبوو کە ئێواران بە جینزێکی تەسک و قژێکی خاوەوە دەهات بۆ یانە و لەگەڵ دەستەیەک کچی دیکەدا بۆ هەڵبژاردەی باڵەی کچان یاریدەکرد. ناوی «دڵارام» بوو. ئەو کات بەئەستەم تەمەنی سەرو هەژدە کەوتبوو، کە یەکەمجاریش هەستی بەو عەشقەی گۆڤەند کرد خەریکبوو لە خۆشیدا بفڕێت، چونکە لەو ڕۆژەوەی فامیکردبووەوە،

دیمەنی پیاوێکی وا قژ درێژ و دەروێشئاسا، بەڵام وەرزشەوان خەیاڵ و خەونەکانی داگیرکردبوو. لەو ڕۆژانەدا بوو ئیدی دوای مەشق هێدی هێدی کچانی بالە پێکەوە دزەیان دەکردە هۆڵی شەترەنجەکە و بە دەستە بەرابەر «گوڤەند» دادەنیشتن... شتەکان بە گشتی مایەی پێکەنین بوون، بەڵام هەر ئەو ڕەفتار و نیگا و سەرنجە منداڵئاسایانە، بووە هۆی ئەوەی گوڤەند دوو هەفتە لەسەریەک هیچ دەستێ لە مامۆستا ئیسماعیل نەباتەوە، مامۆستا لەسەری پازدەهەمین ڕۆژدا شەترەنجەکەی کۆکردەوە و بە ئەسپایی گووتی: «گوڤەند بەڕاستی پێمبڵێ... حەزت لە کامیان کردوە، سنەوبەر یا پەروا؟». گوڤەند بەقووڵی دەستی بە قژیدا هێنا و هەناسەیەکی هەڵکێشا و گووتی: «موسیبەتەکە ئەوەیە حەزم لە دلارام کردوە». دوو هەفتە دوای ئەو ئێوارەیە «گوڤەند» و«دلارام» پێکەوە لە پاریگا چکۆلانەکەدا پیاسەیاندەکرد، بەڵام بەوەدا کە شورای پاریگاکە دەکەوتە سەر شەقامێکی زۆر قەرەباڵغ و گشتی هەر زوو دەبایە وازبهێنن و بیر لە جێگایەکی تر بکەنەوە یەکتری تیا ببینن، ئیدی لەو ڕۆژەشەوە موسیبەتەکان دەستیپێکرد، دلارام نە بەوە ڕازی بوو بێتە ماڵی گوڤەند و نە بەوەش ڕازی بوو لەگەڵیدا بچێتە باغەکانی قەراغ شار، هەر دوو جێگاکەشی بە ترسناک دەزانی. ئەو ئێوارەیەش کاتێک فەرەیدونی مەلەک، گوڤەندی لە ناو دارەکاندا هەڵگرتەوە، ئەو لەو گێژاوە ئەزەلییەی عاشقاندا دەژیا، گێژاوی بێشوێنی. گوڤەند کە خۆی لە جنسی پەیامبەرەکان حسابدەکرد، توانایەکی سەیری لەسەر قسەکردن هەبوو، توانایەک ئەو کاتە لە زێڕینترین ساتەکانی درەوشانەوەی خۆیدا دەژیا، لە هەموو جێگایەک بە دەنگی بەرز باسی بێمانایی ئەم شارەی دەکرد، دەیگووت: «ئەمە چ شارێکە، جێگایەک نەبێت بڕۆیت و لەگەڵ کچێکدا چایەکی تیا بخۆیتەوە، ئەمە چ ژیانێکە بستێک زەوی نەبێت بە دڵنیایی هەناسەیەکی تیا هەڵکێشیت». گوڤەند لە خەیاڵەکانیدا دوورتر

دەڕۆیشت و باسی دۆزینەوەی زەوییەکی دەکرد بۆ عاشقان، باسی لە خولّقاندنی ئیمپراتۆریەتێک دەکرد کە عاشقێک فەرمانڕەواییکات. بەرێگاکاندا دەڕۆیشت و شەقی لە شتەکانی بەردەمی خۆی هەڵدەدا و دەیگووت: «مرۆڤ بۆ ئەوە نەکراوە، گیرۆدەی شارێکی لەمجۆرە بێت کە تێکەڵەیەکی بێمانایە لە قەلا و حوجرە».

یەکەمجار کە «فەرەیدونی مەلەک» بە «نەسرەدینی بۆنخۆشی» ناساند، هەستیدەکرد جۆرە لێکچوونێکی نهێنی لەنێوان ئەم دوو پیاوەدا هەیە، ئەگەرچی بەشێوە زۆر لە یەکتری جودابوون. ئەو وەکو نێرێکی تووکن و چاوقایم دەینواند، ئەمیش پیاوێکی نیمچە کۆستە بوو بە نیگای خانمێکی شەرمنەوە، بەلام ئەو ناکۆکییە ڕووکەشە و ئەو دوو شێوە ژیانە جیاوازە نەبووە مایەی پێکەوە نەگونجانیان، بەڵکو بەپێچەوانەوە، هەر لەگەڵ یەکەم پێکە عارەقدا بوونە دوو هاوڕێی نزیک. ئەمڕۆ کاتێک بیر لەو پەیوەندییە سێ قوڵییە سەیرە دەکەینەوە، بەئاسانی ئەو جیاوازییە گەورانە دەبینین کە جیهانی ئەو سێ پیاوەی بەشێوەیەکی بێڕەحمانە دابەشدەکرد، بەلام لەوکاتەدا کە یەکتریان ناسیبوو، هەریەکەیان بەهانەی خۆی هەبوو هەوڵبدات پەیوەندییەکەیان قووڵتر و قووڵتریکاتەوە. فەرەیدونی مەلەک ئەو کات بەیانیان سەمموونی دەفرۆشت، لە دوای هەشت و نیوی بەیانیشەوە تا نیوەڕۆ وەکو وێڵگەڕێک لە چایخانە بچکۆلە و تاریکەکانی شاردا تاوڵەیدەکرد، نیوەڕوانی هاوین دەچووە مەلەکردن و نیوەڕوانی زستان لەبەر شیشی ئەو کتێبفرۆشییەدا دەوەستا کە شەوی هەڵهاتنی لەگەڵ پەروانەدا، خوشکە دەفبەدەستەکان و خەڵکانی ئیماندار سووتاندیان... ئێواران زۆربەی کات لە دەشتاییەکانی قەراغ شاردا، ئەو پەپولانەی ڕاودەکرد کە هەر وەرزە و ڕەنگێکیان هەبوو... هەڵبەت فەرەیدونی مەلەک هەمیشە بەم ئیقاعە نەژیابوو، ئەو ڕۆژگارێک چکۆلانەترین کۆلانگەڕ و چەقۆوەشێنی شاربوو، بەلام دوای ناسینی بۆ

گۆڤەند وازی لەوە هێنابوو، ئێواران لەبەردەم سینەما و چایخانەکاندا یان لە کۆلانە تۆزاوییەکاندا یان لەو یاریگا جەنجالانەی فوتبالدا وەکو سالوکێکی یاخی و بێسەرەوبەرە بسوڕێتەوە، بەلکو زۆربەی کات وەکو کرێکارێکی بەردەست لەو وەرشەیەدا یاریدەی گۆڤەندی دەدا کە هەر مانگە و کلێشەی پەیکەرێکی دەتاشی و قالبی بۆ دەڕشت، زۆرجاریش لەبێزاریدا چی بکردبایە دەیشکاند و دواتر دەبایە بە چەندین کرێکار پاشماوەی گەچ و بۆرەک و تەختەکان فرێبدرانایە. فەرەیدون لەو ماوەیەدا شتێک لە پەیکەرتاشی فێربووبوو... بەلام جگە لەو سەنعەتە «کە باوەڕی وابوو هەرگیز سوودی لێنابینێت» کارکردن لەگەل گۆڤەندا ئارامییەکی ڕۆحی قوولی پێدەبەخشی... ئەو کات گۆڤەند بە عەشقێکی بەجۆش و سووتێنەرەوە کاریدەکرد، بەلام لە هەمووشتەکان گرنگتر ئەوەبوو کە جیهانی وەرشەکە، فەرەیدونی فێری تێرامان و بێدەنگییەکی قوول کرد.
نەسرەدینی بۆنخۆش دەیگووت فەرەیدون کوڕی هێمنییەکان بوو، بەلام سالانی دوور و درێژی تێکەلاوی لەگەل گەنجە شەڕفرۆشەکانی شاردا، سالانی ژیان لە ناو هەراوهوریای سەمونفرۆشەکاندا، ڕۆحی هێمنی ئەو گەنجەی شێواندبوو. ئەو ماوەیەکی درێژ بەتەنها ژیابوو، لە دە سالییەوە وەکو منداڵێکی تەنها و بێکەس لە مالێکی چۆل و هۆلدا خۆی گەورە کردبوو. دوای مردنی دایک و بابی لەدەست مامەکانی هەلهاتبوو و گەڕابووەوە بۆ ئەو خانوەی دەکەوتە یەکێک لە کوچە کۆن و داخراوەکانی شار، ئەو کات هەرچەندە تەمەنی دە سالانەبوو، بەلام قیافەتی گەنجێکی پازدە سالی هەبوو. لەو مالە هێمن و گەورەیەدا شەوانی دوور و درێژی بێدەنگی و ئارامی مەیلێکی قوولیان بەرەو ڕەهەندە بێدەنگ و نهێنییەکانی ژیان تیاچاندبوو، بەلام دەبێت بلێم هەموو ڕۆژێک بەر لە هەلهاتنی خۆر دەبایە لە بەر سەمونخانەکاندا ئەو هێمنییە لەیادبکات و خۆی بهاوێتە ناو دەنگەدەنگ و هەیاهوی ئەو منداڵە سەمونفرۆشانەوە کە بەردەوام

نوخشەی دەستپێکردنی ڕۆژانی بەدتر و بەدتریان لێدەدا. ئەو شەوانەش کە پورەکانی دەهاتنە لای هیچیان لە بێدەنگی مەملەکەتەکانی شەو نەدەشکاند، کە بەجۆرێک هێمن و فریودەربوو، زۆرجار فەرەیدون بەرگەی ئەو بێدەنگییەی نەدەگرت، هەر ئەو بەرگەنەگرتنەش پاڵی پێوەدەنا هەندێ شەو لەگەڵ هاوڕێکانیدا تا دەمەوبەیان گۆرانی بڵێن و هەراوزەنای منداڵانە سازکەن، ڕەفتارێک هەندێجار پورەکانی دەڕەنجاند و هەندێجاریش دەیهێنانە پێکەنین.

نەسرەدین ئەمڕۆ کە باس لە فەرەیدون دەکات، باس لە گەنجێکی باریکی بە قیافەت دەکات کە پێش لە وادەی خۆی ڕیشی هاتووە و زۆر زوو سیمای منداڵانەی فڕێداوە و بۆتە گەنجێکی چاپوک، بەڵام لە وێنەکانیدا من وەکو گەنجێکی لاواز و چکۆلانە دەیبینم، پێدەچێت هەمیشەش ئەو ڕیشە تەنک و چکۆلانەیەی هەبووبێت. لە زۆربەی وێنەکاندا، لەگەڵ تیپی فوتباڵەکەیدا سێهەم کەس لەلای چەپەوە بە چیچکان دانیشتووە و هەمیشەش سێ پەنجەی خستۆتە سەر زەوییەکە و جوڵەیەکی کردوە، وەکو ئەوەی بیەوێت لە شوێنی خۆی هەستێت... بەڵام دواجار هەرچییەک بێت ئەو لەو گەنجە سەیرانە بوو کە لە پەراوێزی گەڕەکەکانی قەراغشاردا گەورەدەبن. لە دە ساڵییەوە بێ سەرپەرشتێکی ڕاستەقینە ژیابوو، وەکو هەموو گەنجانی ئەو سەردەمە، زوو فێری چەقۆوەشاندن بووبوو، لە ماوەیەکی کەمیشدا بووبووە یەکێ لە ترسناکترین چەقۆوەشێنەکانی باکوری شار کە دەبایە چەقۆکێشە بەئەزموونەکان حیسابی بۆ بکەن. لە باغەکانی قەراغ شار و لەو دەشتاییە بەرینانەی دەوروبەریدا فێری شەراب خواردنەوەیەکی سەخت بووبوو. ئێواران بە مەستی و بە تۆمارێکی چکۆلانەوە کە هەمیشە «نەمردم من ئەگەر ئەمجارە بێ تۆ»ی شارۆخی لێدەدا، خۆی و هاوڕێکانی دەگەڕانەوە و لە کۆڵانەکاندا دەیانکردە دەنگە دەنگ و هەراوهوریایەکی گەورە. مەملەکەتی

عەشـقەكانی پێشووشـی ئـەو كچـە شـەرمن و خنكاوانـە بـوو كـە ئێـواران دەهاتنـە بـەردەرگا، ئـەو كچانـەی زۆربەیـان تـازە لـەو گونـدە ڕاگوێزراوانـەوە دابەزیبوونـە شـار و هێشـتا بۆنـی سروشـتیان لێدەهـات. «فەرەیـدون» هەمیشـە بـە تـۆزی دەشـتەكانەوە، بـە تـۆزی باكانـەوە، بـەو جلـە كوردییـە ڕەشـانە و بـەو چەقـۆ چكۆلانانـەی گیرفانییـەوە، لەگـەڵ هاوڕێكانیـدا كـە ئەوانیـش دەسـتەیەك بـوون لـە مندالانـی وێڵگـەڕ و سـەرەڕۆ، لەتـەك ئـەو دەسـتە و تاقمـە چەواشـانەی دیكـەی سـەر سوچەكاندا، لەگـەڵ ئـەو دەسـتە گەنجـە گەڕۆكانـەی دیكـەی كۆڵانەكانـدا دەكەوتنـە شـەڕ. سـەردەمانێ ئـەو بەناوبانگتریـن چەقۆكێشـی ئـەو كۆڵانـە تاریـك و چكۆلانانـە بـوو، بـەردەوام جێگایـەك لـە جەسـتەی لەزگـەی برینێكـی پێوەبـوو. تـا دواجـار ڕۆژێـك كار گەیشـتە ئـەوەی لەسـەر ئەنجامـی یاریەكـدا كـە بەسـەختی دۆڕاندبوویـان هەشـت چەقـۆ بوەشـێنێ، لـە كێـش؟ لـە برادەرێكـی ئازیـزی خـۆی... ئـەوە ڕۆژێكـی سـامناك بـوو لـە ژیانـی فەرەیدونـدا، كـە لـە خەسـتەخانە و بـە دیـار چاوەدێـری پزیشـكەكانەوە، پەرێشـان و نیـوە مـردوو، خۆیـدا بەسـەر جەسـتەی زامـداری هاوڕێكەیـدا و ماچیكـرد، هەمـوو ئەوانـەی كـە لـەو سـاتەدا لـەوێ بـوون پەشـیمانییەكی گـەورە و دوو دڵـۆپ فرمێسـكیان لـە چاویـدا بینـی كـە سـەرەتای دووركەوتنـەوەی «فەرەیـدون» بـوو لـە دونیـای ئـەو چەقۆكێشـە كوشـندانەی ژیانـی شـاریان كردبـووە دۆزەخ. ئـەو ڕۆژە كـە لـە خەسـتەخانە هاتـەدەرێ دەنگێـك لـە نـاوەوە پێیدەگـووت: «ئـەم شـارە بەجێبهێڵـە، بەرلـەوەی ببیتـە جانەوەرێكی ڕاسـتەقینە... ئـەم شـارە بەجێبهێڵـە». لـەو ڕۆژەوە خولیـای سـەفەركردن بـەرەو عەردێكـی دیكـە و دونیایەكـی دیكـە پەرییـە ڕۆحییـەوە. لـەو ئێوارەیـەوە كـە چەقۆكـەی فڕێدا، خولیـای سـەفەرێكی دوور و درێـژ كەوتـە سـەری، بـە كۆڵانەكانـدا دەڕۆیشـت و لەبـەر خۆیـەوە دەیگـووت: «دەڕۆم بـۆ زەوییەكـی دوور، بـۆ عەردێـك كـەس نەمناسـێت، كـەس نـاوی منـی نەبیسـتبێت، باشـتر وایـە مرۆڤـی لێنەبێـت،

باشتر وایە بەتەنها بمێنمەوە... چ شتێک لە تەنهامانەوە جوانتر نییە لە خاکێکدا کە خۆت هەڵیبژێریت». دەستی دەخستە گیرفانە خاڵییەکانی و پیاسەی دوور و درێژی دەکرد، بە هەموو کۆڵانەکانی شاردا لەمسەرەوە بۆ ئەوسەر دەگەڕا، هەمیشەش بیری لای شارێکی دیکە و عەردێکی دیکە بوو.

لەو گەشتە دوور و درێژانەدا دەیەها کیژی خۆشویست، هەموو عەشقەکانیشی خێرا، کورت، بێهیوا و بێئامانج کۆتاییاندەهات و لەودیو دەرگای داخراوی ژیانی کچانەوە دەکوژانەوە، تەمەنی درێژترین ئەوینیشی بە ئەندازەی ڕێگای قوتابخانەی ئەو کیژانە بوو کە بە جلە شینەکانی قوتابخانە و بە چاوی پڕ لە ترسەوە سەیری هاتن و ئاوابوونی ئەویان دەکرد لە نێو ژیانیاندا. گەورەترین موسیبەتیش ئەوەبوو کە فەرەیدون، لەو کچانەدا بۆ کچێکی دیکە و لەو ئەوینانەدا بۆ ئەوینێکی دیکە دەگەڕا.

ئەمڕۆ نەسرەدینی بۆنخۆش کە ئەلبومی وێنە نازدارەکانی خۆی دەردەهێنێت، دەیەها وێنەی فەرەیدونی تیایە، لەسەر حەوزی مەلەکە، لە یاریگاکاندا، لە کاتی یاریکردندا، لەو سەرشەقامە جەنجاڵانەی شار، لە کۆڵانەکاندا بە خۆی و جلە کوردییە ڕەشەکانییەوە. هەمیشەش سەردەلەقێنی و دەڵێت: «هەمووی ڕێکەوت بوو هەمووی ڕێکەوت... ئەگەر ڕێکەوت نەبووایە نەمدەناسی، ئەگەر نەشمناسیبایە گۆڤەندم نەدەبینی، گۆڤەندیشم نەدیبایە ئەم چیرۆکە بە جۆرێکی دیکە دەبوو». لە پشت هەموو ئەو پەشیمانییەشەوە هەستێکی تاڵ هەبوو بەو قەدەرەی هەموومانی وەکو زنجیرەیەکی بەد و نەفرەتلێکراو پێکەوە بەستۆتەوە. «نەسرەدین» ئەمڕۆ دەڵێت: «ئەو شتانەش کە بێمانا دێنە پێشچاو، زۆرجار دەرەنجامی کوشندەیان هەیە». کێ لەو باوەڕەدابوو ئەو ئێوارەیەی کە بەڕێکەوت نەسرەدین بە زەردەخەنەیەکی شەرمنەوە ئەو وێنەیەی دایە

فەرەیدون و گووتی: «بێ ئەوەی نە تۆ بتەوێت و نە من بمەوێت تۆ لەم وێنەیەدا دەرچوویت...»، ئەو هەموو ڕووداوە سەیرانەی بەدوادابێت کە دەبایە من ساڵەهای ساڵ خەریکبم، تا پێکەوە گرێیانبدەمەوە. خودایە... هەموو شتەکان لەبەردەم ئەو کتێبفرۆشییەدا دەستیپێکرد، ئەو کتێبفرۆشییەی ئێستا دەزانم، بۆدەبایە لەو شەوەدا بسووتێنرابایە... لەو دەمەدا شاعیر و هونەرمەندە گەنجەکانی شار لەبەردەم ئەو کتێبفرۆشییەدا دەوەستان و ڕۆژنامەکانیان پاندەکردەوە، بە دەنگی بەرز پێدەکەنین و گاڵتەیان بە دونیا دەکرد، گاڵتەیان بە نوسەر و هونەرمەندە هاوڕێکانیان دەکرد. لە هەندێ ئێوارەشدا، نەسرەدین لە ناوەڕاستیاندا قووتدەبووەوە و لەگەڵیاندا دەکەوتە باسکردنی دوا شیعر، دوا کورتە چیرۆک، دوا نمایشی شانۆ. لەو ئێوارانەدا فەرەیدون وەکو گەنجێکی باریکەڵە و ڕیشن بە چاوێکی مەست و غەمگینەوە بێئەوەی شتێکی دیاریکراو بکات لەسەر شیشەکان دادەنیشت و سەیری ڕێبوارانی دەکرد، پێنەدەچوو لەوێکانەدا مەبەستێکی تایبەت هەبێت، بەڵکو تەنها دادەنیشت و هیچی تر. ئەو جلە کۆن و تۆزاوییانە و ئەو نیگا کەمێک پەشۆکاوەی دوو هۆی گرنگ بوون گەنجانی ئاپۆرەبەستووی بەر کتێبفرۆشییەکە نرخێکی ئەوتۆی بۆ دانەنێن. بەڵام هەتا نەسرەدینی بۆنخۆشیش کە دوو چاوی ئێجگار فزولیانەی هەبوو، زۆر درەنگ ئەوی بینی. نەسرەدین ئێواران زۆرجار لەبەر ئەو کتێبفرۆشییەدا وێنەی گەنجەکانی دەگرت و بە پێکەنینەوە دەیگووت: «ڕۆژێک لە ڕۆژان ئەم وێنانە نرخێکی گەورەیان دەبێت». لە یەکێ لە ئێوارەکاندا سێ مۆسیقاری تازەپێگەیشتوو کە هەرسێکیان بە شێوەی سەمفۆنیستە بەناوبانگەکان قژیان هێنابووە سەر چاویان، تکایان لە نەسرەدین کرد وێنەیکیان بگرێت، بە ڕێکەوت لەو وێنەیەدا فەرەیدون، وەکو تارمایییەکی پەشپۆش بە سیمایەکی کەمێک غەمگینەوە دەرچووبوو. وێنەکە بۆ سێ مۆسیقارەکە ئێجگار قەشەنگ دەبوو

گەریهاتبایە و فەرەیدون ئەو ڕووبەرە سەیرەی نەگرتبایە. مۆسیقارەکان دەیانگووت: «وێنەیەکی جوانە، بەس ئەگەر ئەو بەرازە ڕەشە ئالەوێدا نەبووایە...خوایە چی ئەمەی وەک سەگ لێرەدا هەڵترووشکاندووە؟».
بەڵام نەسرەدین لەو دەقیقەیەوە کە ئەو وێنەیەی لە ناو وێنەکاندا جیاکردەوە و بەوردی تەماشایکرد لە دیمەنی ئەو گەنجە حەپەسا کە لەناکاو بەشێوەیەکی زۆر غەمگین سەیری کامیراکەی کردبوو.... ساڵانی دوور و درێژی مامەڵەکردن لەگەڵ وێنەدا، نەسرەدینیان کردبووە پیاوێکی شارەزا لە خوێندنەوەی مرۆڤدا لە ڕێگای وێنەوە، ئەو هەندێ جار بەو بزە کچانەیەی خۆیەوە دەیگووت: «وام لێهاتووە گەر وێنەی یەکێک نەبینم، ناتوانم تێیبگەم. تەنیا لەبەر کامێرادا درۆ و ڕاستیم لە مرۆڤدا بۆ جیادەکرێتەوە». هەر ئەو شارەزاییە قووڵەش وای لێکرد، مەیلێکی سەیری بۆ ناسینی فەرەیدون لا دروستببێت.

ئەو ڕۆژە کە فەرەیدون وێنەکەی لە نەسرەدین وەرگرت دوای سوپاسێکی سارد وەکو لە قەدەرێکی ڕەش هەڵبێت بە خێرایی بەردەم کتێبفرۆشییەکەی جێهێشت و ئیدی چەندین ڕۆژ دەرنەکەوتەوە، دواجار لە نیوەڕۆیەکی گەرمدا «نەسرەدین» لەحەوزی مەلەکەدا بینییەوە، بە هێمنی لە تەنکاوەکەدا پاڵیدابوو بە لێواری حەوزەکەوە و سەیری شەپۆلانی ئاوەکەی دەکرد کە مەلەوانەکانی دیکە بە شڵپ و هوڕ تێیکەوتبوون. چەندڕۆژێک دوای ئەو نیوەڕۆیە، نەسرەدین بۆ یەکەمجار فەرەیدونی لە ناوەوەی کتێبفرۆشییەکەدا بینی، بە هێمنی لەبەردەم ڕەفی کتێبەکاندا وەستابوو و چاوی بەناو کتێبەکاندا دەگێڕا. هەندێجار کتێبێکی دەردەهێنا و سەیری پێرست و پێشەکییەکەی دەکرد، ئەو ڕۆژە نەسرەدین بە ئارامی لێی نزیکبووەوە و لێی پرسی: «بۆ چ کتێبێک دەگەڕێیت؟» فەرەیدون گووتی: «بۆ کتێبێک کە پێناچێت لێرە هەبێت...». ڕۆژانی دواتر فەرەیدون یەکە یەکە سەیری دیوانەکانی دەکرد و دەیگووت: «بۆ شیعرێک

دەگەڕێم لەم دیوانانەدا نییە...». کتێبەکانی چیرۆکی هەڵدەدایەوە و دەیگووت: «بۆ چیرۆکێک دەگەڕێم بەداخەوە لەم کتێبانەدا نییە...» لەو ڕۆژانە بەدواوە فەرەیدون کاتێکی زۆری لەو کتێبفرۆشییەدا دەبردەسەر، هەمیشەش بە جۆرێکی نائاسایی لە ناو ئەو کتێبانەدا بۆ کتێبێک دەگەڕا کە هەرگیز نەیدۆزییەوە، هەر ئەو گەڕانە سەیر و درێژانەش فەرەیدونیان کردە هاوڕێی ئەو خاوەن کتێبفرۆشییە کە لەبری ئەوەی وەکو شاعیر و هونەرمەندە مێوانەکانی دیکە گاڵتەی پێبکات، بە ئارامی گوێی لێدەگرت و لە دڵەوە دەیویست یارمەتیبدات، بەڵام ئەویش هەرگیز تێنەگەیشت فەرەیدون بەدوای چ کتێبێک و چ شیعرێک و چ چیرۆکێکدا وێڵە.

تێکەڵاوبوونی «فەرەیدون» لەگەڵ گۆڤەندا زۆر لە عادەتەکانی ژیانی گۆڕی، ئیدی کەمتر لەو شوێنانەدا دەردەکەوت کە جاران تیا دەبینرا، زۆربەی کاتەکانی خۆی لەگەڵ گۆڤەندا دەبردەسەر، بەدەم ئیشکردنەوە گوێی لەو چیرۆک و بەسەرهاتە دوور و درێژانە دەگرت کە گۆڤەند لەسەر ژیانی خۆی لە کوچەی ئاسنگەران و لە ناو هونەرمەندەکانی پایتەختدا دەیگێڕانەوە. هەندێ جار باسی لە ئازارەکانی خۆی دەکرد لەگەڵ دڵارامدا، هەندێ جاریش قژی لەسەر چاوی لادەدا و دەنگی بەرزدەکردەوە و دەیگووت: «فەرەیدون باسی ژیانی خۆتم بۆ بکە». فەرەیدون دەیگووت: «هیچی تیانییە شایەنی باسبێت... هەندێ شەڕەچەقۆ و هەندێ یاری و هەندێ پەپولە کۆکردنەوەیە و هیچی تر»، بەڵام کە گۆڤەند زۆری بۆ دەهێنا، فەرەیدون بە درێژایی لەسەر خەونی خۆی بۆ سەفەر دەدوا و دەیگووت: «دەمەوێت بڕۆم بۆ وڵاتێکی تر، هەر وڵاتێک بێت گرنگ نییە... گرنگ ئەوەیە مرۆڤ لێرە نەژی». فەرەیدون لە ئێوارەکانی کتێبفرۆشیەکەشدا هەندێ جار بێئەوەی کەس لەوبارەیەوە هیچی گووتبێت لەناکاو دەیگووت: «دەمەوێت سەفەربکەم...»، شاعیر و نیگارکێش و ڕۆژنامەنوسەکان بە بێدەنگی سەیری یەکتریان دەکرد و کەس

هیچی نەدەگووت. تەنها کەسێک ئەو خەونەی زۆر بەلاوە گرنگ بوو برای خاوەن کتێبفرۆشییەکە بوو کە گەنجێک بوو لە تەمەنی فەرەیدوندا، بەلام کەمێک لە فەرەیدون منداڵتر دیاربوو. ڕۆژێک ئەو گەنجەی کە بە «ڕەزای دڵخۆش» بانگیاندەکرد، لە پێچێکی کتێبفرۆشییەکەدا فەرەیدونی گرت و بە ئەسپایی گووتی: «منیش دەمەوێت سەفەربکەم، لە مێژە دەمەوێت سەفەربکەم، بەلام نازانم چۆن؟... تۆ دەتوانیت یارمەتیمبدەیت؟»، فەرەیدون گووتی: «ئەگەر من سەفەرمکرد هەموو شتێکت پێدەڵێم، دڵنیابە لە هەمووشتەکان ئاگادارتدەکەمەوە، ئەگەر ڕۆیشتیشم بۆ ولاتێکی دیکە نامەت بۆ دەنوسم». فەرەیدون دواتر دەبێتە دۆستێکی نزیکی ڕەزای دڵخۆش، پێکەوە لە چایخانە تاریکەکاندا دەردەکەون، پێکەوە لەسەر شیشەکان دادەنیشن، هەمیشەش جگە لە قسەکردن لەسەر سەفەر، جگە لە گەڕان بەدوای شاری خەیاڵی و ولاتی نوێدا باسی هیچی دیکە ناکەن... ڕۆژگارێک بە ئەندازەیەک خەیاڵی سەفەر لە خەیاڵی ڕەزای دڵخۆشدا گەورە دەبێت کە ئیدی وەکو مۆتەکەیەکی ترسناکی لێدێت، ئیدی دەبێت باوک و براکانی لە ڕێگای پزیشک، دەرمانی کێویی و هەتوانی تایبەتییەوە بیکەنەوە بە مرۆڤێکی ئاسایی.

لەو ڕۆژەوەی کە فەرەیدونی مەلەک بەڕێکەوت لە حەوزی مەلەکەدا گۆڤەندی مەلەوانی بە نەسرەدینی بۆنخۆش ناساند، نەسرەدین دەرکی بەو ژیانە فرە چەمک و سەیرەی فەرەیدون کردبوو، بەلام لەڕاستیدا بۆنخۆش نەیدەزانی چۆن سەیری فەرەیدون بکات، ئەو لە یاریگاکاندا ناوی فەرەیدونی وەکو یاریزانێکی لێهاتوو بیستبوو، لە تیپی فوتباڵەکەشدا حورمەتێکی زۆری هەبوو، لە حەوزی مەلەکەشدا حیسابی مەلەوانێکی شارەزای بۆدەکرا، لەپاڵ ئەوانەشدا لە ئێوارانی ناو کتێبفرۆشییەکەدا بەشێوەیەکی سەیر سەرقاڵی کتێبەکان بوو، بەلام لەڕاستیدا فەرەیدون

هیچیان نەبوو، نە یاریکەرێکی تەواو بوو، نە مەلەوانێکی تەواو، نە خوێندەوارێکی تەواو... بەڵکو لە هەموو ئەو چالاکییانەدا بۆ شتێک دەگەڕا کە خۆی نەیدەزانی چییە. ئەو وێسکە وێسکە بەناو شتەکاندا تێدەپەڕی و نەیدەزانی چی لەو دونیایانە دەوێت.

هەفتەیەک دوای ئەوەی گوڤەند و نەسرەدین یەکتریان ناسی، نەسرەدین داوەتێکی دەشتەکی فەرەیدون و پەیکەرتاشەکەی هاوڕێی کرد بۆ ناو باغێکی قەراغ شار. ناسینی گوڤەند بۆ ئەو شتێکی سەیربوو، چونکە نەسرەدین کە هەموو شاعیران و هونەرمەندان و ئەکتەران و مۆسیقارەکانی شاری دەناسی، لەو باوەڕەدانەبوو لە دەرەوەی ئەو بازنەیەی ئەو دەیناسێت هونەرمەندێکی دیکە هەبێت نەیناسێت. جگە لەوەش دیمەنی گوڤەند بەو قژە درێژ و سمێڵە سەیرانەوە بێجگە لە فزوڵ، هەموو غەریزە دڕندەکانی وێنەگرتنی لە نەسرەدیندا زیندووکردبووەوە. ئەو نیوەڕۆیە نەسرەدین قاچی خستبووە ناو حەوزی مەلەکە و دەیگووت: «عەجەب پەیکەرتاشێ هەبێت من نەیناسم». فەرەیدون لە ئاوەکەدا بەئارامی مەلەیدەکرد و تەماشای دەستەکانی گوڤەندی دەکرد کە دەیگووت: «حەزم لە مەعشەری هونەرمەندان نییە». ئەو زیاتر حەزی لە مەجلیسی شەرابخۆرەکان و یاریزانە پیرەکان بوو. هەر لە یەکەم ئێوارە و لە یەکەمین پێکی شەرابەوە کە بەخۆشی یەکدی فڕیانکرد، ئولفەتێکی سەیر لە نێوان نەسرەدین و گوڤەنددا دروستبوو، بە جۆرێ فەرەیدون لە نابەینیاندا هەستی بە نامۆییەکی قووڵ دەکرد. ئەمڕۆ نەسرەدین دەڵێت هەمووشتەکان لەو ئێوارەیەوە دەستیان پێکرد کە من ئەو داوەتە دەشتەکییەم سازکرد، فەرەیدون وەکو بووبێت بە تەڵەیەکی کوشندەوە چواردەوری خۆی دەگەڕا و سەیری پەپولەکانی دەکرد، گوڤەند بە کراسێکی درێژی قاوەییەوە نێو درەختەکان بۆ چیلکە دەگەڕا، نەسرەدینیش سفرەکەی دەڕازاندەوە و جارجار وێنەیدەگرت.

ئەو لە ژیانیدا لە هیچ جێگایەک هێندە وێنەی نەگرتبوو، ئێستاش دەیەها وێنەی جیاوازجیاوازی ئەو ئێوارەیە لە ئەلبومەکانیایەتی، لە هەموو وێنەکانیشدا گۆڤەند بەو شێوە مەسیح ئاسایەی خۆیەوە تەماشای کامیراکەی کردوە و پێدەکەنێ، بەڵام فەرەیدون بەگشتی پەشۆکاو و نامۆ دێتەبەرچاو... لەو ئێوارەیەدا کە ئاسمان ئێجگار شین بوو، گۆڤەند بەدەم شەرابخواردنەوەوە ئازارەکانی خۆی وەکو عاشقێک بۆ نەسرەدین باسکرد، نەسرەدین پێدەکەنی و دەیگووت: «قسە بکە... قسە بکە من بەحری نهێنی عاشقانم...». ئەویش سەرلەنوێ ئەو وتارە درێژانەی سەبارەت بە بێشوێنی و ناکامی و بێمانایی ژیانی عاشقان لەم شارەدا بۆ دەگووتەوە. هەندێ جار فەرەیدون سەیری لەوە دەهات چۆن گۆڤەند دەتوانێت بەردەوام ئەو قسانە دووبارەبکاتەوە و بێزارنەبێت، بەڵام ئەو نیوەڕۆیە هەموو قسەکانی بۆ نەسرەدین نوێ و سیحراوی بوون... نەسرەدین هەر ئەو ئێوارەیە بە نیگا ژنانە و زەردەخەنە شەرمنەکەیەوە لە ناو درەختەکاندا چەندین جار پێکەکەی بەرزدەکردەوە و هەموو جارێکیش دەیگووت: «ئاسانە... ئاسانە، لەمڕۆ بەدواوە دەتوانیت لە ستۆدیۆکەی منندا دلارامی ئازیز ببینیت». لە دوای ئەو بەڵێنەوە، ڕۆژ لەپشتی ڕۆژ پەیوەندی گۆڤەند بە بۆنخۆشەوە بەهێزتر دەبوو، ئەو هەندێ جار لەگەڵ دلارامدا لە ستۆدیۆکەدا یەکتریان دەبینی، کاتێکیش ژوان دوایدەهات، بە سەعات لەگەڵ نەسرەدیندا پێکەوە قسەیاندەکرد، باسی سیاسەت و عەشق، هونەر و وەرزش، فۆتۆگراف و پەیکەرتاشییان دەکرد. نەسرەدین ئەمڕۆ دەڵێت: «قسەکانمان هەموو بۆنی ئەو سوڕانەوە گەورەیەی لێدەهات بەدەوری هیچدا. هەمیشە قسەماندەکرد، بەڵام نەماندەویست بگەینە شتێکی دیاریکراو، زۆرجار چەندەها سەعات قسەماندەکرد و دواتر هەڵدەستاین، و نەماندەزانی لەسەر چی دواوین. زۆربەی کات فەرەیدون بەرامبەرمان بێدەنگ دادەنیشت و قسەی نەدەکرد یان گەر قسەشی

بکردبایە باسی شار و وڵاتە فەنتازیاکانی ناو خەیاڵی خۆی دەکرد. ساڵانێکی درێژ ئەو ستۆدیۆیە بوو بە شوێنی ژوان و خواردنەوە و یەکدی بینینی ئەو سێ پیاوەی کە هەمیشە دوای گەشتی ڕۆژانەیان دەگەڕانەوە بۆ ئەوێ.

ئەو دەمانە فەرەیدون هەموو ڕۆژێک چەند پەپولەیەکی ڕاودەکرد، پەپولەی ڕەنگاوڕەنگ، پەپولە سپییەکانی زستان، پەپولە سەوزەکانی بەهار، ئەو پەپولانەی وەکی پشکۆ هاوینان لە گڕەی نیوەڕۆدا لە نابەینی پووش و پەڵاشی پاوانەکاندا دەسووتان، پەپولەزەردەکانی پایز کە لەگەڵ گەڵا وەریوەکاندا دەوەرین و دەمردن... فەرەیدون هەرگیز بە کەسی نەدەگووت لەکوێ و چۆن ئەو پەپولانە دەگرێت، بەڵام لە منداڵییەوە ئەو خولیا شێتانەیە لە ڕۆحیدا دەژیا، خولیای وێڵبوون لە دەشتەکاندا، خولیای دوورکەوتنەوە لە ئاوەدانی، نزیکبوونەوە لە قەدپاڵی چیاکان، گەیشتن بە پاوان و دەغڵی گوندە نزیکەکانی دەوروبەری شار، دواتر کە هەندێ لە پەپولەکانمان لە ئەلبومە تایبەتییەکاندا دییەوە، لە ژێر هەر پەپولەیەکدا ڕۆژ و سەعات و شوێنی ڕاوکردنەکەمان خوێندەوە... بۆ من بینینی ئەو پەپولانە ئەزمونێکی ئاسان نەبوو، من و نەسرەدین پێکەوە ئەلبومەکانمان لەو پورە غەمگینانەی فەرەیدون خواست کە ساڵەهای ساڵ بوو هەموو یادگارییەکانی فەرەیدونیان وەکو خۆی پاراست بوو، سەیر ئەو ڕستەیە بوو کە فەرەیدون بە دەستی خۆی لەسەر بەرگی هەموو ئەلبومەکان نوسیبووی... ڕستەیەکی تۆخ و گەورە کە هێدی هێدی بەرەو کاڵبوونەوە ڕۆیشت بوو. فەرەیدون نوسیبووی: «تکایە... ئەگەر منت خۆشدەوێت، تەماشای ئەم ئەلبومانە مەکە». من و بۆنخۆش کە هەردووکمان فزولێکی شەیتانی لە ناوماندا پەپکەیدەخوارد دەبایە تەماشای ئەلبومەکان بکەین، بەڵام لەگەڵ هەڵدانەوەی دوو سێ لاپەڕەی یەکەمدا بینیمان پەپولەکان دەبنە تۆز، هێندەی جارێکی دیکە

لاپەڕەکانمان هەڵدایەوە پەپولەکان بوونە گەردێکی ورد و بە هەوای ژوورەکەدا بڵاوبوونەوە، پەپولەکان بە ڕوانین، بەتین و تاوی نیگاکردن دەبوونە غوبار. ئێمە دەبایە هەر دوای کردنەوەی چەند لاپەڕەی یەکەم بە خێرایی ئەلبومەکە دابخەین و بیدەینەوە دەست پورەکانی کە دەیانگووت: «عەزیزم، پێمانگووتن ئەو ئەلبومانە بۆ تەماشاکردن نین».

ئەمڕۆ ڕەزای دڵخۆش کە چەند ساڵێکە لە دەردی سەفەرکردن ڕزگاری بووە و لە جێگای کتێبفرۆشییە سووتاوەکەدا، شەربەتفرۆشییەکی گەورەی کردۆتەوە و خۆی بە پادشاهی شەربەتی هەموو شار دەزانێ، دەڵێت کە فەرەیدون پەپولەکانی تەنها لەو ئەلبومانەدا هەڵنەگرتووە کە ئێستا لەلای پورە ناشادەکانی پارێزراوە، بەڵکو فەرەیدون ئێواران کە لە دەشتەکان گەڕاوەتەوە زۆرجار هەندێ پەپولەی لە ناو ئەو کتێبانەدا داناوە کە لەسەر ڕەفە بڵندەکانی کتێبفرۆشییەکە بوون. ئێوارەیەک ڕەزای دڵخۆش بە دەنگێکی غەمگین کە تێکەڵ بە بۆنی مێوژ، پرتەقاڵ و کاڵەکە سەوزە چکۆلانەکان بووبوو، بۆیگێڕامەوە کە فەرەیدون ئێواران دەهاتەوە و لەسەر شیشەکان ئەو پەپولانەی نیشاندەدا و دەیگووت: «دەبێت لەنێو دیوانێکی شیعرا هەڵیانگرین». من کاتێک ئەو ڕستەیەم گوێ لێدەبوو هەموو یادگارەکانم دەورووژا، سات بە سات هەموو ئەو بەیانییەم دەهاتەوە یاد کە پەپولە مەست و سووتاوەکانم تیابینی، وەک شێت پەلاماری یەخەی ڕەزام دەدا، وەکو باوەڕنەکەم دەمگووت: «بەڕاست، کە فەرەیدون پەپولەکانی دەخستە نێو ئەو کتێبانەوە... بەڕاست؟».

ئەویش بێئەوەی تێبگات ڕادەما و دەیگووت: «بێگومان... بێگومان، چۆنت بۆ دەگێڕمەوە وابوو، درۆت لەگەڵ ناکەم». من هاوارمدەکرد و دەمگووت: «کەواتە خودایە ئەو پەپولانەی من لە سپیدەی سووتانی کتێبفرۆشییەکەدا بینیم تەنها فەنتازیا و خەیاڵی خۆم نەبوون، ئەو پەپولانە پەپولەی ڕاستەقینە و هەڵوەریوی ئەو ڕۆژگارانە بوون کە

فەرەیدون لە دەشتەکانەوە دەهاتەوە بۆ شار و لەگەڵ تۆدا بە هێمنی یەکەیەکە دەیخستنە نێوان کتێبەکان». ڕەزای دڵخۆش بە حەپەساوی سەیریدەکردم و دەیگووتەوە: «بێگومان... بێگومان، هەروابووە». من هەڵدەستام و بە دڵخۆشییەوە دەمگووت: «من لەو بەیانییەدا پەپولەکانی فەرەیدونم بینی کە تێکەڵ بە باران و ئاگر و تەم بووبوون... بینیم، خوای گەورە، من پەپولەکانی فەرەیدونی مەلەکم بینی».

نەسرەدین تا ئەمڕۆش لە حکایەتی ئەو پەیوەندییە سەیرەی نێوان فەرەیدون و پەپولەکان تێناگات. گەلێک ئێوارێ لەگەڵ گۆڤەنددا بە فەرەیدونیان گووتبوو: «لەم پەپولانە گەڕێ و بەدوای کچێکی ڕاستەقینەدا بگەڕێ، کچێک لەم دڵدارییە بێسوودانەی سەر کۆڵان و ناو کوچە قوڕاوییەکان ئازادتبکات». فەرەیدون هەمیشە بە غەمگینی وەڵامیدەدایەوە: « تا ئێستا ئەو پەپولەیەم نەدۆزیوەتەوە کە بۆی دەگەڕێم». هەندێ جار گۆڤەند بە دەنگێکی بەرز و ناڕازیی کە ستۆدیۆکەی دەلەراندەوە، گووتبووی: «تۆ چ دەردێکتە، ئەم عیلەتە چۆن عیلەتێکە تووشتهاتووە، چ نەخۆشییەکی سەیر و نائاساییە بەرۆکت بەرنادات؟». فەرەیدون بەوپەڕی هێمنییەوە گووتبووی: «دەرد نییە، عیلەت نییە، هێندە هەیە دەبێت ئەو پەپولەیە بدۆزمەوە کە بۆی دەگەڕێم».

ئەو دەمانە فەرەیدون هێشتا پەروانەی نەدەناسی، کاتێ پەروانە هاتە ژیانییەوە شتەکان هەمووی گۆڕابوون... پەروانە لە ڕۆژانی تەنهایدا دەرکەوت، لە ڕۆژانێکدا ژیانی بەرهووتێکی گەورەبوو، بەڵام وەرزی بەرینی خەیاڵات، ئاوات و ئومێدی گەورەی تیاچاندبوو، بەجۆرێ ماوەیەکی زۆری دەویست تا بیابانەکانی ژیانی خۆی ببینێت و تێبگات لە چ وێرانەیەک و لە چ پوچییەکدا دەژی. ئەو کات فەرەیدون جگە لە دانیشتنی ئێوارانی سەر شیشەکان لەگەڵ ڕەزای دڵخۆشدا و قسەکردن لەسەر وڵاتە خەیاڵییەکان و تەماشاکردنی نەخشەکان هیچی دیکەی نەبوو.

کەس نەیدەزانی شتەکان چۆن بەوشێوەیە گۆڕدران، لە ماوەیەکدا گۆڤەند چەندین جار خوازبێنی دلارامی کرد و سوودی نەبوو، هەرجارەی بە دەستەیەک خوازبێنیکەری بەهەیبەتترەوە دەچووە پێشێ، بەلام باوکی دلارام هەمیشە یەک وەلامیدەدایەوە و دەیگووت: « گوێ لە هیچ تڕووهاتێک ناگرم... دوای چەند هەزار ساڵ لە شکاندنی حەزرەتی ئیبراهیم بۆ بتەکان، تازەبەتازە کچی خۆم بدەم بە بتتاشێکی قژ درێژ و ئۆفیک و حیز؟» . لەو سەردەمەدا شەوان هەرسێکیان لە ستۆدیۆکەدا یان لە وەرشەکەدا یان لە ژوورەکەی فەرەیدونی مەلەکدا پێکەوەدادەنیشتن و تا بەیانی دەیانخواردەوە و دەگریان، پلانیان دادەنا، نەخشەی تازەیان دەکێشا، بیریان لە پیاوانی بەشکۆتر و بە دەسەلاتتر دەکردەوە بیکەن بەگژ باوکی دلارامدا... بەلام هیچ شتێک سوودی نەبوو.

لە گەرمەی ئەو وەرزی نائومێدییەشدا شتێکی سەیر و ترسناک ڕوویدا، شتێک کە کاریگەرییەکی گەورەی لەسەر چارەنوسی هەموومان جێهێشت. بەیانییەک فەرەیدونی مەلەک و گۆڤەند هەموو شار بەدوای نەسرەدینی بۆنخۆشدا گەڕان و نەیاندۆزییەوە... نەسرەدین لەناکاو وەکو زەوی قووتی بدات ونبوو، ونبوونێک کە سەرەتای هەموو ئەو کەوتن و لێکترازانە ترسناکانە بوو کە یەکە یەکە هەموومانی لە یەکترجیاکردەوە.

## ٩

سـەرەتا هەمووشـتەکان بـە شـێوەیەکی زۆر تاریـک و نائومێدانـە دەسـتیانپێکرد.

لـە دوای ونبوونـی نەسرەدینی بۆنخـۆش گۆڤەنـد بـۆ ماوەیـەک وازی لـە هەمـوو پرۆژەکانـی هێنـا و خـۆی لـە مـەی نۆشـیدا نوقمکـرد. فەرەیدونـی مەلـەک بـە بێدەنگـی هـەرەس و مردنـی بەکاوەخـۆی گۆڤەنـدی لـە گێـژاوی ئازارەکانـی پەشـیمانی و عەشـقدا دەبینـی، بـەڵام نەیدەتوانـی هیـچ بـکات. ئـەو ماوەیـە گۆڤەنـد بـووە پیاوێکـی زۆر کەمـدوو کـە زۆربـەی کات بـە جگەرەیەکـی درێـژ و باڵایەکـی بـەرز و لەشێکی لاواز و نیـگای هونەرمەندێکـی غەمبـارەوە لـە شـەقامەکانی شـاردا دەردەکـەوت. یەکەمجـار وەڵامـی سـڵاوی ئـەو پیاوانەشـی نەدەدایـەوە کـە دەیانویسـت لـە گێـژاوی داڵغـە دوور و درێژەکانـی خـۆی دەریبهێنـن... لـە هەمـوو ئـەو شتانەش سـەیرتر ئـەوە بـوو کـە گۆڤەنـد چیتـر وەکـو جـاران دەرگاکانـی ژیانـی خـۆی بـۆ فەرەیدونـی مەلـەک نەکـردەوە و بەدەگمـەن لـە وەرشـەکەدا پێشـوازی ئـەو گەنجـەی دەکـرد کـە ئێسـتاکێ دووری لـە نەسرەدینی بۆنخـۆش وَ گۆڤەنـدی مەلـەوان ژیانـی گۆڕیبـوو بـۆ بیابانێکـی ڕاسـتەقینە.

ڕۆژێـک، پـاش ماوەیەکـی زۆر لـە گـەڕان و عەوداڵبـوون فەرەیدونـی مەلـەک، گۆڤەنـدی بـە جۆرێکـی سـەیر و بێمانـا لـە نـاو کۆمەڵـێ مەیخـۆری زۆر بازاڕیـدا لـە باغێکـی قـەراغ شـاردا بینییـەوە، هێنـد لاوازبـوو، مەلـەک

لەقووڵایی دڵی خۆیدا بەحەسرەتەوە گووتی: «سەیریکە، خەریکە دەبێتە چیلکە، دەبێتە پارچەیەک چڵوچێو». هەموو نیشانەکانیش دەیانگووت کە گۆڤەند پیاوێکە هێدی هێدی بەرەو دواهەمین خەرەندی خۆی دادەگەڕێت و دەکەوێتە ناو ریزی نزمترین شەرابخۆرەکانی شار. ئەو ئێوارەیە «گۆڤەند» کە بە کۆڵانە هێمن و خامۆشەکانی شاردا لەتەک فەرەیدوندا گەڕایەوە، پێیگووت: «من پیاوێکی بێچارەنوسم، پیاوێکم پاشەڕۆژم نییە، وازم لێبێنە، بەو ڕێگایەدا مەڕۆ کە من دەڕۆم... من دەزانم ڕێگاکان هەمووی هەڵەن، ڕوو لە هەر جێگایەک بکەیت هەر هەڵەیە، بەرەو خۆرهەڵات بڕۆیت یان باکوور، خۆرئاوا یان باشوور... هەموویان هەڵەن، بەڵام بەشوێن مندا مەیە... من ئەوسەری هەمووشتەکان دەبینم، تۆ بڕۆ و ژیانێکی دیکە بۆ خۆت بژی». فەرەیدونی مەلەک بە حەسرەتێکی قووڵەوە لە دڵیدا پێیدەگووت: «خەریکە دەبیتە زیخ... دەبیتە لم... ئاخر دواجار ڕۆژێک دێت کە ئیدی خۆتت بۆ کۆناکرێتەوە». گۆڤەند بە مەستی چاوەکانی پتر سوور هەڵدەگەڕا و خێراتر دەڕۆیشت و بێئەوەی سەیری فەرەیدون بکات دەیگووت: «چاوەڕوانی چی دەکەیت؟ دەتەوێت ببم بەچی... ببم بەچی لەم شارە بۆگەنەدا؟ ببم بە بولبولی زیو یان چۆلەکەی یاقووت... چیت دەوێت؟ ترێی مرواریت بۆ بگرم یان خەیاری ئاڵتون. لەم شارە بۆخڵەدا، لەم شاری زێراب و لیتاو و ڕەشەبا و درۆیەدا، هەر شەرابخۆرێکی بۆخڵم لێدەردەچێت». ئەوەی لەو ئێوارە تاریکەدا گوێی لە گۆڤەند بووایە، هەرگیز نەیدەگووت کە هەمان ئەو پیاوە، لەگەڵ سەرەتای وەرزی خەیاڵاتدا بەجۆرێ دەگۆڕێت، تا دوا ڕۆژەکانی ژیانی بە ئومێدێکی گەورەوە باس لە هەمووشتەکان دەکات.

ئەو ئێوارەیە، گۆڤەند بەشێک لە وەرزە ڕەشەکانی خۆی دەژیا، ئەوماوەیە هەموو ئێوارێیەک لەو سەیرانگا ژاکاو و چۆڵانەی قەراغ شاردا،

یان لە یەکێ لە بارە تاریکەکاندا، لەگەڵ دەستەیەک لە گۆرانیبێژ و مەیخۆرانی زەمانی ساقی و پیاڵەدا مەستدەبوو. فەرەیدونیش کە ئاوڕی لە بازنە خاڵییەکانی ژیانی خۆی دەدایەوە جگە لە ڕەزای دڵخۆش کەسی دیکەی نەدەبینی شایستەی ئەوەبێت پێیبڵێیت «هاوڕێم»... فەرەیدون کە هەمیشە بە حەسودییەکی قووڵەوە سەیری گۆڤەندی کردبوو، هەمیشە لە قووڵایی ڕۆحیدا بە پیاویی «تەنهاییە جوانەکان» ناویناببوو، ئەمڕۆ لە دوورەوە مردنی ئەو ڕۆحەی دەبینی کە لە ئازارەکانی ئەویندا بەرەو شوێنی ئەوتۆ هەڵدەهات کە خۆی و جوانی و تەنهاییەکانی تیا دەناشت. فەرەیدون زۆربەی ئێواران بەناچاری دەگەڕایەوە سەر شیشەکانی پێشدەم کتێبفرۆشییەکە و بەخۆی و کراس و شەرواڵێکی ڕەشەوە لەسەر شیشەکان، لەتەنیشت ڕەزای دڵخۆشەوە دادەنیشت. هەردووکیان، وەکو جووتێ باڵندەی نەخۆش لەسەر شیشەکان خۆیان هەڵدەخست و باسی زەوییە ئەفسانەییەکانیان دەکرد... لەو سەردەمەدا، لەو سەردەمی تەنهایی و دوورییەدا، کاتێ نەسرەدینی بۆنخۆش بێسەروشوێن زەوی قووتیدابوو، گۆڤەندیش لە دونیای مەی و مەقاماتی گۆرانیبێژە مەستەکانی ژێر ئەو دارودرەختانەدا ونبووبوو. فەرەیدون جگە لە خەیاڵاتی سەفەر، جگە لە بیرکردنەوە لە کیشوەرێک کە تیایدا ببێتە پیاوێکی تەنها و قەشەنگ بیری لە هیچی تر نەدەکردەوە. خەیاڵاتی ئەو سەفەرە ئەفسانەییانەش ڕەزای دڵخۆشی نەخۆش خستبوو، زۆربەی شەوان تایەکی کوشندەی لێدەهات و تووشی ڕێشکەوپێشکەی سەیر دەبوو، ئێواران کە دەهاتە بەر کتێبخانەی براکەی و لەسەر شیشەکان دادەنیشت، بە هەمان سۆزی کوشندەی ناو ڕۆحییەوە چاوەڕوانی فەرەیدونی مەلەکی دەکرد کە ئێستا ئەویش بووبووە پارچەیەک لە تێڕامان و عەوداڵی بۆ خاکێکی دیکە و عەردێکی دیکە. تێکەڵاوبوونی خولیاکانی فەرەیدونی مەلەک لەگەڵ ئەو خەیاڵاتانەدا کە وڕێنە بەردەوامەکانی ڕەزای دڵخۆش دەیخولقاند،

دەرگای چەندەها کیشوەری نوێ و دەریای نەدۆزراوە و خاکی خورافیانەی لێخستنە سەرپشت... لەسەر ئەو شیشانەوە بەرەو ناو ئەو دەریایانە سەفەریانکرد، کە لە شەپۆلەکانیدا پەرییە ڕازاوەکانی دەریا بە غەمزەوە بەرەو دوورگە سەوز و بەهەشتییەکان دەیانبردن، ئەو خاکە عاجباتیانەیان بینی کە باڵندەکانی بەهەموو زمانەکانی دونیا قسەیاندەکرد، چوونە ناو شاری ئەوتۆوە کە مرۆڤەکان لەبری جلوبەرگ ڕەنگەکانی شەبەنگیان دەپۆشی، دەرگای باغچەی ئەوتۆیان کردەوە کە لە ژێر درەختەکانیدا کچانی هەمەچەشنە، بەبێماندوبوون لەگەڵیاندا دەخەوتن، شاریان بینی شوراکانی لە دەنکی زەیتوون دروستبووبوو، عەرشیان بینی پاشاکانیان سەریان لە گێلاس خولْقابوو، هەرکاتێکیش لە گەرمەی ئەو خەیاڵانەدا کە چاویاندەکردەوە، دووبارە خۆیان لەسەر شیشە ڕەق و ساردەکانی ئەو شۆستەیەدا دەبینییەوە. لەوکاتەدا ڕەزای دڵخۆش هەموو شەوێ تایەکی کوشندەی لێدەهات، بەڵام نەیدەهێشت کەس پێیبزانێت، دەچووە ژوورەکەی خۆی و دەرگاکەی دادەخست و بیری لە ڕێگایەک دەکردەوە بیگەیەنێت بە عەردە ئەفسانەییە دوورەکان... دەشیا هەموو شتێکیش بە ئارامی ڕاببوردایە، دەشیا ئەو خەونە بەجۆشانەی سەفەر هەر بەڕاستی بە سەفەر دواییهاتبایە، بەتایبەت فەرەیدون لە گەشتە بەردەوامەکانیدا بە چایخانە و بازاڕ و گەڕەکەکاندا، گەیشتبووە ناسینی هەندێ لەو قاچاغچییانەی دەیانگووت: «بەمسۆگەری، تا ناوەڕاستی بەهەشت دەتبەین»، بەڵام دواجار شتێ ڕوویدا فەرەیدونی مەلەک چاوەڕوانی نەدەکرد. عەسرێکی درەنگی ڕۆژێکی پایز، پیاوێکی سەیر لەبەردەم «کتێبفرۆشییەکە»دا دەرکەوت و بە هێمنی گووتی: «دەمەوێت فەرەیدونی مەلەک ببینم...». دەرکەوتنی ئەو پیاوە باڵندەیە و بەو شێوە کوتوپڕە لە ناو شاعیر و ڕۆژنامەنووسەکاندا شتێکی سەیربوو، ئەو وەکو باڵندەیەکی غەمگین بێدەنگ بوو، بەڵام ئاشکرابوو کە نهێنییەکی قووڵ

و سەیری پێیە. کە یەکەمجار لە ناو کتێبەکاندا دەرکەوت، پێدەچوو لە ژیانیدا کتێبخانەی نەبینیبێت، ئاشکراشبوو خوێندەواری نییە، لەگەڵ ئەوەشدا ئەو نیگا سەیرانەی کارێکیاندەکرد بەهێزتر و بەهەیبەتتر لە هەموو ئەو ڕۆشنبیرانە دەرکەوێت، کە لە پاڵتۆ درێژەکانیاندا سەراسیمە تەماشایاندەکرد. کە فەرەیدونی مەلەک لەبەر شیشەکاندا دەرکەوت و ئەو گەنجەی بینی هەستی بە بۆنێکی سەیرکرد، بۆنی گەڵاکانی درەخت دوای یەکەم ڕێژنەی پایز، ئەو چاوە سەیرانەشی کە بیلبیلەکانی چەندین جار لە سپێنەکەی گەورەتر بوون، هەستێکی سەیریان بە نهێنی و بێدەنگی و ترس، بەجێدەهێشت... کە فەرەیدونی مەلەکی بینی بە پەنجە درێژ و باریکەکانی، ئەو پەنجانەی بە چەند نینۆکێکی قووڵاپی کۆتاییاندەهات، مەچەکی فەرەیدونی گرت و بەرەو کۆڵانێکی زۆر هێمن و ئارام ڕایکێشا، کۆڵانێک دەکەوتە ئەوبەری کتێبفرۆشییەکەوە. فەرەیدون هەر لە یەکەم نیگاوە هەستیکرد ئەم پیاوە لە خاکێکی دوورەوە هاتووە... نیگاکانی، هەناسەکانی، وردبوونەوەی، جلەکانی، هەموو شاهیدی نامۆیەتی بوون، لەوبەریش لە کۆڵانەکەدا گووتی: «من ناوم سیامەندی باڵندەیە... لەلایەن نەسرەدینی بۆنخۆشەوە هاتووم». فەرەیدون ئەو کات لەو باوەڕەدا نەبوو نەسرەدین مابێت، زیاتر وای بۆدەچوو حکایەتی مەرگێکی ڕەش، کوشتنێکی نهێنی، زیندەبەچاڵکردنێکی سیاسی لەپشت ونبوونەکەیەوە بێت. بەئارامی پاڵیدایەوە بە دیوارێکەوە و هەناسەیەکی دڵنیایی هەڵکێشا و گووتی: «مەبەستت ئەوەیە کە بڵێیت، نەسرەدین نەمردووە... بڵێیت نەسرەدین دەژی». گەنجەکە دیاربوو وەکو باڵندەکێوییەکان نائارامە، بەجۆرێکی سەیر نیگای ئەملاولای کرد و گووتی: «نەسرەدین لەوێیە، نەسرەدین لەو چیا و جەنگەڵە دوورانەیە، لە جێگایەکی ئێجگار عاسی کە ئێمە و باڵندەکان پێکەوە تیا دەژین...». فەرەیدون کە کوڕی بەر سەموونخانەکان و ناو کۆڵانەکانی شار بوو بە عاجباتییەوە سەیری ئەو

پیاوە باڵندەیەی کرد کە بۆنی درەختەکانی لێدەهات، گووتی: «تۆش بۆنی باغێکی تازەت لێدێت». سیامەندی باڵندە، لووتێکی قولاپی چکۆلانەی هەبوو، قژی بە ئەندازەیەک چڕبوو تەنها فاسیلەیەکی زۆر بچووکی بۆ ئەو ناوچاوانە چکۆلانە و تەسکەی جێهێشتبوو، بە چەناگەیەکی باریکەوە تەماشای فەرەیدونی مەلەکی کرد و گووتی: «یەکەمجارە شار ببینم، هەرگیز پێشتر هیچ شارێکم لە ناوەوە نەبینیوە، لەوەوبەر تەنها لە دوورەوە سەیری شارەکانم کردوە». ئەو کات فەرەیدونی مەلەک بە هێمنی سەیری چنگە قولاپییەکانی دەکرد و گووتی: «هەولبدە بە هەوا و دیمەنەکانی شار ڕانەیەیت، هەولبدە زۆر لە ئاوی ئێرە نەخۆیتەوە، زۆر سەیری ئافرەتەکان نەکەیت... شار وەکو تلیاک وەهایە، کە پێی ڕاهاتیت بەئاسانی لەبیرناکرێت». گەنجەکە وەکو شەهێنێکی غەمگین سەری دەلەقاند و دەیگووت: «ناهێڵم شارەکان فریوم بدەن، تا ئێستا نەمهێشتووە، بەلام نەسرەدینی بۆنخۆش پێیگووتم کە بێم و کەمێک دونیا ببینم، بێم و هەوای شار هەڵمژم، ئێستا دەزانم تووشی ئالۆشم دەکات... ئێستا تێدەگەم، نەسرەدینی بۆنخۆش بۆ منی ناردووە بۆ ئەم شارە؟». «فەرەیدون» دەستی سیامەندی دەگرت و دەیهێنایەوە بۆ سەر شەقامەکە، دەیگووت: «بۆ تۆی ناردووە؟... بۆ؟». پیاوە باڵندەکە دەیگووت: «خۆی بۆئەوە منی ناردووە، تۆ و پیاوێکی تر ببینم، ناوی گوڤەندی پەیکەرتاشە، یان گوڤەندی مەلەوان... بەلام بۆ ئەوەش کە کەمێک ئارام ببمەوە. هەموو دەڵێن، من دەبێت کەمێک دەستەمۆ بکرێم. دەڵێن، من زۆر زیاتر لە پێویست کێویم».

فەرەیدون بە هێمنی سەیریدەکرد و دەیگووت: «تۆ بۆنی درەختەکانت لێدێت». گەنجەکە دەیگووت: «هەڵبەت کە بۆنی درەختەکانم لێدێت، هەڵبەت... من بەدرێژایی دوێنێ شەو لەنابەینی گەلاکاندا ماومەتەوە». فەرەیدون ئێستا گەلێ دڵشادبوو، بەلام خۆی وا دەرنەدەخست، لەناخەوە

پێدەکەنی، هەواڵی نەسرەدین لە خۆشترین ئەو هەواڵانە بوو کە لە ژیانیدا پێیگەیشتبوو، بەڵام دیمەنی ئەم گەنجە و نیگاکانی کەمێک پەشۆکاندبوویان. پاش ئێستێک لە هێمنی، پاش نیگایەکی خەڵک، پاش ڕوانینێک لەو شەقامە جوانەی نیوەی ژیانی لەسەر شۆستەکانی بردبووەسەر، بە زەردەخەنەیەکەوە سەیری ئەو جلە درێژانەی بەری سیامەندی باڵندەی دەکرد و دەیگووت: «کەواتە نەسرەدینی بۆنخۆش زیندووە... کەواتە، ئێستاش دەژی». بێئەوەی گوێ لە وەڵامی سیامەندیش بگرێت مەچەکی دەگرت و بەو شەقامە دوور و درێژەدا ڕایدەکێشا و دەیگووت: «خوایە، دەبێت گۆڤەندی مەلەوان لەکوێ بێت؟ دەبێت ئەو مەلعونە لەکوێ خۆی شاردبێتەوە، باوەڕناکەم، بەم ئێوارەیە کە هەور ئاسمانی گرتووە، خۆی و بەدمەستەکانی هاوڕێی چووبێتنە قەراغ شار... ئاه... «سیامەند» بابڕۆین مەیخانەکانی بۆ بگەڕێین». کەمێک دەوەستا و دەیگووت: «ببورە دەڵێم، مەیخانەکان، مەیخانە وشەیەکی کۆنە، بەڵام من... من تازە بەو جۆرە ڕاهاتووم». دیاربوو سیامەند نازانێت ئەو باسی چی دەکات، بەڵام بێدەنگ بە شەقامەکاندا دوایدەکەوت، مەیخانە مەیخانە دەگەڕان، کوچە بە کوچە دەڕۆیشتن... هەر شوێنێکیش کە دەچوون لە سەرخۆش و مەستەکانیان دەپرسی: «گۆڤەندی پەیکەرتاشتان نەبینیوە؟». ئەو خاوەن بارانەش، ئەو بەدمەستە بێڕەحمانەش، بەردەوام بەگاڵتە و لاقرتێکردنێکی تاڵەوە وەڵامیاندەدانەوە. فەرەیدون کە وەڵامەکانی دەبیست تێدەگەیشت، گۆڤەند بەماوەیەکی کەم هەیبەتی خۆی زۆر بریندارکردوە. ئەو هەمیشە پیاوێکی بەدمەست بوو، بەڵام ئەم پیرەمێردە قەرەج و قومارچییە تاقم لەدەمانە، ئەم مەستە شەڕفرۆشانە، ئەم تلیاکفرۆشە ددان زێڕانە، هیچ لە فرمێسکەکانی ئەو پیاوە تێنەدەگەیشتن... دواجار لە مەیخانەیەکی تاریکدا لە حاڵێکی زۆر شڕدا بینیانەوە، بە مەستی لەنێوان مێزەکاندا گۆرانی دەگووت: «بریا هەر نەمدیبا... کە دیم نەمناسیبا... ناسیم بەدڵی

خۆم با... با... با...با». هێندە مەست بوو کەسی نەدەناسییەوە، کە پەلکێشیانکردە دەرەوە بارانێکی خەست دەباری، لە ژێر بارانەکەدا فەرەیدون یەخەی گرت، پێیگووت: «گۆڤەند بڕوانە، بڕوانە ئەو پیاوە لەلای نەسرەدینی هاوڕێمانەوە هاتووە... لەلای نەسرەدینی بۆنخۆشەوە». بەڵام ئەو بەزەحمەت چاوی بۆ هەڵدەهات، بە دەنگێکی مەست پێدەکەنی و دەیگووت: «نەسرەدینی بۆنخۆش چییە؟ زەلامە؟ گوڵە؟ فلیمە؟... من نەسرەدینی بۆگەنم بیستووە... نەسرەدینی پۆخڵ... نەسرەدینی شیاکە... نەسرەدینی پشقل... نەسرەدینی تەرسەقوول، ئەوانە هەموویان برادەرم بوون... هەموویان بە شەرەفم دۆستی گیانی بەگیانیم بوون، بەڵام نەسرەدینی بۆنخۆشم نەبیستووە». ئەو شەوە بە مەستی گێڕایانەوە بۆ ماڵێ، بە جلە تەڕەکانییەوە، بەو قژە درێژە سەیرەیەوە لە ناو پاشماوەی چەندەها پەیکەری شکاودا لە ناو جێگاکەدا خەوت. فەرەیدون بەردەوام بەو گەنجە سەراسیمەیەی دەگووت: «سوودی نییە، تا سبەی بەیانی بەئاگانایەتەوە... سوودی نییە، تۆش بخەوە». سیامەندی باڵندە لەژیانیدا شوێنی وەکو ئەم وەرشەیەی نەبینی بوو، شەو ڕادەکشا و فەرەیدونیش لە کونجێکی وەرشەکەدا دەخەوت، بەڵام سیامەند تا بەیانی لەسەر کورسییەکی تەختەی درێژ دادەنیشت و سەیری شتەکانی دەکرد، دەیڕوانییە ئاسکە پارچەپارچەکان، هوماکان بە ئاگرەوە، کەروێشکە مەڕمەڕەکان، لەقلەقە برۆنزەکان، منداڵە مۆمەکان، ڕیشۆڵە تەختەکان، سیمرخە شوشەکان.

گۆڤەند لەتەنیشت قاڵبی شکاوی ئەسپێکەوە خەوتبوو. بەربەیان کە هەڵدەستا و سیامەندی بە دووچاوی گەشی بریسکەدارەوە دەبینی، سەرەتا وایدەزانی نیگای شوشەیی یەکێ لە کونەپەپووەکانی خۆیەتی کە جارجار بۆ ڕازیکردنی یەکێک لە خزمە دوورەکانی دروستیدەکرد، بەڵام کە زیاتر وردەبووەوە و ئەو گەنجەی بەتەواوی دەبینی، بەسەرسامییەوە دەیگووت:

«تـۆ چ مەخلوقێکیـت، تـۆ ئادەمیت یـان باڵنـدە، وەکـو مرۆڤـەکان لـە گۆشـت و ئێسک دروست بوویت، یان وەکو پەیکـەرەکان لـە شوشـە و مـۆم و میتـاڵ؟» . ئـەو بەیانییـە سیامەند وەڵامـی گۆڤەنـدی نەدەدایـەوە، بەڵکـو هەڵدەستایە سـەرپێ و دەیگـووت: «نەسرەدینی بۆنخـۆش سـڵاوت لێـدەکات، دەڵێت پێویستە بیبینـم» . گۆڤەنـد بـۆ سـاتێ دەحەپەسا و دواتـر دەیکێشـا بەسـەری خۆیـدا و دەیگـووت: «بـۆ خاتـری خـودا، بـۆ خاتـری شـەیتان، بـۆ خاتـری پێغەمبـەر، نەسـرەدین مـاوە؟... نەسـرەدین نەمـردووە؟» . سـیامەندی باڵنـدە دەیگـووت: «مـن پێتدەڵێـم، نەسـرەدینی بۆنخـۆش، دەیەوێت بتانبینێت... دەیەوێت سبەی شـەو لـە قـەراغ شار بتانبینێـت» . ئـەو بەیانییـە فەرەیدونـی مەلـەک لەسـەر هـاوار و تریقـەی شـادییەکانی گۆڤەنـد بەخەبەرهـات، گۆڤەنـد لـە خۆشـی هەواڵەکـە وەختەوەبـوو دەفـڕی، سـەمایدەکرد، باوەشـی بـە پەیکـەرە شـکاوەکاندا دەکـرد، لەسـەر قاچێـک دەوەسـتا و بـەدەوری خۆیـدا دەسـوڕایەوە، وەکـو هەڵپەرکێـی کرمانجەکانـی باکـوور چەقۆیەکـی چکۆلانـەی هەڵدەگـرت و سـەمای جەنگـی دەکـرد، سـەمایەک نـە هەیبەتـی تیابـوو، نـە جوانـی، بـەڵام بەجۆرێکـی سـەیر دەرونـی ئـەو پیـاوە قژدرێـژەی خاڵیدەکـردەوە، کـە ئێسـتا باوەشـی بـە فەرەیدونـدا دەکـرد و دەیگـووت: «ئیـدی هەمـوو ژیانـی خـۆم دەگـۆڕم، ئیـدی کـەی حەزتکـرد وەرە وەرشـەکەمەوە» . لـەو بەیانییـەدا و بەرلـەوەی نەسـرەدینی بۆنخۆشـیش ببینـن گەشـبینییەکی کوشـندە هاتـە ژیانـی گۆڤەنـدی مەلـەوان و فەرەیدونـی مەلەکـەوە. ڕۆژی دواتـر، ئێوارییەکـی تاریـک، سیامەندی باڵنـدە هـەر لەبـەر کتێبفرۆشـییەکەوە پێشـی فەرەیدونـی مەلـەک و گۆڤەنـد کـەوت بۆ باغێکـی چکۆلـەی قەراغشـار، بـۆ کۆلیتێکـی فەرامۆشـکراو لـە ناوەڕاسـتی کێڵگەیەکـی ڕووتەنـدا کـە پڕبـوو لـە قاوغی گەورە گەورەی گوڵـی گوڵەبەڕۆژە. لـەو کۆلیتـە چکۆلەیـەدا هەرسـێ هاوڕێکـە جارێکـی دی یەکتریـان گرتـەوە و دەسـتیانکردە ملـی یەکتـری و بەسـەر شـانی یەکـدا گریـان، سـیامەندی

باڵندەش لە پەنجەرەیەکی چکۆڵەوە بە چاوە سەیرەکانییەوە، بەو لووتە کورت و قولاپییەی خۆیەوە هەوای فرمێسکاوی کۆلیتەکەی هەڵدەمژی و سەیری دەرەوەی دەکرد، نەسرەدین هەتاوی ڕێگاکان سووتاندبوویان، کەمێکیش لاوازتر و غەمگینتر دیاربوو، ڕەفتەیەکی سووری لەملدا بوو، دەمانچەیەکی چکۆلانە بەلای پشتێنەکەیەوە بوو، کەمەکێ قژی لە جاران درێژتر بوو، زەردەخەنەکانیشی هەندێ ڕەقتر دەینواند، بەڵام وەکوتر هەر وەکو خۆی بوو. دیاربوو خەیاڵاتی جیهانێکی سەیری لەگەڵ خۆیدا هێناوەتەوە... بەدرێژایی ئەو شەوە باسی لە عەشق دەکرد. دەیگووت: «هەموو جیهان بە عەشقی ناکام قاندراوە، ئەو چیا دوورانە پڕە لە عەشقی ناکام، ئەو گوندە فەرامۆشکراو و بچوکانە هەمووی پڕە لە عەشقی ناکام، هەرچی شارێک یان شارۆچکەیەک دێتە سەر ڕێگام، جگە لە عەشقی دەستخەرۆ و بێئامانج، هیچی دیکەی تیا نییە». دەیگووت: «من ئێستا خەباتگێڕێکی ناسراوم بۆ وڵاتەکەم، بەڵام ئەوەتا ئەم نیشتمانە لە عەشقی بێسوود و کوژراو دروست بووە، من هاتوومەتە سەر خەیاڵێکی سەیر، هاتوومەتە سەر ئەو بڕوایەی کە لە جێگایەکدا هەندێ عەشق ئازاد بکەم، هاتوومەتە سەر ئەو خەیاڵەی پارچە زەویەکی عاسی بکەمە مەڵبەندی هەندێ لەو عاشقانەی کە جێگایەکیان نییە پێکەوە تیابژین».

دیاربوو کە نەسرەدینی بۆنخۆش لە ڕۆژانی بێسەروشوێنیدا، بۆ ساتێکیش لە خەیاڵی ئەو عاشقە بەستەزمانانە دانەبڕاوە کە لە هەموو جێگایەکدا دەیبینین، لە چیاکانیش یاریدەدەری ئەو عاشقانە بوو کە لەو بەرزایی و بەفر و هەڵەمووتانەدا دەژیان... هەندێجار، وانەی عەشقی بەو پیاوە تەنهایانە دەگووتەوە کە تەنها شوانکارەیی و شەڕیان دەزانی، هەندێجار گەنجەکانی فێردەکرد، بە چ نازکییەک لە دڵدارەکانیان نزیکببنەوە، هەرکاتێکیش عەشقەکان بە ویساڵ دوایی بهاتایە ئەو خۆی

بە بەختەوەر دەزانی. وەکوتر ژیانی وەکو پێشمەرگەیەکی لەخۆبوردوو و شەڕکەرێکی زیرەک، هەیبەتێکی بۆ دروستکردبوو کە کاری ئەو خەندە ژنانە و شەرمنەی سەر سیمای سڕیبووەوە.

ئەمرۆ نەسرەدینی بۆنخۆش دەڵێت: «گرنگ ئەو یەکدی بینینە سەیرە نەبوو لە کۆلیتێکی بچوکدا، لە ناو کێڵگەیەکی فەرامۆشکراوی گوڵەبەڕۆژەدا، بەڵکو ئەو وەرزە سەیرە بوو کە دواتر دەستی پێکرد». گۆڤەند دوای گەڕانەوەی لەو یەکدی بینینە سەیرە، ئارامییەکی دەروونی قووڵی وەدەستهێنایەوە، لەو ماوەیەدا دووبارە دەستیکردەوە بە نوسینەوەی نامە دوور و درێژ و پڕ لە سۆزەکانی بۆ دلارام کە لەمێژبوو حەسرەتەکانی عەشقێکی بێئاکام تووشی بەدبەختییەکی گەورەی کردبوو. گۆڤەند لە نامە تازەکانیدا، لەگەڵ بڕوایەکی گەورەدا بە عەشق بە دلارامی دەگووت: «دەبێت پێکەوە هەڵبێین، دەبێت ئەم شاری ترس و دوودڵییە بەجێبهێڵین». ئێستا ماوەیەکی زۆربوو دلارام وازی لە تیپی بالەکە هێنابوو، کچانی مندالتر لەبری ئەو بەخۆیان و باندە سپییەکانی ناوچەوانیانەوە لەوێ یاریاندەکرد، ماوەیەک بوو پەیوەندییەکی دوور بە دووریشی لەگەڵ گۆڤەندا هەبوو، بەلام بۆ ساتێک چییە ئەوینی گۆڤەندی فەرامۆش نەکردبوو. گۆڤەند لەو مانگە دوور و درێژانەی دوای ونبوونی نەسرەدینی بۆنخۆشدا، بەدەگمەن لە دلارامی دەپرسییەوە و لە هەموو جێگایەکیشدا خۆی وەکو شەهیدێکی عەشق نیشاندەدا. حکایەتی قەلەندەرێتی گۆڤەند و تەسلیمبوونی وەکو هەموو دەروێشەکانی دیکەی غەزەل بە پیالە و مەی، وای لە دلارام دەکرد زیاتر خۆشیبوێت، کچەکانی هاوڕێی بەردەوام حکایەتی ئەو پیاوەیان بۆ دەهێنا کە بە بالایەکی بەرز و قژێکی درێژ و غەمێکی قووڵەوە بە شەقامەکاندا دەگەڕێ، حکایەتی پیاوێک کە پاشماوەی مەستییەکی عاشقانە لە چاویایەتی و لەگەڵ هیچ رێبوارێکیشدا ناوەستێت و وەلامی سلاوی کەسیش ناداتەوە. دلارام باوەڕی

نەدەکرد تا ئێوارەیەکیان خۆی بە چاوی خۆی گۆڤەندی بینی، ئەو کات ئەو لەبەردەم شەرابفرۆشێکدا وەستابوو، بەکزییەوە بوتڵێکی پێچراوەی خستبووە بندەستی و چاوەڕوانی هاوڕێیەکی دەکرد کە لە ژوورەوە تامی شەرابێکی تازەی تاقیدەکردەوە. سەیرترین شت لە گۆڤەندی ئەو ئێوارەیەدا ئەو خیرقە شڕەی بەریبوو کە تەواو لەگەڵ ئەو جوانییە ماندوو و پڕ شکستەی سیمایدا دەگونجا. دڵارام ئەو ئێوارەیە خۆی نەگرت و هەر لە پاسەکەدا دایە پڕمەی گریان. بەهەرحاڵ ئەو کات گریان بووبووە شتێکی ڕۆژانەی ژیانی دڵارام، دواجاریش کە لە گێژاوی ئەو غەمە قووڵانەدا یەکەمین نامەی گۆڤەندی پێگەیشتەوە، چەندین ڕۆژ لە حەسرەت و خۆشیدا دەگریا، دواتر، بێئەوەی بیر لە هیچ بکاتەوە، بۆ گۆڤەندی نوسی: «بۆ جەهەنەم، بۆ مەرگ، بۆ قیامەت، لەگەڵتدا دێم». هەر لەو وەرزەدا گۆڤەند لە یانەکە، بەرامبەر مامۆستا ئیسماعیل لەسەر روقعەی شەترەنجەکە دەرکەوتەوە، مەسەلەکە هەر ئاسایی بوونەوەیەکی لەناکاو و کوتوپڕی پیاوێکی مەست نەبوو، بەڵکو ئێستا بەهەر جێگایەکیشدا بڕۆیشتبایە ئارامییەکی قووڵی جێدەهێشت، ئارامییەک کە نیشانەی دەستپێکردنی وەرزی خەیاڵات بوو. ئێستا تەنها بە سیما و شێوەیدا لە پێغەمبەرەکانی نەدەکرد، بەڵکو بە هەڵسوکەوت و قسەکانیشیدا، بە دەنگی بەرز لە هەموو شوێنێکدا دەکەوتە باسکردنە ئێمپراتۆریەتەکانی ئەڤین، دەکەوتە وتاردان دەربارەی دامەزراندنی دەوڵەتی عەشق، هەندێ جار بە زمانێک کە کەس تێنەدەگەیشت بەگاڵتەیەتی یان بەڕاست، دەیگووت: «ئایەتی ئەڤینی بۆ هاتۆتەخوار، خەڵکان دەبێت چیتر نوێژی عەشق بکەن، دەبێت فەرزەکانی خۆشەویستی جێبەجێبکەن». پیرەمێردی مەستی مەیخانەکان قاقا بە قسەکانی پێدەکەنین، ئەویش بە هەڕەشەوە دەیگووت ئەو هەمیشە تیکەڵەیەکی سەیر بووە لە پێغەمبەر و مەیخۆر... بەڵام خەڵکی چاویان نەبوو بیبینن.

وەرزی خەیاڵات لە چەندەها شێوەی جیاوازدا دەرکەوت، هەر لەو وەرزەدا نەسرەدینی بۆنخۆش لەنابەینی دەیەها لوتکە و خەرەند و جەنگەڵی عاسییدا ئەو زەوییە ئەفسانەیی و گۆشەگیرەی دۆزییەوە، هەر لەو وەرزەدا فەرەیدونی مەلەک و پەروانە یەکدیان خۆشویست، لەو وەرزەدا خەیاڵاتی سەفەر، سەدەها پیاو و گەنجی بەرەو بەهەشتە ئەفسانەییەکان هەڵگرت. خەیاڵاتی عەشق، سەدەها ژن و پیاوی لە ژیانی چکۆلە و ئارامی خۆیان دەرهێنا، کوێرەکانی خستە سەر خولیای بینین، کەڕەکانی لەسەر فەنتازیاکانی دەنگ هێنایە سەر شەقامەکان و خستنیە سەر سەما، ژنە نەزۆکەکان زگیان بە منداڵی وەهمی پڕبوو، پیاوە ئیفلیجەکان یەکی چەندەها دەست و قاچی خورافییان لێڕوا، منداڵانی بێزمان کەوتنە هۆنینەوەی هۆنراوەی ئەفسانەیی. وەرزی خەیاڵات لە هەموو شوێنێکدا ژیانی دەگۆڕی بۆ واهیمەیەکی سەوز، لە ناو ئەو واهیمە سەوزەدا پیرەمێردە پەککەوتەکان لەسەر سەکۆکانی بازاڕ، لەبەر خۆردا خۆیان هەڵدەخست و باسی ئومێدیان دەکرد، ژنانی تەنها و نەخۆشی بەر تەشتە ژەنگاوییەکانی جلشتن، لەبەر دەرگاکان یەکتریان دەبینی و دەیانگووت: «گرنگ ئەوەیە، داهاتوومان، بە ئیزنی خوا، خۆش و شیرین و گەشاوەیە». سواڵکەرەکان لەسەر شۆستەکان دەکەوتن و خەون وەکو فوارە لە ناوچاوانیانەوە پرشنگیدەدا، شاعیران لە وەسفی جوانییەکانی داهاتوودا وەستاییان دەنواند، چیرۆکنوسەکان دەیانگووت دەبێت کۆتایی هەموو چیرۆکەکان وەکو خودی داهاتوو بە شادی بدرەوشێتەوە. پێشانگاکان پڕبوون لە تابلۆی سەیر سەیر کە لافاوێکی قەشەنگی ڕەنگ هەموو فیگوور و هێڵ و ماناکانی داپۆشیبوو. لەو وەرزەدا هەموو خەونیان بەوە دەبینی کە جیهان بەرەو باشتر بڕوات.

نەسرەدینی بۆنخۆش لە ناو دەشتی واهیمە سەوزەکاندا، دەیگووت: «هەموو ئەو عاشقانەی کە جێگایەکیان نییە، کە زوڵمی خێزان و

قەبیلە و شەیتان لە یەکدی جیایکردونەتەوە، دەبێت باغچەیەکی ئازادیان هەبێت... عەشق دەبێت زەوی خۆی هەبێت». لەیادمە پەروانە لەو وەرزەدا بە منی دەگووت: «یەکێک دەدۆزمەوە دڵی لە گوڵ نەرمتر بێت، هەستی لە گەڵای گوڵەباغ ناسکتر بێت، خەیاڵی وەکو شەوبۆ و نەسرین و یاسەمین ڕازاوەبێت». من کە گوێم لەو ڕستانە دەبوو دەمدایە قاقای پێکەنین، چونکی لەوەوبەر ئەو ڕستە پەڕپووتانەم تەنها لەو ڕادیۆ کوردییە شڕەوە گوێ لێبووبوو کە هەندێ جار پەروانە دەیکردەوە، لەگەڵ ئەوەشدا دڵنیابووم کە وشەکانی پەروانە لە دڵیەوە دێنە دەرێ و جیاوازن لە وشەکانی ئەو خاتوونە حەپۆلەی ناو ڕادیۆکە.

نەسرەدینی بۆنخۆش دەڵێت، وەرزەکانی خەیاڵات هاوڕێی هەمیشەیی مرۆڤن، جۆرە وەرزێکن هەرگیز ئاوانابن و دواییناین، بەڵام هەندێک جار بە ئەندازەیەک لەگەڵ وەرزە ئاساییەکاندا تێکەڵدەبن لەیەکدی جیاناکرێنەوە، بەڵام هەندێ جاریش بەشێوەیەکی سەیر فاسیلە لە شتە ئاساییەکان وەردەگرن... دەڵێت، کەسانێک هەن کە جارێک چوونە ناو وەرزێکی لەو جۆرە سەوزەوە هەرگیز لێی نایەنە دەرێ، کەسانێکیش یەک جار پێیان تێخست جارێکی دی لێی نزیک نابنەوە.

لە سەرەتای ئەو وەرزەدا بوو من و پەروانە ئێوارێیەک لە ئێوارە خوێناوییەکانی قوربان لە دەرگای ماڵی فەرەیدونمان دا، پێنەدەچوو پەروانە ئاگاداریی ئەوەبێت کە فەرەیدونی مەلەک، ڕاوچی پەپولەکان، ماوەیەکە خۆشیدەوێت، بەڵام لەوسەر کە سینییە بەتاڵەکانمان گرت بە دەستمانەوە و گەڕاینەوە، پەروانە بەجۆرێکی نائاسایی بەختەوەربوو، بە جۆرێک لەگەڵ بێتاقەتی و تورەیی یەکەمجاریدا نەدەگونجا، دەڕۆیشت و زەردەخەنەی دەگرت، بیریدەکردەوە و پێدەکەنی، بەجۆرێ من گومانێکی گەورەم لا سەوزبوو. ساڵانێکی دوور و درێژیش من هەروامدەزانی، ئەو ئێوارەیە یەکەم ئێوارێی یەکبینینی ئەو دوو عاشقە بووە، بەڵام زۆر

درەنگ بۆمدەرکەوت کە ئەو ڕۆژە خوێناوییەی قوربان تەنها لای من وەکو سەرەتا کەوتۆتەوە و پاڵەوانەکانی دیکە زۆر پێشتر سەرەتاکانی ئەم چیرۆکە ژیاون کە ئێستا بەدڵنیاییەوە دەتوانم بڵێم: چیرۆکێکە هەرگیز، سەرەتای نەبووە.

ئەمڕۆ کە پارچە پارچە نیگاری هەلاهەلای ئەو ڕۆژانە پێکەوەدەنێمەوە، تێدەگەم کە فەرەیدونی مەلەک لە ئێوارە فێنکەکانی ئەو بەهارەدا، لەبەردەم ئەو کتێبفرۆشییەدا پەروانەی بینیوە، کە هەندێ جار من و پەروانە بۆ کڕینی هەندێ قەڵەم و دەفتەر و کاغەزی بەرگ خۆمان پیادەکرد، هەر جارێکیش کە دەهاتینە دەرێ، پەروانە دەیگووت: «نازانم بۆ حەزم لە چارەی ئەم پیاوە بەدفەساڵانەی ناو ئەم کتێبفرۆشییە نییە». من یادم نییە جارێک لە جاران فەرەیدونی مەلەکم لەوێ بینیبێت، بەڵام ڕەزای بۆنخۆش دەیگووت: «ئەو بەردەوام لەوێ بووە، هەمیشە لەسەر ئەو شیشانە بووە، هەر ئەو نیگایانەی ئەویش پەروانەی بەرەو ئەو کتێبفرۆشییە ڕاکێشاوە».

فەرەیدونی مەلەک لە یەکێ لە ئێوارەکانی عەشقدا بە پەروانەی گوتبوو: «من هەموو ئێوارەیەکی فێنک تۆم دەبینی، بەڵام خۆشمنەویستیت، تا ئێوارێیەک هەستمکرد هەوا سەرتاپای پڕبووە لە گەردی پەپولە، هەستمکرد جلەکانم، دەستم، سیمام، بڕۆم هەمووی تۆزی نازکی پەپولەکانە، تۆزێکی نەرم کە هیچ کەسێکی دی نەیدەبینی من نەبێت، من لەو باوەڕەدا نەبووم مرۆڤێک هەبێت وەکو پەپولەکان غوبار و گەردێکی وەها نازکی هەڵگرتبێت، تا دووریش کەوتیتەوە هەر گومانم هەبوو کە ئەم گەردە لە جەستەی مرۆڤێکەوە بێت، کە هێدی هێدی دواتکەوتم لەڕاستیدا دوای ئەو تۆزە نەرم و ئاوریشمییە دەکەوتم کە تۆ لە دوای خۆت جێتدەهێشت».
ئاشکرایە کە پەروانە و فەرەیدونی مەلەک هەردووکیان هەر لە سەرەتاوە کوشتەی ئەو خەیاڵە سەیرانە بوون کە بە ڕێگایەک لە ڕێگاکان ئەو

وەرزە لەگەڵ وەهمەکانی دیکەدا خولّقاندبووی. کە یەکەمجار فەرەیدون لەبەردەم ئەو کتێبفرۆشییەدا پەروانەی گرت، لەبری نامە کتێبێکی دایە کە نابەینی پەڕەکانی پڕبوو لە پەپولەی قەشەنگ، کتێبەکەش خۆی وەکو کۆکراوەیەکیَ بێمانا دەینواند لە نەخشەی جیاواز جیاواز و نیگاری باغ و باغات و وێنەی پەیکەری ئەفسانەیی. من ئێستاش ئەو ئێوارەیەم لەیادە کە پەروانە بەپەلە گەڕایەوە و بەرلەوەی جلەکانی قوتابخانەی بگۆڕێت، خۆیدا بەسەر چەرپاکەدا و ئەو کتێبەی لە جانتاکەی دەرهێنا و کەوتە گەڕان بەدوای نامەیەک، قسەیەک، حەرفێک، نیشانەیەکی عەشقدا، بەڵام هیچی نەدۆزییەوە، بە ئەندازەیەک سەرەتا واتێگەیشت کە دەشێت ئەو گەنجە خوێندەواری نەبێت، بەڵام دیمەنی ئەو هەموو پەپولەیە، دیمەنی پەروانە مردووەکان لەو کتێبەدا، دیمەنی ئەو هەموو جوانییە بێدەنگە، ترساندی. دواتریش بۆی دەرکەوت ئەو نەخشانە، جگە لە نەخشەی کۆمەڵێک وڵاتی وەهمی هیچی تر نین. پەروانە کتێبەکەی بە پەیامێکی پڕ لە تەلیسم و پڕ لە هێمای زۆر ئاڵۆز تەفسیرکرد، بەڵام هەر لە شەوی یەکەمەوە، لەو تێکەڵاوکردنە ئاڵۆزەی نەخشە و پەپولە و باغ و پەیکەرەکاندا، دەنگدانەوەکی نهێنی خەونە شاردراوەکانی خۆی دەبینی بۆ ونبوون لە مەملەکەتە نادیار و نەناسراوەکانی دیکەدا. بۆ ڕۆژی دوایی عەوداڵانە لەبەردەم هەمان ئەو شیشانەدا بە فەرەیدونی گووت: «ئیتر ئەو پەپولانە مەکوژە». ئەو ڕۆژە فەرەیدونی مەلەک هیچی نەگووت، بەڵام دواتر کە پێیانخستە یەکەمین ڕۆژەکانی عەشقەوە، ڕۆژێک بە پەروانەی گووت: «پەپولەکان تەنها پردی منن لەگەڵ سروشت و تەنها پردیشن لەگەڵ خەیاڵاتەکاندا». ئاخۆ ئەو دوو وشەیە تەنها دوو وشەی سەرزارەکی ناو کتێبێک بوون و فەرەیدون بەبێ هیچ بیرکردنەوەیەک دەیدرکاندن، یان دوو وشە بوون لە قووڵایی دەروونی پیاوێکی تەنهاوە دەهاتنەدەرێ؟ پەروانە نەیدەزانی. فەرەیدون لەو ئێوارەوە کە پەروانەی

بینی چیتر هیچ پەپولەیەکی ڕاونەکرد... ئیدی لەو ئێوارەیەوە تا مردن وازی لە ڕاوی پەپولەکان هێنا.

هەر لە یەکەمین هەفتەکانی عەشقەوە، هەستێکی سەیر باڵی بەسەر پەروانەدا کێشا، هەستێک وای لێکرد فەرەیدون وەکو پیاوێکی ڕاگوزەر سەیربکات، کە لە جیهان و ئەتمۆسفیرە جیاوازەکاندا دەردەکەوێت و بێئەوەی جێگیربێت دەڕوات... تەنها شتێکی جیدی لە ژیانی فەرەیدوندا بێدەنگییە قووڵەکان و خەیاڵاتە سەیرەکانی سەفەر بوو. کۆی شتەکانی دیکەی ژیانی وەکو یاریکردن، سوڕاندنەوەی بێهودە لە چایخانەکاندا، مەجلیسەکانی مەی، دانیشتنی ئێوارانی بەر کتێبفرۆشییەکە، هەمووی ڕووکەشی پڕ لە هەیاهوی پیاوێکی بێدەنگ بوون. شتێک کە پەروانەی بۆلای فەرەیدون ڕادەکێشا، ئەو کپییە قووڵ و بێبنەی ناو گلێنەکانی بوو، کە کپییەکی لە کپی قووڵاییە تاریکەکانی گەردون سامناکتر بوو. من ئەو چەند جارە کەمەی فەرەیدونی مەلەکم بینیبوو، ئەو جۆرە کپییەم لە چاوانیدا نەبینیبوو، بەڵام پەروانە دەیگووت: «تۆ کوێریت، تۆ منداڵیت، ئەو جۆرە شتانە نابینیت». بە هەر حاڵ پەروانە ئەو کپییەی بە کپی ڕێبوارێک دەزانی کە دەیەوێت تا ئەوسەری شتەکان بە بێدەنگی بڕوات. دەیگووت: «ژیان لەگەڵ قەلەندەرێکی گەڕۆکدا، جوانترە لە ژیان لەگەڵ ئەو پیاوانەدا کە بە جێگایەکەوە دەگیرسێنەوە و ئیدی ناتوانن بیگۆڕن». کاتێک لە شەوە تاریکەکاندا لە ناو جێگاکەدا پێکەوە دەکەوتینە قسە، هەستمدەکرد ڕقی لە هەموو ئەو پیاوانەیە کە نایانەوێت ئەم شارە جێبهێڵن، دەیگووت: «ئەم شارە چی تیایە، لە دیوار و زێراب زیاتر؟». ئەو لە هەفتەی یەکەمەوە کەوتبووە دووبارەکردنەوەی هەموو ئەو قسە و داواکاریانەی لەوەوبەر لەگەڵ عاشقەکانی دیکەشدا باسیکردبوون، دەربارەی سەفەر و دوورکەوتنەوە لەم شارە کە بە شاری «عاشقە بێوەفاکان» و «پیاوە خیانەتکارەکان»ی دەزانی، بە شاری ئەو

هەموو شکستە یەک لە دوای یەکەی ئەڤینی دەزانی کە ژیانی تووشی گێژاوێکی بێسەروبن کردبوو.

سەیر لەوەدایە کە فەرەیدونیش لە هەفتەی یەکەمەوە دەستیکردبووە باسکردن و وەسفکردنی مەڵبەندە خەیاڵییەکان و دوورگە دوورەکان و شارە بلوورییە سەیرەکانی قەراغ دەریا. هەر لە هەفتەی یەکەمەوە لەبری باسی خۆشەویستی و جوانی، کەوتبووە باسی هەرێمە سەیرە دوورەکان. فەرەیدون کە ئێوارە دوور و درێژەکانی دانیشتن و بیرکردنەوە لەبەر کتێبفرۆشییەکەدا، ئاسۆکانی خەیاڵی فراوانکردبوو، دەیتوانی بەردەوام لەسەر زەوی ئەفسانەیی وڵاتە عاجباتیەکان قسەبکات، توانایەک هەر لە سەرەتاوە پەروانەی ڕادەکێشایە ناو بازنەی سیحرێکەوە، ڕۆژ دوای ڕۆژ پتر بەرەو ئەو کورەی ڕادەکێشا کە بەپێچەوانەی هەموو عاشقەکانی دیکەوە، جلە کوردییە هەمیشە تۆزاوییەکانی نەوەک ڕۆمانسیەتی تیا نەبوو، بەڵکو بەردەوام سیمای ئەو گەنجە شەڕفرۆشانەیان وەبیر پەروانە دەهێنایەوە کە هەندێ جار بێهودە لە کۆڵانەکاندا شەڕیان بە پەروانە و دڵدارەکانی دەفرۆشت کە تا ئەو کات زۆربەیان کوڕی ڕێکپۆشی ناو کۆگا و قەیسەری و ئۆتۆمبیلە گرانبەهاکان بوون.

من ئەمڕۆ دڵنیام ئەوەی یەکەمجار دڵی پەروانەی بۆ فەرەیدونی مەلەک نەرمکرد ئەو کتێبی پەپولە و نیگارانە بوو کە کەس نازانێت چ شەیتانێکی زۆرزان ئەوەی خستبووە خەیاڵی فەرەیدونەوە بەو جۆرە لە پەروانە بێتەپێش... دواتریش ئەوەی بەردەوامی بەخشیبوو بە پەیوەندییەکەیان و خستبوویە سەر ڕێگای خۆی، ئەو وڕینە سەیرە و قووڵانەبوو دەربارەی جیهانێک کە هەردووکیان دڵنیابوون لەسەر ئەم زەوییەدا نییە، بەڵام دڵنیاشبوون بەبێ ئەو خەیاڵانە ژیان مانایەکی

نییە.

لەو وەرزەدا، وەرزی بەرینی خەیاڵات، پەروانەش وەکو هەمووان لە بەحری ئەو خەیاڵ و ئومێدانەدا نوقمبووبوو، بەڵام دەبێت بڵێم خەیاڵ لە ڕۆحی ئەودا هەر لە سەرەتاوە نزیکییەکی سەیری لەگەڵ ئەو کیشوەرە سەیر و تەلبەندکراوانەی غەمدا هەبوو، کە لە هەموو قۆناغەکانی ژیانیدا لە قسە و نیگا و هەڵسوکەوتەکانیدا دەمبینی. لە ناو ماڵدا دەهات و دەچوو، لە قوتابخانە لە ناو دەستەی کچە جوانەکاندا دەوەستا، بە تراکسووتی وەرزشەوە لە گۆڕەپانەکەدا لەگەڵ کیژە باڵابەرزەکانی دیکەدا ڕایدەکرد، هەمیشەش ئەو غەمە لە چاویدا بوو.

من ئێستاش سەیرم لەو بێئاگاییەی خۆم دێت، هەرگیز لەبەر کتێبفرۆشییەکەدا سەرنجی هیچ شتێکی نائاساییم نەدابوو، لە بەیانی سووتانی کتێبەکانیشدا تێنەدەگەیشتم کێ فەرەیدون و پەروانەی خزاندۆتە ناو ئەو کتێبفرۆشییە؟... خوایە، هەزارەها جار بەبەردەم ئەو کتێبفرۆشییەدا ڕابوردبووم و هیچم نەبینیبوو، بەڵام دەبێت بڵێم لەو وەرزەدا پەروانە بەشێوەیەکی زۆر بێمانا خۆی لێدەدزیمەوە، زۆرجار ماوەیەکی درێژ لەبەر قوتابخانەدا چاوەڕوانمدەکرد و دوایی دەردەکەوت کە بەجێیهێشتووم. هەندێ جار زۆر تووڕە دەبووم، هەندێ جاریش خەریک بوو لەسەر ئەو شۆستەیەی بەردەمی قوتابخانەدا، لە نابەینی گوڵەبەڕۆژەفرۆش و منداڵانی مەحەلەبی و عەرەبانەکانی پاقلەدا دەستبکەمە گریان... هەستمدەکرد زوڵمم لێدەکات، کەچی ئەو تاقە جارێکیش چییە خۆی ماندوونەدەکرد داوای لێبوردنم لێبکات. ئێستاش هەندێ جار هەستدەکەم کە ئەو زۆر جار دڵڕەقییەکی سەیری بەرامبەرم دەنواند. ئەو پێی نەگوتم کە فەرەیدونی مەلەکی لەبەردەم ئەو کتێبفرۆشییەدا ناسیوە. ساڵانێک دواتر کە ئێواران لەبەردەم شەربەتخانەکەی ڕەزای دڵخۆشدا بۆ شەربەت خواردنەوەیەک دەوەستام، ئەو پارچە پارچە

چیرۆکی ئەو ڕۆژانەی بۆ دەگێڕامەوە. ئەو پێیگوتم کە پەروانە چەندەها ئێوارێ، لەو ژووره چکۆلانەیەی ماڵی فەرەیدوندا لەسەر ئەو کورسییە ڕاکشاوە و بیری لە سەر زەمینی فەنتازیاکان کردۆتەوە «کەچی من ئەو کات وامدەزانیَ، کە ئەو هەر لە کۆلانەکان و لە تەلەفونی ماڵی کچە هاوڕێکانییەوە قسەی لەگەڵ فەرەیدوندا کردوە». بەڵام ئەمڕۆ ڕەزای دڵخۆش بەخۆی و پێکەنین و دارشەقەکانییەوە دەڵێت، پەروانە چەندان ئێوارە لەو ژوورەدا لەگەڵیاندا بووە، چەندان ئێوارە پێکەوە سێ قووڵی نەخشەیان داناوە، ڕێگایان هەڵبژاردووە، بیریان لە سەفەر و کۆچ و بەهەشت و وڵاتە بێگانەکان کردۆتەوە، بەڵام هەمیشە و هەمیشە خەیاڵەکانیان لەبەردەم بێپارەیدا بێ قەرەبوو پوچبۆتەوە، هەمیشە و هەمیشەش درۆی قاچاغچییەکان دەستخەرۆیکردون. ڕەزای دڵخۆش زۆرجار بەشەرمەوە دەڵێت ئەگەر ئەو کارەساتە نەبایە کە لە ناوەڕاستی وەرزی خەیاڵاتدا لەو قەوما، لەوانەبوو پێکەوە چارەیەکیان بدۆزیایەتەوە. چونکێ لەو وەرزەدا هێشتا سنوورەکان بەتەواوی نەگیرابوون، هێشتا پاسەوانە دڕندەکانی گاردی کۆماری نەگەیشتبوونە سەر هەموو لوتکە و سنوورێکی وڵات، تا بەر بە لێشاوی ئەو پیاوانە بگرن کە تفیان لە نیشتمان دەکرد و ڕوویاندەکردە بەهەشتە وەهمییە دوورەکان... لەو وەرزەدا و لەوپەڕی خەیاڵاتدا، شتێکی دیکە ڕوویدا کە ماوەیەکی درێژ پەروانە و فەرەیدونی ئیفلیجکرد.

لەو وەرزەدا کە فەرەیدونی مەلەک وازی لە ڕاوکردنی پەپولەکان هێنا، پێیوابوو خودی پەروانە ئەو تێکەڵە خورافییەیە لە مرۆڤ و پەپولە کە لە منداڵییەوە بەدوایدادەگەڕێت... ئەو شەوێک لە شەوان کاتێ لەگەڵ ڕەزای دڵخۆشدا پێکەوە بە کۆلانێکدا بەرەو ماڵ دەگەڕانەوە، بە ڕەزای گووتبوو: «من لە منداڵییەوە، لەو ڕۆژانەوە کە لە ماڵی مامم و لە ژێر زەبری جنێوەکانی ئامۆژنمدا گەورەبووم، خەیاڵم لای مرۆڤێک بوو،

وەکو پەپولە وەهابێت... من لەو زەمانەوە بۆ یەکێک دەگەڕێم دیوێکی مرۆڤ بێت و دیوێکی پەپولە». هەمان ئەو قسانەشی لە وەرشەکەدا بۆ گۆڤەند دووبارەکردەوە. گۆڤەند بەجۆرێک دڵشادبوو، لە یەکەمین فرسەتدا کە یەکەمین نامەی بۆ نەسرەدینی بۆنخۆش نارد، هەر لە سەرەتاوە نوسیبووی: «بۆنخۆشی برام، دوای ڕێز و سڵاو، سەیرترین هەواڵی شار ئەوەیە کە فەرەیدونی هاوڕێمان، ئەمجارە بەڕاستی عاشق بووە...». گۆڤەند لە یەکەم ئێوارەدا، لە ناو پەیکەرەکانیدا پێکی هەڵدەدا و دەیگووت: «شتێکی باش دەکەیت، لەو عەشقە خۆڵاوییەی ناو کۆڵانەکان خۆت ڕزگاردەکەیت و حەز لە کچێکی شیک و ڕێکپۆش دەکەیت». بەڵام لەگەڵ هەموو ئەو دڵخۆشییەدا «گۆڤەند» باوەڕی بە سروشتی پەپولەئاسای پەروانە نەبوو، ئەو مەسەلەیەشی بە خەیاڵێک لەو خەیاڵانە دادەنا کە خوێندنەوەی هەندێ لە دیوانە شیعرەکانی کتێبفرۆشییەکە لەسەری فەرەیدوندا دروستیانکردوە. بەڵام ڕەزای دڵخۆش ڕایەکی دیکەی هەبوو، ڕەزا دەیگووت: «فەرەیدون... فەرەیدونی مەلەک، هاوڕێم، عەزیزم، پەپولە چییە؟ پێمناڵێیت پەپولە چییە؟ هەر یەکێک لە ئێمە بگریت، نیوەمان مرۆڤە و نیوەکەی دیکەمان پەپولەیە». ڕەزای دڵخۆش کە تەواو باوەڕی بەو بەشە پەپولەئاسایەی پەروانە هەبوو... هێدی هێدی دەکەوتە سەر بڕوایەکی سەیر و ترسناکی دیکە، هێدی هێدی خەیاڵات زۆر بۆ دوور دەیبرد، شەوان لەبەر ئاوێنەیەکدا خۆی ڕووتدەکردەوە و لە جەستەی خۆی ورددەبووەوە، تا ڕۆژێک بەتەواوەتی باوەڕی بەوە هێنا، لە ناو جەستەی خۆشیدا پەروانەیەکی خەوتوو هەیە. سەرەتا خۆیشی باوەڕی نەدەکرد، گومانی هەبوو، بەڵام بەئاشکرا فڕین و هاتوچۆی ئەو پەروانەیەی هەست پێدەکرد، شەو و شەوگارێکی زۆر گینگڵی دەدا، بیریدەکردەوە و سەرنجی گەورەبوونی ئەو پەپولەیەی دەدا لە جەستەیدا، بەڵام ترسی هەبوو چیرۆکەکە لای فەرەیدونی مەلەک

و پەروانە ئاشکرابکات. دەشیا ئەو هەستەشی هەر وەکو هەستێکی نهێنی و شاردراوە و کپکراو بمایەتەوە ئەگەر ڕۆژێک لە ناو کۆمەڵێ کتێبدا، کە تازە بەتازە براکەی بەستەکانی دەشکاند و بەسەر ڕەفەکاندا دابەشیدەکردن، ئەو کتێبە سەیرەی لەسەر مێژووی فڕین نەبینیایە....
ڕەزای دڵخۆش کە جگە لە کوردی هیچ زمانێکی دیکەی نەدەزانی، کاتێ کتێبەکەی کردەوە و ئەو وێنە سەیرانەی ئیکارۆس و عەباسی کوڕی فەرناسی بینی، تەواو حاڵی تێکچوو. ئەو کە پێی وابوو پەپولەیەکی باڵدار لە ڕۆحیایەتی، وێنەی پیاوە باڵدارەکان بەجۆرێکی سەیر و بێڕەحمانە هەژاندیان... شەوێک لە شەوان بێئەوەی جورئەتبکات نهێنی خۆی لای هیچ کەسێ ئاشکرابکات، بڕیاریدا بفڕێت.
ئەمڕۆ ڕەزا لە وچانی کاردا، جارجار قسەم بۆ دەکات، دەڵێت: «خولیای فڕین لەسەرما، چەندە پەیوەندی بەو وێنە سەیرانەی ئیکارۆس و پیاوە باڵدارەکانی دیکەوە هەبوو، هێندەش پەیوەندی بە دۆزینەوەی سروشتی پەروانەئاسای خۆمەوە هەبوو کە بینینی پەروانە لە خەیاڵمدا سەوزیکردبوو». ئەمڕۆ کە بیر لەو ڕۆژانە دەکاتەوە بە جۆرێکی هێندە سەیر پێدەکەنێت کە زۆرجار حەرفەکان لە قوڕگی دەگیرێن و دەبێت ماوەیەکی زۆر درێژ بکۆکێ و دەست بە سنگی خۆیدا بکێشێ تا ئارام دەبێتەوە. هیچ کەسێکیش لەو سیما نیمچە ماندوو و پیرەیدا ناتوانێت سێبەری پیاوێک ببینێت کە ڕۆژێک لە ڕۆژان ویستوێتی بفڕێت... بەڵام من، من کە بە هێمنی تەماشایدەکەم، کە لە دەرەوەی کەش و هەوای ئەو شەربەتخانەیە دەیهێنمە پێش چاوی خۆم، کە وەکو گەنجێک لەبەر ئەو شیشانەدا وێنای دەکەمەوە، بەدڵنیاییەوە ئەو پەپولە چکۆلانەیەی ناو ناخی دەبینم کە ئێستاش سێبەرێکی چکۆلانەی لە سیمایدا ماوە...
ڕەزای دڵخۆش دەڵێت، من لەو باوەڕەدابووم هەڵەی گەورەی ئیکارۆس و عەباسی کوڕی فەرناس ئەوەبوو کە باڵەکانیان وەکو باڵی باڵندە

دروستکردوە، لەکاتێکدا مرۆڤ بۆئەوەی بفڕێت دەبێت باڵی وەکو باڵی پەپولەکان لە خۆی ببەستێت. هەر لەسەر ئەو بڕوایەشەوە نەرمترین و نازکترین و سورمەییترین قوماشی پەیداکرد، قوماشێک شەوان لەبەر مۆمێکی کزدا و بەدزی براکانییەوە بە نەخش و زەخرەفە و ئەتەمین دەیڕازاندەوە، تا پتر لە باڵی پەروانە بچێت، ئیدی ئەو بڕیاریدابوو چیتر خۆی نەخاتە بەر ڕەحمی قاچاغچییەکان و چاوەڕوانی پارەیەک نەکات کە تا دەمرێت نابێتە خاوەنی، لەبەرئەوە فڕین باشترین چارەبوو.

باڵەکان زۆر گەورەنەبوون، بەڵکو هەر بەڕەچاوکردنی ڕێژەی نێوان باڵی پەپولەکان و بەراوردکردنی بەخۆی دروستیکردبوون، بەجۆرێکیش ئەندازەیکردبوون کە بتوانن لە هەوای ژوورەکەی خۆیدا تاقیبکاتەوە. «ڕەزای دڵخۆش» کە زۆر باوەڕی بە موعجیزە نەبوو، لە یەکەم تاقیکردنەوەدا سەرنجیدا کە باڵەکان دەتوانن بەشی ئەوەی چەند بستێک لە زەوی بەرزیبکەنەوە و ستوونی خۆی بگرێت و بفڕێت، هەڵیبگرن. چەند شەوێکی دیکەش لەسەریەک باڵەکانی تاقیکردەوە و هەموو هەوڵەکانیشی سەرکەوتووبوون، ئیدی ڕەزا ئێجگار دڵخۆش بوو، پێیوابوو ڕێگایەکی ڕاستەقینەی بەرەو ئازادی دۆزیوەتەوە.

ئەو شەوەی کە باڵەکانی لە دوو کارتۆنی گەورەدا کێشکردە سەر بەرزترین باڵەخانەی شار، لەو باوەڕەدانەبوو تووشی چارەنوسێکی لەو جۆرە بێت، ئەمڕۆ ڕەزا لە وەسفی ئەو ساتانەدا دەڵێت: «ئەو چەند سەد مەترییەی لەنێوان لێواری باڵەخانەکە و کۆتایی باغچەی گشتیدا بڕیم، خۆشترین ساتی ژیانم بوون، من دووسەد مەتری یەکەم زۆر ئاسایی فڕیم، بەئەندازەیەک گووتم تازە تا ئەوسەری دونیا دەفڕم، بەڵام کە گەیشتمە سەر دارەکان، لەنگەری خۆم گۆڕی و کەمێ خۆم لارکردەوە تا ئاسۆیی بفڕم و بتوانم لە ژێرەوە سەیری ناو درەختەکان بکەم، ئەو لەنگەرگۆڕینە بە جۆرێ هاوسەنگی تێکدام نەمتوانی خۆم

بگرمەوە، کە لەوسەری باغچەکەش بۆ ناو سنەوبەرەکان بەربوومەوە، هێشتا لەزەتی فڕینەکە لە ترسی مەرگ لەلام گەورەتر و زاڵتر بوو، کاتێکیش وەکو پیاوێکی لەخاچدراو بە دوو قاچی شکاوەوە لەنابەینی سنەوبەرەکاندا شۆڕبوومەوە، هەستمدەکرد ئەو پەپولەیەی ناو ناخم هێشتا هەر دەفڕێت».

دەشیا کەوتنەخوارەوەی ڕەزای دڵخۆش لە ناوەڕاستی درەختەکانی باغچەی گشتیدا، سەرەتای کۆتایی وەرزی خەیاڵات بێت. بەڵام ڕووداوەکە هاوکات بوو لەگەڵ نامەیەکی نەسرەدینی بۆنخۆشدا بۆ گۆڤەند، نامەیەک سەرلەنوێ کۆی واهیمەکانی بەشێوەیەکی ترسناکتر زیندووکردەوە، لەگەڵ ئەوەشدا لەو ڕۆژەوەی کە دارەوانەکانی باغچەی گشتی ڕەزایان بە گوریسێک داگرتەخوارێ و بە ماشێنێکی چکۆلانەی فەرمانبەرێکی باغچە گەیاندیانە بیمارستان، فەرەیدونی مەلەک تووشی غەمباری و نائومێدییەک بوو کە تەواو لە نیگا و هەناسە و قسەکانیدا دەبینرایەوە. گرفتەکە هەر دوورکەوتنەوەیەکی لەناکاوی هاوڕێیەک نەبوو کە ماوەیەکی درێژبوو بەبێ یەکتری نەدەژیان و جەراحەکان پێیان گوتبوو، تا مردن دەبێت بە دارشەق بڕوات، بەڵکو ئەو گۆڕانە سەیرەش بوو کە فشاری دین و خێزان و پزیشکەکان لە ناو ڕەزادا دروستیانکرد. ڕەزا کە پزیشکەکان، دۆعانووسەکان، ناسیاوە دوور و نزیکەکان هەموو لەویاوەڕەدابوون کە خولیاکانی بۆ سەفەر نەخۆشییەکی نائاساییە و دەبێت چارەبکرێت، دەبایە چەندەها مانگی دوور و درێژ لە قەرەنتینەی دکتۆر و فالچی و مەرقەدەکاندا بە زنجیر ببەسترێتەوە تا ببێتەوە بە مرۆڤێکی ئاسایی، دەبایە چەندین مانگ لەسەر یەک لە ژێر دەرمان و هەتوان و شۆکی کارەبادا بێت، چەندین مانگ پزیشک و دەروونناس و جەراحەکانی ئێسک و نووشتەنوسەکان خەریکیبن تا خەیاڵاتەکانی سەفەریان لەسەریدا سڕییەوە. کە دواجاریش لە زوڵمەتی ئەو قەرەنتینانە هاتەدەرێ بەجۆرێک بووبوو

بە پیاوێکی شەرمن و بێخەیاڵ و ترسنۆک، دەبایە فەرەیدون ڕۆژانێکی زۆر لەگەڵیدا خەریکبێت تا بە هەندێ شتی ئاسایی ڕایدەهێنێتەوە. لەگەڵ ئەوەشدا دەتوانم بڵێم ڕەزا لە تاریکییەکانی ڕۆحیدا هەمیشە عەشقێکی قووڵی بۆ فەرەیدونی مەلەک و پەروانە پاراستبوو، ئەگەر ئەو عەشقەش نەبووایە لەو ڕۆژی قیامەتەدا، لەو ڕۆژەدا کە هەموو شار بەدوای فەرەیدون و پەروانەدا دەگەڕان، بە خۆیی و دارشەقەکەیەوە پێش هەمووان نەدەکەوت و دوو جار ئەو عاشقانەی لە مردن ڕزگار نەدەکرد.

ئەمڕۆ کە دوای تێپەڕینی ئەو هەموو ساڵە غەمگینە کاتێ بیر لەو هەموو ڕووداوانە دەکەینەوە «ئەو ڕودانەی کە دواجار ئێوارەی پەروانە سنوورێکی بۆ دانان»، هەستدەکەین کە دوورکەوتنەوەی ڕەزا بەیەکجاری ژیانی فەرەیدونی ئاوەژووکردەوە، وای لێکرد ئیدی وەکو پیاوێک سەیری خۆی بکات کە قەدەرێتی هاوڕێکان بەجێیبهێڵن... قەدەرێتی تەنها لەوسەری هەموو تەنهاییەکاندا بمێنێتەوە. چونکە هەر لەو هەفتانەدا گوڤەندیش لە بەیانییەکی ساردی پایزدا، بە یارمەتی شۆفێرێکی پیر لەگەڵ دلارامدا لە شار هەڵهاتن و ڕویانکردە جێگایەک لە ناو ئەو زنجیرە چیا دوورانەدا. لەوێ نەسرەدینی بۆنخۆش، بە خۆی و دەمانچەیەکی چکۆلانە و دووربینێکی سەوزەوە لەسەر بەردێک لەنابەینی دەیەها ڕێگا و جەنگەڵ و بەرزایدا چاوەڕوانیدەکردن. گوڤەند لە ئێوارێی ڕۆژی بەر لە کۆچکردنەکەدا بە هەموو شوێنەکاندا گەڕا، چووە یانەکە، چووە مەیخانەکان، هەندێ لە هاوڕێ کۆنەکانی گەنجی بەسەرکردەوە، لە هەموو جێگایەکیشدا کەمێک دادەنیشت و بە غەمەوە سەیری شتەکانی دەکرد و بە هێمنی هەڵدەستا و دەڕۆیشت، دواجار کە فەرەیدونی لە بازاڕ بینی پێیگووت: «دەبێت لە سەرەتاوە دەستپێبکەینەوە، لە سەرەتای سەرەتاوە... دەبێت وا بیربکەینەوە کە ئەو هەموو ساڵانەی بەسەرچوون، ئەو هەموو سەدە دوور و درێژانە، ئەو هەموو شارە گەورە

و شارستانیەتە نغرۆیانە هیچ نەبوون... هیچ». لە دوای کۆچی گۆڤەند و دلاّرام، فەرەیدون بە ئەندازەیەک تووشی قەهربوو کە پێدەچوو هەموو وەرزەکانی خەیاڵ و ئومێد لە ژیانیدا کۆتاییان پێهاتبێت، ئەو هەفتەیە بۆ یەکەمجار لە ژیانیدا خۆی لەنێوان دیوارەکانی ماڵدا دیلکرد، نە دەرگای لە پەروانە کردەوە نە لە پوورەکانی، دوای تێپەڕینی ئەو هەفتەیەش شەوێکی پایز، کە باران و بروسکە یارییان بە پاشماوەی هەموو وەرزە مردووەکانی تر دەکرد، خۆیکرد بە یەکێ لە هەرە قەبزترین و تاریکترین بارەکانی شاردا و لەوێ لە نزیک چەند مەقامبێژێکی غەمگینەوە دانیشت، وەکو ئەوەی بیەوێت دوای هەمان سووڕی زیندەگی گۆڤەند بکەوێت. شەوەکانی داهاتووش کاتێ بازنەکانی تەنهایی، دووری، بێ هاوڕێیی، خەمەکانی عەشقی پەروانە «کە تا دەهات وەکو عەشقێکی ئەفسانەییتر و خورافیتر دەهاتە پێشچاوی» تەنگتر و تەنگتر دەبوونەوە، فەرەیدون زیاتر و زیاتر لە مەجلیسی ئەو مەقامبێژانە نزیکدەبووەوە کە هێدی هێدی، لەگەڵ تێپەڕبوونی ڕۆژان و هەفتەکاندا بوونە نزیکترین هاوڕێی، دواجاریش هەر ئەوان لەو نانەواخانەیەدا کاریان بۆ دۆزییەوە... لەو ڕۆژانەدا فەرەیدون تا دەهات باوەڕی بە دوو شت زیادیدەکرد، باوەڕی بە عەشقی بێسنووری بۆ پەروانە و باوەڕی بە تەنهایی... ناکۆکییەک هێدی هێدی تا سەر ئێسقان بەناو ڕۆحیدا دەچووەخوارێ و ژیانی وێراندەکرد.

## ١٠

لەگەڵ کۆتایی وەرزی خەیاڵاتدا، وەرزێکی ترسناک و خوێناوی دەستی پێکرد... وەرزی تاریکی قەسابخانەکان. هێشتا ماوەیەکی زۆر بەسەر هەڵهاتنی گۆڤەند و دڵارامدا نەڕۆیشتبوو، کە سێبەرە سەنگین و کوشندەکانی ترس بە لێشاو هاتنە ژیانمانەوە. لەو وەرزەدا کۆڕەوی عاشقەکان و کۆچی پیاوە تەنهاکانیش دەستیپێکرد. کە پیاوە ئاینییەکان، تۆبەکارەکان، ئەو کۆچەیان دەبینی، لە تورەییدا شەڕیان بە درەخت و ئاسمان و کوچەکان دەفرۆشت. لەو وەرزەدا ئەو پیاوانەی کە تا دوێنێ بە هێمنی لەسەر بەرماڵەکانیان نوێژیاندەکرد خەبەریانبووەوە و تەماشایانکرد پیاوانێکی دیکە دەستکاری جیهان دەکەن. بۆ ماوەیەک شتەکان هێمن بوون، ماوەیەک وامدەزانی هیچ ڕوونادات. ئەوانەی لە وەرزی خەیاڵاتەکانی خۆیاندا خەونیان بە باڵ، دەست، قاچی زیاد، وڵاتی تر و ئاسمانی دیکەوە دەبینی بە هێمنی دەچوونە سەر کاری خۆیان و هەموو شتێک ئاسایی بوو. پیاوەکانی دیکەش، لە گۆشە تاریکەکانی خۆیانەوە سەیری سەرهەڵدانی غەریزە تازەکانیان دەکرد، سەیری ئاڵوگۆڕە پڕ لە باق و بریقەکانی دونیایان دەکرد و بێدەنگ بوون، پێنەدەچوو ڕۆژگارێکی وەها خوێناوی بەڕێگاوەبێت. تا بەیانییەک بەئاگاهاتینەوە و بۆ یەکەمجار سەری دوو عاشقمان بینی وەکو دوو

زەنگی خوێناوی بەملاولای دوو فولکەی گەورەدا لە ناوەڕاستی شاردا هەڵواسرابوون. ئەوە یەکەمین دەستپێکی ئەو وەرزی خوێنە بوو کە من و پەروانە نەماندەزانی چۆن چۆنی تێبیگەین، لەو دەمانەشدا شەڕ لە هەموو سنوورەکانی وڵات گرپسەندبوو، لە ناویشەوە شەڕی نێوان دەوڵەت و خەڵک نیشتمانی وێرانکردبوو، هەندێ شەو لەبەر دەنگی گولله و موشەک نەماندەتوانی بخەوین، لە ترسدا بە خێرایی دەچووینە ژێرزەمینەکە و تا بەیانی لەوێ دەماینەوە... لەوەش ترسناکتر، باسی ئەو قەسابخانانە بوو کە هێدی هێدی ڕۆژانە دووبارەدەبوونەوە. پەروانە لەو ڕۆژانەدا ئێجگار ماندوو بوو، لەوکاتەدا ئێواران لەبری ئەوەی لەگەڵ عاشقەکانیدا بڕوات، دەچووە سۆراغی هەواڵی ئەو ڕەشەکوژییە سامناکانە کە لەملاولای شاردا ڕوویاندەدا، هەموو شەوێک دەگەڕایەوە و چیرۆکی ترسناکی بۆ دەگێڕامەوە، چیرۆکی ئەو عاشقانەی بەزیندوێتی کۆیاندەکەنەوە و دەیانسووتێنن، چیرۆکی ئەو کچانەی لەبەردەم سەرچاوەی ڕووبارەکاندا سەریاندەبڕن، چیرۆکی ئەو سێدارانەی لە کێڵگەکانی دەوروبەری شار و لە شارۆچکە دوورەکاندا بۆ خەڵکی هەڵدەخەن، سەربوردی ئەو خێزانانەی بە گوناهی جۆرا و جۆر بە تەور پارچەپارچە دەکرێن. هەندێ شەو دەگریا، زۆر دەگریا. هەندێجار سەیرم لێدەهات چۆن دڵی بەرگەی ئەو هەموو ئازارە دەگرێت، دەگریا و دەیگووت: «دونیا بۆ وەها خوێناوی و ژیان بۆ وەها ناخۆشە؟». منیش بە ترسەوە گوێمدەگرت و دەمگووت: «پەروانە، بەسە، بەسە، چیتر ناتوانم گوێبگرم». ڕۆژێک کچێکیان لە بەردەمی قوتابخانەکەماندا کوشت، شەوێکیان دراوسێیەکمانیان بە درەختێکدا لەنزیک مەیدانی جەڵەبچییەکانەوە هەڵواسی، لە یەکێک لەو شەوە تاریکانەشدا بوو کە هەستمانکرد مەترسییەکان بە ئەندازەیەکی گەورە لێمان

نزیکبوونەتەوە... شەوێک بوو پورم هات و پەروانەی برد. پەروانە بە هێمنی دەگریا، جلەکانی دەپێچایەوە و دەگریا، من ویستم تێبگەم، بەڵام ئەو هیچی نەگووت، هەر دەیگووت: «هیچ نییە خەندان... هیچ نییە، تۆ بنوو». دواجار بەرلەوەی بڕوات بە بیانووی شتێک گەڕایەوە ژوورێ و بە ئەسپایی بە منی گووت: «ئەگەر فەرەیدونی مەلەکت بینی، پێیبڵێ دەگەڕێمەوە، دڵنیابێت دەگەڕێمەوە». بەڵام من فەرەیدونی مەلەکم نەبینی.

لەو وەرزەدا بوو کە یەکەمجار ژنە دەفبەدەستەکان لە کوچە و کۆڵانەکانی شاردا دەرکەوتن، پیاوانی سەیر سەیر بە خۆیان و شوشە تێزابەکانیانەوە لەدەوروبەری قوتابخانەکان دەبینران. هەر لەو وەرزەشدا پورم وەکو دەستەڵاتدارێکی گەورە لە لەشکری خاتوونە ئیماندار و خوداناسەکاندا دەرکەوت، لەو وەرزەدا زۆر کچ وازیان لە خوێندن هێنا و چیدی نەگەڕانەوە بۆ قوتابخانە، کە بە قوتابخانەی کوفر و نەزانییان ناودەبرد، لەچکیان دەبەست و دەیانگووت: «دەبێت لەدژی بێئابڕوویی و پیسی و ڕووزەردییەکانی ئینسان جیهادبکەین». بەیانییەک ئەو ژنانە بە خۆیان و لەچکە سپییەکانیانەوە هاتنە قوتابخانە و کچێکیان لە پۆل دەرهێنا و بە قژ بە شەقامەکاندا ڕایانکێشا، ساڵۆنێکی چکۆلانەی قژبڕینیان لە بەرامبەرمان سووتاند، کوڕێکی بەرگدروویان کوشت کە کچێکی حیجاب بەسەری فریودابوو. لەو وەرزەدا کە هێشتا من تەواو لە یاساکانی دونیا و لە حیکمەتی ئەو هەموو خەیاڵ و خوێنە تێنەدەگەیشتم، ناخۆشترین شت لای من مردنی بە لێشاوی باڵندەکان بوو، ئەو باڵندانەی زۆربەی شەو لە پەنجەرەی شکاوی ژوورەکانی قوتابخانەوە دەهاتنەژوورێ و لە نابەینی مێزەکاندا دەمردن. هەر لەو وەرزەدا لەناکاو درەختی باغچەکان سیس بوون، پیاوانێکی سەیر بە

خۆیان و شمشێرە درێژەکانیانەوە، بە خۆیان و پرچی درێژەوە لەسەر شەقامەکان دەرکەوتن، بەردەمی مزگەوتەکان پڕبوو لە هەزارەها پیاو کە لە سەردەمی خەلیفە کۆنەکانەوە نەبینرابوون. پەتای سەیرسەیریش بڵاوبووەوە، کچان لە قوتابخانە یەک لە دوای یەک دەکەوتن و بێهۆشدەبوون، ژنان لەکاتی نوێژدا بە دەستەجەمعی دەبورانەوە. لەو وەرزەدا هەزارەها دەسگرەوە و فاڵچی هەموو شەقام و کوچەکانی شاریان پڕکرد، لە دەورووبەری شار پیاوێک دەرکەوت کە دەیگووت: «من مەحەمەدی مەهدیم». پێغەمبەرێکی تر سەریهەڵدا کە ئایەتەکانی بە زمانێکی تێکشکاوی عەرەبی و کوردی بۆ دەهاتەخوارێ... هەر لەو وەرزەدا دەوڵەت شەقامێکی سەیری بە دەوری شارەکەماندا دروستکرد و زۆربەی کێڵگەکانی دەورووبەری بە مین چاند... من ئەو کات لەو بڕوایەدابووم کە چیتر پەروانە لە چنگی ئەو خاتوونە خوداپەرستانە ڕزگاری نابێت، بەڵام نیوەشەوێکی تاریک پورم نائومێدانە پەروانەی هێنایەوە و بە باوکمی گووت: «ئەم کچەی تۆ، زەڕەیەک نوری خودا لە دڵیدا نییە... دۆعابکە، خودا بەزەیی بە خۆت و پیریەکەتدا بێتەوە...».

پەروانە لە دوای هاتنەوەی سەرسەختتر و دڵڕەقانەتر هەڵسوکەوتیدەکرد، کراسی زۆر کورتتری دەپۆشی، بە غرورێکی زیاتر و ڕقاویترەوە بە شەقامەکاندا دەڕۆیشت، لەو ڕۆژانەشدا بە ئەندازەیەک بێدەنگ بوو هیچم دەربارەی ژیانی نەدەزانی. ئێستاش نازانم پەروانە و فەرەیدون لەو ڕۆژگارە سەیرەی مردن و خوێندا چۆن یەکتریان دەبینی. فەرەیدونی مەلەک لەو ماوەیەدا شەوان تا بەیانی لە ناو گۆرانیبێژەکاندا دەمایەوە، ئەوان کەسانێک بوون کە تەنها گۆرانییان دەگووت، جیهان لە چواردەوریان وێران دەبوو و ئەوان تەنها گۆرانیان

دەگووت، لە بازاڕەکان، لە ژێرزەمینی ماڵەکاندا گۆرانییان دەگووت، هەندێ شەو پەتای گۆرانیگووتن هەڵیدەگرتن بەرەو شەقامەکان. هەندێ جار پیاوانی زۆر سەیر و نامۆ لە کۆڕەکانی گۆرانیدا دەردەکەوتن، گۆرانیبێژە شەیداکانیش لە مەقامەکانی عەشقەوە تا سروودەکانی شۆڕش تێکەڵاویاندەکرد، هەر ئەو جۆش و خرۆشەش دواجار هەموویانی بەرەو دەهلیزە تاریکەکانی مردن برد... ئەوان لە شەوانی مەستیدا لە چریکەی «پاوانەکانت دەزرنگێتەوە» دەیانگواستەوە بۆ «خوایە وەتەن ئاواکەی». لە «لە سیلەی قەبرانەوە» دەچوون بۆ «ئەی ڕەقیب»، لە «دیسان شەو هات بۆ حاڵی من»ـەوە بۆ «وا وەتەن خەملیوەوە»، لە «عومرێکی درێژە بە خەیاڵی سەری زوڵفت» ـەوە بەرەو «دەمی ڕاپەڕینە... دەمی ڕاپەڕین». دواجاریش کە هێزەکانی دەوڵەت کەوتە گەڕان بەدوای کۆمەڵی گۆرانیبێژدا کە مەستانە سروودە قەدەغەکانی وڵاتیان دەگووتەوە، یەکەم کەس دوو لەو هاوڕێیانەی فەرەیدون بەرکەوتن کە هێدی هێدی بووبوونە دوو کەسی نزیک لەوەوە... ئەو ئێوارەیەی دەوڵەت لە ئاهەنگێکی گەورەدا هەردوو گۆرانیبێژەکەی تیربارانکرد، فەرەیدون تێگەیشت کە چیدی ناتوانێت لەو شارەدا بژی. لەو هەفتەیەدا بوو من لەگەڵ پەروانەدا فەرەیدونی مەلەکم لە نانەواخانەکەیدا بینی... لەو هەفتەیەدا بوو کە هەموو ژیانمان گۆڕدرا و پەروانە ڕۆیشت... ڕۆیشت و لە جیهانێکی دیکەدا، لە ناو جەنگەڵە دوورەکاندا، نەسرەدینی بۆنخۆش وەکو ژمارەیەکی تر لە عاشقان بەرەو بنی خەرەندێکی قووڵ بردنی... لەوێ بە پەیژەیەکی هەزار بە هەزاردا دابەزین... من ئەمڕۆ دڵنیام کە ئەوان هەرگیز جارێکی دیکە بیری ئەم شارەیان نەکردوە، بیری ئەم ژیانەیان نەکردوە کە بە هەموو ترس و تەنهایی وغەمەکانییەوە بۆ ئێمەیان بەجێهێشت، ئێمە

خوشکە ترسنۆک و چکۆلەکانیان. دڵنیام ئەو ڕۆژەی کە لەو خەرەندە هاتنەدەرێ، خەیاڵیان لای سەفەرێکی تر بووە بەرەو عەردێکی باشتر و ژیانێکی جیاوازتر. ئیدی ئەوە دواهەمین سەفەری پەروانە بوو، بەرلەوەی ئێوارەیەکی بەفرین و سارد جارێکی دی هەموومان لەدەوری ماڵاوایەکی هەتاهەتایی کۆبکاتەوە... ماڵاواییەک کە دونیای پڕکرد لە گەردی پەپولەکان.

## ١١

فەرەیدونی مەلەک کە دابەزینی دوور و درێژ بەو پەیژە هەزار بە هەزارەدا، دیمەنی ئەو هەرێمە سەیرانەی دەهێنایەوە یاد کە لە خەیاڵدا بینیبووی، ئازادانە سەیری ئەو جەنگەڵە بێقەرارەی خوارەوەی دەکرد و دەیگووت: «لە خوارەوە، لەو جەنگەڵەدا حەتمەن ژیانێک هەیە جیاواز لەو ژیانەی کە لە شار و گوندەکان بینیومانە، من دڵنیام کزەیەکی سەیری سەرمای زستانان لەو دۆڵە تەنگانەی باکوورەوە دێن و پزیسکی ساردی ئەو ئاوە تەزیوانە هەڵدەگرن و دەیدەن بەسەر ئەم دارستانانەدا». نەسرەدینی بۆنخۆشیش کە بە چەکەکەیەوە لە ناوەڕاستی ئەو و پەروانەدا دادەبەزی، دەیگووت: «باکان زۆربەی وەخت لە خۆرهەڵاتەوە دێن، بەڵام بەوەدا کە ئەم جێگایە شوێنی پاڵەپەستۆیەکی نزمە، هەوا بە هورووژم لە هەموو دەربەند و دۆڵ و بەرزاییەکانەوە دێتەوەناوەوە». پەروانە کە دوو پلە لەسەروو ئەوانەوە دادەبەزی و لەگەڵ هەموو پلەیەکدا دەبایە بە دڵنیاییەوە قاچی لەسەر ئەو تەختانە گیرکردایە و ئینجا خۆی بۆ هەنگاوێکی دی ئامادەبکردایە، بێئەوەی سەیری ئەو هەزار بە هەزارە بکات دەیگووت: «بێدەنگبن، گەر قاچم بترازێت، دەبم بە هەزاران کەرتەوە». لەکاتێکدا هاوڕێ چاوشینەکەی نەسرەدینی بۆنخۆش، ئەو وردەواڵە فرۆشە ڕووخۆشەی کە بە خۆی دەگووت چاوساغی عاشقان، دەیگووت: «خانم، مەترسە،

تا ئێستا هیچ کەسێ لێرە نەکەوتۆتەخوارێ... بەدڵنیایی سەیری ئەو دارستان و هەور و ڕووبارانە بکە، لەوێ چەندەها خانمی وەکو تۆی لێیە، هەموویان وەکی تۆ هاتوونەتە ئەو جەنگەڵە».

نەسرەدین پێیوابوو کە چەند سەعاتێکە بەناو تەم و غوبارێکی گەرمدا کە لەو دەریاچانەی باکوورەوە هەڵدەستا دادەبەزن. فەرەیدون هەندێ جار سەیری ئەو پۆلە باڵدارانەی دەکرد کە بەلایاندا ڕادەبوردن، سەیری ئەو هەزارەها پەپولە پاییزییەی دەکرد کە بە هێمنی و بە لەنجە بەلایاندا تێدەپەڕین و بە قژ و جلەکانیانەوە دەگیرسانەوە، سەیری ئەو گوڵانەی دەکرد کە با بردوونی و لەو هەوایەدا وەستاون، سەیری پاشماوەی هەندێ عەرشی ڕماوی ئاسمانی دەکرد کە هێشتا لەو مەودا نەبینراوانەی هەوادا مەلەدەکەن. فەرەیدون هەندێ جار لەنێوان دوو چینی هەوادا هاواریدەکرد: «پەروانە سەیری پەپولەکان بکە». فەریدون دەستێکی بەردەدا و بۆ پەپولەکانی درێژدەکرد کە بەسەر شانییەوە دەنیشتنەوە، بۆنخۆش دەیگووت : «زۆر خۆت بە پەپولەکانەوە سەرقاڵمەکە». بەڵام ئەو کوڕە چاوشینە دەیگووت: «نا، دیتنی پەپولەکان لەم وەرزەدا دڵخۆشکەرە، ئەمە یەکەمجارە ببینم پەپولەکان هێندە بەرزببنەوە، چونکە هێندەی من بزانم پەپولەکان لە شوێنی بەرز دەترسن». پەروانە کە چاوی نوقاندبوو و توند خۆی بە قەراغەکانی ئەو پەیژەیەوە گرتبوو دەیگووت: «من پەپولە نابینم، پەپولەی چی؟»

دابەزین بەو پەیژەیەدا ڕۆحی فەرەیدونی مەلەکی پڕکردبوو لە هەوا و بادەیەکی سەیر، خۆشی و زیندوێتییەکی نوێی پێبەخشیبوو. بە ماوەیەک بەر لە دابەزین جریوە و هاواری باڵندەکان بە ئەندازەیەک بەرزبوو بە زەحمەت گوێیان لە یەکتر بوو. هەزارەها پاساری دەیانجریواند، سەدەها باڵندە بەیەکەوە دەیاندا لە شەقەی باڵ، نەسرەدین ئەگەرچی

لەوەوبەر چەندەها جار بەم پەیژەیەدا دابەزیبوو، بەڵام هەرگیز دیمەنی باڵندەکانی ئەو بەیانییەی لەیادنەچووەوە کە بەسەر جەنگەڵدا دەفڕین و ئیقاعی زەنگێکی خەیاڵییان بەسەر ئەو هەرێمەدا بڵاودەکردەوە، سەدەها باڵندە کە پێدەچوو لەو ساتەدا لە هەناوی خەلیقەتەوە هاتبێتنەدەرێ و هەموو ترسی لەدایکبوونیان لەگەڵ خۆیاندا هەڵگرتبێ و بێئامانج ڕووەو دەربەندێکی ڕەش بڕۆن. فەرەیدون لەسەر دوا پلەکە پەروانەی داگرت و گووتی: «ئازیزم چاو بنوقێنە و بۆنی هەتاو بکە، سەیرکە شتەکان لێرە جۆرێکی ترن». پەروانە کە زۆربەی ئەو ڕێگا درێژە بە هەواوە چاوی نوقاندبوو کە لە ئامێزی فەرەیدوندا چاویکردەوە و چاوی بەو درەختە زەبەلاحانە کەوت، چاوی بە ڕەنگی ئاڵتونی ئەو هەتاوە کەوت، ئەو سەوزییە تۆخەی بینی کە وەکو شلەیەکی چڕ لە درەختەکان دەتکا و تنۆک تنۆک دەکەوتە سەر بەردەکان، گووتی: «ئاە، خوایە، ئەمە چ مانایەکی هەیە؟». لەو بەیانییەدا هیچ یەکێک لەو سێ پیاوە تێنەگەیشتن، ئایا پەروانە لە خۆشیدا یان لە نائومێدیدا وا دەڵێت، بەڵام ئاشکرابوو دیمەنی ئەو قارچکە زەبەلاحانەی لە بنی درەختەکاندا وشکبوونەتەوە، دیمەنی ئەو هێلانە سەیرانەی لەسەر درەختەکان دەبینرا، نیگاری ئەو تولەڕێگا باریکەی بە گیا پەرژینکرابوو، بۆ ئەو ئامـاژەی شتێک بوو ئەو کات تێینەدەگەیشت.

هەر چواریان بەناو ئەو چڕستانەدا دەڕۆیشتن و دەلیلە چاوشینەکە بەو زەردەخەنە سادە و پاکەی خۆیەوە دەیگووت: «یەکەمین کەس کە پێیخستۆتە ناو ئەم دار و چڕستان و بێشەیەوە، عاشق بووە، ڕەنگە حکایەتی پەیوەندی ئەم دارستانە بە عاشقانەوە بگەڕێتەوە بۆ سەدەیەک لەمەوبەر، کاتێ عاشقێکی نەناسراو بە تەنها و بە نهێنی و دوور لە ئاگاداری هیچ کەسێ دەستیکرد بە ڕەهێڵکردنی ئەو پەیژە ئەفسانەییەی کە لەو زەمانەدا لە گوریسی کارخانە ئێرانییەکان دروستیکردبوو، لە

هەمان ئەو گوریسانەی دەریاوانە فارسەکان لە بەندەرەکانی باشوور بۆ هەڵکردنی چارۆکەکانیان بەکاریاندەهێنا، هەڵبەت پەیژەکەی بۆیە دادەهێلا، بۆئەوەی لەگەڵ دەستگیرانە بەدبەختەکەیدا دابەزنە ناو ئەم خەرەندەوە، تا خۆیان لە چارەنوسی رەشی عاشقەکانی پێش خۆیان دەربازبکەن، کە سەربوردیانیان لە دەمی حکایەتخوان و لاوکبێژە گەڕۆکەکان بیستبوو».

گەنجەکە بوارێکی چکۆلانەی دایە باڵندە نزیکەکان بۆ چریکاندن و تورەبوون، دوای هەڵکێشانی هەناسەیەک و ئێستێک و زەردەخەنەیەک گوتی: «لە دوای ئەو عاشقە، کەم کەم عاشقی بێکەس و بێپەنا هاتوون و سالانێک ئەم بێشەیەیان کردۆتە حەشارگا، هەندێکیان جارێکی دی سەرنەکەوتونەتەوە بۆ جیهان، بەلام هەندانێکی دیکەیان دوای چەندین مندال، دوای گۆڕانی دونیا و کۆنبوونی یادەوەرییەکان گەڕاونەتەوە... بەلام بەگشتی ئێرە خاکێکی چۆڵ و فەرامۆشکراوبووە».

نەسرەدین بەناو گیاکاندا دەڕۆیشت و بە دەنگێکی بەرز کە گوڵە چکۆلەکانی دەوروبەری دەترساند، دەیگووت: «ئەمڕۆ زەوییەکی چۆڵ و فەرامۆشکراو نەماوە... سەیرکە سەربازە هەڵهاتووەکان لەم چیا و دەربەندانەدا هۆبەیەکیان بۆخۆیان دۆزیوەتەوە، ئەوانەی لە دەوڵەت هەڵهاتوون هەوارێکیان ئاوەدانکردۆتەوە، دەروێش و دیندارەکان کونجێکیان لەم هەردانەدا کردۆتە مزگەوت و ماڵ، هەتا پیاوکوژەکانیش هەر ڕوو لەم دەشت و کێوانە دەکەن... ئیتر بۆ دەبێت پارچەیەک زەوی بە عاشقان حەلاڵ نەبێت؟». دەلیلە چاوشینەکە دەیگووت: «ئاخر عەشق لە هەموو شتەکان ترسناکترە، عەشق وادەکات مرۆڤ لەبری ئەوەی بۆ خودا بگەڕێت بۆ دیتنی مانگ و ئەستێرە و جوانی بگەڕێت... کێشەی عەشق ئەوەیە کە هێندە خەون دەبینێ، خۆی لەیاددەکات، دونیا لەیاددەکات... هەمیشەش بە حوزنێکی ترسناک دواییدێت، چونکە من

دەزانم عەشقی بەختەوەر بوونی نییە... عەشقی بەختەوەر هەمیشە عەشقێکی مردووە». نەسرەدین بە دەستەسرێک ناوچاوانی خۆی دەسڕی و دەیگووت: «عەشقی بەختەوەر چۆن بوونی نییە؟ عەشق خۆی بەختەوەرییە». گەنجە وردەواڵەفرۆشەکە کە چەندەها پارچە شیعری کلاسیکی لەبەربوو، کاریگەری ئەو شیعرانەش لە زمانیدا ڕەنگی دابووەوە وەڵامیدەدایەوە: «نا، نەسرەدینی بۆنخۆش، عەشق خەیاڵە... عەشق خەیاڵێکی سەیرە دەربارەی مەعشوق».

هەمووان بە بێدەنگی سەیری یەکتریان دەکرد و بەناو جەنگەڵەکەدا دەڕۆیشتن، ئیدی کەس هیچی دیکەی نەدەگووت... تاڤگە و چەمەکان بە سەرسامییەوە پێشوازییان لێدەکردن، لە قووڵایی دارستاندا بەسەر پردێکی دارینەی چکۆلانەدا دەپەڕینەوە و دەگەیشتنە یەکەمین مەنزڵگا، لەوێکانە دەیەها عاشقی ڕاکردوو لە ژێر کەپر و لە ماڵی چکۆلەدا لە نیشتەجێییەکی پەرتوبڵاودا، دوور لە یەکدی دەژیان. دیاربوو ئاوەدانییەکی نوێیە، ئەم خاکەش تازە بە بینینی مرۆڤ ڕاهاتووە. لەوەوبەر عاشقەکان لەگەڵ قافڵە و قەتارچییەکاندا بەرەو ئێران و توووران، ڕووەو چین و ماچین هەڵدەهاتن، لە سایەی ئیمپراتۆرێکەوە دەچوون بۆ سایەی ئیمپراتۆرێکی دیکە، لە ئیمارەتێکەوە هەڵدەهاتن بۆ ئیمارەتێکی دیکە، بەڵام ئەمڕۆ بستێکی ئەمین لە زەویدا نەماوە، بەدرێژایی سنوور سوپا گەورەکان بەرامبەر یەکتری وەستاون، زەوی بەشێوەیەکی ئەندازەیی ئاڵۆز لەنێوان هەزارەها سەرکردە و تیپ و گروهدا پارچەپارچەبووە. ئەو ماوەیە «نەسرەدین» وەکو تەتەرێکی برسی هەرێمە و هەرێم گەڕابوو مەکری خۆی لەگەڵ سەرۆکی خێڵەکان و بەگە گەمژەکان و سیاسیە حیلەبازەکان بۆ دۆزینەوەی حەشارگەیەک بەکارهێنابوو، بەناو دوند و دەربەند و هەوراز و سەرەوژێرەکاندا هاتوچۆیکردبوو، هەر بەو چەشنەی کە لە کۆڵانەکانی شاردا ئاهی حەسرەتی هەڵکێشابوو، لەوێش بەو

زەمینە ئاسنئاساسایەدا ڕۆیشتبوو و گووتبووی: «چ سووکایەتییەکە عاشقان لەم مەملەکەتەدا کە وڵاتی هەزار خێڵ، هەزار باب و هەزار پێغەمبەری ڕاست و درۆزن بووە، هەوارێکیان نەبێت... ئەم عەردە، ناوی چییە کە دەربەندێکی بۆ مەحەبەت نەکردبێتەوە؟... وای چ سوکایەتییەکە... چ شەرمێکە نیشتمانێ بەم گەورەییە... نیشتمانێ، سەرێکی تاقەکانی فەرهاد بێت و سەرێکی کێلەکانی مەم و زین بێت حەشارگەیەکی بۆ عاشقان تیا نەبێت... وای لەم ئابڕوچوونە».

دواجار پیرەمێردێکی کۆنە عاشق، پیرەمێردێک کە هەموو ژیانی لە شاردنەوەی خۆی و مەعشوقەکەیدا لەم چیایانەدا بردبووەسەر، دوای شەو و ڕۆژێک ڕۆیشتن، نەسرەدینی گەیاندبووە بەر ئەو پەیژەیە و گووتبووی: «ڕۆژگارێکی دوور، من هەڵهاتووی ئەم چڕوزەبەندە بووم». نەسرەدین کە لە بینینی ئەو خاکە حەپەسابوو، گووتبووی: «ئێرە لە دەرەوەی زەمەنە، لە دەرەوەی دونیایە، خەیاڵی خودایەکی ڕاکردوو لە ئاسمان خوڵقاندویێتی... پەح، لەم قەڵایە، پەح، لەم هەموو لێڕەوارە بێبنە، لەم خەرەندەی کە شەیتانیش بەبێ چاوساغێکی شارەزا نایدۆزێتەوە». پیرەمێردەکە گووتبووی: «نەسرەدین هێندە گەمژە مەبە وا بزانیت ئەم عەردە بە کەس نادۆزرێتەوە، هێندە وڵاغ مەبە وا تێبگەیت کە قەڵایەکی عاسی و ئەستەمت دۆزیوەتەوە... ئێرەش زەویەکە وەکو هەر زەویەکی تر، بشزانە پارچە خاکێک لەم دونیایەدا نییە مرۆڤ نەیگاتێت ... من ئاگادارتدەکەمەوە، ئاگادارتدەکەمەوە».

نەسرەدین سەیری ئەو پیرەمێردەی دەکرد، کە عومری لە حەشارگەکانی عەشقدا بردبووەسەر، بە حەشارگەکانی دەگووت: «کوونە عاشقان»، بەڵام هیچی نەدەگووت، لە دڵی خۆیدا دەیناڵاند: «ئەی ئەو هەموو عەشقە ناکامانە بۆ کوێ بچن؟ ئەی ئەو هەموو ئەڤینە کوژراوە ڕوو لە کوێ بکەن؟».

لە گەڕانەوەدا، سیامەندی باڵندە وەکو واشەیەکی ماندوو لە بەردەلانێکی شیندا چاوەڕوانیدەکرد، کە حکایەتی ئەو خەرەندە قووڵ و دووردەستەی لە دەمی نەسرەدینەوە دەبیست، دەیگووت: «ئەو زەوییەم نیشانبدە، من یەکەمین کەس دەبم کە دەڕۆم... هەر ئەم شەو دەڕۆم... هەر ئەمشەو مەعسومە دەهێنم».

سیامەند باڵندە یەکەمین کەس بوو کە هاتە ئەم چڕستانە، دوابەدوای ئەویش هەندێ لە عاشقانی شەرمن و بێخەیاڵی دیکە ڕوویانکردە ئەم هەرێمە، هەندێ لەو عاشقە ناکامانەی نەسرەدین لە دەمێ زەمانەوە دەیناسین، زۆربەیان ئەوکچ و کوڕە ناکامانەبوون کە پێشتر لە ئەشکەوت و بن بەردەکاندا خۆیان شاردبووەوە.

کە پەروانە و فەرەیدونی مەلەک دابەزینە ئەو خاکە، فێڵی گەلاکان و مەستی ئاوەکان ماوەیەک سەراسیمەی کردبوون، لە یەکەمین کەپردا گۆڤەندی پەیکەرتاش بە خۆی و ئەو قژە ماشوبرنجییەوە «کە ئێستا لە جاران درێژتر بوو» پێشوازی لێکردن. فەرەیدون، لە یەکەمین ساتەوە هەستی بە گۆڕانێکی قووڵ کرد لە گۆڤەندا. ئێستا پیاوێکی جیدیتر و چالاکتر دەهاتە بەرچاو، ئاشکرابوو فاسیلەیەکی بەرینتری لەنێوان خۆی و هەموو دونیادا دروستکردوە، جگە لە جۆخەیەکی شۆڕ کە بەسەر شەرواڵێکی درێژدا بەریدابووەوە هیچی لەبەردانەبوو، ئاشکرابوو بە دیتنی فەرەیدون خۆشحاڵە، بەلام هۆیەکی نادیار وای لێکرد خۆی وانیشانندەدات، ئێستا پتر خۆی بەو خرەبەردانەوە سەرقاڵدەکرد کە لە کاتی بێئیشیدا ڕەنگیدەکردن، ئەو بەردانەی کە خانوێ چکۆلەی لێ دروستدەکردن، بورجی ڕەنگاوڕەنگ، قوللەی درێژ، قەلای بازنەیی، هەموو ئەو شێوانەشی بە شێوەیەکی ئەندازەیی ئاڵۆز بە قەراغ ئەو چەمەدا دابەشکردبوو. فەرەیدونی مەلەک و هاوڕێکانی تا زیاتر بەرەو ناوەوە بڕۆیشتبانایە، زیاتر بەر هەموو ئەو شێوە سەیرانە دەکەوتن

کە گۆڤەند لەملاولای دارستانانەدا هەڵیچنیبوون، دەیەها جانەوەری سەیر سەیر، چەقەڵی مۆری باڵدار، بەرازی ڕەنگاوڕەنگ، ورچی تێکەڵاو لە پرتەقاڵی و سوور، بزنەکێویی سپی، کونەپەپوی ڕەش، کۆتری ئەرخەوانی، دەڵەکی زەرد، قەلەمونی سوور. گۆڤەند هاوڕێکانی دەبرد و زوو زوو پێیدەگووتنەوە: «بەخێربێن، بەخێربێن بۆ ئەم وڵاتە».
نەسرەدین بە دڵنیاییەکی زۆرەوە سەیری کەپرەکانی دەکرد، سەیری ئەو ماڵانەی دەکرد کە ئێستا عاشقان دروستیانکردبوو و حەسرەتی بۆ ئەوە هەڵدەکێشا کە خۆی عاشق نییە.

دەلیلە چاوشینەکە خۆشحاڵانە دەیڕوانییە ئەو لەقلەقە زەیتونییە پیرانەی لە ناو دارەکاندا وەستابوون و بە گۆڤەندی گووت: «هەر جارێک کە دێم شتێکی نوێ زیادیکردوە، جاری پێشوو ئەم لەقلەقە زەیتوونی و حوشترە خاڵدارانەی لێنەبوو. من کە چاوم بەم گیانلەبەرە ڕەنگاوڕەنگانە دەکەوێت کە تۆ لە بەرد و درەخت و گەڵا دروستیاندەکەیت، هەستدەکەم ئادەمیزادەکان زۆرجار لە وەحی پێغەمبەرایەتی تێناگەن... ئاخر مەرج نییە پێغەمبەرەکان تەنها لە شێوەی کتێبدا، یانی بە وشە، وەحییان بۆ بێتەخوار، لەوانەیە پێغەمبەران وەحییان لە شێوەی دیکەدا بۆ بێتەخوار... وانییە؟».

هەمووان بێدەنگدەبوون، سەیری گۆڤەندیان دەکرد کە لەپێشیانەوە دەڕۆیشت و بە دەنگێک کە زرینگەیەکی خودایی تیابوو دەیگووت: «زۆر سەیری ئەو پەیکەرانە مەکەن... زۆر سەیرکردنی ئەو پەیکەرانە وادەکات خەیاڵتان بەشێوەیەکی سەیر و ترسناک هەوبکات، خەیاڵتان تووشی دەردێک بێت کە چیتر ڕاستی و درۆی بۆ لەیەکدی جیانەکرێتەوە... ئەوانە پەیکەری منن... ئەوانە پەیوەندییان بە هیچ کەسەوە نییە، بە منەوە نەبێت».

پەروانە ئەو کات تێنەدەگەیشت گۆڤەند مەبەستی چییە؟ بەڵام

تێپەڕینی کات و شارەزابوون لە ژیانی ئەو دارستانە، مانای هەموو شتەکانی بۆ ئاشکراکرد.

گۆڤەند ئەو بەیانییە بە خۆی و گۆچانێکی گەورە و درێژەوە بەرەو ناوەوەی ئەو هەرێمە پێشیانکەوت، دەڕۆیشتن و ئەو ژن و پیاوە عاشقانەیان دەبینی کە لەبەردەم ماڵەکانیاندا، یان لە ناو کەپرەکاندا یان لە ژێر بەتانییەکانیانەوە سەریاندەردەهێنا و سەیری ئەو میوانە تازانەیان دەکرد، نەسرەدینیش هەمیشە بە زەردەخەنەیەکی شەرمن و کچانەوە وەڵامیدەداوە. دونیایەک بوو پەروانە لە ساتەوەختی یەکەمەوە، تووشی ترس و سڵەمینەوەیەک بوو لەگەڵیدا. کەس نازانێت لەبەر چ هۆیەک پەروانە لە یەکەمین ساتەوە ئەو پیاوەی قەبووڵ نەکرد کە خۆی وەکو پێغەمبەرێک نیشاندەدا. گۆڤەندیش سەیری چاوی ئەو کچەی نەکرد کە گەلێ چیرۆکی لەسەر سیحر و جوانی بیستبوو... بەڵام دیاربوو ئیدی هەمووان لەوێن و لەو جێگایەش دەمێننەوە. لەسەر تەنوورێکدا بەدیار ئەو ژنانەوە وەستان کە نانیان لە گەنمەشامی و بەڕوو و جۆ دروستدەکرد، لەبەر ئەو ئاگرەدا، گۆڤەند چیرۆکی ڕۆژانی سەرەتای بۆ گێڕانەوە، حکایەتی هاتن و دابەزینی خۆی لەگەڵ دلارامدا بۆ ناو ئەم دۆڵە فەرامۆشکراوە. کە قسەیدەکرد، فەرەیدون دەنگی ئەو گۆڤەندەی جارانی تیا نەدەدۆزیەوە کە لە چایخانە و سەیرانگاکانی دەوروبەری شاردا سەرخۆشدەبوو، جنێویدەدا، بوتڵی دەهاوێشت و سەمایدەکرد. ئێستا پیاوێکی دەدیت شێوەیەکی نورانی بە خۆی دەبەخشی، یەکێکی دەبینی لەشێوەی شێخێکدا دەینواند، گۆڤەند دەیگووت: « کاتێک ئێمە هاتین، هەموو پلەکانی ئەو پەیژە مەلعونە لەقبوون، دەترساین لە ژێر پێماندا بترازێن و بەرببینەوە، چینێکی ترسناکی هەور کە ئەستوراییەکەی بە ئەندازەی بڵندی بالامان بوو لەگەڵماندا دەنیشتە سەر زەوی... تا گەیشتینە خوارێ هیچمان نەبینی، تەنها ئەو هەورە

نەبێت کە لە ناویدا سێبەری چەندەها گوڵم دەبینی کە وەکو نەخشی بەجێماو و کوژاوەی سەر بەردێ لەسەر هەورەکان هەڵکەنرابوون... کە من و دڵارام گەیشتینە ئێرە جەنگەڵێک بوو تاکە تاکە عاشقانی دی تیا نیشتەجێ بووبوون، هەموو تازەبووین، هەموو لێرە نوێ بووین، پێدەچوو دەیەها ساڵیش بێت کەس ڕووی لێرە نەکردبێت، لە هەندێ جێگادا ئێسکی ئەو عاشقە زۆر دێرینانەمان دۆزییەوە کە لێرە مردبوون و دوای خۆیان کەسێ پەیدا نەبووبوو بیانشارێتەوە، یەکەم هەفتە دەبایە ئەو ئێسکانەمان بکردایە بەژێر خاکەوە تا بتوانین زیندەگییەکی ئاسایی لەم جەنگەڵەدا دەستپێبکەین، چونکە دەمانزانی شوێنێکی دیکەمان نییە تیابژین».

گۆڤەند بەردەوام بە گۆچانەکەی دەستی یاری بە وردە بەردەکانی بەردەمی خۆی دەکرد، یاری بە گەڵا وەریوەکان دەکرد و دەیگووت: «من کە یەکەمجار هاتمە ئەم دارستانە، وامدەزانی کوشتەی چارەنوسی خۆمم، شەوانێکی دوور و درێژ لەو ئاسمانانە ڕادەمام کە وەکی جۆرە ئابلۆقەیەکی ترسناکی گوناه و بێکەسی تەماشامدەکرد. من و دڵارام پێکەوە دەمانقیژاند، بەڵام دەنگی ئەو ئاوە هەموو سەدایەکی دەکوشت، هێدی هێدی دەبوایە ئەم جیهانەم دروستبکردایەتەوە، بیرم لە ئاگر و ڕاو و چاندن و پاشەکەوت بکردایەتەوە، بیرم لە پەیوەندییەکی تازەبکردایەتەوە لەگەڵ ئەم سروشتەدا کە تێینەدەگەیشتم و ئەویش تێمنەدەگەیشت، دەبایە ڕۆژانێکی زۆر لەگەڵ بەرد و درەخت و باڵندەکاندا قسەبکەم، دەبایە لەگەڵ ڕۆحی ئەو ئاوانەدا بدوێم، بیانهێنمە زمان، تا ڕۆژێک هەستمکرد تەنهانیم، هەستمکرد ئەو مەترسییە گەورانەی دەرەوە... ئەو جیهانە ترسناکەی شار و دێکان، جیهانی سیاسەت و ئاین، ڕۆژ لە دوای ڕۆژ عاشقان زیاتر بەرەو ئەم جەنگەڵە ڕاپێچدەکەن. ئێستا لە قووڵایی ڕۆحمدا هەستدەکەم، دەکرێت ئێرە شارێکی سەربەخۆ و

جیاوازی لێ دروستبکرێت، جوانتر و بەرینتر و ئازادتر لەو جیهانەی کە لێوەی هاتووین... ئێرە وڵاتێکی عاسییە، دەکرێت هەموو قەومێ، هەموو خێڵێ بەشێوەی خۆی، شەریعەتی خۆی دامەزرێنێت... دەکرێت ئێمەش شەریعەتی خۆمان هەبێت».

گۆڤەند بەردەوام بە دەنگێکی هێمن، بە دەنگی پیاوێک کە لە ژێر ئاسمانی ئەم جەنگەڵەدا بیری لە حیکمەتی ژیان کردۆتەوە قسەیدەکرد، ئاماژەی بۆ ئەو لاخەرەندە بەرزانە دەکرد کە کەس ناتوانێت پیایاندا بێتەخوار، لە باکوریشەوە ئامارەی بۆ ئەو بەرزاییە ترسناکانە دەکرد کە دەمی نیمچە دەریاچەیەک هەموو ڕێگاکانی تیا قوفڵدەکرد، لە هەندێ شوێنیشدا ئاوەکان بووبوون بە تاڤگەیەکی بەخوڕ کە زیندەوەرێک چییە لێی دەرنەدەچوو، لە خواریشەوە ئەو چەم و تاڤگانە شەتاویاندەدایە و دەریاچەیەکی دیکەیان پێکدەهێنا، دیاربوو ئەو بەو چەند مانگە کون و قوژبنی ئەو جەنگەڵە گەڕاوە، دەیزانی ئەوەی بێتە ئەم جەنگەڵە، دەبێت تەنها لەسەرەوەڕا دابەزێت.

ئەو ڕۆژە تا خۆرئاوابوون، گۆڤەند درەخت و چەم و باڵندە و بەردەکانی نیشاندان... پێچاوپێچی جەنگەڵ و ئاوەکانی بۆ ڕووندەکردنەوە، هێمنی و گەشبینییەک لە چاویدا بوو کە گەلێ بەو غەمە ئەزەلییەی ناو ڕۆحی پەروانە غەریب بوو.

شەوی یەکەم لەو جەنگەڵەدا، شەوێکی سەیربوو، لای فەرەیدونی مەلەک وەکو دۆزینەوەی دونیایەکی تربوو، لای پەروانەش سەرسوڕمان و ترس و تارمایی بوو.

لە یەکەم شەوەوە کاتێ هەموو عاشقان وەکو ئەڵقەیەکی سیحراوی گەورە بەدەوری ئەو ئاگرەدا دانیشتن، پەروانە هەستیکرد ئەم جیهانە شتێکی ترسناکی تیایە، کە سەیری ئەو سیما ماندووانەی دەکرد کە لە دەوری دەنگی پڕ لە حیکمەت و خەونی گۆڤەند کۆبووبوونەوە،

بەردەوام ئەو پرسیارەی لە خۆی دەکرد: «ئێرە بەهەشتە یان دۆزەخ؟».
گۆڤەند بەو سیما سەیر و سیحراوییەی خۆی، توانای هەبوو عاشقەکانی تر مەستبکات. ئەو هەموو شەوێ لەبەر ئەو ئاگرەدا دادەنیشت و بەو دەنگە مەست و نیمچە گرەی لەو خەونانە دەدوا کە دەیبینی، باسی ئەو دونیایەی دەکرد کە دەکرێت دروست بکرێت، نەخشەی ئەو شارە خەیاڵییانەی دادەنا کە دەشێت ببنە بەهەشت، باسی ئەو زەوییە ئازادانەی عەشقی دەکرد کە دەشێت بدۆزرێنەوە، بەڵام «پەروانە» جگە لە زەوییەکی گۆشەگیر و تاریک و شێدار هیچی دی نەدەبینی. پەروانە جگە لەو سیما غەریبانەی دەوروبەری کە بە غەریبی سەیریاندەکرد و بە غەریبی سەیریدەکردنەوە لەم جەنگەڵەدا مژدەیەکی لێ دیارنەبوو...
سەیرترین شت بۆ پەروانە دیمەنی ئەو منداڵانە بوو کە بێچووی حەرامزادەی ئەو عاشقانە بوون، کە پێشتر لە ئەشکەوت و چیا و سەر لوتکە بەرزەکاندا ژیابوون و لەویادا خێزانیان دروستکردبوو... منداڵانێ لە ژێر بروسکە و ڕەهێڵە و ترسدا گەورەبووبوون، منداڵانێک هێندەی پەیوەندییان لەگەڵ با و شەو و درەخت و گیاکاندا هەبوو، پێنەدەچوو پەیوەندییان بە مرۆڤەکانەوە هەبێت، گیانییان لە قوڕی ئەو چەمانە هەڵکشابوو، بەدرێژایی ڕۆژیش لە ناو گەڵاکاندا یاریانکردبوو. پەروانە سەیریدەکردن و دەیگووت، ئەمانە دوور لە جیهان، دوور لە شارەکان گەورەدەبن، دەبێت وەکو منداڵی زەوییەکی نەفرەت لێکراو بژین، کە سەریشی بەرزدەکردەوە جگە لە گەڵا و لق و پۆپی دۆزەخییانەی درەختەکان هیچی دیکەی نەدەبینی. ئەو شەوە کە لە کەپرێکی چکۆلانەدا خەوتن، فەرەیدون زوو بەئاسوودەیی خەوی لێکەوت، بەڵام دەنگی سەیر و پڕ لە هاژە و قریشکەی ئەو چەمانە نەیانهێشت پەروانە بخەوێت، پەروانە لەو شەوەوە ئەو مێرووە باڵدارە زیووینانەی دەبینی کە وەکو چرا دەدرەوشانەوە، ئەو کوللە گەورانەی دەبینی کە بە پۆل

بەناو جەنگەڵدا دەفڕین و باڵەکانیان نورێکی مەیلەوسوور و ئاگراوی لێ هەڵدەستا، ئەو بوونەوەرە سەیرانەی دەبینی کە گەڵا دروستیدەکردن و سەرلەنوێ تێکیدەدانەوە، ئەو ئاوانەی دەبینی کە وەک پشکۆ دادەگیرسان و دەکوژانەوە، چاوی لێکدەنا و ئەو چیلکە و چڵوچێوانەی دەبینی کە وەکو سیحربازێک کۆیانبکاتەوە، کۆدەبوونەوە و دەچوونە سەریەک و شێوەی سەیرسەیریان دروستدەکرد، کە چاویشی دەکردەوە دەیبینی بڵاودەبنەوە و لە یەکدی دەترازێن.

ڕۆژانی دواتر پەروانە لەنزیکەوە حەقیقەتی ئەو ژیانە دەبینێت، لەنزیکەوە تێکەڵاوی ئەو ژنە چکۆلە و لاوازانە دەبێت کە لە ناو ئەو دارستان و جەنگەڵەدا، سەبەتەی چکۆلە چکۆلە دروستدەکەن. لەگەڵ گۆڤەند و فەرەیدوندا دەچێتە ئەو وەرشە گەورەیە کە لە جێگایەکی چڕی دارستانەکەدا دروستکراوە، لەویادا پیاوان لە سروتێکی سەیردا پەیکەری دوو عاشق دادەتاشن کە بە ئارامییەوە ئامێزیانکردوە بەیەکدا. فەرەیدون لەو جێگایەدا، هەموو ئەو زانیاریانەی، لە شار لە وەرشەکەی گۆڤەنددا فێریبووبوو دەخاتەوە کار و دەبێتە پەیکەرتاشێکی نوێ، مەستانە گۆرانی دەڵێت و ئیشدەکات... هەر لە یەکەم ڕۆژیشدا جارێکی تر سیامەندی باڵندە دەبینێتەوە، ئەو پیاوەی هەرگیز لە کۆبوونەوە شەوانەکانی گۆڤەنددا ئامادەنابێت و بەردەوام لەسەر درەختەکانەوە بە جووتێ چاوی درەوشاوەوە سەیری شەو و گوند و عاشقەکان دەکات. سیامەند کە عاشقەکانی دیکە بە واشە و کۆلارە و داڵە شەڕانییەکان دەیشوبهێنن، ئیشی ئەوەیە درەختەکان ببڕێت و ئامادەییبکات بۆ پەیکەرسازەکان. کە یەکەمجار فەرەیدون بە تەورێکەوە دەیبینێت، دەیەوێت سڵاوی لێبکات، دەیەوێت یادەوەری ئەو دوو شەوەی بهێنێتەوە یاد کە پێکەوە لە وەرشەکەی گۆڤەند و لە کێڵگەی گوڵەبەڕۆژەکاندا بەسەریانبردبوو، بەڵام هێندەی فەرەیدون لێی نزیکدەبێتەوە، ئەو

بێئەوەی هیچ مەیلێک بۆ قسەکردن نیشانبدات، ڕوو وەردەگێڕێت و دەچێتە سەر یەکێ لە درەختەکان و لەسەرەوە لە ناو گەڵاکاندا خۆی حەشاردەدات... عاشقەکانی دیکە پێیانوایە، سیامەند کەمدوترین و ترسناکترین پیاوی ئەم دۆڵەیە، گۆڤەندیش دەڵێت: «سیامەند پێیوایە ئەم جەنگەڵە نیشتمانی ئەوە و ئێمە زەوتمانکردوە».

فەرەیدون هەر لەو وەرشەیەدا عەزیزی تیرئەنداز دەناسێت کە تاکە تفەنگچی جەنگەڵە و خۆی بە دەست ڕاستترین پیاوی دونیا دەزانێت. مەهدی گوڵەباخ دەناسێت کە ئێواران، دوای کار، گوڵەکێوییەکان کۆدەکاتەوە و لە شوشەیەکی گەورەدا گوڵاویان لێدروسدەکات. «غەمگینی بەختەوەر» دەناسێت کە ژیانی بەشێوەیەکی سەیر لەنێوان گریانی بەکوڵ و پێکەنیندا دابەشبووە. کڵپە دەناسێت کە دەتوانێت بە فیکە هەموو گۆرانییە بەناوبانگەکان و سەمفۆنیا گرنگەکان دووبارەبکاتەوە، ئەسعەدی نامۆ کە تەنها گیا دەخوات، تاهیری توتی کە هێندە لەو کەژ و چیایانە ژیاوە، بەئەستەم هەندێ وشەی لەبیرماوە و جگە لە توانای دووبارەکردنەوەی هەندێ دەنگ، بەهرەیەکی تری نییە... چەندەها پیاوی دیکەش کە لە شوێنی جیاواز جیاوازەوە دابەزیبوونە ئەو جەنگەڵە، هەمووش پێکەوە خەریکی تاشینی ئەو پەیکەرە چکۆلانانەی دوو عاشق بوون کە دەلیلە چاوشینەکە دوای ئەوان هەڵیدەکێشایە سەرێ، لەتەک سەبەتەی چنراوی کچەکاندا باریدەکرد و لەگەڵ خۆیدا دەیبردە شارە دوورەکان، لەوێ دوای گەشتێکی درێژ دەیفرۆشتن و عاشقەکان چیان بویستایە دەیکڕی و دەگەڕایەوە بۆ دارستان.

گۆڤەند لە یەکەمین بەیانیدا دەیگووت: «بڕوانە فەرەیدون، عەشق هەموو پیاوە ئاساییەکان دەگۆڕێت بۆ هونەرمەند... تەماشاکە... ببینە... ئەم پەیکەرانە لە هەموو هەرێمەکانی دەوروبەرمان دەفرۆشرێت... بەسەر زەویدا بڵاودەبێتەوە، دەچێتە ماڵەکانەوە، دەچێتە ژیانی

پیاوە بچکۆلەکانەوە». فەرەیدون سەیری پەیکەرەکانی دەکرد، سەیری وەرشەکەی دەکرد، سەیری جەنگەڵەکانی دەوروبەری دەکرد لە یەکەم ساتەوە هەستیدەکرد کە ئێرە دوا نیشتمانی ئەوە، دوودڵ لەنێوان خەونە کۆن و دێرینەکانی خۆیدا و ئەم جیهانە سەوز و چکۆلانەیەدا کە مەیلانێکی سەیری بەلای سێبەر و تاریکی و ترسدا هەیە دەچووە ژوورێ، سەیری شتەکانی دەکرد، سەیری ئەو ڕێگا سەیر و پێچاوپێچ و تاریکەی دەکرد کە دنیای ئەو کۆلیتە لەبەردەمیدا دەیکاتەوە، بە گۆڤەندی دەگووت: «لێرەوە دەتوانین بەرەو هەموو دنیا سەفەربکەین... لێرەوە دەتوانین بەبێدەنگ بفڕین». گۆڤەند بێئەوەی گوێی لێبێت دەستی بەرزکردەوە و بە هەموو عاشقە کرێکارەکانی دەگووت: «با دەستپێبکەین... با دەستپێبکەین...». خۆی لە ناوەڕاستی هەمواندا گۆچانەکەی دادەنا، قژی دەکردە دووپرچ، چۆغەکەی دادەکەن و بە هەیبەتی پێغەمبەرێکی سەرسامەوە دەستی بەرزدەکردەوە و دەیگووت: «با ڕۆح بکەین بەبەر ئەم دارانەدا». لە چەند ساتێکی کەمدا هەموان ئامادەی کار دەبوون، هەموان بەشی خۆیان لەو کۆتەرەدارانە هەڵدەگرت و دەکەوتنە تاشین. گۆڤەند یەکەیەکە بەسەریانەوە دەگەڕا، فێریدەکردن دەبێت چیبکەن، هەمیشەش ئەو فەرمانە تەلیسماوییانەی خۆی دووبارەدەکردەوە : «ڕۆحی بکە بەبەردا... تێیبگە... شەرمی بشکێنە... بیلاوێنەوە... خۆشتبوێت... هتد». دواجاریش، هێندەی بەردەستەکان پەیکەرێکی چکۆلانەیان تەواوبکردبایە، گۆڤەند هەموو توانای خۆی دەخستەکار تا دەیگەیاندە ناسکترین شێوە. هەمیشە خۆی دواهەمین تەڵەزمی دەتاشی، خۆی دواهەمین نیگاری ڕتووشدەکرد... دواجاریش کە تەواودەبوو لە جەستەی تێکەڵاوی ئەو دوو عاشقە ڕادەما و پەیکەرکەی بەرزدەکردەوە و دەیگووت: «سەیرکەن، چ موعجیزەیەکی جوانە... چ شاکارێکی بچکۆلانەیە».

پەروانەش هەر لە سەرەتاوە، بەناو ئەو کەپر و ڕێگا و قەراغی چەمانەدا دەڕۆیشت و دەکەوتە پشکنینی ئەو دونیایەی دەوروبەری، تێکەڵ بە جۆگەی ئەو ژنانە دەبوو کە لە دوای سەبەتە چنین، لەسەر چەوی ئەو ڕۆخانە دەکەوتن، ئێواران سەرنجی پیاوەکانی دەدا کە دەچوونە سەر درەختەکان، گۆرانییان دەگووت، خۆیان فڕێدەدایە ئاوەکانەوە و مەلەیاندەکرد. عەزیزی تیرئەنداز بە خۆی و تەنها ساچمەزەنی ناو ئەو جەنگەڵەوە کۆتر و چۆلەکەکانی ڕاودەکرد. تاهیری تووتی، لەسەر بەردێک ئەو ئارەزووە کوشندەیەی خۆی بۆ لاسایکردنەوەی بولبول و کونەپەپو و دارکونکەرەکان تێردەکرد. دەستەیەکیان بە کۆمەڵ لە ناو بەشە تاریک و چڕەکانی ئەو دۆڵەدا بەدوای کۆکردنەوەی بەلاڵوکی کێوی و تووترکی چۆمەلاندا وندەبوون. پەروانە ئاوڕیدەدایەوە و ئەو ژنە منداڵدارانەشی دەبینی کە لە ناو مێشووله و گیزەگیزی مێرووەکانی جەنگەڵدا شیریان بە ساواکانیان دەدا. پەروانە لە ژێر کەپرەکاندا مەعسومە دەناسێت کە بە چاوێکی پڕ لە گومان و ترسەوە دەڵێت: «ئەم جەنگەڵە گەورەترین درۆیە، عەشق ئەزەلی نییە، دواجار کە عەشقیش نەما ئێرە زیندانێکی ترە». دلارام دەناسێت کە بە ئەندازەیەک مەستی ئەو دەنگە سیحراوییەی گۆڤەند بووە، پێیوایە جارێکی دیکە ناتوانێت لە دەرەوەی ئەم دارستانە بژی. «شەهلای خوداناس» دەناسێت کە بە قورئانێکەوە ناو جەنگەڵ دەگەڕێت، لەنێوان منداڵە زۆڵەکانی خۆی و باوەڕی بێسنووری بە خودادا تووشی شێتی و وڕێنەیەکی گەورە بووە، لە یەکەم بینینیشیدا بۆ پەروانە پێیدەڵێت: «لە داهاتوویەکی نزیکدا ئەم دارستانە دەبێتە جەهەنم». «مرواری گچکەلە» دەناسێت کە تەنها مەراقی وشککردنەوەی میوەکانە، چونکە ترسێکی سامناکی لە بەفر و گەردەلولەکانی زستان هەیە.

لە ناو ئەو دارستانەدا، کاتێ باکان دێت، گەردەلولەکان هەڵدەکات،

ئاوەکان تورەدەبن، باڵندەکان دەقیژێنن، پەروانە هەستدەکات هەموو ئەو دەنگانە وەحشەتێکی قووڵ لە ڕۆحیدا دروستدەکەن، هەستدەکات کە سێبەری سەنگین و بەرینی ئەم جەنگەڵە، کچە عاشقەکانی گۆڕیوەتە سەر تارمایی ڕەنگ زەرد و بێمار، هەستدەکات کچەکان ڕۆژ بە ڕۆژ ڕەشتر و ڕەشتر دادەگەڕێن و ڕەنگی ئەو دارانە وەردەگرن، ڕەنگی ئەو بەردە بۆر و ئەسمەرانە وەردەگرن، کە لە کەندەڵانە دوورەکانەوە بەربوونەتەوە ناو ئەم جەنگەڵە. ڕۆژێک لەبن بەردێکی عاسیدا هەموو ئەو خانمانە دەبینێت بە ڕووتی لە ناو ئەو چەمەدا خۆیان دەشۆن... دەبینێت هەموو وەکو سێبەرێکی تاریک و قەترانیان لێهاتووە، دەبینێت هێدی هێدی ڕوخساری خۆیان وندەکەن و دەبنە تارمایی ڕەش. ماوەیەک پەروانە تێناگات، ئایا ئەو دیمەنە سەیرانەی دەیانبینێت، مۆتەکەی ناو خەیاڵەکانی خۆیەتی یان حەقیقەت، بەڵام کە بەرچاوی ڕووندەبێتەوە، کە ئەو ورێنە و خەیاڵانە بەریدەدەن، کە تەماشای ئەو ژنانە دەکات کە منداڵەکانیان لە لیتاوی چەمەکاندا دەردەهێننەوە، کەمێک ئارام دەبێتەوە. بەڵام دواجار دڵنیایە، ئەڵقەیەکی سپی لە تەنهایی بەدەوری مەخلوقەکانی ئەم جەنگەڵەدا کێشراوە، کە وەکو شەبەنگێکی بازنەیی لە دەوری ژن و پیاوەکان دەبینرێت. هەر لەو ڕۆژانەدا میدیای غەمگین دەناسێت، کە کچێکە لە منداڵییەوە فێری قسە نەبووە و بەردەوام بە دەفتەر و پێنووسێکەوە لەسەر بەردێکی گەورە خەریکی نوسینی مێژووی ئەو شتە سەیرانەیە کە دەیانبینێت. میدیا لەسەر لاپەڕەیەکی سپی بۆی دەنوسێت: «ئەمە جەنگەڵی گۆشەگیرییە... عەشق لێرەدا دەمرێت». پەروانە بێباکانە خۆیدەداتە دەست ئەو با ساردەی لە سکونێکی لەناکاوی نێوان دارەکانەوە دێت، لەسەر یەکێک لە بەردەکان بە خەڵوزێکی جێماو لە ئاگرێکی کۆن دەنوسێت: «من دەمەوێت بڕۆم بۆ جێگایەکی دیکە، گرنگ ئەوەیە لە شوێنێکدا نەوەستیت». میدیای

غەمگین تەماشای نوسینەکانی پەروانە دەکات، لەپشت وشەکانیشیەوە خەونێکی قووڵ و دێرین دەخوێنێتەوە بۆ دۆزینەوەی دنیایەکی ڕاستەقینەی دیکە، تێدەگات پەروانە ڕقی لە جەنگەڵە. ڕۆژانی دواتریش پەروانە لە هەموو جێگایەکدا دەکەوێتە نوسینی ئەو ڕستە سەیرانەی کە دەبنە جیهانێکی تایبەتی بۆ خۆی. میدیاش هەنگاو بە هەنگاو لە ناو ئەو جەنگەڵەدا دوای پەروانە و وشەکانی دەکەوێت کە با لە هەمان ڕۆژا دەیانسڕێتەوە، لە شوێنێکیشدا لە قووڵایی جەنگەڵدا ڕوویەڕوو بەرامبەری یەکدی دەوەستن و تێدەگەن، کە ئەو نوسینە سەیر و دووبارەبووەوەی سەر دەفتەر و دیوارە بەردینەکان، جگە لە حەقیقەتی قەتیسبوونێکی سامناک لە شوێن و لە زەمان و لە عەدەمدا هیچی تر نییە.

## ١٢

ئەو ماوەیەی من لە ماڵەوە ژیام، ژیان لە شاردا ڕۆژ لە دوای ڕۆژ شێوەیەکی ترسناکتری وەردەگرت، شەپۆلی ئەو پیاو و ژنانەی وڵاتیان جێدەهێشت، تادەهات گەورەتردەبوو، خەڵکانێکی زۆر ماڵەکانیان لەسەر شۆستەکان هەڕاجدەکرد، خەڵکانێک یادگاری پشتە دوورەکانیان دەبردە مەزاتخانەکان و دەیانفرۆشت، بە هەزارەها لەبەردەم زەڕەنگەرەکاندا سەرەیاندەگرت و زێڕ و سامانی خۆیان بەتاڵاندەدا، بێوەژنەکان گەردانەکانی ملیان، کچانیش کچێتی خۆیان دەدایە قاچاغچییەکان تا لە سنوور بیانپەڕێننەوە. شار بوویووە هەڕاجخانەیەکی گەورە، ماوەیەکی کەم بەر لە ڕۆیشتنی من، ئەو مەیدانی جەڵەبەشیان کرد بە مەیدانێکی مەزاد، من لە باڵکۆنەکەدا دادەنیشتم و سەیری ئەو هەزاران چرپا و سیسەمە گەورە و گرانبەهایانەی خەوتنم دەکرد کە ژنان و پیاوان شەوانی خەوتنی خۆیان لەسەر مەزاددەکرد. سەیری ئەو پیاوانەم دەکرد کە پانکەی بنمیچەکانی خۆیان، شوشەی پەنجەرەکانیان، سەعاتەکانی دەستیان، جلی ژێرەوەی کچەکانیان هەراجدەکرد. ئەو کچانەی ئاوێنە و سوراو و جوانی خۆیان دەخستە مەزادەوە. منداڵم دەبینی دەستکێشەکانی ڕێگای قوتابخانە، کڵاوە فەرووەکانی خۆیان دەفرۆشن، هەمووش دەیانویست خۆیان بگەیەننە قافڵەی ئەو پیاوانەی بە پێ لە دەشت و چیا و دەریاکان دەدەن... من لە یەکێ لەو

ئێوارانەدا بوو، بڕیارمدا هەرگیز ئەم شارە بەجێنەهێڵم و تا هەتاهەتایە لێرە بمێنمەوە.

لە یەکێ لەو ئێوارە سەیرانەدا بوو کە پورم دووبارە دەرکەوتەوە و بە دەنگی بەرز نەفرەتی لە هەموو ئەوانە کرد کە دینی خۆیان دەفرۆشن و ڕوو لە دیاری گوناهباران دەکەن. دەرکەوتنەوەی پورم پەیوەندی بەو پرۆژە گەورانەوە هەبوو کە پیاوانی ئیماندار بۆ چاککردنی ڕەوشت و ڕاستکردنەوەی ژیان و گرتنەوەی شیرازەکانی لەش و ڕۆح ئامادەیاندەکرد. من هەموو بەیانییەک، کاتێ خەریکی شتن و پاککردنەوەی شتەکان بووم، کە سەرقاڵی کۆکردنەوەی کرمە وەریوەکانی ژێر دایکم بووم، لەو ڕادیۆ کوردییە بێمانایەوە هەواڵی کۆبوونەوەی زانا ڕۆحانییەکانم لەگەڵ پیاوە پایەدارەکانی سوپادا دەبیست، دەمبیست ڕۆژ لە دوای ڕۆژ ئەفسەرە بەرزەکان زیاتر کاروباری ئەخلاق، کاروباری ڕاستکردنەوەی دین و ژیان دەدەنە دەست ئەو پیاوە ڕۆحانییە پایەبەرزانەی مزگەوتەکانی خۆیان گۆڕیبووە سەر قوتابخانەیەکی نوێ.

ئەو کاتەی کە پورم دەرکەوتەوە،ماڵی ئێمەش وەکو ئەو جیهانەی دەرەوە، بە هێمنی لە ناو خۆیدا دابەشبووبوو. براکانم وەکو سەدەها هەزار پیاوی تر خولیای سەفەر و دۆزینەوەی خاکێکی تر کەوتبووە سەریان، هەندێکیان لە شەوی دوای هەڵهاتنی پەروانەوە تووشی شەرمەزارییەک ببوبوون، چیتر نەیاندەتوانی سەربەرزبکەنەوە، هەندێکیشیان دەیانویست بڕۆن و بە ئازادی بژین، بەڵام باوکم بە پێچەوانەوە ڕۆژ دوای ڕۆژ پتر دەخزایە کونجی ئەو مزگەوتە تاریکانە و لەگەڵ پیاوە چکۆلەکانی دیکەدا لە بەحری پاڕانەوە و زیکر و سەڵاواتدا وندەبوو. جارجار بانگیدەکردم و دەیگووت: «بەرلەوەی کار لە کار بترازێت، دەبێت چارەیەک بۆ تۆ بدۆزینەوە...»، ئەو بە

جیدیەتێکی زۆر قووڵــەوە بیریدەکـردەوە. دەمزانـی ئەوانـە قسـەی خـۆی نیـن، بەڵکـو خەیاڵـی ئـەو خوشـکە دەفڕەنەیەتـی کـە ڕۆژانـە لـە بـازاڕی زەڕەنگەرەکانـدا باوکمـی دەگـرت و پێیدەگـووت: «بیـر لـە چارەنوسـی کچەکـەت بکـەرەوە، وا تەمەنـی لـە چـواردە سـاڵ بـەرەوژووره، کـە ئەویـش ڕەدووی پیاوێـک کـەوت، ئـەو کات چـۆن سـەر بەرزدەکەیتـەوە، سـەری لووتــی خــۆت بــەرەو چ مەملەکەتێــک ڕەشــدەکەیت، لــە ڕۆژی حەشــردا چـی وەڵامـی خـودا دەدەیتـەوە؟». براکانـم هیچیـان نەدەگـووت، مـن و براکانـم هەرگیـز پەیوەندیمـان نەبـوو، مـن جگـە لـە ئیشـکەرێکی بچکۆلانـە و بەردەسـتێکی گوێڕایـەڵ هیچـی تـر نەبـووم. زۆرجـار وامدەزانـی کـە نـاوم نازانـن، زۆربـەی کات هـەر بـە «تـۆ» بانگیاندەکـردم، منیـش جـار جـار بـە ئەنقەسـت ناوەکانیانـم یاددەکـرد، لەگـەڵ یەکـدی تێکەڵاومدەکـردن، بـەڵام هەرگیـز لێیـان یاخـی نەبـووم، مـن وەکـو پەروانـە عەیـار نەبـووم. ئـەو بـە وریاییەکـی زۆرەوە دەیبوغزانـدن، ئازاریـدەدان، لـە ناویەکـدا دەیـدان بـە شـەڕ، گۆرەوییەکانـی دەشـاردنەوە، جلەکانیانـی بـە جگـەرەی یەکـدی دەسـووتان، کلیلەکانـی وندەکـردن، نەشیدەهێشـت لـە هیـچ شـتێکدا گوناهبـار دەرچێـت. مـن بـە پێچەوانـەی پەروانـە خـۆم لـە تووڕەبوونـە ترسـناکەکەیان دەپاراسـت، خـۆم لـە چاوانیـان دەپاراسـت کـە هەنـدێ جـار هێنـدە سـەیر سـەیریاندەکردم، پێدەچـوو تەمـاح لـە شـتێکم بکـەن.

مـن «خەندانـی چکۆلـە»، عەسـرێکی فێنـک جیهانـم لـێ هەڵگەڕایـەوە... عەسـرێکی فێنـک بـە پێچەوانـەی هەمـوو چاوەڕوانییەکانـی منـەوە، باوکـم زوو لـە بـازاڕی زەڕەنگـەران گەڕایـەوە و بـە هێمنـی پێیگوتـم: «خـۆت بگـۆڕە، کراسـێکی ڕەشـی درێـژ لەبەرکـە و لەچکێـک ببەسـتە و بابڕۆیـن». ئـەوە یەکەمیـن جـار و دواهەمیـن جاربـوو تـەنها لەگـەڵ بابمـدا بچمـەدەرێ. ئیـدی لـەو ئێوارەیـەوە بابـم و خێزانەکـەم منیـان دایـە دەسـت ئـەو تۆبەکارانـە و بـۆ هەتاهەتایـە دەسـتبەردارمبوون. هـەر بـە پێچاوپێچـی

ڕێگاکانـدا تێگەیشـتم ئـەو دووبـارە بـەرەو ئـەو مزگەوتـەم دەباتـەوە کـە لـە شـەوی گـەڕان بـەدوای پەروانـەدا لـە ژێـر سـتوونەکانیدا هەڵلەرزیبـووم. کەچی کاتێـک لـە دەروازەی ئـەو مزگەوتـە چـووم بەودیـودا، هەسـتمدەکرد هەرگیـز گومـەزی لەوجـۆرە و منـارەی لەوشـێوەیەم نەبینیـووە. ئێسـتا حەوشـی مزگەوتەکـە گەورەتـر دەهاتـە بەرچـاوم، زۆر لـە هەمـوو ئـەو حەوشـانە گەورەتربـوو کـە لـە ژیانمـدا دیبـووم. مـن لـەو لەچکـە گـەرم و جلـە ئەسـتوورانەدا هەتـاوی درەنـگ وەختـی ئێـوارێ دەیسـووتانم، بـە شـێوەیەکی ترسـناک ارەقمدەکـرد، هێنـدە عارەقمدەکـرد، ئـاگام لـەو گوڵانـە نەمابـوو کـە بـە درەختێکـی تەنهـا و غەمگینـی حەوشـەکەدا شـۆڕببووبوونەوە، هـەر لـە دەرگای دەرەوەی مزگەوتەکـەوە سـێبەری هاتوچـۆی ئـەو ژنـە دەفژەنانـەم بینـی کـە باڵنـدە بچوکەکانـی حەوشـی مزگەوتیـان هەڵدەفڕانـد. سـێبەری گومـەزەکان بەسـەر دوو چوارگۆشـەی گـەورەدا بڵاوبووبوونـەوە، ئـەو دوو چوارگۆشـە جیـاوازەی کـە دوو جیهانـی گەورەیـان لـە یەکـدی دادەبـڕی جیهانـی ئێمـە و جیهانـی ئـەو پیاوانـەی کـە نەدەبایـە هەرگیـز تێکەڵبێـت. لـەوێ، لـە ناوەڕاسـتی ئـەو حەوشـەیەدا، لـە نزیـک ئـەو سـتوونە ئاسـنینە بەرزانـەوە، لـە نزیـک گـۆڕی هەزارەهـا پیاوچاکـەوە، لـە تەنیشـت ئـەو قسـنانەوە کـە لاشـەی ئـەو پیاوانـە لەپشـت چەترەکانیانـەوە هەڵگیرابـوو کـە ڕۆژ دوای ڕۆژ، سـاڵ دوای سـاڵ، سـەدە دوای سـەدە ئـەم شـارەیان گەیاندبـووە ئـەو ئێـوارە ترسـناکە... لەوێـدا، پـورم پاڵیدابـوو بـە کۆڵەکەیەکـی گـەورەوە و چاوەڕوانیدەکـردم. پێدەچـوو لەمێژبێـت چاوەڕوانمبـکات. دەیەهـا ژنـی دەفبەدەسـت لـە ناوەڕاسـتی ئـەو حەوشـەیەدا، لـە دەوری ئـەو وەسـتابوون، هەموویانـم دەناسـی، هەموویانـم لـە پرسـە و ئەڵقەکانـی زیکـر و شـەوە ڕەشـەکانی ماڵـی پـوردا بینیبـوو. بـە نیگاکانیانـدا دیاربـوو هەمـوو ئـاگاداری ئـەو ڕەشـەبا ترسـناکەن کـە دواجـار مۆزەخانـە پیرۆزەکـەی پورمـی وێرانکردبـوو... لـە چاوانیانـدا

شتێکی زیاترم لە کینە و تورەیی دەبینی، شتێک، دەکرێت ناوی بنێم نەفرین. جگە لەو دەفبەدەستانە، دەیەها کچی دیکەشم دەبینی، دەیەها کیژی منداڵکار، زۆربەیان بەتەمەن لە من بچوکتر دیاربوون، بەڵام هەموویان بە قەڵافەت گەورەتر دەیاننواند، دەموچاویان هێشتا ڕەنگی ئەو سێبەرە قورسەی ماڵی بەسەرەوەبوو، ڕەنگی حەوشە تاریک و نسرمەکان، کەسمان نەماندەزانی بۆ لێرەدا کۆیانکردوینەتەوە، هەموو لە حەوشی مزگەوتەکەدا و دوور لەیەک بە چاوێکی غەمگین و پڕ لە گومانەوە سەیری یەکترمان دەکرد. ئەو ئێوارەیە باوکم پەلی منی بەرنەدا تا مەچەکمی دایەدەست پورم، ئەو ژنەی کە وەک لە نەخشی سەر دیوارێک وردبێتەوە، لەو سیما زەرد و ترساوەی منی دەڕوانی... سیمایەکی زەرد و ترساو، بەڵام گەشاوە بە خەندەیەک کە ئەو کچە چکۆلە و ترساوانەی دیکە، ئەو باوکە شەرمن و پیرانەی تر نەیاندەبینی، بەڵام پورم بە ڕوونی لە چاوانمدا دەیخوێندەوە.

باوکیشم پەرییەوە بۆ ئەوبەر، چووە ناو چوارگۆشەی باوکە خەجاڵەتەکان. فریاکەوتم ئاوڕێکی غەمگینی لێبدەمەوە، فریاکەوتم کاتێ لە ناو حەشاماتی باوکە پیرەکانی دیکەدا وندەبێت نیگایەکی خێرای بکەم. ئەوە دواهەمین جارم بوو باوکم ببینم، ئیدی تا ڕۆژی مردنی یەکجاری دیکە لە ئێوارەی پەروانەدا بینیمەوە.... پورم کاتێ ئەو ئاوڕە غەمگینەی منی دەبینی لە باوک، دەیگووت: «بڕۆ و ئاوڕمەدەرەوە». ئەو پەلی کێشدەکردم و بەسەر پلەیەکی بچکۆلانەدا بۆ ناو دنیایەکی نوێ سەریدەخستم... دونیایەک، ساڵانێکی دوور و درێژ، ڕۆژانێک وەکو دیل و ڕۆژانێکیش بە ویستی خۆم تیا مامەوە... پەلی گرتم و بردمی بەرەو جیهانێکی سەیر، جیهانی خوشکە تۆبەکارەکان، جیهانی ئەو کیژە منداڵ و گەنجانەی قەدەریان بوو گوناهی خوشکەکانیان هەڵگرن و پاکیبکەنەوە، جیهانی ئەو کچانەی

کە دەبوایە کڕنووشبەرن و بخوێنن و نوێژبکەن و وسڵی پیسێتییەک دەربکەن هەرگیز لە جەستەیان نەدەبووەوە. باوکم لە حەشاماتی پیاوەکاندا ونبوو، منیش لە حەشاماتی ئەو کچە ترساوانەدا کە بۆنێکی قورس و کوشندەیان لێدەهات. ئەوان لە چوارگۆشەیەکدا و ئێمە لە چوارگۆشەیەکی دیکەدا، کچەکانی دەوروبەرم بۆنی «ماڵیان» لێدەهات، بۆنی ئەو قاپوقاچاغ و سفرانەیان لێدەهات کە ژیانیان لەنێویدا بەسەربردبوو، بۆنی پاشماوەی ئەو قازانانەی نیوەڕیان لێ هەڵدەستا کە بە پیسی لەبەر بەلۆعەکاندا جێیانهێشتبوو. من شەیتانێک لە ناو دڵمدا پێیدەگووتم: «تەماشاییکە، تەماشاییکە». من تەماشای پورمم دەکرد کە لەگەڵ ژنە دەفبەدەستەکاندا وەکو پورەیەک هەنگی سپی دەهاتن و دەچوون... دەمڕوانی و چرپە و پێکەنینی نهێنی هەندێ لە کچەکانم دەبینی، دەمزانی هەندێکیان، وەکو وازییەک تەماشای شتەکان دەکەن. ئەوان زۆربەیان مەملەکەتی ترسناکی ئەو ژنانەیان نەبینیبوو... بەڵام من دەترسام، سەرم بەرزدەکردەوە و بۆ چاوانی دەگەڕام، ئەو چاوانەی لە ناو ئەو حەشاماتەدا دەمدۆزییەوە و دەمبینی بۆمدەگەڕێت، تا ئەو زیاتر لە منی دەڕوانی، پتر ئەو تەنهایی و ترسەی ناو ڕۆحم قووڵتر و قووڵتردەبووەوە، پتر سێبەری ئەو ئێوارەیە لەسەر هەناسەم قورستردەبوو. ئیدی زۆری نەبرد هەمووان ئامادەبوون... هەمووان لەم مەیدانە سامناکەدا خۆیان بۆ شتێک تەیارکردبوو، کە دەفەکان دەستیان بە کووتانکرد، باڵندەکانی سەر گومەزەکە پۆل پۆل هەڵفڕین، هەموو سەرمان دانەواند و ملکەچانە گوێمان لەو سەڵاواتە درێژانەی خانمەکان گرت کە لە پشت ئێمەوە لە حەوشەکەدا زیکرێکی شێتانەیان دەستپێکرد، مەلاکان لەبەردەمماندا هاتن و تێپەڕین، ئێمە لەسەر فەرشی باریک و بچکۆلانە دانیشتبووین، من لە ڕیزی ئەو هەموو زانا ئاینییەدا ئەو پیاوەم ناسییەوە کە لە شەوی هەڵهاتنی

پەروانەدا دەستیبردو منی لە ناو گێژاوی حەشاماتێکی کوێردا دەرهێنا. هەستمدەکرد فەنتازیایەکی ترسناک بەڕێوەیە، دەمزانی دەفەکان بێدەنگ دەبن و ئەو پیاوانە دێنە قسە. من لە جێگای خۆمەوە بۆنی عارەقی جبە و فێست و فرمێسکەکانیانم دەکرد، لە جێگای خۆمەوە گریان و پێکەنینی کوژراوی ناو دڵیانم دەبینی، ئاگاداری ئەو کچە چکۆلانانەش بووم کە بە دزییەوە سەیری یەکتریان دەکرد و دەیانویست پێبکەنن. هەندێ لەو کچانەی بە تەمەن گەورەتر دەیاننواند، بە شەرم و ترسێکی زۆرەوە سەریان دانەواندبوو و نەیاندەوێرا نیگاکانیان بەرزبکەنەوە. ئەو ئێوارەیە من وەکو شەیتانێک بەراوردی نیگاکانی ئەوانم دەکرد و ترسێکی سەیر لە ڕۆحمدا گەورەدەبوو، هەموو کچە گەورەکان ترساوتر و ڕەنگزەردتر دیاربوون، تا گەورەتر دەربکەوتنایە نیگاکانیان شەرمنتر و تەماویتر و کوژراوتر بوو. منداڵەکان بە گشتی گەشتر و کراوەتر و بزێوتربوون، من سەیری چواردەوری خۆم دەکرد و نەمدەزانی لە کوێی ئەو دوو دەستەیەدام، سیمای گێژ و شین هەڵگەڕاوی کچە هەرزەکارەکان تۆقاندبوومی. گووتم: «خوایە، هەموو گەورەبوونێک موسیبەتە»... ماوەیەکی زۆر تەهلیلەکان بەردەوامبوون، هاواریاندەکرد: «مەدەد یا حەبیبی عالەم»، «مەدەد یا شاهی بەڕ و بەحر»، «مەدەد یا پیری پیران». هەستمدەکرد ڕۆحی هەندێ لە کچەکان وردەوردە سڕدەبێت، وەکو تەلیسمێک ڕایانپێچێت دەکەوتنە ناو ئەو بازنەیەوە، بەڵام مەلاکان بەردەوام یارییان بە تەزبیحەکانیان دەکرد. سەیری ئەو دەست و پەنجە وشکەڵاتووانەمَ دەکرد، سەیری ئەو تەزبیحە کۆنانەم دەکرد، ئەو زەردەخەنە شەڕانییەی سەر سیماشم تا دەهات گەورەتر دەبوو. تەماشامدەکردن و نەمدەتوانی بەسەر ئەو خەندەیەدا زاڵبم، چیتر ئەو خەندەیە خەندەی من نەبوو، بەڵکو بۆ خۆی لە سەیرکردنی شتەکانەوە، لە دیمەنی عاجباتی مەخلوقاتەکانەوە

هەڵدەقوولا، لەو سێبەرە سەیرەوە هەڵدەقوولا کە دەمبینی دەگۆڕێت و لەگەڵیشیدا ڕەنگی هەموو شتەکانی تریش دەگۆڕدران، زۆربەمان سەرمان داخستبوو، بەڵام من بە وردی تەماشای هەموو شتەکانم دەکرد، ئاگاداربووم ژنە دەفبەدەستەکان زوو زوو تەماشایاندەکردم، ئاگاداربووم مەلاکانیش سەرنجی ئەو خەندەیەی من دەدەن. نیگاکانیان بەشێوەیەکی بازنەیی دەسوڕانەوە و دووبارە دەگەڕانەوە سەر ڕوخساری من، دەمبینی هەموو لەکاتی جیاواز جیاوازدا سەیری ئاسمانیان دەکرد، سەیری قوبەی منارەکانیان دەکرد، سەیری مێروولەکانی بەرپێیانیان دەکرد، دواجاریش دەگەڕانەوە و چاوێکیان بەو سیما هێمن و لەسەرەخۆ و ئارامانەدا دەخشاند، بەڵام لەناکاو وەکو لە بەردێک هەڵنوتێن، دەوەستان و سەیری ئەو خەندەیەی منیان دەکرد. هێدی هێدی دونیا تاریک دادەهات، پورم بەردەوام چاوەدێری منی دەکرد، ئاشکرابوو دەترسێت لە ساتێکی غافڵیدا ئەو خەندەیە ببێتە قاقایەکی گەورە، بەڵام من خۆم لە هەرکەسێ باشتر دەمزانی کە ئەو بزەیە لە گریانەوە نزیکترە نەک لە پێکەنین.

گوێم لێبوو دەفەکان بێدەنگ دەبن، سڵاواتەکان بێدەنگ دەبن، منارەکان بە خۆیان و پاسارییە غەمگینەکانیانەوە بێدەنگ دەبن، کۆترەکان لە دوورەوە دەگەڕێنەوە سەر گومەزەکان، پیرەمێردەکان هەموو لە جێگای خۆیان هەڵدەستان، تەزبیحەکان بۆ ساتێ ئارامدەبوووەوە، ئەو قەترە ئاوە سپیانەی کە فرمێسکی پیری بوو نەوەک غەم لە چاواندا دەوەستا. «مەلا کەوسەری باغەوان» هەڵدەستا و بەرەو پێشی سەکۆیەکی بەرز دەڕۆیشت، هەمووان شێوەی دەریایەکی هێمن بێدەنگدەبوون، لە ناو ئەو سکونە ترسناکەدا دەفژەنێک دەستی بەرزدەکردەوە و لەچکەکەی خۆی توونددەکرد، سروەیەک هەڵیدەکرد، گەڵایەکی تەنها بەسەرسەری بازنەی باوکاندا دەفڕی و لەبەردەم مندا

دەکەوتەوە. مەلا کەوسەر دەگەیشتە بەردەم مینبەرێکی بچکۆلانە، چاوێلکەکانی دەگۆڕی، بەڵام بێئەوەی هیچ کاغەزێک لە گیرفانی جبە شینەکەی دەربهێنێت، دەستیدەکردە قسەکردن، خاتوونە ئیماندار و سپیپۆشەکان، وەکو بت دەوەستان. پورم بەردەوام سەیری ئەو خەندەیەی نێو نیگای منی دەکرد، خەیاڵی لای ئەو گەڵا چکۆلەیە بوو کە من هەڵمدەگرتەوە و یاریم پێدەکرد، دیاربوو لەو نەسیمە چکۆلانانە دەترسێت کە لەنێوان دارەکاندا تێدەپەڕی، ئاشکرابوو باوەڕێکی تەواوی بەو توانا شەیتانییەی من هەیە لەسەر خولّقاندنی ڕەشەباکان، بەڵام باوەڕی بە خودا و بەو ئایەتە دوور و درێژانەی لە ژێر لێوی خۆیەوە دەیخوێندن بەهێزتر بوو. منیش جارجار ئەو گەڵا بچکۆلانەیەم هەڵدەگرت و لاسکەکەیم دەسوڕانەوە و نیشانی ئەو ژنە ترساوانەم دەدا کە دیاربوو ئێستا لە هەموو نەسیمێکی بچوک سڵدەکەنەوە، دیاربوو هەموو لەرینەوەیەکی هەوا بەجۆرێک لە یاری شەیتانانەی من دەزانن... کەسیان نەیدەزانی من هەرگیز لەگەڵ باکاندا بەیتم نەبووە و هەردەم کچی هێمنییەکان بووم.

«مەلا کەوسەری باغەوان» بە پیاوەکانی دەگووت: «گوناه هێندە زۆربووە شارەکان نایگرێت، دەشتە پان و بەرینەکان نایگرێت، بیابانەکان نایگرێت، بڕوانن، گوناه وەکو باران بەسەر سەرماندا دەبارێت، گوناه وەکو با بەسەر سەرماندا هەڵدەکات، گوناه وەکو بەفر لەسەر ڕۆحەکان نیشتووە». سەیرێکی سیما بێدەنگ و ئەبڵەقەکانی دەوروبەری خۆی دەکرد و لەسەری دەڕۆیشت: «لەنێوان هەموو گوناهبارێک و گوناهبارێکدا گوناهبارێک دانیشتووە. لەنێوان هەموو خەتاکارێک و خەتاکارێکدا خەتاکارێک نێژراوە، ژیان خۆی بۆتە گوناه، هەوا پڕبووە لە شەیتانەکان، ئاو پڕبووە لە گومڕایی، سامانەکان گڵاوبوون، جەستەش کوللی و برین و هەلاهەلابوون چاوەڕوانیدەکات،

ڕۆح... ڕۆح، جگە لە ئارەزووییەکی چڵێسانە هیچی تر نییە، لەش بووە بە پارچە گۆشتێکی سوکنا بە خراپە... لەبەرئەوە من فەرمانتان پێدەدەم ئیشی ئێمەیە، ئاسمان پاکبکەینەوە، زەوی بگۆڕین، لە کاتی ئەم ئاوە حەرامانە نەخۆینەوە، ڕۆح چاکبکەین، لەش دەستەمۆبکەینەوە، ناوی خوا بهێنینەوە ناو دڵ و سەرزوبان».

ئێستا لە قسەکانی ئەو پیاوە تێدەگەیشتم، دەمزانی ئەو پیاوانە هەموو مێرد یان باوکی ئەو ئافرەتانەن کە زینایانکردوە، ڕەدووکەوتون، بێبن کراون، شارە و شار هەڵگیراون، خراپە پیشەیان بووە. تێدەگەیشتم ئەم کچە ترساوە بچکۆلانەی دەووبەرم، ئەم کیژە هەرزەکارە شەرمنانە، هەموو خوشکی ئەو خاتوونە خراپەکارانەن، کچی ئەو دایکە سۆزانییانەن کە بە لێشاو لەو چەند وەرزانەی دواییدا دوای شەیتانی ئارەزووەکانی خۆیان کەوتون، حەرام و حەڵاڵیان لەیاد خۆیان بردۆتەوە. ئێستا دەمزانی هەموومان سەربە یەک خێزانین، هەموومان کەسانی نزیکی ئەو کچ و ژنانەین کە پەیوەندییان بە شەیتانەوە هەبووە. لە دڵی خۆمدا هاوارمدەکرد: «کەواتە ئێمەیان هەڵبژاردووە، ئێمەیان لەو دونیایە جیاکردۆتەوە». دەمویست لە شوێنی خۆم هەستم و ئەو مزگەوتە و ئەم ئێوارەیە و ژێر ئەم مەلەکوتە ساردانە جێبهێڵم، بەڵام دەنگێک لە قووڵایی ڕۆحمدا پێیدەگووتم: بۆ کوێ دەچیت، تۆ چیتر سەربەم جیهانەیت، تۆ چیتر لەم ئابلۆقە گەورانەدا دەربازێکت نییە.

هێدی هێدی شەو داهات، چراکان داگیرسان، هەستمدەکرد ئیدی لێدانی زەنگەکانی دڵی من سوودێکی نییە. «مەلا کەوسەری باغەوان» لە ژێر چراکاندا دەنگی بەرزدەکردەوە و دەیگووت: «ئێوە هەمووتان باوکانی کچی گوناهکارن، خوشکی کچی ئەوتۆن کە خەتایەکی هێندە سامناکیان کردوە زەوی و ئاسمان بەسەر یەکدا هەڵدەگێڕێتەوە،

ئێوە لکەیەکی زۆر گەورە، گەورەتر لەوەی عەبدێکی بچوکی وەک من بتوانێت باسیبکات بە ئابڕووتانەوەیە، کە دەڕۆن بە گوناهێکەوە بەسەر زەویدا دەڕۆن، کە منداڵتان دەبێت بە گوناهێکی تر و بە خەتایەکی زیاترەوە دێتە دونیا، کە دەردەکەون، خراپەیەک بەبیر دڵە سادە و پاکەکاندا دەهێننەوە، کە خۆتان دەشارنەوە هەموو ڕۆحێکی سازگار و بێگەرد گومان لە ونبوون و نادیاریتان دەکات، کە دێنە بەردەمی میحراب پەڵەیەکی سیاه بە ناوچاوانتانەوەیە، کە پشتدەکەنە میحراب نیازتان ئاشکرا نییە، کەس نازانێت چی لە حەوش و هەیوان و پشت هەیوانەکانی ئێوەدا ڕوویداوە؟ چی لە ڕیواق و سەرداب و هەورەبانەکانتاندا ڕوویداوە؟ تا کچەکانتان خراپەیەک بکەن فریشتەکان و شەیتانەکانیش ئەژنۆیان لەبەردەمیدا بلەرزێت، چی لە ژووری خەوتن و لە ژێر پێخەف و لەبەردەرگا و سەردابەکانتاندا ڕوویداوە، تا گوناهێکیان لەدەست بترازێت ئەستێرە و دەریا و ڕەشەباکان لەبەردەمیدا بلەرزن».

من دەترسام، ئەو کچانەی چواردەورم سەریان داگرتبوو وەکو چەند باڵندەیەکی پەلشکاو گوێیان دەگرت، ئەو مەخلوقاتانە لەبەردەم هەموو وشەیەکدا زیاتر و زیاتر بچوکدەبوونەوە، زیاتر و زیاتر گومانیان لە خۆیان دەکرد، مەلا دەیگووت: «ئەوەی کە ڕوویداوە... سامناکە، سامناکە، سامناک. هەریەکێ لە ئێوە کچێکتان گەورەکردوە، ئافرەتێکتان گۆشکردوە، کە دەکرێت بە چەند خراپەکارێکی لەو جۆرە هەموو خەلیقەت تەفروتونا بکرێت، شارێک سەرلەبەری ببێتە خۆڵەمێش و تەپوتۆزی خراپە نغرۆببکات... سەیرکەن، کافران و بێئیمانان چۆن ڕووەو هۆردوی گوناه و خەتا ڕێچکەیان بەستووە، چۆن بەرەو وڵاتەکانی ڕەزیلەت و خراپە قەتارەیان گرتووە. بڕوانن، جاهیلییەت و وەحشییەت دەگەڕێتەوە... وای... بڕوانن وەحشییەت سەری هەڵداوەتەوە و دەرگای پێگرتووین... مرۆڤ بەرەو ئەو ڕۆژانە دەڕواتەوە کە هێشتا ناوی

خـودای نەدەناسـی، لەفـزی ئـەو لەسـەر زاری نەبـوو، نـوری ئـەو دڵانـی ڕۆشـن نەکردبـووەوە، بـەرەو ئـەو سـەردەمانە دەگەڕێتـەوە کە هێشـتا بۆنـی موبارەکـی پێغەمبـەران باغچـەی ئینسـانیان پـڕ لـە عەتـر نەکردبـوو... وای لـە مـن... وای... گوناهبـاری یەکەمیـش ئێـوەن، خەتـاکاری یەکـەم ئێـوەن، قوربانـی یەکـەم ئێـوەن، ئـەم وەحشـییەتە لـە حـەوش و هەیوانـی ماڵەکانـی ئێـوەوە هاتـووە». ئـەو قسـەیدەکرد و بـاوکان دەسـتیاندەکردە گریـان، لـە گەرمـەی ئـەو هەناسـە قـووڵ و داد و بێـدادە گەرمانـەدا بـوو دەمبینـی ئـەو کچـە چکۆلـە و بێگوناهانـەی تەنیشـتم هەمـوو گیانیـان دەلەرزێـت و دەگریـن، بـاوکان هەندێکیـان بـە زۆر ددانیـان بەخۆیانـدا دەگـرت، کچـان بـە ئەسـتەم دەیانتوانـی لێشـاوی ئـەو حەسـرەتە بگـرن کـە بـەر گـەرووی گرتبـوون. منیـش تـرس و خەنـدە و شـەرمەزاری بەجۆرێکـی سـەیر لەسـەر سـیمام تێکەڵاوبووبـوو، بـەڵام نەدەگریـام. لەوکاتـەدا کچێکـی بچکۆلانـە لەتەنیشـتمەوە بـە چرپـە گووتـی: «خەنـدان، خەندانـی بچکۆلانـە بگـری... باشـترە بگریـت». مـن بـە ئەسـپایی وەڵاممدایـەوە: «نامەوێـت بگریـم». ئـەو گووتـی: « لـە ئێسـتاوە مەیکـە بـە عینـادی، کـەس نازانێـت چـی دەبێـت و چـی ڕوودەدات، تـۆ لەمـڕۆوە بکەویتـە سەرسـەختی بـاش نییـە، باوەڕتبێـت بـاش نییـە». ئـەو کچـە «فەتانـەی غەمگیـن» بـوو کـە دواجـار پێکـەوە ڕێگایەکـی زۆر درێژمـان بـڕی. ئـەو خانمـە حکایەتخوانـە بـوو کـە سـاڵەهای سـاڵ شـەڕی لەگەڵـدا کـردم، لەسـەرئەوەی کـە مافـی ئـەوە ئـەم چیرۆکـە بگێڕێتـەوە. «ئەگـەر ڕۆژێکیـش هـات و ئـەو چیرۆکـی خـۆی گێڕایـەوە، بزانـن کـە هەمـان چیرۆکـی کچێکـە کـە وەک مـن بەنـاو بازنـە سامناکەکانی ڕۆژگارێکدا ڕابـورد، کـە ئەگـەر لـەم وڵاتـەدا نەژیابایـە، ئـەم مەلەکوتـە تاریکانـە ڕاپێچیـان نەکردبایـە، دەکـرا لـە فەنتازیاکانـی خۆیـدا ونبێـت و ئازادانـە بـژی و کەسـیش سـزای نـەدات». ئـەو شـەوە هیچـی دیکـەی لەگـەڵ منـدا نەگـووت، هەسـتمدەکرد زۆر بەکـوڵ دەگـری، لـە

کچەکانی دی زیاتر دەنگی بەرزدەکردەوە، لەگەڵ ئەوەشدا من دەمزانی بەدرۆ دەگری، بەدرۆ و لاقرتێییەوە کردوێتییە ناڵە و فیغان، دواتریش بە پێکەنینەوە پێیگووتم، ئەگەر خۆی نەیەوێت، هیچ هێزێک لە دونیادا ناتوانێت بیخاتە گریان.

ئەو شەوە مەلا کەوسەری باغەوان، باوکەکانی خستە بەردەم دووڕیانێکی سامناک، دەبایە یان وەکو گوناهکار و نەفرەتلێکراوێک بمرن یان بەقەد گەورەیی ئەو گوناهەی هەڵیانگرتووە خزمەت بە خودا بکەن. ئەو دەیگووت: «کچەکانتان بکەنە قوربانی خودا... ئا، بیانکەنە قوربانی، بیانکەنە قوربانی، قوربانی، قوربانی». خودایە، بەشێوەیەک هاواریدەکرد هەموو درەخت و گومەز و ئاوەکان دەلەرینەوە، ماسیەکانی ناو ئەو حەوزە گەورەیەی پشتمان بەجۆرێ ڕادەچڵەکین پولەکەکانیان دەوەری، کۆترەکان هەڵدەفرین و پەڕ و باڵیان بەسەر سەرماندا دەهاتەخوار، ئەو بەشێوەیەکی سەیر ددانی بە وشەکاندا دەنا، هێندەش دووبارەیدەکردنەوە ماندوو دەبوو، دەنگی دەنووسا، بەسەر مینبەرەکەدا دەنووشتایەوە و بە چاوە تورە و هیلاکەکانی سەیریدەکردین، دووبارە خۆی بەرزدەکردەوە، گەرووی پاکدەکردەوە و بە هێمنی دەیگووت: «ئا، بیانکەنە قوربانی، بیانکەنە فیدای خودا، ئەگەر دەتانەوێت گەردنی خۆتان لەو تەوقە ترسناکانەی گوناە ڕزگاربکەن، ئەم زەعیفانە، ئەم مەخلوقە لاوازانە کە خوێنیان لە هەمان خوێنی دایک و خوشکە خەتاکارەکانیانە لەو گۆماوەی دنیا دەربهێنن، لەو زەلکاوە دەریانبهێنن کە سەرچاوەی هەموو شەهوەتێکە... ڕزگاریانکەن، ڕزگاریانکەن، هاوار... هاوار... ڕزگاریانکەن ». مەلا کەوسەر پڕ بە بڵندگۆکە هاواریدەکرد: «دنیا یانی شەهوەت، ئەم قوتابخانە نەگریسانەی ئەمڕۆ یانی شەهوەت، مەحەبەتی بەشەر بۆ بەشەر و لە یادکردنی خودا یانی شەهوەت... یەک ڕێگاش هەیە بۆ ڕزگاربوون، ئەویش ڕێگای دابڕانە

لەم بەحری بە شەپۆلی خەتایانە، ڕێگای دابڕانە لەم ڕێگای تاریکی گوناهە، هەر ئەوەش ئەم گوناهبارە بەستەزمانانە پاکدەکاتەوە، لە شەوقی چراکانی ڕەزیلەت و لەزەت دوریاندەخاتەوە».

«مەلا کەوسەر» بە درێژایی هەموو قسەکانی، لەناکاو هەڵدەچوو و لەناکاویش هێور دەبووەوە، دواجار پشت ملی دەسڕی و نێوچاوانی پاکدەکردەوە و دەیگووت: «نا من نەهاتووم وەعزبدەم، هاتووم ئەم ڕۆحە خراپەکارانە ڕزگاربکەم، ئەمڕۆ ئێوارێی ڕزگارییە، ئێمە بۆیە لێرە لە ژێر گومەزە پاکەکانی خودادا دانیشتوین، لە ژێر سێبەری مەلەکوتی بەرینی ئەودا وەستاوین، تا سەرلەنوێ لەسەر ئەم ڕۆحانە کاربکەینەوە، لە گوناه و خراپەکان پاکیانبکەینەوە، کۆمەڵەیەک لە داوێنپاکانیان لێدروستبکەین کە ڕێگای خراپەکاری نەگرن... ڕێگای خوشکە فاجیرەکانیان هەڵنەبژێرن... تا نەهێڵین خراپە زەفەر بە لەشە بچکۆلەکانیان و عەورەتە عاسیەکانیان بەرێت... من هاتووم لە ژێر سێبەری ئەم منارەدا دروستبوونی قوتابخانەیەک ڕادەگەیەنم بۆ ئەم کیژانەی ئێوە، ئەو کیژانەی لە خێزانی خراپ، لە ئامێزی دایکی خراپ، لەپاڵ خوشکی شەهوەتبازدا ژیاون و گەورەبوون، هاتووم کۆمەڵەیەک ئاشکرابکەم کە کۆمەڵەی خوشکانی تۆبەکارە... کۆمەڵەی ئەو ئافرەتانەیە کە لەتەنیشت شەیتانەوە ژیاون، لەتەنیشت شەیتانەوە ڕۆحی خۆیان ناسیوە، هەر شەیتانیش یاری بە وەتەرەکانی دڵیان و جەستەیان کردوە».

ئەو قسەیدەکرد و باوکان دەگریان، یەکەیەکە هەڵدەستان و بەسەر دەستیدا دەکەوتن، کچەکان هەڵدەستان و خۆیان دەدا بەسەر داوێنیدا، ئەویش هاواریدەکرد: «ڕزگاری ئێوە بە دەست من نییە... بە دەست من نییە... ئەو گوناهە گەورەیەی ئێوە بە شەفاعەتی عەبدێکی وەکو من ناسڕدرێتەوە، من تەنها دەتوانم ڕێگاتان نیشانبدەم، دەتوانم

ئەو خەڵوەتە سازبکەم کە تیایدا ڕۆح خۆی لەگەڵ خودای خۆیدا بڕیاردەدا... ڕزگاری ئێوە بە دەست خۆتانە».

ئەو ئێوارێیە کۆتایی ڕۆژە هێمن و سادە و فێنکەکانی ژیانی من بوو. لەو ئێوارەیەوە من بووم بە یەکێک لەو خوشکە تۆبەکارانەی ناوبانگی تەقوایان سالآنێک دوور و درێژ ولآتی پڕکرد، بووم بە یەکێ لەو کۆمەڵەیەی سالّ دوای سالّ کچانی خراپ و بەدڕەوشتی کۆدەکردەوە و دەیکردنە مرۆڤی ئیماندار، ئەو کچانەی کۆدەکردەوە کە وەکو ئێمە سەرپەرشتکارێکیان نەبوو، ئەوانەی دوای گومڕایی، تۆبەیان هەڵدەبژارد. هەندێکیان بە ئازادی خۆیان دەهاتن و هەندێکیشیان فشاری برا و باوک پالّیان پێوەدەنان. من خەندانی بچکۆلانە سالآنێکی دوور و درێژ لەو کۆمەڵەیەدا، لە گۆشەگیری قوتابخانە تاریکەکانیدا ژیام، چونکێ لە دوای مردنی باوکم و دایکم و سەفەری براکانم بۆ دەرەوەی ولآت جێگایەکی ترم نەبوو تیا بژیم، ڕاهاتنم لەگەڵ ئەو دونیایەشدا ڕاهاتنێکی ئاسایی نەبوو. لەوێ لە شەوە تێکەلآوەکانی ئەو قوتابخانە ئاینییەدا خۆم و حەقیقەتی خۆم ناسی، لە ناو ئەو ژوور و دیوارە داخراوانەدا گەورە بووم، هەموو هەرزەکاریم لەوێ بردەسەر، لەوێ فێربووم کە هەموو ئارەزووەکانم بمرێنم، لەوێ فێربووم لە تەنهایی و خامۆشی و بێدەنگیدا بژیم... لەوێ تێگەیشتم من جیهانێکی خۆمم نییە، من نەژیاوم و ناژیم، لە شەوە تاریکەکانی مەملەکەتی ئەو خوشکانەدا تێگەیشتم، چارەنوسی منە دواجار حکایەتخوانی ڕۆژگارێک بم کە من تەنها وەکو سێبەرێکی بچوک لەتەنیشت کارەساتەکانییەوە، لە پەراوێزی هەموو پەراوێزەکانیدا فەرامۆشکرابووم. ئاە، من خەندانی چکۆلە هیچ کات لە ناوجەرگەی دونیا و لە ناو شتەکاندا نەژیابووم، من لە جیهانی خانمە بڕوادارەکاندا فاممکردەوە، کە دواتریش لەگەڵ فەتانەی غەمگین و مەعسومدا لە قوتابخانەی ئەو خوشکە تەنهایانە هاتینەدەرێ، من

جەستەم جەستەی ژنێکی کامڵ بوو، تێفکرینی خۆشم هەبوو لەسەر خودا و ژیان و ئازادی و جوانی، بەڵام خەیاڵم هێشتا هەر خەیاڵی منداڵێک بوو. ئەمڕۆش کە ئەم چیرۆکە دەنوسمەوە، هیچ نیازێکی دیکەم نییە جگە لەوەی کە ڕووداوەکانی ڕۆژگارێک پێکەوەبنێمەوە، کە تیا ژیابووم و نەمبینیبوو، تیا ژیابووم و لە نهێنی و ئاڵۆزییەکانی نەگەیشتبووم. من خەندانی چکۆلە، کە تا ئەمڕۆ بۆ سێبەرەکانی پەروانە دەگەڕێم لە ژیانمدا، دەمەوێت تا ئەوسەر لەگەڵ سەربوردی خۆم و خوشکێکدا بڕۆم کە شمشێری عەشق و ئاین و خەیاڵ لەیەکدی جیاکردینەوە. من خەندانی چکۆلە کە هەرگیز چاوەڕوانم نەدەکرد ببمە حکایەتبێژێکی تەنها، لە ناو ماڵێکی چۆڵ و خاڵیدا، ماڵێک کە جگە لە تارمایی ڕۆژە سارد و بەباچووەکان هیچی دیکەی تیانییە، ئەوانەش کە سەردەمێ ئاوەدانیانکردبووەوە، جارێکی دی ناگەڕێنەوە و چاو بە داڵان و ڕاڕەوە و ژوورە خاڵییەکانیدا ناخشێننەوە.

# ١٣

ئەو زەمانەی کە عاشقان لەو چەم و لێرەوارەدا کەپریان دروستکردبوو، هەرزاڵیان بەرزکردبووەوە، زەمانی هەڵهاتن بوو. وڵات بەشێوەیەکی سەیر شیرازەکانی تێکچوبوو. دەوڵەت لە شەڕێکی کوشندەدابوو لەگەڵ دراوسێکاندا، سەربازەکان بە هەزارەها لە بەرەکانی جەنگ هەڵدەهاتن و لەو چیایانەدا حەشارگەیان دەدۆزییەوە، جەنگ هەزارەها گوندی کاولدەکرد و گوندنشینەکان لە ترسی سوپا دەکشانەوە بۆ ئەو هەرێمانەی دەوڵەت دەستی پیاڕاناگات. پێشمەرگەکان لەو هەرد و کەژە تاریک و عاسییانەدا بنکەیان دادەنا، خێڵە ڕەوەندەکانی باشووریش هەندێکیان بەرەو سەرەوە دەکشان، هەندێ لە بەگ و شێخەکانیش لە دەوڵەت هەڵدەگەڕانەوە و ڕوویان لەو شاخانە دەکرد... ئەو ڕۆژگارە زەمانێک بوو هەموو هەڵهاتووەکان لەو عاسییانەدا قایمگەیەکیان چنگدەکەوت. ئەو زەوییە هەمیشە خاکی یاخییان بووە و هەرواش دەمێنێتەوە، زەوییەکی هێندە پڕ لە هەڵبەز و دابەزیش بوو، شەیتانیش بە خۆی و لەشکرێکەوە دەیتوانی خۆی لە پێچاوپێچ و ناو دۆڵ و هەزاربەهەزارەکانیدا بشارێتەوە.
نەسرەدینی بۆنخۆش دوای هەڵهاتنی لە شار کە بۆ یەکەمجار لە ناو ئەو هەموو لوتکە و دۆڵ و چڕ و دارستانەدا چاویکردەوە تووشی سەرسامییەکی سەیر هات، ئەو وێنەگرێکی بچکۆلانەی شار کە وەکو دۆستێکی غەمخۆری عاشقان ناوبانگی دەرکردبوو، بە تۆمەتی گۆڕینەوەی نامە

لەنێوان جەنگاوەرەکانی کێو و خانمانی شاردا دەوڵەت کەوتبووە دوای، لە بەرامبەر ئەو سروشتە تەلیسماوییەدا تووشی گێژیی و سەرلێشێوانێکی گەورە بوو... کە قەسابخانەکانی عەشق دەستی پێکرد، نەسرەدین لە چیاکانەوە لە ژێر چادری ئەو پێشمەرگە کێونشینانەوە دادەبەزی و ژیانی خۆی دەخستە سەر دەستی و ڕووی لە گوند و شارۆچکەکان دەکرد، بە درێژایی ڕێگاکان بەناو گۆڕستانەکاندا دەڕۆیشت. وڵات هەمووی پارچەیە گۆڕستانی گەورە بوو، یان گۆڕی تێکەڵاوی ئەو سەرباز و پێشمەرگانە بوو کە جەنگ لاشەکانیانی لە ناو کێڵگە و باغ و شەقام و کۆڵانەکاندا بەجێدەهێشت، یان گۆڕی ئەو عاشقانە بوو کە خەنجەری برا و باوک و گروپە ئاینییەکان و تایفە شەڕانییەکان سەریاندەبڕین. نەسرەدین دەڕۆیشت و هەردێ نا هەردێ ڕێگای دەکەوتە سەر قەبرستانێکی گەورە، هەندێ جار بە درێژایی ڕۆژەڕێیەک جگە لە گۆڕ ئاوەدانییەکی لێ دیار نەبوو. ئەمڕۆ نەسرەدینی بۆنخۆش کاتێک لەو ستۆدیۆ بچکۆلانەیەی خۆیدا دووبارە سەر بەسەر مێز و وێنە و فلیمی ڕیزکراوی کامیراکاندا شۆڕدەکاتەوە، بە غەمەوە دەڵێت: «من زۆر درەنگ بیرم لە ڕزگارکردنی ئەو عاشقانە کردەوە... زۆر درەنگ».

من دەزانم، نەسرەدین بەر لە وەرزی ڕەشەکوژی عاشقان، بەڵکو هەتا پێش سەرەتای وەرزی خەیاڵاتیش بۆ دەربازێک گەڕابوو، هەرێم و هەرێم دیوەخانی ئاغاکان چووبوو، سەروزبانی سەرکردە سیاسییەکان و پیاوانی ڕۆشنفیکری حیزبەکانی تاقیکردبووەوە، بەڵام هیچی چنگ نەکەوتبوو، لەگەڵ جەنگاوەرەکانی هاوڕێیدا قسەیکردبوو، هەمووش لەو باوەڕەدا بوون، عەشق لەگەڵ شەرەفی جەنگاوەراندا ناگونجێت... ئێستا هەندێ جار بە تووڕەییەوە... تووڕەییەک کە تاڵاوی پەشیمانییەکی سەیری تیایە، دەڵێت: «ڕزگارکردنی ئەوان، بە تەنها کاری من نەبوو، کاری هەموو بەشەریەت بوو». بەڵام دواجار دەداتە قاقای پێکەنین و دەڵێت:

« درۆیەک بوو سەری نەگرت، ئاخر درۆکان با جوانیش بن، مەرج نییە هەموو جارێ سەربگرن» . من ئەمڕۆ هەستدەکەم، نەسرەدین لەو پیاوەی جاران ناچێت، ئەمڕۆ هێندەی سەرقاڵی سازکردنی پەیوەندی حەرامە لەگەڵ ئافرەتە عەیار و ئابڕووبەرەکاندا، خەریکی عەشق نییە. ئەو ڕۆژێک بە تووڕەییەوە پێیگووتم: «تۆ هەمیشە باسی پەروانە دەکەیت، پەروانە... پەروانە... پەروانە... بیریش ناکەیتەوە کە پەروانە خۆی درۆیەکی جوان و نازک بوو. تۆ دەزانیت، ئەو لە چ سەردەمێکدا ژیاوە؟ دەزانیت؟ تۆ هیچ نازانیت... ناکرێت لە ناو ئەو دەریا بێسنوورەی ڕقدا هێندە لاوازبیت، ناکرێت... من گوناهم نییە».

نەسرەدین زۆرجار وا هەستدەکات، من چیرۆکی گوناهی ئەو دەنوسمەوە، بە سەعات لە ستۆدیۆکەدا باسی ڕقی کەڵەکەبووی ئەو ڕۆژگارە دەکات، ئەو وەکو گەڕۆکێکی بێئارام بەناو شار و گوند و کێوەکاندا گەڕابوو هەموو شێوەکانی ڕقی بینیبوو، دەیگووت: «لەو ڕۆژگارەدا دیانەتەکان بەیەکەوە نەدەگونجان، میللەتەکان ڕقیان لەیەک بوو، زۆرایەتییەکان کەمایەتییەکانیان قڕاندەکرد، حیزبەکان لە حاڵەتی شەڕێکی بەردەوامدا بوون، ئەم خێڵ لەگەڵ ئەوی تردا لە شەڕی تۆڵەدا دەژیا، دراوسێ دوژمنی دراوسێ بوو، برا لە ناو ماڵدا برای دەدایە بەر گوللە... ئاه ڕۆژگارێکی سەیر بوو». نەسرەدین بە بێزارییەکی قووڵەوە دەستی ڕادەوەشاند و قسەیدەکرد، ئاشکرابوو یادگاری ئەو دەمە ڕۆحی دەگوشێت، زۆرجار پەلەپەل قسەیدەکرد، وەکو ئەوەی بیەوێت هەموو ئەو حکایەتە لە چەند دێڕێکدا کورتبکاتەوە، بەڵام بۆی نەکرێت، دەیگووت: «ئەوانەی کە دژی ئەوەن دیانەت لەگەڵ دیانەتدا بژی، میللەت بە ئازادی لەگەڵ ئەویتردا بژی، خەڵکانی گەنج کەمێ بەئازادی پێکەوەبژین، هەموو یەک شتن... یەک گوون... ئەم وڵاتە هەمیشە ئەو گووانە دەیبەن بەڕێوە، ئەو گووانە لە ئاودەستخانەکان دێنە دەرەوە و حوکمدەکەن...

حوکمدەکەن و تەواو... خۆیان فڕێدەدەنە سەر کورسیەکانی حوکم و پێوەی دەنووسێن، جبە لەبەردەکەن و دەبنە ئیمام، ئەستێرە دەخەنە سەرشانیان و دەبنە ئەفسەر، چاوێلکە لەچاو دەکەن و دەبنە پرۆفیسۆر، لەچک دەبەستن و دەبنە پەچەپۆشی ئیماندار، قات و پاڵتۆ دەپۆشن و دەبنە سیاسی، قوونیان ڕووتدەکەن و دەبنە قەحپە، بەڵام هەموویان یەک گوون».

من بزەیەکی غەمگینم دەهاتێ و دەمگووت: «نەسرەدین، ئەمڕۆ، ئێمە لەسەر خەراباتی ژیانی خۆمان دانیشتوین، چ زیانێکی هەیە وردتر سەیری ئەو وێرانەیە بکەین؟». ئەو بە غەمەوە سەریدەخستە سەر مێزی ستۆدیۆکەی و دەیگووت: «زیانی ئەوەیە، کە من ئیدی شەوان ناتوانم بەئارامی بخەوم، بەڵێ زیانەکەی ئەوەیە». من دەمزانم ئەو دەیویست ئەو یادگارانە فەرامۆشبکات و بۆ وێنەی ئەو کچانە بڕی کە لە ئاهەنگ و شاییەکانی شووکردن و فیستیڤاڵە ڕۆژانەکاندا دەیانبینێ. زۆر جار بەشێوەیەکی سەیر هەندێ بەشی تاریکی ئەم سەربوردەی قفڵدەکرد، هەندێ نهێنی بەحەرام دەزانی، هەندێ جێگاش بە مەتەڵ. گەر ڕۆژێک بێ ئەو زەردەخەنە شەرمنە بمدیبایە، دەمزانی ئارەزووی یادکردنەوەی هیچ غەمێکی نییە، هەندێ کاتی دیکەش، کە خەندە کچانە گەشەکەیم لەسەر لێوانی دەدیت، تەماحم زیادیدەکرد... ئەو لەو ئێوارانەدا نهێنی زۆرتری بۆ ئاشکرادەکردم. پێکەوە دادەنیشتن و سەرنجمان لە هەموو وردەکارییەکانی ڕابوردوو دەدایەوە، لەسەر لەوحێکی بچکۆلانە یەکەیەکە ناوەکانمان دادەنا، لە چارەنوسیانمان دەڕوانی. نەسرەدین دەڵێت: «من هەر لە سەرەتاوە ئەو تێکەڵاوبوونە سەیرەی عاشقانم بە ناجۆر دەبینی، هەندێکیان کچ و کوڕی ناسکی شارە گەورەکان بوون و هەندێکی دیکەشیان ئافرەت و پیاوی ناوچە شاخاوییەکان، هەر یەکەیان لەبەر هۆیەک هەڵهاتبوون، هەندێ لە عاشقەکانی شار مەترسی کوشتن

بەدەستی دینداره توندڕەوەکان بەرەو ئەم شاخ و کێوانەی هێنابوون، هەندێکی دیکەشیان لە قەسابخانە گەورەکانی عەشق ڕاپانکردبوو، لە ژێر چەقۆی پیاوکوژەکان دەربازبوویوون، هەندێکیان بە پشکۆی خزمەکانیان و هەندێکیشیان بە تێزابی کینەی کەسوکار سووتێنرابوون، بەڵام دڵداره گوندنشینەکان، پتر لە داخی تۆڵە و کینە و نەفرینی تایەفەکانیان هەڵهاتبوون، هەندێکیان ڕقی هەزار ساڵ دوژمنایەتی خێزانە کێونشینەکانیان بەدواوە بوو، هەندێکیشیان خەنجەری پوورزا و ئامۆزاکانیان». نەسرەدینی بۆنخۆش لەو ڕۆژانەدا ئاگایەکی ئەوتۆی لە ژیانی عاشقانی بێشە و لێرەوارەکە نەمابوو، لە دڵی خۆیدا دەیگووت: «کێ دەکاتە بنی ئەو هەزار بە هەزاره، عاشقێکی مەست یان ڕۆحانییەکی مەیزەدەی ئەڤین نەبێت». ئەو بە خۆی و چەکەکەیەوە گوند و شاخەکان بۆ عاشقی ناکامی تر دەگەڕا، چیرۆکەکانی عەشقی کۆدەکردەوە، دەچووە سەر گۆڕی عاشقەکان، شوێنەواری قەسابخانەکانی ئەڤینی دەدۆزییەوە، سەربوردی دڵداره کوژراوەکانی دەنوسییەوە، ئەو سەردەمە ئەو باکی بە چارەنوسی ئەوانە نەبوو کە چیتر لەو دارستانەدا نیشتەجێبوبوون. دەیگووت، خۆیان و ئەو دەلیلە دڵخۆش و چاوشینە، ژیانی خۆیان پلاندەکەن... ئەو بۆ عاشقانی تر دەسووتا، هەر لەو سەردەمانەدا خەریکی کۆکردنەوەی هەموو تراژیدیاکانی ئەڤین بوو، خەریکی نوسینی ئەو کتێبە گەورەیە بوو کە بە «کەشکۆڵی عاشقان» ناویدەنا، کتێبێک هەموو تراژیدیای ئەو ڕۆژگارانەی لەخۆی گرتبوو، بەسەرهاتی هەزارەها عاشقی سووتێنراو کوژراو و دەربەدەرکراو بوو، دواتر سیاسییەکان و ئاغاکان و سەرۆک عەشرەتەکان و زانا ڕوحانییەکان، زەوی بەدوای ئەو کتێبەدا تەیدەکەن، بە قاموسی شەرەفە شکاوەکان و ئابڕووە تکاوەکان ناویدەبەن، بەڵام عاشقان و خوێندەوارەکانی شار ناویدەنێن «عەشقنامە». کتێبێک کە دوا فەسڵی لە ئێوارێی پەروانەدا دوایدێت، دوا حکایەتیشی حکایەتی

پەروانەیە، چونکە لە دوای ئەو ڕۆژەوە نەسرەدین ئەو چیایانە جێدەهێڵێ و نائومێد لە دنیا، لە مەخفەرێکی بچکۆلانەی شارۆچکەیەکی دووردا، خۆی و کەشکۆڵەکەی تەسلیم بە دەوڵەت دەبێتەوە و ساڵانێکی درێژ لە بیابانەکان و زۆنگاوەکانی جەنگی کەنداودا وەکو سەربازێک لەڕیزی پێشەوەی گوردانە شەڕکەرەکاندا بۆ مردن دەگەڕێت، لەوێ دەبێتە جەنگاوەری گروپە خۆبەخشەکان. تا ئەمڕۆ خەڵکانێکی زۆر، پیاوماقووڵانی دەیەها عەشرەت، باوە گەورەکانی چەندین خێزانی ناسراو، بەدوای ئەو عەشقنامەیەدا دەگەڕێن... نەسرەدین دەڵێت: «ئەو کەشکۆڵە گەورەیە، کە هەزاران لاپەڕەی دوور و درێژبوو، ناو و سەربورد و چارەنوسی یەک سەدە لە عاشقانی تیابوو، حکایەتی هەموو دڵدارەکانی کوردستانی لە دوای ئیمارەتی بابانەوە پاراستبوو، وێنەی سەدەها گۆڕەعاشق و مەزاری ئەڤینی هەڵگرتبوو، لە شیرین و فەرهاد و وەلی دێوانە و شەمەوە تا دەگەیشتە سەر پەروانە و فەرەیدونی مەلەک، وەسف و تەفسیری تیابوو... هەمووی تۆپێکی تۆپخانەکانی ئێران لە سەنگەرێکی بچکۆلانەی دەورووبەری «دیزفول» لە ناو جانتاکەمدا سووتاندی».

ئەمڕۆ کەس باوەڕ بە نەسرەدینی بۆنخۆش ناکات، منیش لەبەرهۆیەکی نەزانراو باوەڕی پێناکەم. هەموو ئەوانەی کە چیرۆکی ئەو کەشکۆڵەمان بیستووە، پێمان وایە، نەسرەدین لە شوێنێکی قایم و لە حەشارگەیەکی دووردەستدا هەڵیگرتووە... هەموو دەڵێین ئەو لەترسی هەڕەشەی ئاغا و دەسەڵاتدارەکان ئەو کتێبەی کردوە بەژێر گڵەوە و ڕۆژێک لە ڕۆژان دووبارە دەریدەهێنێتەوە. بەڵام خۆی دەڵێت: «من چیتر پەیوەندیم بە عەشقەوە نەماوە... عەشقیش وەکو هەمووشتێکی دیکە ڕۆژ و قۆناغ و مێژووی خۆی هەیە، ئێستاش سەردەمی قسەکردن لەسەر عەشق بەسەر چووە». نەسرەدینی بۆنخۆش کە بە گەنجی هاوڕێی هەموو شاعیر و نیگارکێش و مۆسیقارەکان بوو، ئەمڕۆ جگە لە گرەوکردن و شەڕ و

دەمەقاڵی لەسەر یارییەکانی تۆپ و شارەزایی لە تیپەکان و لە یاریزانانـدا مەستی هیچی دیکە نییە، ئەمڕۆ بەجۆرێکی دیکە بیر لە ئافرەت و عەشق و شەرەف دەکاتەوە، بەڵام لەپشت هەموو ئەو گۆڕانانەشەوە هەستدەکەم بە ئەندازەیە سۆزی بۆ ژیانی ئەو سەردەمانەی خۆی هەیە، کە بڵێت: «ئەو دەمانە، ڕۆژگاری ڕاستەقینەی نەسرەدینی بۆنخۆش بوون، ڕۆژانی زێڕینی ئەو بوون. ئاخر هەر پیاوەو دیوێکی قەڵب و دیوێکی ڕەسەنی هەیە، ئەو ڕۆژگارە نەسرەدینی بۆنخۆش، دیوە ڕەسەنەکەی خۆی دەژیا».

من ئەمڕۆ وادەبینم کە نەسرەدینی بۆنخۆش بەشێوەیەکی زۆر یەکلایەنە و سادە سەیری حەقیقەتی کردوە، ئەو هەموو فەلسەفەی خۆی بۆ عەشق و مرۆڤ لەسەر ویساڵ و بەیەکگەیشتنی ئەڤینداران پێکەوەنابوو، تەنها لە چاوی عاشقانەوە سەیری دونیای کردبوو، عاشقانیشی تەنها لە ڕۆژانی ناکامی و سووتاندا بینیبوو. گرفتی گەورەشی ئەوەبوو کە نەیدەتوانی تێبگات چۆن عەشق لە ناوەوە دەمرێت، چۆن عەشق لە ناوەوە دەکەوێتە ناکۆکی لەگەڵ خۆیدا. کە پێکیشەوە بەسەر کۆی حکایەتەکاندا دەچووینەوە، ئەو گومانی لە تەفسیرەکانی من دەکرد، پێیوابوو کە نهێنییەکی قووڵ لە ژێر گەڵاکان و وەرزەکانی ئەو جەنگەڵەدا نێژراوە و هەرگیزیش نادۆزرێتەوە، ئەو دەیگووت: «ئەم چیرۆکە، حیکمەتی ئەو وێرانەیە نادرکێنێت».

من دەمگووت: «ئاه، نەسرەدینی بۆنخۆشی برام، من شێتی دۆزینەوەی حیکمەتەکانی وێرانبوون نیم، من گەرەکمە شتەکان، حەقیقەتە پارچەپارچەکان، وێنەکانی ئەو سەردەمە لەیەکترازاوە بەیەکەوەبنێمەوە، تا بتوانم لە خۆم و لە مەرگی پەروانە تێبگەم، تابتوانم نیگارێک وەکو ئەو نیگارانە دروستبکەمەوە کە تۆ بە دیواری ئەم ستۆدیۆیەدا هەڵتواسیوون».

ئەو بە گومانی وێنەگرێکەوە، کە لە هیچ نیگارێکی نارێک و تەڵغ ڕازی نییە، دەیگووت: «تازە هەر وێنەیەک دروستبکەین، وێنەیەکی خەیاڵی خۆمانە، وێنەیەکە پەیوەندی بە فەنتازیاکانی من و تۆوە هەیە... بەڵام ئەو جیهانە ئێستا هەمووی وەکو سەراب و تۆز وایە... تێمبگە حەقیقەت نازکە، کە بوو بە تۆز، بە غوبار، بە تەم، ئیدی کۆناکرێتەوە». بەڵام ئەو دەیزانی کە هەرگیز ناتوانێت پەشیمانمبکاتەوە. من وەکو شێت، بێوەستان، بێسەبر بەدوای سەربوردی پەروانەدا دەڕۆیشتم.

❋❋❋

«شەهلای خودناس» یەکەمین کەس بوو کە پەروانەی ناسی، کەپر و ژوورەکەی شەهلا، تەنها چەند مەترێک لە کەپرەکەی پەروانەوە دووربوون، کە بەیانییان کزەی ساردی دارستان پەروانەی خەبەردەکردەوە، یەکەمین دەنگێک کە دەیبیست، دەنگی شەهلا بوو. ئەو لەگەڵ کازیوەدا، لەسەر بەردێکی گەورەی پێشدەمی ئاوەکان لە خودا دەپاڕایەوە، شەوانیش لە نابەینی دەوەن و بنچکە کێوییەکاندا، لەبەر قوتیلەیەکدا بە دەنگی بەرز قورئانی دەخوێند، زوو زوو خۆی فڕێدەدایە ئاوەکان و بەدوای پاکبوونەوەیەکی ونبوودا دەگەڕا، شەهلا بە جلە کوردییە شۆڕەکان و فەقیانە و پشتێنە شلەکانی کەمەریەوە، شێتانە بەناو درەختەکاندا بە خۆی و قورئانەکەیەوە دەهات و دەچوو، پەلی منداڵەکانی کێشدەکرد و بەسەر چەو و بەرد و زیخەڵانەکاندا کێشیدەکردن، بێسەرەوتییەکی ناوازە و نائاسایی لە هێمنی نێو درەختەکاندا دروستدەکرد، هەندێ شەو ئێجگار تووڕە و هەندێ شەویش زۆر ئارام بوو، بەڵام هەردوو منداڵە دەردەدارەکەی خۆی بێڕەحمانە ئازاردەدا... شەهلا کە لەگەڵ «عەزیز تیرئەنداز»دا هەڵهاتبوو، کچی

شێخی شارۆچکەیەکی دوور بوو، شێخێکی زەنگین کە سنووری باغ و زەوییەکانی بە جۆرێ بەرین بوو، شکۆی ئەمیرە کوردە کۆنەکانی دەهێنایەوە یاد. عەزیز کە بە خۆی دەگووت: «ڕاوچییەکی وێڵ»، لە هەرێمە دوورەکانی کوردستانەوە هاتبوو، خەڵکی گوندێکی بچوکی سەر سنوورەکانی ڕۆژهەڵات بوو، بە دەم ڕاوکردنی باڵندەکانەوە هەرد بە هەرد هەموو وڵاتی تەیکردبوو تا دواجار گەیشتبووە باغەکانی شێخی گەورە، لەوێ لەگەڵ ڕاوکردنی باڵندەکاندا عاشقی شەهلا بووبوو کە ئەو کات بە خۆی و قورئانەکەیەوە ئێواران لەبەر هەیوانی باڵەخانەکەی باوکیدا دادەنیشت و لەنێوان هەموو سورەتێک و سورەتێکی دیکەدا، بە غەمگینی گوێی لە یەکێ لەو گۆرانییانە دەگرت کە ئەو کات ئێستگە کوردییە جۆرا و جۆرەکانی ئێران پەخشیاندەکردەوە. شەهلا لە یەکەم نیگاوە بە ئارەزوویەکی کوشندەوە بۆ عەشق و بە ترسێکی قووڵەوە لە خودا تەماشای ئەو ڕاوکەرە دەکات کە لە ژیانیدا نیشانی لە نیچیرێک نەگرتبوو، نەیپێکێت. عەزیزی تیرئەنداز لە ژوانی نیوەشەوانی ئەو باغەدا، لە ژێر دار هەنارێکدا بە شەهلا دەڵێت: «قەسەم بەم هەنارانە، خودا دژی عەشق و ڕەدووکەوتن نییە». شەهلا کە بە کەوایەکی بریقەدار و چەمک شۆڕەوە، بە قورئانەکەی دەستییەوە کێواوکێو ڕەدووی عەزیزی تیرئەنداز دەکەوێت، تەواو دوودڵە بەرانبەر هەڵوێستی خودا دەرهەق بەو کارەی کە لەدەستی قەوماوە. ئەو ماوەیەکی درێژ لەو ترووپک و بڵندایییە سارد و سەختانەدا بە خۆی و کتێبەکەیەوە لە ئەشکەوت و بن بەرد و حەشارگا شاخاوییەکاندا دەژی، لەوێش ژیانیَ لەنێوان قورئان و ترسدا بە جۆرێکی سامناک دابەشدەبێت. بەڵام تێپەڕینی ساڵان و لەدایکبوونی دوو منداڵی شێواو، یەکێکیان خێل و ئەوی دیکەیان قەموور، دوورکەوتنەوەی زیاتر و زیاتری عەزیزیش بەدوای باڵندەکاندا، لای شەهلا وەکو سزای گوناهێکی گەورە تەفسیردەکرێت، ئیدی هێدی

هێـدی پتـر خـۆی بـە خەتـاكار دەزانێـت، بەنـاو چیـا و ئەشـكەوت و دەشـتەكاندا دەڕوات و بـەردەوام لـەو قورئانـەی دەسـتی دەخوێنێـت و داوای پاكبوونـەوە دەكات. عەزیزیش كـە شـەهوەتی بۆ ڕاو هەمیشـە لـە شـەهوەتی بۆ ئافـرەت بەهێزتربـووە، پتـر و پتـر لـە شـەهلا دوردەكەوێتـەوە كـە ئێسـتا بـاس لـە خنكاندنـی مندالّەكانـی و كوشـتنی عەزیـزی تیرئەنـداز و گەڕانـەوە دەكات بـۆ شـارۆچكەكەی خـۆی.

پەروانـە هەنـدێ ئێـوارە لـە ژێـر درەختێكـەوە سـەرنجی شـەهلا دەدا كـە لەسـەر بەردێكـی گـەورە دوو مندالّەكـەی دادەنـا و دەكەوتـە پاڕانـەوە لـە خـودا و دەیگـووت: «خودایـە، بـا عاشـقان تـا مـردن نەحەسێنەوە، خودایـە گیـان، مـن دەزانـم عەشـق لـە دەسـتكردی شـەیتانە، بـەلاّم تـۆ پێمبلـێ، ئـەم كوێـر و قەمـووره بـەرەو كـوێ بـەرم، لەكـوێ بیانشـارمەوە، بیانكـەم بەژێـر چ گلێكـەوە؟». عەزیـزی تیرئەنـداز ئێـواران دەگەڕایـەوە، بـەو دەمووچـاوە گەنمڕەنـگ و ڕوومەتـە تیسـكن و تووكاویانـەوە، بـەو جامانـە بچكۆلانەیـەی سـەریەوە بـە كاروانچییەكـی گورجوگـۆڵ دەچـوو نـەوەك بـە عاشـق، سـاچمەزەنەكەی بـە سـەقفی كەپرەكـەدا هەڵدەواسـی، كۆترێـك یـان مریشكەڕەشـەیەكی كـوژراوی دەخسـتە سـەر سـەبەتەیەك و بـە زەردەخەنەیەكـی گەشـەوە بـەرەو لێـواری چۆمەكـە دەڕۆیشـت، كـە گوێـی لـە سـكالاّكانی شـەهلا دەبـوو قاقـا پێدەكەنـی و دەیگـووت: «لـەم باڵندەیـە بخۆیـت، هەمـوو ئـەم خەیاڵـە خراپانـەی سـەرت چاكدەبێتـەوە، گۆشـتی تەیروتیـور باشـترین دەرمانـی وڕێنـە و ماخـۆلان و پەركەمـن... ئا، باشـترین دەرمانـن، تـۆ لـە مـن بپرسـە، نەنكـم كاتـی خـۆی بەناوبانگترین داڕوسـازی سـابلاّغ بـووە». شـەهلا كـە هەمیشـە قورئانەكـەی لەبندەسـتدا بـوو دەیگـووت: «گۆشـتی باڵندەكانیـش، كاتـێ ڕاوچییەكـی خودانەنـاس و بێڕەحـم و درۆزن و فریـودەر ڕاویانبـكات، حەرامـن». پەروانـە گوێـی لـە قسـەكانیان دەگـرت و لـە هیـچ تێنەدەگەیشـت، دەیویسـت زیاتـر لـە شـەهلا

نزیکببێتەوە، بەڵام ئەو بەردەوام دوور دەوەستا و دەیگووت: «بڕۆ... بڕۆ... خۆت پاکبکەوە، بڕۆ، بەرلەوەی زۆڵێکت ببێت و گیرۆدەببیت تۆبەبکە».

پەروانە ئاوڕی لە دەوروبەری خۆی دەدایەوە و دنیایەکی سەیری دەبینی، ئەو بە نیازی مانەوەیەکی دوور و درێژ نەهاتبووە ناو جەنگەڵ، هەر لە شارەوە بە فەرەیدونی گوتبوو: «دەبێت بەردەوام بین لە سەفەر، مانەوە لە یەک جێگادا ژیان و ڕۆح و عەشق دەکوژێت». بەڵام فەرەیدون لە دوای کەوتنەخوارەوەی ڕەزای دڵخۆش، کەمتر باسی لە شارە فەنتازیاکان دەکرد، دوای تیربارانکردنی دوو مەقامبێژەکەی هاوڕێشی، بە هێمنییەکەوە کە پەروانە نهێنییەکی قووڵی تیا دەبینی دەیگووت: «خوایە، بۆ هێندە ڕێگای جیاواز و شێوەی سەیر سەیر هەیە بۆ سەفەر؟». مردنی دوو مەقامبێژەکە چاوی فەرەیدونیان لەسەر سەفەر بە ڕێگای نوێ و دونیای تازەدا کردبووەوە، لەو دەمانەدا فەرەیدون لە خەیاڵی کۆچدا بوو بە شێوەی سەیرتر و نەبینراوتر، کۆچێک سنوورەکانی شوێن و بەربەستەکانی سروشت و لەمپەرەکانی زەمان نەیوەستێنن، بەڵام پەروانە لە شەوانی سەرەتاوە وەکو حکایەتێ بۆ خۆی بگێڕێتەوە لەسەر هەرزاڵەکە ڕادەکشا و چاوی لە تاریکستانە بێبنەکانی شەو دەبڕی و دەیگووت: «سەفەردەکەین، بەرەو شوێنی دیکە دەڕۆین، درێژە بە ڕێگاکان دەدەین، هەر دەڕۆین... هەر دەڕۆین». فەرەیدون کە لە تەنیشتییەوە پاڵدەکەوت، بە خەندەیەکی بچوکەوە دەیگووت: «من دەتوانم هەر لێرە، بێئەوەی لە جێگای خۆم بجوڵێمەوە سەفەربکەم، دەتوانم خاکی زۆر جوان ببڕم، بە زەوی ئەوتۆدا تێپەڕم هیچ گەڕیدەیەک پیا تێناپەڕێت، ئاە، مەرج نییە جوانترین سەفەر پابەندی گواستنەوە بێت لە شوێندا... مەرج نییە شارەکان ببڕین، دەشتەکان تەیبکەین، بەسەر کێوەکاندا سەربکەوین».

پەروانە دەیویست بڵێ: «فەرەیدون سەیری ئەم مەخلوقاتە ماندووانە بکە لە دەورمان... سەیری ئەم هەموو ژن و پیاوە بیمارە بکە». بەڵام بێئەوەی هیچ بڵێت بێدەنگ دەبوو.

ئەمڕۆ من دڵنیام کە نائومێدی پەروانە تەنها لە سروشتە نازک و لاوازەکەیەوە نەهاتووە، بەڵکو لەو دەستخەڕۆبوونەوە هەڵقوڵیوە کە لەگەڵ ئەو لێرەوارە و دارستان و چۆمەدا تووشی هاتووە. ئەو هەمیشە شوێنەکانی بە خەتابار دەزانی، زۆرجار لە قوتابخانە ورکیدەگرت لە پۆلێکەوە بیگوازنەوە بۆ پۆلێکی تر، لەسەر کورسییەکەوە بیخەنە سەر کورسییەکی تر، چونکی قوتابییەکی زیرەکیش بوو هەموو داواکارییەکانی جێبەجێدەکرا. زۆر جاریش بەشێوەیەکی بێمانا هەموو بێزاری و ماندوێتی خۆی دەخستە ملی ماڵ، دەیخستە ملی شەقامەکان، دەیخستە ئەستۆی ئەم شارە... دواجاریش باوەڕی بە بوونی خاکێکی خورافی هەبوو کە دەتوانێت لەم شارە دەرچێت و بیدۆزێتەوە، لەو جەنگەڵەشدا، لە نزیک سێبەری ئەو کێو و هەڵدێڕ و تافگانەوە دەیویست بەرەو جێگایەکی دیکە بڕوات... جێگایەک نەیدەزانی کوێیە، بەڵام ڕاهاتبوو باسیبکات و بیری لێبکاتەوە. پەروانە، هەر لە سەرەتاوە هەستیکرد کە هەموو شتەکان لەو جەنگەڵەدا بەجۆرێکی سەیر ڕاوەستاوە، بەڵام سەیرترین و کوتوپڕترین شت بەلایەوە ڕاوەستانی فەرەیدون بوو لەو دۆڵەدا... ئەو هەستەش، ترسێکی گەورەی بە کۆتایی دونیا لا دروستکرد. شەوێک کە هەموو ئەو خێڵی عاشقانە لەبەردەم ئاگرێکی گەورەدا کۆبووبوونەوە، لێی پرسین: «ئایا ناکرێت بڕۆین؟ ناکرێت بۆ شوێنی ئاوەدانتر و ڕوناکتر بگەڕێین؟ ناکرێت بەسەر زەویدا بڵاوببینەوە؟». بەڵام ئەو عاشقانەی زۆربەیان لە مەرگ هەڵهاتبوون و تفەنگی تۆڵەکاران لە دوایانەوە بوو، نەیاندەویست جارێکی دی لەو حەشارگەیە دەرچن. گۆڤەند بە خۆی و دارە درێژەکەیەوە دەیگووت: «شوێنەکان هەر شوێنن، ئەوەی دەبێت

بگۆڕدرێت مرۆڤەکانن، بشزانە، ئەم دونیایە شارێکی ڕازاوە و ئامادەی تێدا نییە ئێمە تێیبچین و بەسەر فەڕ و بەرەکەتی درەختەکانیدا بکەوین، تەنها شارێک بتوانین ڕووی تێبکەین، ئەو شارەیە کە خۆمان دروستیدەکەین».

پەروانە وەکو هەر پەپولەیەکی کاڵفام تێنەدەگەیشت چۆن جیهانێک نییە بۆ خۆی هەر لەسەرەتاوە جوان بێت؟ چۆن شارێک نییە هەر لەسەرەتای خەلیقەتەوە بە نازکی دروستبووبێت؟ چۆن مرۆڤگەلێک نیین لە ئەزەلەوە ئازادبن؟

بەیانیان لەکاتی چنینی سەبەتە و پڵاوپاڵێو و ئینجانەکاندا، بەدەم بادانی شولکی بییەکانەوە، لە کچەکانی دەپرسی تا کەی لێرەدا بمێنینەوە؟ شەهلای خودناس پێیدەگووت: «من، جگە لە خودا بەدوای هیچ شتێکی تردا ناگەڕێم». دلارام دەیچرپاند بەگوێیدا: «ئێرە دواهەمین شاری منە». میدیای غەمگینیش لەسەر لاپەڕە سپییەکانی دەفتەرەکەی بۆیدەنوسی: «من لە قەسابخانەکان هەڵهاتووم و ناتوانم بگەڕێمەوە». مرواری چکۆلەش بێئەوەی وەڵامیبداتەوە، دەیگووت: «ئاە، پەروانە خان، ئاە، بۆ هاوینێ، مێوەکانی هێندە زۆر بێت، شەقامەکان لەبەر کاڵەک و شەمام و بەرچنەکانی هەنجیر بەر ڕێداران نەکەون». نا، هیچ کەسێ باسی لە شارێکی دیکە نەدەکرد ئەو و گۆڤەند نەبن، بەڵام گۆڤەند دەیویست خۆی ئەو شارە دروستبکات، پەروانەش دەیویست لە ناو جەرگەی سروشت و ژیان خۆیەوە هەڵبقوڵێت و حازر و ئامادە وەکو هەر جەنگەڵ و چیایەکی دیکە لەسەر زەوی بەرزببێتەوە.

لە ڕۆژانی سەرەتاوە، پەروانە بەکاوەخۆ دەبێتە مەخلوقێکی کەمخەو، ئارەزووی سەفەر و گواستنەوەش لە ڕۆحیدا لەبری هێوربوونەوە، دەبێتە جوڵەیەکی بەردەوام لە ناو دونیای ئەو دۆڵەدا، دەبێتە بروسکێکی قووڵ و بزوێنەر کە لە نابەینی درەخت و کەپر و ماڵ و چەمەکاندا دەیهێنێت

و دەیبات، دەبێتە جوڵەیەکی نائارام و بێسرووت کە پەشێوییەکی ڕۆحی ترسناک دەردەخات، بەڕادەیەک وای لێدێت پەروانە چیتر شەوانە ناتوانێت بۆ خەوتنیش لە جێگاکەی خۆیدا ڕاکشێت، دەبێت بەردەوام لە شوێنێکەوە بڕوات بۆ شوێنێکی تر، لەبن درەختێکەوە بگوازێتەوە بۆ بن درەختێکی تر، لە ماوەیەکی کەمدا چەندین جار شوێنی کەپرەکەیان دەگۆڕن، شوێنی هەرزاڵەکانیان دەگۆڕن، کە پاڵیشدەکەوێت، بەردەوام لەمسەرەوە سەر دەگۆڕێت بۆ ئەوسەر، لەشوێنی خۆیدا تلدەدات، ئاراستەی پێخەفەکەی دەستکاریدەکات، چەندەها شەو فەرەیدون لە ناو دارستان و قەراغ چۆمەکەدا دەیهێنێتەوە، بەڵام هەندێ شەویش هێندە خێرا دەڕوات، فەرەیدون ناتوانێت لە تاریکییەکاندا بیدۆزێتەوە.

لەو شەوانی وێڵگەرییە ڕەشەدا، لە ناو دارەکاندا سیمەندی باڵندە دەبینێت کە بە خۆی و چاوە بریسکەدارەکانییەوە، چاوی باڵدارێکی گۆشتخۆر، لەسەر درەختەکان تەماشایدەکات، ئاگاداربوو، سیامەند هەندێ شەو مەعسومە ناچاردەکات سەرکەوێتە سەر درەختەکان... بەزۆر سەریدەخاتە سەر لکە بەرزەکان. ئاگاداربوو سەختترین ڕێگا دەگرێتەبەر، بەو چڕنوکە قولاپییانەی بەناو لقەکاندا ڕایدەکێشێت، هەندێ شەو گوێی لە گریانێکی کپی مەعسومە دەبوو کە تێکەڵ بە دەنگی با و گەڵا و ئاوەکان دەبوو، بەڵام هیچی نەدەگووت. هەر لەو شەوانەدا جارجار گۆڤەند دەبینێت کاتێک لەسەر ڕۆشنایی چەندین چرا و قوتیلە و شاپلیتەی چکۆلە، خەریکی هەڵچنین و دروستکردنی پەیکەرەکانی خۆیەتی، کە هەمیشە پێشتر ئێواران لە ناو ئەو بەردەڵانە بێبنەی نزیک ئاوەکاندا بەردەکانی بۆ ڕەنگکردبوون... پەروانە سەرنجیدەدا کە گۆڤەند تابێت پەیکەری گەورەتر و گەورەتر دروستدەکات، تا دەهاتیش ڕەنگی پەیکەرەکانی گەشتر دەیاننواند و گۆڤەند خۆیشی گەشبینانەتر قسەی لەسەر ژیان و عەشق دەکرد، بە

جۆرێ وردە وردە پەروانە پەیوەندییەکی سەیری لەنێوان گەشبینییەکانی گۆڤەند و سێبەری شێتییەکی گەورەدا دەبینێ، شێتییەک شەوان لەکاتی کارکردنیدا لەسەر ڕۆحلەبەرە خورافی و خەیاڵییەکان، لە سیما و قژ و جوڵە و دەنگیدا دەبینرا. لە یەکێ لەو شەوانی جوڵە و نەسرەوتنەدا، لەو شەوانەدا کە پەروانە هەستیدەکرد هێزێکی گەورە بەرەو پیری ڕوناکییەکی نادیار هەڵیدەگرێت، بە بێهۆیەکی دیاریکراو ڕوویکردە ئەو وەرشە گەورەیە کە پیاوان بە ڕۆژ پەیکەری عاشقەکانیان لێدەتاشی و لە بازاڕی ئەنتیکەفرۆشەکانی دەرەوەدا دەیانفرۆشت، ئەو شەوە کە دەرگای وەرشەکەی کردەوە و چووە ژوورێ، کەوتە ناو دەریای بێبنی پەیکەرەکانەوە، یەکەیەکە لەسەر شەوقی فانۆسێکدا ئەو پەیکەرانەی تاقیکردەوە، سەیریکردن، پەیکەری دوو مەخلوقی لەیەکئالاو بوون، پەروانە نەیدەزانی ئایا یەکیان لەئامێز گرتووە یاخود پەلاماری یەکدیان داوە؟ ئایا لە حاڵەتی ژواندان یان لە حاڵەتی جەنگدان؟ ئایا یەکتریان گرتووە، یان لە ئامێزی یەکدیدا مردوون؟. لەو شەوەدا پەروانە سەرنجیدا شێوەی پەیکەرەکان هێندەی ملکەچی کەیف و هەوای پەیکەرتاشەکانە، ملکەچی ئەو شێوە ئەفسانەیی و نازکەی عەشق نییە کە گۆڤەند پێشتر لە وەرشەکەدا وێنەی بۆ کێشابوو... پەیکەرتاشەکان ڕق و بێزاری و ناکامییەکانی خۆیان لەسەر ئەو تەختەیە تاشیبوو، پەروانە سەیری پەیکەرەکانی دەکرد و دەترسا، هەندێ لە پەیکەرتاشەکان بە جۆرێ وێنەی ئەو دوو عاشقەیان دروستکردبوو هەوڵەکانی گۆڤەند بۆ ڕاستکردنەوە و جوانکردنیان هیچ دەرەنجامێکی نەبووبوو. پەروانە نەیدەزانی بۆچی ئەو پەیکەرانە لە حاڵەتی دەعجانبووندا دەبینێت، چاوی دەگلۆڤی و ئەو عاشقە تێکەڵاوانەی وەکو چەند ڕمووزنێکی سامناک دەهاتەبەرچاو، وەکو کۆمەڵێ جەستەی تواوە بەسەر یەکدا. پەروانە لەو شەوەدا پەیکەرێکی بچکۆلانە هەڵدەگرێت و دەرگای گەورەی

ئەو وەرشەیە دەکاتەوە و بە تونێڵی سیاهی هەموو شەوزەنگدا وەکو هەڵهاتوویەک لە با، لە شەو، لە ترس، بەناو درەختەکاندا دەگەڕێتەوە. ئەو پەیکەرە هەمان ئەو پەیکەرەیە کە هەفتەیەک دواتر ناوی خۆی لەبنیدا هەڵدەکۆڵێ و بەدەستی گەنجە چاوشینەکەدا دەینێرێت بۆ من، ئەو پەیکەرەی چیا بە چیا دێت و ساڵ دوای ساڵ لە کونج و قوژبنەکانی ماڵەوەدا دەمێنێتەوە و بەرگەی هەموو گەردەلوولەکان دەگرێت... من ئەمڕۆ تێناگەم پەروانە مەبەستی چی بووە لەو پەیکەرە؟ ئایا باسی ئەبەدیەتی عەشقی کردوە، یان ویستوێتی مردنی عەشقم نیشانبدات؟.

فەرەیدون ئەو پیاوەی کە دەیگووت: «قەدەرمە هەموو شتەکان ونبکەم». دەترسا هێدی هێدی پەروانەش لەدەستبدات. لەو شەوانەدا کاتێک پەروانە، وەکو غەریزەی باڵندەیەک هەڵیبگرێت، وەکو پەپولەیەک بەشەوارە کەوتبێت، بەرەو ناو ئەو جەنگەڵە دەڕۆیشت، دوای پەروانە دەکەوت، لە ناو ئەو دار و دەوەنانەدا دەیگرت و دەیگووت: «پەروانە، پەروانەی من بگەڕێوە». پەروانە هەندێ جار سەری دەخستە سەر شانی و دەیگووت: «وەرە پێکەوە بگەڕێین، وەرە پێکەوە تا بەیانی لەنابەینی ئەم درەختانەدا بێین و بچین». هەندێ شەو فەرەیدون لەگەڵیدا دەڕۆیشت، سەرنجی ئەو نائارامی و نەسرەوتنە قووڵەی پەروانەی دەدا، سەرنجی ئەو ڕاوەستانە سەیرەی دەدا بەدیار شەو و بێدەنگی و گیا و بۆشاییەکانەوە، سەرنجی ئەو هەڵوەرینە سەیرەی دەدا کە دونیای چواردەوری خۆی پڕدەکرد لە بازنەی ئاوریشمین. هەندێ شەو فەرەیدون بێئەوەی توانای بەردەوامی هەبێت، بەناو شەوەزەنگ و تاریکیدا دەگەڕایەوە، بەڵام هیچ هێزێک نەیدەتوانی پەروانە لەو گەشتە بێسرەوتانەی شەو پەشیمانبکاتەوە، هیچ هێزێک پەروانەی نەدەگێڕایەوە... نە هاواری جانەوەرەکان... نە دڕکی ڕێگاکان... نە چوارگۆشە ترسناکەکانی دوپشک... نە ڕێگا باریکەکانی مار. پەروانە

لـە هەنـدێ کاتـدا وای هەسـتدەکرد کـە ئـەو چیتـر لەسـەر زەوی نییـە، هەسـتیدەکرد ڕۆحێکـی گڕگرتـوو باڵەکانـی خـۆی داوەتـێ و دەفڕێـت، بـەڵام هـەر لـە نـاو ئـەو خەیاڵانـەدا بـوو، کـە شـەوێک هەسـتیکرد یەکێـک چاوەدێریـدەکات، هەسـتیکرد مەخلوقێـک لەنابەینـی دارەکانـدا بەدوایـدا دێت، دوور بـە دوور چـاوی لـێ ناتروکێنێـت، پەروانـە چەنـد شـەوێک هەسـتی بـە نیگاکانـی دەکـرد و هیچـی نەدەگـووت، تـا دواجـار نیوەشـەوێک کـە زوڵمـەت لـە شـەوانی دیکـە بێڕەحمتـر و سـەنگینتر بـوو هاواریکـرد: «تـۆ... هەرکەسـێک هەیـت، لەپشـت ئـەو درەختانـەوە وەرە دەرێ... بـا بتبینـم».

دواجـار میدیـای غەمگیـن لەپشـت درەختێکـی گـەورەوە هاتـەدەرێ، سـەرەتا تەنهـا سێبەرە ڕەشـەکەی لـە نـاو تاریکیـدا دیاربـوو، کـە هاتـە بـەر تریفەکان دەفتەرێکـی پێبـوو بەرگەکـەی پڕبـوو لـە وێنـەی سـەدەها مانـگ، هـەر ئـەو شـەوە میدیـای غەمگیـن بـۆ پەروانـەی نوسـی: «پەروانـە تـۆ دەبیتـە تـۆز... دەبیتـە گـەرد. پەلـی دەسـتگیرانەکەت بگـرە و بـڕۆ... مـن چاوم لێتـە کـە هـەوا، بـا، هەتـاو، توێـخ لـە دوای توێـخ هەڵتدەگـرن و دەتبـەن».

ڕۆژێـک وای لێدێـت هەمـوو پیـاوان و ژنانـی ئـەو لێـڕەوارە، هەمـوو ئەوانـەی بـە خۆیـان دەگووت:«قەرەجەکانـی عەشـق»، هەسـتیان بـەو ڕەشـەبای تـۆز و گـەردە ئاوریشـمییەی پەروانـە دەکـرد، هەنـدێ شـەو ئـەو تـۆزە بەئەندازەیـەک تۆفانـی و زۆربـوو هەمـوو پێیـان وابـوو هەزارەهـا هـەزار پەپولـە پێکـەوە لەدەوریـان باڵەکانیـان دەتەکێنـن. میدیـا لـە یەکـێ لـەو شـەوانەدا لەسـەر دەفتەرەکـەی نوسـیوێتی: «پەروانـە بـا دەبیـات، گـەردی بریقـەدار و ئاوریشـمینی لەشـی وا لەسـەر دەفتەرەکەمـە. شـەو چەنـد جارێـک دەبێـت ئـەم دەفتـەرە بتەکێنـم... خودایـە... ئـەو کچـە دەبێتـە غوبـار». لەو شـەوانەدا کـە پەروانـە لەگـەڵ فەرەیدونـدا دەخـەوت، بەیانییـان فەرەیدونـی مەلـەک لـە خـەو هەڵدەسـتا و هەمـوو قـژ و بـرۆ و گـەردن و سـمێڵی بـەو گـەردە نازکـە داپۆشـرابوو. تـا پەروانـە زیاتریـش هەڵوەریبایـە فەرەیـدون

توندتر و کێویانەتر لەگەڵیدا دەخەوت، بەیانیانیش کە بەو گەرد و غوبار و تۆزە ئاوریشمییەوە هەڵدەستایە سەرپێ و بۆ خۆشتن دەچووە قەراغ ئەو چۆمە، ئەشوەیەکی سەیر دایدەگرت، ئەشوەیەکی دڵرفێن، ئەشوەی هاتنەدی ئومێدێکی دێرین، ئومێدی خەوتن لەگەڵ پەپولەیەکدا. بەلام فەرەیدون هەستیدەکرد هاتنەدی هیچ ئومێدێک، کۆتایی بەو گەڕانە نهێنییە ناهێنێت بەدوای شتێکی نادیاردا، کە لە منداڵییەوە لە ناخیدا گەورەبووبوو، ونبوون و دۆڕانە گەورەکانی ژیانیشی دەیان جار ئەو ئارەزووەیان تیا قووڵتر و قووڵتر کردبووەوە، بەلام ئێستا هەستیدەکرد هەمووی پەلکوتانێکی بێئەنجامە لە ناو سەراب و خەیاڵ و وڕینەدا.

هەڵوەرینی زیاتر و زیاتری پەروانە هیچ لەوە ناگۆڕێت لە هەموو شوێنێکدا، وەکو ستوونێکی هەلالە دەربکەوێت، بەیانیان لە ڕیزی سەبەتەچنەکاندا بە پەنجەکانی ئەو شولکە ئاسکانە بابدات و لەیەکتریان هەڵبکێشێت، بە دەنگێکی غەمگین قسە لەگەڵ ئافرەتەکاندا بکات، لەگەڵ میدیادا بەرەو قوولایی دارستانەکان بڕوات، لەسەر بەردەکان، دیواری خەرەندەکان ڕستە سەیرەکانی خۆی بنووسێت. میدیا لە سەرەتاوە بۆیدەنوسێت: «بە هیچ ئومێدێک مەژی. عەشقێک نییە لە دونیادا خۆی مردنی خۆی لە ناو خۆیدا هەڵنەگرتبێت». پەروانە لەسەر بەردەکان بۆی دەنوسێتەوە: «میدیای هاوڕێم. تەنیا خۆشەویستی گوناهبار نییە، سەیرکە، جیهان لە چواردەورمان هەمووی ماندووە، درەختەکان ماندوون، باڵندەکان ماندوون، ئێمەش بە وێرانی گەیشتووینەتە ئێرە». پەروانە دەنوسێت و با حەرفەکانی دەبات، دەنوسێت و لە چاوتروکانێکدا وشەکانی دەبن بە تۆز، هەندێجار بەدوای حەرفەکانی خۆیدا، دوای هەوا دەکەوێت، بەلام هیچ شتێک سوودی نییە. میدیا لەگەڵیدا ئاسمان و ناو سێبەرەکان دەگەڕێت بەلام ئەو شتانەی کە با دەیانبات هەرگیز ناگەڕێنەوە. میدیاش تا زیاتر لەو دنیایە ڕادەمێنێت، زیاتر و زیاتر

دەفتەرەکەی بە سنگییەوە دەنوسێنێ و دەڵێت: «عەشق دەڕوات، ئەوەی دەمێنێتەوە ئەم دەفتەرەیە». لە قووڵایی دارستاندا پەروانە بەو خاتوونە لاوازە دەڵێت: «گەورەترین بەدبەختی من ئەوەیە کە وشەکانم ئەمرن، هەمووشتێکم لەیاد دەچێتەوە، یادگارەکانم فەرامۆشدەکرێن، عومرم دەبێتە با، من مەخلوقێکی بچکۆلانە و نەگبەتم، بە جۆرێ ئاسایی و بچوکم بەزەحمەت بە یادوەرییەکانەوە دەلکێم، من وەکو هەموو مرۆڤە پەراوێزییەکان لە مردنەوە نزیکترم، دەمرم و کەس نازانێت کە ژیاوم، کەس نازانێت بە ژیانی دەیەها پیاو و گەنجدا ڕابوردووم... ئاه، میدیای غەمگین، ئاه... من لەیاد دەچمەوە، وای لە من، وای... من تێکەڵ بە نەبوون دەبم و حەرفەکانیشم وەکو خۆم، وەکو خۆم تێکەڵ بە نەبوون دەبن». ترسی هەرە گەورەی ژیانی ئەوەبوو لەیاد بچێتەوە، هەرواش بوو، ئەمڕۆ خزمەکانمان، کچانی گەڕەک، ئەو کوڕانەی لە زەمانی عاشقێنی پەروانەدا دەستە هەرزەکاری بەجۆش بوون، بەدەگمەن وێنەی پەروانەیان لەبیرماوە، تەنها کەسێک کە هەمیشە پەروانەی لەیادە، ڕەزای دڵخۆشە، ئەو دەیگووت: «ئافرەتێک بوو، نەدەبایە لەو ڕۆژگاری شەڕ و ئاگربارانەدا لەدایکبێت، ئەو لەوە ناسکتربوو بەرگەی ئەو هەموو ئاگر و ڕوناکی و ڕەشەبایە بگرێت، ئەو خۆی نەگرتبوو، مەخلوقێکی دەڵەمە بوو، لە شەرابێک دەچوو بەر لە وادەی خۆی تێکرابێت».

نەسرەدین ئەمڕۆ بە ستۆدیۆکەدا دێت و دەچێت و دەست لە گوڵە نایلۆنەکانی سەر مێزەکە دەدات و دەڵێت: «هەزارەها نەوە. پشت لە دوای پشت لە ناو ئەو چیایانەدا لەدایکبوون و مردوون و یادچوونەتەوە... کوردستان سەرزەمینی سەدان هەزار گوندە کە لە پێچاوپێچەکانی نێو ئەو سروشتە دڵڕەقەدا ونبوون، ملیۆنەها مرۆڤ لەویادا ژیاون، ئێستا هیچ یادگارێکیان جێنەهێشتووە... من لەو ساڵانەدا دەمگووت، دەریایەکی گەورە لە ڕۆح و دەرونی زیندوو، دەریایەکی بەرین لە زیندەگی، هەمووی

لەم چیا و کێو و هەڵەمووتانەدا ژیاون و مردوون و زەوی قووتیداون، لە خۆم دەپرسی چی لە مێژووی ئەم وڵاتەدا شایستەی ڕزگارکردنە؟ وەکو تەتەر لەمسەری کوردستانەوە دەچووم بۆ ئەوسەر، لەگەڵ دوژمنان و خێڵە بەکرێگیراوەکان و چڵکاوخۆرەکانی بێگانەدا تووشی شەڕ دەهاتم... لەو چیایانە هەموو سەرکردە سیاسییەکانم ناسی، لە پێدەشتەکان، زەنوێرەکان، لە گەرمیان و لە کوێستان، ئاغا کوردەکان و ڕەنجبەرەکانیانم بینی... تا گەیشتمە ئەو بڕوایەی بڵێم ئەم وڵاتە خاڵییە لە بەشەرێک بتوانێت خۆشتبووێت، خاڵییە لە بەشەرێک بتوانێت، لە ژێر پێی ئەو دێوە گەورەیەدا کە ناوی زەمەنە بەرگەی مانەوە بگرێت، من لە ژێر کەپر و دەوار و خێوەتی سەدەها عەشرەتدا دانیشتم، پیاوماقووڵانی هەموو ئەو عەشرەتانەم بینی... تەنها خەڵکێک لەم وڵاتەدا، لەم بۆشستانەدا شایستەی یادکردنەوە بن عاشقەکان بوون، هەربۆیەش ڕۆژ و ڕۆژگارێک نیشتمە سەر نوسینەوەی مێژووی عاشقان... بەڵام ئێستا دەڵێم، لەم وڵاتەدا کە خۆی وڵاتێکی لەبیرکراوە، لەم زەوییەدا کە هەزاران ساڵە یادوەری چەند مەزنە پیاوێکی هەڵنەگرتووە، بیرەوەری دوو بلیمەتی نەپاراستووە، دەبێت بۆ سەیربێت گەر ئەو عاشقانەش وەکو ملیۆنەها ملیۆن ئادەمیزادی دیکە بڕۆن و یادبچنەوە؟ دەبێت بۆ سەیربێت کەسێک پەروانە یان فەرەیدونی مەلەکی یادنەمێنێت؟ هەموو شتەکانی ئەم وڵاتە سەرابە، مێژووەکەی جگە لە غوبارێکی دوور هیچی تر نییە، خێڵەکانی جگە لە سەراب هیچی تر نین، سنوورەکانی لەبەر خورافەتەکانی خۆی و خورافەتی دوژمنەکانی دیار نین، شۆڕشەکانی دەبن بە تۆز، ڕاپەڕینەکانی دەبن بە دوکەڵ... ئیدی بۆ سەیرە مەخلوقاتە بچوکەکانی بەو جۆرە هەڵوەرێن؟»

من لە شەوە درێژ و خاڵییەکانی ماڵدا، هەڵدەستام و وەکو شێت بەناو ئەو ماڵە چۆڵ و هۆڵەدا دەسوڕامەوە، گوێم لە دەنگی با و باران

دەگرت لە دەرەوە، پەردەکانم لادەدا و لە تاریکی ورد دەبوومەوە و بیرم لە قسەکانی نەسرەدینی بۆنخۆش دەکردەوە، دەمگووت: «خودایە، یارمەتیمبدە، پەروانە لە بەحرە ترسناکەکانی بیرچوونەوە دەربهێنم، خودایە یارمەتیمبدە، زوڵمەتە بێبنەکانی ئەم یادچوونەوەیە ببڕم و سەربوردی مرۆڤێک ڕزگاربکەم». دەمگووت: «خودایە چارەنوسەکان چەندە دووبارە و سەدبارە و هەزاربارە ببنەوە، دواجار چارەنوسی هەرکەس بە تەنها و بۆ خۆی، شتێکە، جوانییەکە، ئەنتیکەیەکە، دەبێت نەمرێت... خودایە، یارمەتیمبدە، من ژیانی ڕاستەقینەی عەبدێک لە عەبدە یاخییەکانی تۆ دەنوسمەوە... ئاخر هیچ شتێ لە چارەنوسی مرۆڤەکان، سەیرتر و فریودەرتر و دولبەرتر نییە». من دەگەڕامەوە ستۆدیۆکەی نەسرەدینی بۆنخۆش، جانتاکەم فڕێدەدایە سەر کورسییەکەی و دەمگووت: «نەسرەدین، با، مێژووی ئەم وڵاتە بە درێژایی یەک سەدە هەمووی تەپوتۆز و غوبار بێت، با شۆڕشەکانی ببن بە خۆڵەمێش، با مرۆڤەکان ببنە با، بەڵام مانای ئەوە نییە دەستنەبەین و لە ناو ئەو تاریکییەدا چیرۆکێک دەرنەهێنین، یادەوەری مەخلوقێک نەپارێزین کە دەزانین ترسێکی گەورەی لە لەیادچوونەوە هەبووە».

بەڵام نەسرەدینی بۆنخۆش بە ترسێکەوە چاوە ژنانەکانی دەتروکاند، بە ترسێکەوە سەیری ئەو نائومێدییەی منی دەکرد و دەیگووت: « خەندان، خەندانی چکۆلە، من زۆر جار گومانم هەیە کە لەو جەنگەڵەدا سەروکارم لەگەڵ مرۆڤی ڕاستەقینەدا بووبێت، من ئێستاش دەپرسم، ئایا ناشێت ئەوان هەموو لە بنەڕەتدا کۆمەڵێ وەهمبن، گۆمەڵێ خەیاڵبن، دەستەیەک تارماییبن... تۆ دڵنیایت کە پەروانە و فەرەیدونی مەلەک لەو شەوەدا نەکوژران؟ دڵنیایت لەو شەوی مەحشەرەدا کە باسیدەکەیت لە ناو ئەو کتێبفرۆشییەدا نەسووتێنران... دڵنیایت؟»

وەک شێت بە شەقامەکاندا دەڕۆم، لە گێژاوی عەرەبانە دەستییەکان

دەردەچم، لە هەرێمی ڕۆنفرۆشەکان دەپەڕمەوە، بە بازاڕی هەلاجەکاندا گوزەردەکەم، گوزەری ماستفرۆشەکان بەجێدەهێڵم و بیر لە هەموو ئەم چیرۆکە دەکەمەوە. بە پرتاو دەگەمە ماڵ، دەست لەو پەیکەرە دەدەم، سەیری ناوی هەڵکۆڵراوی پەروانە دەکەمەوە لە ژێریدا، پەلاماری دەفتەرەکانی میدیای غەمگین دەدەم، بیر لە قسەکانی مەعسومە دەکەمەوە، بیر لە چیرۆکە درێژەکانی دەکەمەوە لە شەوی قوتابخانەی خوشکە تۆبەکارەکاندا... بیر لە ئێوارەی پەروانە دەکەمەوە، هەموویان... هەموویان، ڕاستی بوون... ناکرێت هەمووی وەهمی حکایەتخوانێک بووبێت، ناکرێت هەمووی خەیاڵەکانی من و درۆکانی ژیان خوڵقاندبێتی. نەسرەدین کە گومانی لە هەموو چیرۆکەکە دەکرد، ئێستا لەو باوەڕەدا بوو ئەو ڕۆژگارانە بۆ خۆیان ڕۆژگاری تەماوی بوون، هەموو فریوەکانی وێنەگرێکی بەکاردەهێنا تا زیاتر و زیاتر من بەرەو ڕیواقی گومان ڕابکێشێت، دەیگووت: «خەندان، هەمووی... هەمووی... زنجیرەیەک حکایەتە کە تۆ خۆت پێکەوە گرێیاندەدەیتەوە... زنجیرەیە حکایەتی جیاواز جیاوازە، من ئەمڕۆ وەکو ونبوویەک لە سەرابدا سەیری ئەو ڕۆژانەی خۆم دەکەم... کوا، کوا، ئەو جەنگەڵە لەکوێیە؟ وەرە با بۆی بگەڕێین... بزانین سالانی شەڕ و کاولکاری گەلایەکی سەوزی بۆ جێهێشتووین، ئەی کوان ئەو خێڵی عەشقە؟ ئەو شەوە کە من لەبەردەم ئەو پەیژەیدا بەجێمهێشتن بۆ کوێ چوون؟ بەکوێدا بڵاوبوونەوە، چ ڕەشەبایەک تەفروتونایکردن؟».

من دەمگووت: «تۆ لەوێبوویت، تۆ لە ناو ئەو دارستانەدا بوویت، تۆ خۆت دۆزیتەوە، خۆت ژیانی عاشقانت ڕێکخست، خۆت کەلوپەل و خواردن و جێگات بە بەستەی گەورە گەورە و بە گوریسی ئەستوور بۆ شۆڕکردنەوە، خۆت لەو چیا و دەشت و سەرسنوورانە کۆتکردنەوە، خۆت لە وەرزی قەسابخانەکانی ئەڤیندا پاراستتن، خۆت ئاگرت بۆ بردن،

هیوات خستە بەردەمیان، خۆت گۆڤەندت کردە وەستایان تا بە هونەر بژین». نەسرەدین بەو نیگایەی ئێستایەوە بە قووڵی سەیریدەکردم و دەیگووت: «بەڵام من کێم... کێم، منیش وەکو هەموو مەخلوقێکی تری ئەم وڵاتە نیوەم درێژکراوەی خەیاڵ و تەم و تەپوتۆزەکانە و نیوەم حەقیقەتە».

ئەو دەیگووت کاتی گێڕانەوەی ئەم چیرۆکە نەهاتووە، هەر ساتێ کۆی بەسەرهاتەکان لە گەرد و تاریکی پاکبووەوە ئەوسا تۆ ئەم چیرۆکە بگێڕەوە. من دەمزانی ئەو سەرم لێ تێکدەدات، بەرەو جێگای زۆر تەنگ و کوڵانی زۆر داخراوم دەبات، دەشمزانی حەقیقەت سەفەرێکە بەناو ئەو تەپوتۆز و خەیاڵانەدا کە ئەو ئەمڕۆ لێی هەڵدەهات، ئەمڕۆ دەیگووت:«منی وێنەگر چ کارم بەو هەموو نەخش و زەخرەفە و ترسانەی ڕۆحەوە هەبوو؟... چ کارم بە وێنەی شتێکەوە هەبوو کە وێنەی ناگیرێت؟... هەر لە سەرەتاوە وەکو پیاوێکی ناکۆک ژیاوم، من کە ئیشم وێنەگرتنی جەستەکان بوو، چی بردمیەسەر ئەو خەیاڵەی، خۆم بە ئازارەکانی ڕۆحەوە سەرقاڵبکەم؟»».

لەو ڕۆژە درێژانەدا من زیاتر و زیاتر ناکۆکی ڕۆحی ئەو پیاوەم دەبینی، کە ئێستا جارێک ویژدانی ئازاریدەدا و جارێکیش بە خۆی دەگووت: «هەمووی خەیاڵ و درۆ بوو... هەمووی چیرۆک و وەهم بوو» هەندێ جار منیشی لەگەڵ خۆیدا تووشی گێژاو و ڕێویلکەکان دەکرد، منی دەخستە ناو ئاوێنەکانی بزرۆکەیەکی ترسناکەوە، وای لێدەکردم بڵێم: خودایە، من کەوتوومەتە ناو چ وێڵگایەکی ترسناکەوە. دەستم دەبرد و دەفتەرەکانی میدیای غەمگینم دەخوێندەوە، پەڕە لە دوای پەڕە زیاتر دەگەیشتمە یەقین، دەمگووت: «ناکرێت درۆبێت، ناکرێت».

حەقیقەتی دەفتەرەکانی میدیا و چیرۆکەکانی مەعسوم بەگشتی وەکو یەکە، پەروانە و میدیا و مەعسوم پێکەوە لەو جەنگەڵەدا بوونە هاوڕێ،

ئـەوان دوور لەیـەک، جـودا لەیـەک، بێئـاگا لەیـەک، بەسـەرهاتی ئـەو ڕۆژانەیـان بـۆ گێڕابوومـەوە. کـە لـە قوتابخانـەی خوشـکە تۆبـەکارەکان بوویـن مەعسـومە نەیدەزانـی ڕۆژێـک لـەڕۆژان مـن دەفتـەری یاداشـتەکانی میدیـا دەخوێنمـەوە، لـەو باوەڕەشـدا نەبـوو ئـەو دەفتەرانـە مابێتـن... هەڵبـەت میدیـاش، نـاوی منـی نەبیسـتبوو، چونکـە پێناچێـت پەروانـە هەرگیـز باسـی ئـەو تاقـە خوشـکەی کردبێـت کـە دوای خـۆی ژیانـی لـە کونجـی تاریکـی تۆبەخانەیەکـی ژنانـدا بردەسـەر... بـەڵام چیرۆکـەکان هەمان چیـرۆک بـوون، بەسـەرهاتەکان هەمـان بەسـەرهات بـوون. ئەمـڕۆ، دوای ئـەو هەمـوو سـاڵە بـە ڕوونـی ئـەو هێڵـە تەریبـە دەبینـم کـە مـن و پەروانـە دوور بـە دوور دروسـتماندەکرد، ئـەو بـە گەشـتەکانی لـە شـەوی دوور و درێـژی دارسـتاندا و مـن بـە سـوڕانەوە و نەسـرەوتنم لـە تاریکـی ئـەو تۆبەخانـە گەورەیـەدا، ئـەو بـە مردنـی و مـن بـە نائومێدیـم، ئـەو بـە یادچوونـەوەی و مـن بـە یادکردنـەوەی، ئـەو بـە سـەفەری و مـن بـە نیشـتەجێبوونم.

## ١٤

ئەو شەوە دوای تەواوبوونی مەراسیمی دروستکردنی کۆمەڵەی خوشکە تۆبەکارەکان، من باوکم نەبینییەوە، بەڵکو سێ خاتوونی دیکە بە جۆرێ منیان ئابلۆقەدا، وەکو ئەوەی جانەوەرێکی ترسناکیان ئابلۆقەدابێت، هەر سێکیان منیان خستە نابەینی خۆیانەوە و بەرەو ماڵ گەڕاینەوە. بەدرێژایی ڕێگا هیچیان نەگووت، کە گەیشتینە ماڵیشەوە بێئەوەی پشووبدەن یان کەمێ بحەوێنەوە یەکسەر بەر لە من دەگای ژوورەکەمیان کردەوە و چوونە ژوورێ، ئاگادار بووم یەکێکیان بە برا گەورەکەمی گووت: « بۆ کچێک لەم تەمەنەدا، هیچ شتێک لە ژوورێکی تەنها ترسناکتر نییە». من لە سوچێکی تاریکدا وەستام و ئەوان یەکەیەکە دۆلابەکانیان کردمەوە، پارچە پارچە جلەکانیان دەرهێنام، تەنورە و کراسەکانی قوتابخانە، گۆرەوییە درێژەکانم، جلەکانی ژێرەوەم، هەندێ ژێرکراسی ڕەنگاوڕەنگ کە هەندێکیانم هەرگیز لەبەرنەکردبوو، چەند دەستەسرێکی بۆنخۆش، یەک دوو شوشە عەتری خاڵی و بچکۆلانە، جلی گەڕانی هاوینان، قاتە کوردییە پولەکەکەم، تی شێرتەکانم... ئەوانەیان هەموو خستە بوخچەیەکی گەورەوە، دواتریش هەموو کتێبەکانمیان ئاخنییە جانتایەکەوە. هەر ئەو شەوە پێیانگووتم: بوخچەکەت هەڵگرە و با بڕۆین. ئەو شەوە من بوخچەی جلەکانم و ئەوان جانتای کتێبەکانیان هەڵگرت و ڕۆیشتین. من و سێ ژنی ڕەشپۆش بەناو کۆڵانەکانی شەوێکی

تاریکدا، من بێدەنگ دەڕۆم و ئەوانیش جگە لە دەنگی پێ و خشەی ئەو جلە درێژانەیان کە لە خۆڵ و بەرد و دیوارەکانی شەو دەخشێ، دەنگێکی تریان لێوەنایەت، ئەوان تەماشای من ناکەن، منیش لەو پێڵاوە ڕەشە لاستیکانەی ئەوان زیاتر هیچی تر نابینم. هەرگیز شەو و شەقامی بەوجۆرە هێمنم نەبینیوە، سەیری ئاسمان دەکەم، هەرگیزیش ئاسمان وا شەپۆلاویی و زەوی وەها سفت نەبووە. بەدیار چرای سەر کۆڵانەکانی ئەو سەرەتای پایزەوە هەندێ مێشوولەی هاوینەی مەست بەجێماوە، من لە نیوەی ڕێگادا ماندوودەبم، دەستدەگرم بە عەبای یەکێکیانەوە و دەپرسم: «پورێ بۆ کوێ دەچین؟». یەکێکی دیکەیان دەڵێت: «دەتبەین بۆ بەهەشت». ئەوی دیکەیان پەلم دەگرێت و دەست بۆ دیوار و باڵەخانەکانی دەوروبەرمان درێژدەکات، دەڵێت: «دەتبەین بۆ دەرەوەی ئەم کافرستانییە». هیچ ناڵێم، شەو دەمانبات و ئێمە دەڕۆین، سوار ماشێنێک دەبین و پاش ماوەیەک دادەبەزینەوە. بەدرێژایی ڕێگا بۆ ئەوەی لەترسا نەمرم بیر لە پەروانە دەکەمەوە، لەو ژنانە دەپرسم، ئەگەر تا دەمرم، عیبادەتبکەم، خوا لە پەروانە دەبورێت؟ ئەوان دەڵێن: کەس لە پەروانە نابورێت، کەس. شار بە تەواوی لە پشتمانەوە وندەبێت، ماشێنێکی تر ماوەیەک دەمانبات و لە لاڕێگایەک دادەبەزین و بەناو خاکێکی بەیار و پڕ لە دڕکدا دەڕۆین، سروەیەک دێت و خۆڵەمێشێکی نەرم لەگەڵ خۆیدا دەهێنێت، بەناو دەیەها کێڵگەدا دەڕۆین. مێگەلە خەواڵوەکانی شەو بەتەکماندا تێدەپەڕن، زەوی بۆنی وەرزی خنکاوی لێدێت، گیای قەراغ ڕێگاکان لە قاچمەوە دەئاڵێن، بەڵام ئەو ژنانە وەکو خۆیان دەڕۆن، من هەستدەکەم گیاکان دەمگرن، هەستدەکەم چەندەها دەوەنی دڕکاوی تێمدەئاڵێت، بەڵام ئەوان ڕامدەکێشن و منیش خۆم لە چنگی شەو و ڕێگا و گیاکان ڕادەپسکێنم و دەڕۆم، هەستدەکەم مەخلوقاتی سپی و بریندار بەتەکماندا و بەرەو جێگایەکی نادیاری ناو

سندووقە تەلیسماوییەکانی شەو دەڕۆن، تا ئێمە زیاتریش بڕۆین زیاتر لە سپیدەی بەیان نزیکببینەوە، ئەو مەخلوقاتە نائارام و غەمگینانە زیاتر دووردەکەونەوە. دەمەوبەیان لەدوور تارمایی ئاوەدانییەکمان لێدەردەکەوێت، لە بولێلی خۆڵەمێشی پێش کازێوەدا، لەبەردەم دیوارێکی سپیدا دەوەستین، لە قەراغ شارۆچکەیەکی هێمندا. کۆترەکان بەر لە هەرکەس پێشوازیمان لێدەکەن، ژنێکی سپیپۆش دەرگایەکی ئاسنینی گەورەمان لێدەکاتەوە، دەچینە ناو حەوشێکی گەورە، چرایەکی کز لەبەر هەیوانێکی خاوێندا دەسووتێت، هەموو سەیری یەکتری دەکەین، ژنە عەبابەسەرەکان سەرتاپای عەباکانیان بووە بە تۆز، کە خۆیان دەتەکێنن هەموو ئەو ئاسمانەی دەوروبەرمان دەبێتە تەپوتۆز، کۆترەکان ئەو تەپوتۆزە دەیانترسێنێت و دەفڕن، دەنگی باڵەفڕێیان ئەو کەمتیارە پیرانەی دەشتاییەکانی دەوروبەر خەبەردەکاتەوە و بەرەو دوور هەڵدێن. ئەو ژنەی کە دەرگای لێکردینەوە، کەمێ ئاومان دەداتێ و دەڵێت: «ئێوە یەکەم کەسن... تا ئێستا کەسی تر نەگەیشتووە». بەڵام هێدی هێدی ژنانی عەبابەسەری دیکە و کچانی تەنهای وەکو من لە هەمان ڕێگاوە دەردەکەون، هەموو سەرو بوخچەیان بەدەستەوەیە... بەرلەوەی خۆر بە تەواوی هەڵبێت، دەبێت هەمووان لەوێبین.

من لە ناوەڕاستی ئەو حەوشەیەدا لەسەر بوخچەی جلەکانم دانیشتووم، هێدی هێدی چواردەورم قەرەباڵغ دەبێت. سوبح چەند بۆ پێشەوە هەنگاو بنێت، هێندە زیاتر کچی ترساو و ماندوو و خۆڵاوی لەو دەرگا ئاسنینەوە دێن بەم دیودا، هەمووانیش چەند خاتوونێکیان لەگەڵدایە، ژنەکان هەندێکیان هەر ئەو ژنە دەفبەدەستانەی ئێوارێی مزگەوتەکەن و هەندێکیشیان ژنانی دیکەن... یەکێک لە ناو ئەو بینا سپییە گەورەیەوە دێتەدەرێ و لیستێکی گەورەی بەدەستەوەیە، یەکە یەکە ناوەکانمان دەنوسێت و بەو لیستەیەی کە لای خۆی هەیە بەراوردیدەکات... لەگەڵ

هەتاوکەوتندا، دواهەمین کچ دەگات و ژنە عەبابەسەرەکان دەستە دەستە دەگەڕێنەوە و دەرگاکە دادەخرێت... دواهەمین کچ فەتانەی غەمگینە کە ڕاستەوڕاست بەرەولای من دێت و بوخچەی جلەکانی دادەنێت و لەسەری دادەنیشێت. هەتاو کەوتووە، بەڵام حەوشەکە هێشتا سێبەرێکی سارد و ئارام باڵی بەسەرداکێشاوە. فەتانە بە ئەسپایی و بێئەوەی تەماشامبکات دەڵێت: «من ناوم فەتانەی غەمگینە، ناوەکەمت لەیادبێت، ڕەنگە لێرە ناوەکانیشمان بگۆڕن، من و تۆ لە یەک قوتابخانە بووین، بەڵام من لە پۆلێکی تر بووم». لەنزیکەوە سەیریدەکەم، کچێکی ئەسمەر و بچکۆلانە و چاوڕەش دەبینم کە موورویەکی شینی چاوەزاری لەملدایە، سەیری کچەکانی چواردەوری خۆشم دەکەم، چاو لەو دەرگایە دەبڕم کە چەند خاتوونێکی پاک و پۆشتە و لەچک بەسەر، لێوەی دێنە دەرێ و دەچنە ژوورێ، ئەو جێگایە خانویەکی زۆر گەورەیە، جگە لە زەخرەفەی پەنجەرەکانی هیچی دیکەی لە مزگەوت ناچێت. وەکو دوایی دەرکەوت، ئەو شوێنە لە بنەڕەتدا قوتابخانەیەکی ئاینی بووە کە دەوڵەت لەسەر داوای گوندییەکانی ئەو ناوچەیە دروستیکردوە، دواتر لەگەڵ تێکچوونی بارودۆخی ناوچەکەدا دراوەتە دەست لێپرسراوانی ئەوقاف تا بەشێوەی تایبەتی خۆیان بیبەنبەڕێوە، ئەوانیش لەو ناوچە لاتەریک و دووردەستەدا کردبوویانە ناوەندی سازاندنەوەی منداڵی خێزانە بێشیرازەکان، بەڵام ئەو ناوە تەنها ڕووکەشێکی ڕەسمییە، ئەگینا ئێمە وەکو خوشکە تۆبەکارەکان ناوبانگدەردەکەین.

هیچ کچێ بە ئەندازەی من شتی پێنییە، بوخچەیەکی گەورەی جل و جانتایەک پڕ لە کتێب. «فەتانەی غەمگین» سەیرێکی جانتاکەم دەکات و دەڵێت: «کتێبەکانیشیان هێناوە؟ من بەرلەوەی بێم کتێبەکانم هەمووی شاردەوە، دەمزانی شتێکی وا بەڕێوەیە». من لێم پرسی: «دەزانیت، ئێرە کوێیە؟ تا کەی لێرە دەمێنینەوە؟». بەو دەنگە نازکەی

خۆی گووتی: «نازانم، بەڵام پێدەچێت ماوەیەکی زۆر لێرە بمێنینەوە».
فەتانە لەچکێکی سپی سادە بەڵام کەمێک چڵکنی لەسەردایە، سەیرێکی لەچکەکەی من دەکات و دەڵێت: «دەمێکە لەچک دەبەستیت؟». گووتم: «لەوکاتەوەی پەروانەی خوشکم ڕۆیشتووە». سەیرێکم دەکات و دەڵێت: «خوشکەکەی تۆش خراپ بوو؟». گووتم: «نازانم... باوەڕناکەم... حەزی لە زۆر پیاو کردبوو، بەڵام باوەڕناکەم لەگەڵ هەموویاندا خەوتبێت». ئەو گووتی: «خوشکەکەی من سۆزانی نەبوو، تەنها حەزی لە یەک کوڕ کردبوو، ناوی کڵپە بوو، خوشکەکەم لاڵ بوو، قسەی نەدەکرد، وەکو ماسی وابوو، بەردەوام دەینوسی، لە تەمەنی چوار ساڵییەوە فێری نوسین بووبوو، ساڵانێکی درێژ ئەو کوڕە شەوان دەهاتە بەردەمی دەرگاکەمان و مۆسیقای جۆرا و جۆری لێدەدا، هەڵبەتە تەنها بەدەم، میدیاش نامەی درێژی بۆ دەنوسی و دەیخستە ناو قاوغە شقارتەوە و بۆی فڕێدەدا، کڵپە نەیدەزانی میدیای خوشکم ناتوانێت قسەبکات. تا ئەو شەوەش کە ڕایانکرد کڵپە نەیدەزانی میدیا لە نوسین زیاتر هیچی تر نازانێت». من گووتم: «خوشکەکەی منیش لەگەڵ کوڕێکدا هەڵهاتووە، ناوی فەرەیدونی مەلەکە». ئەو چپاندی: «دەزانیت ئێستا لەکوێن؟» گووتم: «نا... نازانم... کەس نازانێت».

لەوکاتەدا ژنێکی لەچک بەسەر دەرکەوتەوە و فەرمانی پێداین بە خۆمان و جانتاکانمانەوە بۆ حەوشێکی دیکە لەپشتەوە دوای بکەوین، قوتابخانەکە لەوێ دیوارێکی بەرز و سپی و ئەستووری هەبوو، حەوشەکەش حەوشێکی خۆڵی گەورەبوو کە پێدەچوو جارێک لە جارەکان یەکێ ویستبێتی هەندێ گوڵی تیابچێنێت، هەندێک گوڵ کە هەرگیز سەوز نەبووبوون، پاش تۆزێ هەمان ئەو ژنە ڕەشپۆشە گەڕایەوە و هەندێ خانمی دیکە هاتن، پێیانگووتین جانتاکانمان هەڵڕێژین، یەکە یەکە چی لە جانتا و بوخچەکانماندا بوو هەڵمانڕشت، کاتێک گەیشتە ئەوەی

مـن جـل و کتێبەکانـم هەڵڕێـژم، کۆمەڵەیەکـی گـەورە جـل و کتێـب بـە شـێوەیەکی سـەیر لەسـەریەک کەڵەکـە بووبـوون. هەموومـان جانتاکانمـان هەڵتەکاند، دوا پارچـە جلـی خۆمـان دەرهێنـا و تورماندایـە سـەر ئـەو تەبارە گەورانـە، دوای ئـەوەش هەمـوو بـە ئەڵقەیەکـی گـەورە لـە دووری ئـەو دیمەنـە دانیشـتین. فەتانـە بـەردەوام لـە تەنیشـتمەوە بـوو، ژنێکـی باڵابـەرز و تۆکمـە بـە خـۆی و مانتۆیەکـی شـین و لەچکێکـی سـپییەوە هاتەپێشـێ، سـەیری جـل و کتێبەکانـی کـرد، سـەیری هەمـوو کچەکانیشـی کـرد، لیسـتی ناوەکانـی گرت بەدەسـتەوە و گووتـی: «ئێـوە ئەمـڕۆ ژیانێکـی تـازە دەسـت پێدەکـەن، چیتـر هیـچ شـتێ بەکارناهێنـن کـە لـە ڕابـوردوودا بەکارتانهێنـاوە، هیـچ شـتێ کـە ئـەو ڕۆژانـە و ئـەو یادگارانـە و ئـەو هەسـتانەتان وەبیربخاتـەوە، ئێـوە ئەمـڕۆ کچـی دونیایەکـی تـرن، دونیایەکـی پـاک...». لـە یەکـەم ڕۆژەوە فێردەبیـن وشـەی سـەرەکی لـە ژیـان و لـە ئایـن و لە ئێسـتا و لـە داهاتوومانـدا، پاکییە. هەمووشـتەکان دەبێـت پاکبـن، دەسـتمان، دەرونمـان، لەشـمان، نیگامـان، زەردەخەنەمـان، نیازمـان. فێردەبیـن کـە ئێـرە قوتابخانەیەکـە پاکژیمـان پێدەبەخشـێتەوە، چونکـێ ئێمـە منداڵـی کۆمەڵـێ خێزانیـن کـە تاسـەر ئێسـک لـە خراپـەدا ڕۆچـوون، ئێمـە گوناهـی شـەهوەتی خوشـکەکانمان پێیە، دەبێـت خۆمـان لـە ئاگـری ئـەو شـەهوەتانە پاکبکەینـەوە. ئـەو ژنـەی لـەو بەیانییـەدا قسـەی بـۆ دەکردیـن «زەینەبـی کوێسـتانی» بـوو، ئـەو سـاڵانێکی درێـژ لـە تەکیـەی شـێخێکی گـەورەدا لـە چیایەکـی بەفـراوی کوێسـتاندا ژیابـوو، حکایەتەکانیـش دەیانگـووت لـە کەمـەری بەرەوخـوار یـەک پارچـە سـەهۆڵە، هـەر کەسێکیش لـە نزیکییـەوە بوەسـتابایە هەسـتی بـەو ساردییە دەکـرد کـە لـە چواردەوری خـۆی بڵاویدەکردەوە، بـەڵام فەتانـە دەیگـووت، هەمـووی درۆیـە ئـەو سـاردییەش کـە باسـیدەکەن پەیوەنـدی بـە چـاو و نیگاکردنییـەوە هەیـە، ئـەو سـەرمایە سـەرمای سـەیرکردنەکانێتی، بـەڵام ئەوانـی دی ئەفسـانەیان لەسـەر دەچنـی و دەیانگـووت هەمـوو ئـەو پیاوانـەی

کە لێی نزیک کەوتونەتەوە ڕەقبوونەتەوە، هەموو ئەو باڵندانەی لە نزیکییەوە نیشتوونەتەوە بوونەتە شەختە. ئەو لەو بەیانییەدا بە هەموو شکۆی خۆیەوە، تەماشایدەکردین، پێیڕاگەیاندین کە ئەو لێپرسراوی ئەم قوتابخانەیەیە، کاتێ بوخچە و جانتاکانمان خاڵییدەکردەوە، هەندێ جار دەستیدەبرد بۆ یەکێ لە تەزبیحەکانی سەر سنگی و دەیگووت: باشتر ڕایتەکێنن، جوان خاڵیبکەنەوە. جارجار پشتیدەکردە ئێمە و لەسەر دەفتەرێکی بچکۆلانە شتێکی دەنوسی و جارجاریش بە پەنجە یان بە چاو ئیشارەتی تایبەتی دەدا بە ژنە هاوکارەکانی، من لەوەوبەر ئەم ژنەم نەبینیبوو، ژنە هاوکارەکانیشی هەموویان بۆ من نەناسراوبوون، خاتوونێکی سپیکەلانە نەبێت کە خاڵێکی ڕەشی زۆر گەورە لە ژێر چەناگەیدا بوو، هەندێ جار ئەوم لە مەجلیس و شەوە تاریکەکانی ماڵی پوردا بینیبوو. ئەو ژنە لەو بەیانییەدا قاپێ نەوتی چکۆلەی دەهێنا و دەیدایە دەست زەینەبی کوێستانی، من دڵنیانەبووم ئایا دەمناسێت یاخود نەء؟ زەینەبی کوێستانی پێیدەگووت: «کەمێ نەوتی دیکەش بهێنە، جلەکان زۆرن» . ئەو دەگەڕایەوە و خانمی زەینەب خۆی بەدەستی خۆی نەوتەکەی دەکرد بە تەباری جل و کتێبەکاندا، پێیدەگووتین کەمێ دوورکەوینەوە، لە جانتا بچکۆلانەکەی خۆشی شقارتەیەکی دەردەهێنا و دەیگووت: «ئێستا کاتی ئەوە هاتووە یەکەم هەنگاو بنێین، بۆ پاکبوونەوە» . لەگەڵ بەرزبوونەوەی ئاگر و بۆسوی جلەکاندا، هەستمکرد کۆترە سپییەکان جارێکی دی دەفڕنەوە، ئاگرەکە لەسەرەخۆ بڵاودەبووەوە من لە ناو ئەو دوکەڵ و گڕەدا سوچی دەفتەری یادگارەکانم دەبینی دەسووتێت، بە ئەسپایی بە فەتانەم گووت: «سەیرکە ئەوە دەفتەری یادگارەکانمە دەسووتێت» . ئەو لە تەنیشتمەوە بە چرپەوە دەیگووت: «من لە منداڵییەوە لە میدیای خوشکمەوە فێربووم چۆن دەفتەرەکانم بشارمەوە... لە جێگایەکدا شاردومەتەوە کەس ناتوانێت بیدۆزێتەوە، لە

ژێر هەنجیری حەوشی ماڵی کچێکی ڕەفیقمدا». فەتانە زۆر قسەیدەکرد، بەردەوام قسەیدەکرد، من نەمدەتوانی گوێی لێبگرم، دەمویست هەستم و دەستبەرم لە ناو ئەو ئاگرەدا جلەکانم و دەفتەرە سووتاوەکانم دەربهێنمەوە، ئەو جلانەی ئێواران کاتێ لەگەڵ پەروانەدا دەچوومە دەرێ لەبەرمدەکردن، ئەو جلانەی پیاسەم پێوە دەکردن، هەموو ژیان و یادگارەکانم بەو جلانەوە بوو، بەڵام بۆسۆکە تادەهات زیادیدەکرد، گڕەکە تادەهات بەرزدەبووەوە و دوکەڵێکی ڕەش وەکو ستونێکی گەورە دەچوو بە ئاسماندا و نەسیمی هێمنی بەیانی بەسەر ئەو شارۆچکەیەدا بڵاویدەکردەوە، بەڵام لەبری تورەیی، لەبری خۆهەڵدانە ناو ئەو ئاگرەوە تەنها خەندەیەکی بچکۆلانە و تاڵ دەکەوتە سەرلێوم. فەتانەش وەکو من سەیری ئاگرەکەی دەکرد و دەیچرپاند بەگوێمدا: «حەیفم لەو کراسە دەیالینە شینەم دێت، زۆر حەزم لێی دەکرد».

من بەردەوام سەیری ئاگرەکەم دەکرد، وردە وردە دوکەڵەکە کچەکانی دەهێنایە کۆکە و چاویان ئاویدەکرد، زەینەب بەشێوەیەکی سەیر خۆی لە ئاگرەکە دوورگرتبوو، من لە جێگای خۆمەوە لەپشت کلپەکانەوە دەمبینی، ئەو مەستانە تەماشایدەکرد و لە نێو نێڵەنێڵی ئاگرەکەوە دەیگووت: «ئەوەی دەسووتێت کۆمەڵێ کتێب و جل و سیپاڵی شڕ نییە، بەڵکو دنیایەکە ئێوە تیایدا بە چەوتی گەورەبوون». کچەکان هێدی هێدی لە ئاگرەکە دوورکەوتنەوە، هەستمدەکرد من بە پێچەوانەی هەموانەوە نە دەکۆکم، نە چاوانم ئاودەکات بەڵکو تادەهات پتر لە ناو ئەو ئاگرەدا پەڕە پەڕە و پارچە پارچە سووتانی کتێبەکانم و جلەکانم دەبینی. حەسرەتێکی سەیر لە دڵمدا دروستدەبوو، یەکەمجار بوو هەست بە حەسرەتی وەها قووڵ بکەم، هەستبکەم تەواو کەوتوومەتە ناو دنیایەکی غەریبەوە، لە سووتانی شتەکانی خۆم و پەروانەدا، سووتانی ئەو ئولفەت و گەرمییەم دەبینی کە من بە ژیانەوە دەبەستێتەوە. لە

ساتێکدا ڕوانیم و بینیم تەنها من لەنزیک ئەو ئاگرەوە وەستاوم، تەنها من بە قووڵی سەیری کڵپەکان دەکەم، بە تەنها من حەسرەتەکانم لە ترسم گەورەترن. سەرم هەڵبڕی ئەو خاتوونەم بینی لە ناو دوکەڵ و بۆسۆ و قرچەقرچی سووتانەکەدا لێم نزیکدەبێتەوە و پێمدەڵێت: «دڵت بۆ شتەکانت دەسووتێت؟». من تەماشامکرد و هیچم نەگووت، بەڵام ئەو سەراسیمە سەیریکردم و گووتی: «ئەو خەندەیەی تۆ لە خەندەیەکی پاک ناچێت». لەهەمان کاتدا چەند ژنێکی یاوەر بە چەند دارێکی درێژ و گەورەوە جل و کتێبەکانیان هەڵدەگێڕایەوە تا هەر جێگایەک ئاگر نەیگرتووە بیگرێت، تا ئەوەی نەسووتاوە بسووتێت. یەکێ لەوانە بە دارێکی گڕاوییەوە لێم نزیکبووەوە و گووتی: «بڕۆ دواوە... بڕۆ دواوە». فەتانەی غەمگینیش ڕایکێشام و چرپاندی: «خەندان، شتێکی باش نییە سەرسەختیان لەگەڵدا بکەیت... شتێکی باش نییە لەمڕۆوە سەرنجێکی خراپت لێ وەربگرن». لەگەڵ فەتانەدا گەڕامەوە ناو ئەو کچانەی ئێستا هەموو لەپاڵ قوتابخانەکەدا و دوور لە دوکەڵەکە ڕیزبووبوون، بە لەچکەکانیان دەم ولووت و چاویان گرتبوو، تا ئاگرەکەش بڵێسەی بسەندایە، نێڵە نێڵی ڕۆحی ئەو ژنەش زیاتر بەرزدەبووەوە کە دەیگووت: «ئاگر گوناهەکان دەشواتەوە، خراپە پاکدەکاتەوە، بۆئەوەی خاوێنیش ببنەوە دەبێت نەفرەت لەو ڕۆژانە بکەن کە نیمچە ڕووت، بە کۆڵان و شەقام و شاراندا هاتوچۆتانکردوە، حیکمەتی نوێی ئەم ژیانە لە شتێکی زۆر ساردەوە دەست پێدەکات، ئەویش جلەکانتانە، ئەوەی دەیەوێت تۆبەبکات و پاکببێتەوە دەبێت لە جلەکانییەوە دەستپێبکات، بزانن، هەموو ئەو ژیانەی کە بەو جۆرە جلانەوە ژیاون، ژیانێکی ئاسایی نەبووە، ژیانی ئاسایی ئەو ژیانەیە کە یادتانکردوە».

«زەینەبی کوێستانی» کەمێک دەوەستا، با سووتووی کتێب و جلەکانی بە هەموولایەکدا بڵاودەکردەوە، کەمێک خۆی لە دوکەڵەکە

دوردەخستەوە کە ئێستا با بە ئارەزووی خۆی بەملاولادا یاریپێدەکرد... سەیریدەکردینەوە و بە شێوەیەکی جیدیتر دەکەوتەوە قسەکردن و دەیگووت: «ئاینی ئێمە لەو ئاینانە نییە بە خەڵکی و بە ئومەتی ئیمانداران بڵێت بڕۆن کەیفتان بە چییە بیکەن... چی لەبەردەکەن گرنگ نییە، چی دەخۆن گرنگ نییە... نا، ئاینەکەی ئێمە ئینسان لە هەموو ڕوویەکەوە سازدەدات، لە هەموو ڕوویەکەوە بۆ خوداپەرستی ئامادەیدەکات، ڕوکنی سەرەکی و یەکەم و گەورەی ئەو سازدانەش بۆ ئافرەت لە جلوبەرگەوە دەستپێدەکات، بەوەدا کە ئافرەت لەشی هەمووی لەزەتە، جلوبەرگ بۆ ئافرەت نیوەی ئیمانە، جلوبەرگ تەنها ڕەوشتی بەرز و نزم لەیەکتر جیاناکاتەوە، بەڵکو ئەو نیازەش ئاشکرادەکات کە تۆ لە چ جیهانێکدا دەتەوێت بژیت، جلوبەرگ زمانە، زمانی لەشە، زمانی ڕۆحە، زمانی ئارەزووەکانە، ئارەزووەکانی جەستە و ئارەزووەکانی عەقڵیش. کە لەشی خۆت دەردەخەیت بەربەستێکی ئەستوور و گرنگ لەبەردەم شەیتاندا هەڵدەگریت تا بێت و ئاسانتر ختووکەی شەهوەتەکان بدات. جل پەیوەندییەکی گرنگی بە شەیتانەوە هەیە، شەیتان بەر لە هەر شتێک بەرگئەنداز و بەرگدرووە، دەبێت هەمووتان بزانن کە شەیتان یەکەمجار لە شێوەی قاتێک جلدا خۆی بۆ ئافرەت ئاشکرادەکات... شەیتان لە وێنەی کراسێکی کورت یان بریقەداردا دەردەکەوێت، لە وێنەی پانتۆڵێکی ئارەزوو هەستێن، یان سوخمەیەکی کراوەی شەهوەت بزوێندا دێتە خەیاڵمان... ئاین لە منداڵییەوە پێماندەڵێت: «لەشتان داپۆشن». شەیتانیش لە منداڵییەوە پێماندەڵێت: «لەشتان ڕووتبکەن، عەورەتتان دەرخەن، لە ڕووتی مەترسن». بۆیە دەبێت بزانن گۆڕینی ئەم دونیایە لە گۆڕینی جل و بەرگەکانەوە دەستپێدەکات، بۆئەوەی جیهان چاکبکەین، دەبێت مرۆڤ چاکبکەین، بۆئەوەی مرۆڤیش چاکبکەین دەبێت جلێکی لایەقی لەبەردابێت... سەیربکەن، کچانی من، سەیرکەن

ئەو جلانە هێندەی پارچەیەک لە سەنعەتی شەیتان بوون، جل نەبوون. هێندەی مایەی ئەو ڕۆژە ڕەشانەی ژیانی ئێوە بوون، جل نەبوون... ئەوەی دەسووتێت، جل نییە بەڵکو شەیتانە، شەیتانێکە ئێوە عومرێکی درێژ لەگەڵ خۆتاندا هەڵتانگرتووە، لەبەرتانکردوە، ختوکەی پێستەکەی داون، لەشتانی بزواندووە... غەم بۆ ئەو شەیتانە مەخۆن... ئەمڕۆ لێرە، جلی نوێ و پاکتر وەردەگرن، جلێک کە لە هەموو پیسی و خراپەیەک دەتانپارێزێت، جلی ئیمان و بڕوا بە خودا بوون».

زەینەب وریایی ژنێکی گوندنشین و مامۆستایەکی خوێندەواری شاری تێکەڵکردبوو... دیاربوو ئەزموونێکی زۆری لە ژیانی تەکیە و خانەقاکاندا هەیە، هەروەها بێبەشیش نییە لە ئەزموونی مەجلیسی ژنە شارییەکان. بەر لە دروستبوونی یەکێتی ژنانی موسڵمان، ئەو لە یەکێتییەکانی دیکەی ژنان و ئافرەتاندا ئەندام بووبوو، لەوێش وەکو خۆی دەیگووت هەوڵیدابوو نرخە بەرز و پیرۆزەکانی ئاین بڵاوبکاتەوە، دواتر بووبوو بە چاودێری ئەو حوجرە ئاینییە چکۆلانانەی کە ئەوقاف لە تەکیە جیاواز جیاوازەکانی ناو گوند و شارۆچکەکاندا سەرپەرشتیدەکردن، بەهۆی شارەزایی و ئیمانداریی و بڕوای گەورەشی بە پاشەڕۆژی ئاین، لە چاودێرێکی بچوکەوە کردیان بە چاودێری گشتی... هەڵبژاردنی لەلایەن مەجمەعی زانا ئاینییەکانەوە بۆ بەڕێوەبردنی ئەم قوتابخانەی سازدانەوەیە، گەرچی ئەرکێکی قورس بوو، بەڵام ڕێزلێنانێکی گەورەبوو بۆ ئافرەتێک تازە بەرەو سەروو چل هەڵدەکشا.

ئەو بەیانییە کە زەینەبی کوێستانی قسەیدەکرد، گومانمدەکرد هەموو کچان لە قسەکانی تێبگەن، هەندێکیان دیاربوو چەندساڵێکی کەم قوتابخانەی سەرەتاییان خوێندبوو و هەندێکیشیان هەرگیز قوتابخانەیان نەبینیبوو، یەکێ لە ئەرکەکانی ئەم قوتابخانەیە ئەوەبوو کە ئەو کچانە فێری خوێندن و نوسین بکات تا بتوانن قورئان بخوێننەوە و پیسی و پاکی

لەیەکتر جیابکەنەوە… ئەو بەیانییە خاتوونی کوێستانی زۆر قسەیکرد، لەگەڵ قسەکردنەکانی ئەویشدا چیتر جگە لە پاشماوەیەک لە خۆڵەمێش و سووتوو و نایلۆنی تەواوە هیچی تر لە ڕابوردوومان نەدەمایەوە. دوای خامۆشبوونی ئاگرەکە، ڕیزیانکردین و بەرەو بەردەرگای مەخزەنێکی گەورە بردیانین، مەخزەنەکە دەکەوتە گۆشەی باکووری بیناکەوە، لەوێ جگە لە دوو دەست مانتۆی شین و چەند لەچکێک، هەندێ نوێن و متیل و بالیفی تازەشیان داینێت، دواتر بە دالانێکی تاریک و درێژدا بەرەو نهۆمی دووهەمی بیناکە سەرکەوتین، فەتانەی غەمگین بەردەوام بەدوامەوە بوو، دەیگووت دەبێت لە ژوورێکدا پێکەوەبین، چونکە پێویستیمان بە یەکتری دەبێت، هەرواش بوو، دواجار من و فەتانە لەگەڵ دوو کچی دیکەدا ژوورێکی چوارکەسیمان وەرگرت.

قوتابخانەکە جگە لە ژوورەکانی خەوتن، چەندین سالۆنی گەورە گەورەی خوێندنیشی هەبوو، ژێرزەمینێکی زۆر فراوان، چەند ژوورێکی تایبەت بۆ مەخزەن و سووتەمەنی و ئازووقە، چێشتخانەیەکی زۆر بەرین، ڕیزێکی درێژ حەمامی داخراو و دەستشۆری تایبەت بۆ دەستنوێژ.

ژوورەکانی خەوتن هەروەک ئەو ژوورانە وەهابوون کە لە بەشە ناوخۆییەکانی دیکەدا بینیووتانە، دوو قەرەوێڵەی دووقات و مێزێکی خواردن و دوو لۆکەری جلوبەرگ. ژوورەکەی من و فەتانە چەندین پەنجەرەی بچکۆلانەی تێدابوو، لەگەڵ ئەوەشدا هەمیشە تاریک بوو. فەتانە دەیگووت: «براکەم گووتوێتی، لە چەند ساڵی داهاتوو هەموو وڵات پڕدەبێت لە قوتابخانە و ئیسلاحیاتی دینی، چونکە تا مەترسی لەسەر ئەخلاق گەورەتر بێت، مرۆڤ پێویستی بەمجۆرە قوتابخانانە زیاتر دەبێت، براکەم دەیگووت تا پتر سوود لە جێگای دوورە شار و دوورە دەست ببینرێت باشترە، چونکە تا گۆشەگیری قووڵتر بێت، پەیوەندی مرۆڤ بە خوداوە قووڵتر دەبێت، ئەمە جگە لەوەی کە دوورکەوتنەوە

لە گوناه و خراپە زامنتر و مسۆگەرترە».

ئەو دوو کیژەی دی کە لە ژوورەکەدا لەگەڵمان بوون، دوو خوشک بوون لە یەکێ لە هەرە هەژارترین گەڕەکەکانی شارەوە هاتبوون، خوشکە گەورەکەیان لە ژێر فشارێکی دەرونی سەختدا دەژیا، کە هاتنە ژوورێ، بێئەوەی هیچ بکەن یان هیچ بڵێن، دەستیانکرد بە گریان. فەتانە هۆی گریانەکەی دەگێڕایەوە بۆ تاریکی و قەبزی نێو داڵان و ژوورەکان. بەڵام خوشکەکان دەیانگووت دایکیان لەگەڵ زەڕەنگەرێکدا ڕایکردوە و باوکیشیان سەری خۆی هەڵگرتووە و کەس نازانێت لەکوێ گیرساوەتەوە، ئەوانیش بۆ بێکەسی خۆیان دەگرین. فەتانە پێیدەگووتن: «دەمووچاوتان بشۆن، هەمووشتی چاکدەبێت، ئێمە لێرە پێکەوە دەژین... لە داهاتوودا لەوانەیە ببین بە مامۆستای ئاینیش». ئێوارەی ڕۆژی یەکەم، بۆ دڵنەواییدانەوەی ئەو کچانە، هەر چوارمان پێکەوە کەوتینە گەڕان بەناو قوتابخانەکەدا، ئەو کیژانەمان بینی، کە هێدی هێدی کەوتبوونە سەر تاقیکردنەوەی شوێنە تازەکەی ژیانیان، پەردەیان بە پەنجەرەکاندا هەڵدەواسی، متیلیان لە دۆشەکەکان دەگرت و لۆکەرەکانیان چاکدەکرد، یەکە یەکە بەسەر هەموو ژوورەکاندا گەڕاین، کچەکان هەندێکیان بۆمان پێدەکەنین و هەندێکیان بە بێدەنگ سەیریاندەکردین، کە دابەزینە حەوشەکەوە، هەستێکی منداڵانە بە غەم دڵمانی دەگووشی، هەر چوارمان دڵنیابووین کە دوا جێگا بتوانین ئاسمان و هەتاوی تیا ببینین ئەو حەوشەیەیە کە دیوارە بەرزەکانی بووبوون بە بەربەستێکی گەورە لەنێوان ئێمە و دونیادا، دوو خوشکەکە کەم کەم پێکەنین کەوتەوە سەر ڕوخساریان، هەندێ لە مامۆستا ژنەکان جارجار دەردەکەوتن و سەیری ئەو حەوشە بەرهووتەیان دەکرد کە ئێمە لەپاڵ سێبەری دیوارەکەیدا دانیشتبووین و قسەماندەکرد. خوشکە بچکۆلانەکەیان ناوی «مەهتاب» بوو زوو زوو ژێرچەنەی خۆی دەخوراند و دەیگووت: « دایکم گوناهبارنەبوو... دایکم

ئەو ئافرەتە نەبوو کە ئەمانە باسیدەکەن». لەیلای خوشکە گەورەکەی بە تورەییەوە سەیریدەکرد و دەیگووت: «دایکم گوناهبار بوو، ئێمەش گوناهبارین، هەموومان گوناهبارین و بە هیچیش پاکنابینەوە». من لە ڕۆژی یەکەمەوە نائارامییەکی قووڵم لە ڕۆحی لەیلادا دەبینی، ئەو ئێوارەیە کە لەبەر سێبەرەکەدا دانیشتبووین بەجۆرێ دەستی دەجولاند هەستم بە شپرزەییەکی زۆر قووڵ دەکرد، کچێکی چاو پچکۆلە بوو، بالای لە هەرسێکمان بەرزتر بوو و سینەشی لە هەموومان گەورەتر، بەلام لە ڕقەبەرەکایەتییەکی شێتانەدا دەژیا لەگەڵ ئەو خوشکە بچکۆلانەیەیدا کە باوەڕی بە هیچ شتێکی نەدەکرد، کاتێ ئەوان لەگەڵ یەکدا شەڕیاندەکرد من و فەتانە گوێماندەگرت، لەیلا دەیگووت: «ماڵی ئێمە پڕبووە لە شەیتانەکان، شەیتانی هەمەڕەنگ، ئەوانە دایکمیان لەخشتەبرد و تووشی ئەو چارەنوسەیان کرد». بەلام مەهتاب کە دواتر بە «کوپە» ناوبانگیدەرکرد، دەیگووت: «ماڵی ئێمە لە هەمووشتێ خاڵیبوو، لە نوێن، لە خواردن، لە فەرش، لە جل، لە فریشتە، لە شەیتان... بۆیە دایکم ڕایکرد». مەهتاب کە بە پێچەوانەی خوشکەکەیەوە، کچێکی خڕپلە و کورت بوو، سیمای کونەپەپویەکی غەمگینی هەبوو، ئەو دەیگووت: «دایکم گوناهبارنییە، هەر کەسێکی دیکەش بووایە لە شوێنی ئەو، هەر وایدەکرد». دیاربوو دوو خوشکەکە هەرگیز پێکەوە ناگونجێن، بەلام ئاشکراش بوو بێ یەکتری ناژین، هەمیشە پێکەوەبوون و بەردەوامیش ئازاری یەکیاندەدا. ئەو ئێوارەیە مەهتاب بە دزییەوە، جووتێ گوارەی زۆر قەشەنگی نیشاندام کە تاکە شتێک بوو توانیبووی لە ماڵەوە دەریکات و لە ناو جلەکانیدا بیشارێتەوە، ئەو دەیگووت ئەوە دواهەمین یادگاری دایکێتی و هەرگیز دەستەبەرداری نابێت. ئەو ڕۆژە سەرنجماندا کە قوتابخانەکە لە عەسرێکی زووەوە تاریکدەبێت، هێمنییەکی سەیریش لە هەموو ژوورەکاندا بەرقەراربوو، من و فەتانە ئەو ڕۆژە چەندەها

جار پێکەوە چووینە دەرێ و بە سالۆنەکەدا گەڕاین، لە پەنجەرەیەکی گەورەوە سەیری دەرەوەمان کرد، ئەو ماشێنە گەورەیەمان بینی کە فەرش و کورسی و تەختە و کەلوپەلی دیکەی دەهێنا بۆ ژوورەکانی خوێندن و شوێنی مامۆستاکان، فەتانە بە چرپەوە دەیگووت: «خەندانی چکۆلە، هێشتا شتەکان خۆیان نەگرتووە... لە سبەینێوە ڕۆژانی زۆر ناخۆش دەستپێدەکات». لەبەر دەستشۆرەکاندا، لەو جێگایەدا کە دەبایە ئاوێنەیەک هەڵبواسرایە، یەکێک بە خەتێکی گەورە نوسیبووی: «تاکە ئاوێنە، ئاوێنەی ڕۆحە». فەتانە گووتی: «ئەوە مانای ئەوەی ئیدی ئێمە ئاوێنە نابینینەوە». من لەو کیژانە نەبووم کە زۆر شەیدای ئاوێنەن، لەبەرئەوە سەیرم لە فەتانە دەهات کە لەتە ئاوێنەیەکی بچکۆلانەی لە گیرفانی جبە درێژەکەی دەرهێنا و گووتی: «بڕوانە خەندان، دەبێت ئەم پارچە ئاوێنەیە بپارێزین، چونکە ئەوە تەنها شتێکە لەڕێگایەوە خۆمان ببینین». ئەو کات من بەخیلییەکی گەورەم بە «مەهتاب» و «فەتانە» دەبرد کە نهێنییەکیان هەبوو بیپارێزن... کە فەتانە ئاوێنەکەی خستەوە گیرفانی گووتی: «بەچاوی تۆ، ئەگەر نهێنییەکم نەبێت، دەمرم». ڕۆژانی داهاتوو پتر تێگەیشتم کە دروستکردنی نهێنی و ژیان لە ناو فەنتازیاکانی نهێنیدا، ئارەزوویەکی سەیری فەتانە و زۆر کیژی دیکەی قوتابخانەکەیە... ئارەزوویەک بەسەختی بەر شەریعەتی تۆبەکردن و یاساکانی دەکەوت. شەوی یەکەم بە ئەندازەیەکی سەیر ئارام و بێچپەبوو، لە ئێوارەیێکی زووەوە چووینە ناو جێگاکانمانەوە. پەنجەرەکانی قوتابخانە هەمووی بەجۆرێکی سەیر کلۆمکرابوون، ئەو شەوە بە ئەسپایی پەردەی پەنجەرەی ئەو ژوورەم لادا و سەیری ئاسمانم کرد کە هەزارەها ئەستێرە تیایدا دەدرەوشانەوە. فەتانە هەر ئەو شەوە لە غافڵیدا دەستیکرد بە گێڕانەوەی حکایەتەکانی، هەموو لە جێگاکانی خۆماندا بێدەنگ ڕاکشابووین و بیرماندەکردەوە، کە لەناکاو فەتانە بە

دەنگی حکایەتخوانێک دەستیپێکرد و گووتی: «میدیای غەمگین حەزی لە مانگ بوو، هێندە حەزی لە مانگ بوو پێنەدەچوو بتوانێت بەبێ مانگ بژی، ئەو شەوانەی کە مانگی نەدەبینی زۆر غەمگین دەبوو، شەوێکیان کە میدیا هێشتا منداڵ بوو مانگی نەبینی، لە ماڵ چووە دەرێ تا بەدوای مانگدا بگەڕێ، لەجیاتی مانگ کتێبێکی کۆنی هێنایەوە بۆ ماڵێ، کتێبێک کە لەبەر دەرگای کۆشکێکی کۆندا دۆزیبوویەوە، کە باسی چۆنێتی مردنی شاعیرێکی دەکرد، میدیا بەرلەوەی کتێبەکە تەواوبکات، تووشی نەخۆشییەکی کوشندەبوو». بەرلەوەی فەتانە چیرۆکەکەی تەواو بکات، من بەدەم سەیرکردنی ئەستێرەکانەوە خەوم لێکەوت... ئیدی شەو لە دوای شەو، ساڵ لە دوای ساڵانیش، لە ژێر هەموو فشارەکاندا، لە شەوە هەرە تاریک و سارد و ناخۆشەکاندا، من لەوێ لەسەر دەنگی حکایەتەکانی فەتانە دەخەوتم... حکایەتەکانی ئەو بەجۆری ڕاستی و درۆیان لا تێکەڵکردم، کە تا ئەمڕۆ گومان لە چارەنوسەکانیش دەکەم. ئەو شەوە شەوی سەرەتای دەستپێکردنی جیهانی حکایەت و تۆبە و ترس و دەستەمۆبوون و تەنهاییە قووڵەکانی من بوو، شەوێک تا مردن بەدوامەوە دەبێت، نە لە ئێستاو نە لە داهاتووشدا دەربازێکم لە دەست سێبەرە ڕەشەکانی نییە... کە هەمیشە و هەمیشە بێڕەحمانە لەدوومدەبن و سەرفرازم ناکەن.

## ١٥

له یەکێ لەو شەوانەدا کە پەروانە لە ناو دار و درەختەکاندا درێژەی بە کۆچە خەیاڵییەکانی خۆیدەدا، میدیاش لە دوای بینینی مانگ و گەڕان بەدوای تریفەکاندا دەهاتە جەنگەڵ، مەعسومە لێیان نزیکبووەوە و خۆی کردە دەستەخوشکیان. بەڵام شتەکان هەموو وەها سادە و ئاسان بەڕێوەنەچوون، بەڵکو جیهانی ئەو دوو هاوڕێیە کە پێکەوە بەناو درەخت و ڕێگا و قەراغ چۆمەکاندا دەڕۆیشتن و بە ڕێگای جۆرا و جۆر باسی عەشق و ژیان و یادگارەکانیان بۆ یەکتر دەکرد، سەرەتا لای مەعسومە زۆر سەیر کەوتەوە، بەڵام ئەو مەحەبەتە زۆرەی لای ئەوان بینی، ئەو سۆز و گوێگرتنەی لەو دوو کچەدا هەستیپێکرد، بووە هۆی دڵنیایی و خۆشنوودی ئەو. مەعسومە لەو شەوانە لەدەست سیامەندی باڵندە هەڵدەهات. پەروانە پێشتر لە گەشتە شەوانەکانیدا سەرنجی ئەوەی دابوو کە سیامەندی باڵندە تابێت بەشێوەیەکی دڕندانەتر و سەیرتر مەعسومە ئازاردەدا، سەرنجی ئەوەی دابوو کە شەوان ناچاریدەکات سەرکەوێتە سەر درەختەکان، ناچاریدەکات وەکو باڵندە لەسەر لقە بەرزەکاندا هەڵکورمێت و لەو لقەوە بچێت بۆ ئەو لق. هەندێ شەو پەروانە لە ناو درەختەکاندا دەوەستا و گوێی لە هاوار و قریشکەکانی مەعسومە دەگرت. سەرەتا ئەو زۆر بە بێدەنگ دەیناڵاند، بەڵام شەو لە دوای شەو هاوارەکانی زیادیاندەکرد. سیامەند لەو شەوانەدا بە مەعسومەی دەگووت: «ئەگەر

حەزت لە باڵندەیەک کردوە، دەبێت ئامادەبیت وەکو باڵندەیەکیش بژیت» . هەندێ شەو مەعسومە هەڵدەهات و لە ناو تاریکی و درەخت و بەرد و ناو دەوەنەکاندا خۆی دەشاردەوە . مەعسومە لەو شەوانەدا دەبایە تا دەمەویەیان خۆی قایمبکات و دەرنەکەوێت، لەگەڵ خۆرهەڵهاتندا هەموو شتێ ئارامدەبووەوە و سیامەند لەگەڵ پیاوەکانی دیکەدا دەچوو بۆ کار و ئەویش دەچوو بۆ سەبەتەچنین لە ناو شۆڕەبییەکاندا . سیامەند هەمیشە وانەبوو، هەندێ شەو دەبووە پیاوێکی ئارام، دەهاتە سەرزەوی و دەگەڕایەوە ژێر کەپرەکەی خۆیان، وەکو جاران بە مەحەبەتەوە سەیری مەعسومەی دەکرد، هەتا هەندێجار مەعسومە هەستیدەکرد کە سیامەند دەگری، هەستیدەکرد فرمێسک لە چاوانیدا دەبینێت، بەڵام ئەو بەگشتی هەمیشە تەنهابوو، هەتا جارێکیش کە نەسرەدینی بۆنخۆش بۆ سەردانی هاوڕێکانی چووە ئەو جەنگەڵە، سەرنجی ئەو نامۆیەتییە قووڵ و تەنهاییە سەیرەی سیامەندی دا کە دیاربوو لە دونیای هەموو عاشقەکانی دیکە دابڕاوە . نەسرەدین، لەو باوەڕدا نەبوو سیامەند جارێکی دیکە بکەوێتەوە ناو بازنەی گۆشەگیریی و دوورەپەرێزیی، ئەو ڕەنجێکی زۆری لەگەڵدا دابوو، پێشیوابوو کە کردوێتییە پیاوێکی ئاسایی، بەڵام کاتێ لەڕێگای عاشقەکانی ترەوە زانی کە سیامەند هەمیشە تەنها، دوور لە هەمووان دەژی، نائومێدانە و تورە سەرکەوتە سەر درەختێک بەرامبەریی و پێیگووت: «من وامدەزانی جارێکی تر ناگەڕێیتەوە سەر ئەم دارانە، وامدەزانی عەشق دەتگۆڕێتە سەر مەخلوقێکی هێمن و ئاسایی...» . ئەو ڕۆژە سیامەند و نەسرەدینی بۆنخۆش بەرامبەر بە یەک، لەسەر دوو درەختی جیاواز تا شەوێکی درەنگ قسەیانکرد، بەڵام دواجاریش نەسرەدین نائومێدانە دابەزی و نەیتوانی سیامەند لەو دنیا دوورەدەستەی خۆی دەربهێنێت، نەسرەدین ئەمرۆ دەڵێت: «ڕۆحی ئەو باڵندە کێویی و گۆشەگیرانەی لە منداڵییەوە چووبوونە ڕۆحییەوە بەئاسانی ڕیشەکێش نەدەکران» .

ئەو ڕۆژە و ڕۆژانی دواتریش کەس نەیتوانی، سیامەند پەشیمانبکاتەوە، کەس نەیتوانی سیامەند لەو جیهانە دەربهێنێت، ڕیشەکانی ئەو گۆشەگیرییەش دەگەڕایەوە بۆ ئەو ئیقاعە سەیرەی سیامەندی باڵندە لە منداڵییەوە وەریگرتبوو، نەسرەدین پێشتر سیامەندی وەکو مەخلوقێکی کێویی و دەستەمۆنەکراو ناسیبوو، وەکو ڕۆحلەبەرێکی نیمچەشاخاوی کە پەیوەندی بە جیهانی باڵندە و دارستانەکانەوە بەهێزترە نەک بە مرۆڤەکانەوە. لە سەرەتاوە ژیانی بە ڕێگایەکی بونبەست و بێدەربەندا تێپەڕیبوو... یەکەمجار داربڕێک لە زەمبیلەیەکی پوشدا بە چڵی درەختێکەوە لە سەرەڕێی زەنوێران دۆزیبوویەوە، تا تەمەنیشی بوبوو بە دوو ساڵ، هەر ئەو داربڕە پیرە لەگەڵ منداڵەکانی خۆیدا بەخێویکردبوو. دوای مردنی ئەو، ژنی ناوەنجی و وەجاغکوێری یەکێ لە بەگەکان سیامەند هەڵدەگرێتەوە، بەڵام لەگەڵ گەورەبوونیدا لەو ژینگە سەختگیر و ئاینییەدا، هەر زوو دەکەوێتە ژێر باری سزا و ئەشکەنجە و توانجەوە، ئەمە جگە لەوەی کە چنگە قولاپییەکانی و بیلبیلە گەورە و ترسناکەکانی وێنەی باڵندەیەکی کێوی پێدەبەخشن. سیامەند تا گەورەدەبوو زیاتر هەستیدەکرد ژنان و منداڵانی گوند خۆیان لەو نیگایانەی دەپارێزن کە بە نیگایەکی پیس و شەیتانی و زیانبەخش لە قەڵەمیاندەدا، تا گەورە دەبوو زیاتر تێدەگەیشت ئەو جانەوەرێکی نامۆ و نەفرەتلێکراوە و ئەو هۆردووە وەک تاعون سەیریدەکەن، وەک ئافەتێکی کوشندە و بەڵایەکی ترسناک لێی دەڕوانن. ئەو هەموو فشار و نەفرینە زۆرەش زیاتر پاڵیان پێوەدەنا دووربکەوێتەوە، بەڵام جگە لەو کێوانە شوێنێکی دیکەی نەبوو ڕوویتێبکات... لەبەرئەوە ناچار ڕوویدەکردە چیاکان، ڕوویدەکردە دارستان و سەرترۆپکە عاسییەکان، دەچووە ئەشکەوتە دوورەکان، پتر لەسەر گۆشتی باڵندە و میوەی کێوی و ماسی گۆمەکانی ئەو هەرێمە دەژیا، بەڵام جار جار ئارەزوویەکی قووڵی بۆ ژیان و تێکەڵبوونەوە لەگەڵ مرۆڤەکاندا لا دروستدەبوو، جارجار لە

ناکاو لەبەر مزگەوتی گوند و لە کوچە تەسکەکانیدا دەردەکەوت... زۆر جار ڕوویدەکردە ماڵی بەگ، ڕوویدەکردە ئەو کۆشک و سەرایەی منداڵییەکی پڕ لە شکست و شەرمی تیا بردبووەسەر، بەڵام لەوێ جگە لە نیگای کینەئامێزی زڕخوشکان و زڕبرایان، هیچی دیکەی نەدەبینی، کە وەکو لکەیەکی شەرم و شوورەیی لێیان دەڕوانی. سیامەند تا زیاتر لە کێوەکاندا بمایەتەوە، زیاتر کێویی دەبوو، زیاتر خەڵکی ئەو گوندە و گوندەکانی دەوروبەر لێی دەترسان و ئەفسانەیان لەسەر دەهۆنییەوە. هەندێ جار سیامەند بەدرێژایی چەند وەرزێک وندەبوو، هەندێ جاریش لەناکاو چەند هەفتەیەک دەگەڕایەوە بۆ سنووری گوند و کێڵگەکانی دەوروبەری، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا لە تەمەنێکی دیاریکراوەوە بێئەوەی گوێبداتە هیچ جنێو و نەفرین و توانجێک، هاوینان هەموو ڕۆژێک لە چیا دادەبەزیی و مەعشەری باڵندە و جانەوەرەکانی جێدەهێشت و ڕوویدەکردە ئەو گوندە، هۆکەشی گڕگرتنی عەشقێکی کوتوپڕبوو بۆ کچێک لە هەرە نازکترین کچانی گوند.

کەس نازانێت، سیامەند چۆن مەعسومەی بینیبوو و چۆن خۆشیویستبوو. مەعسومە تاکە کچێکی گوند و ئەو هەرێمانەش بوو کە لە شار دەیخوێند و تەنها هاوینان و پشووی نیوەی سالآن دەگەڕایەوە بۆ گوند، مەعسومە لە گەشتەکانیدا بەناو کێڵگە و بێستان و ڕەز و باغەکاندا، لە وێڵگەڕییەکانیدا بەدوای ڕووەکە شاخاوییەکان و گوڵە دەگمەنەکانی چیادا، ئەو تازە هەرزەکارە ترسناکە دەبینێت کە جووتێ چنگی قولاپی و لووتێکی دەنووکئاسای کورت و قژێکی چڕ و هەڵچووی هەیە، نیگاکانیشی بە نیگای شەهێنێکی برسی دەچن، مەعسومە کە لە منداڵییەوە گوێی بەو چیرۆکە ترسناکانە پڕبووبوو کە ژنان لەسەر ئەم منداڵە دەیانگێڕایەوە، ئێستا نەوەکو تەنها دەرگای قسە و سۆز و ئەڤین لە سیامەند دادەخات، بەڵکو هەر زووش لە ترسی ئەو عەشق و نیگا ترسناک و کێوییانەی، گوند جێدەهێڵێت و دەگەڕێتەوە بۆ شار. بەڵام تێپەڕینی وەرزەکان و

ساڵەکان هیچ لە عەشقی سیامەند کەمناکەنەوە کە وردە وردە عەشقەکەی دەبێتە هێزێکی زیانبەخش و سوتێنەر و تێکدەر. تا زەمەنیش زیاتر بڕوات سیامەند دڵڕەقتر و ترسناکتر و کوشندەتر دەردەکەوێت، هەر ئەو عەشقە ناکامەش وای لێدەکات باغەکان ئاگرتێبەربدا، دەغڵەکان بسووتێنێ، ڕەزەکان وێرانبکات و ڕابکاتەوە سەر لوتکە بەرزەکان و شوێنە عاسییەکان.

«سیامەند» لە گەرمەی وەرزی وێرانکاریەکانیدا بوو کە نەسرەدینی بۆنخۆش بەبێهۆشی و بیماری لە ئەشکەوتێکدا دۆزییەوە، نەسرەدین ئەو کات بۆ حەشارگەیەکی قایم دەگەڕا بۆ خۆی و پێشمەرگەکانی ، ڕێگاکان بەڕێکەوت بردیانە هەمان ئەشکەوت... دیاربوو هەندێ لە پێشمەرگەکان بەسەرهاتی ئەم عاشقە دەزانن کە لەو کێوانەدا حکایەتی مەجنونێکی وێرانکەر و تێکدەری دووبارەدەکردەوە، نەسرەدین ئەگەرچی هەموو ژیانی خۆی لەگەڵ سەربوردی عاشقاندا بردبووەسەر، بەڵام چیرۆکی وا سەیر و عاشقی لەوجۆرەی نەبینیبوو. نەسرەدین دەیگووت: «ئەو بۆ من وەکو عاشقێک وەهابوو، لە سەری ئەوسەری مێژووەوە هاتبێت، عاشقێک بۆنی تێکەڵاوبوونی عەشقی لێدەهات بە هەموو ویستە سەرەتاییەکانی ئینسان... عاشقێکی دڕندەبوو، عاشقێک کە لە دەرەوەی یاسا و دەستوورەکانی ئێمە دەژیا». ئەو دەیگووت: «دەبایە شتێک بکەم، دەبایە ئەو مرۆڤە بیمار و نیمچە شێتە بگێڕمەوە بۆ ناو مەعشەری مرۆڤەکان». لەبەرئەوە بەدرێژایی چەند وەرزێک خۆی بە دەستی خۆی تیماریدەکات و دەیگێڕێت و لەگەڵیدا دەچێتە ناو دارستان و سەر چەمەکان، لەو شەو و ڕۆژانەدا نەسرەدین بە سیامەند دەڵێت: «ئەم کێو و چیا و جەنگەڵانە تۆیان کوشتووە، دەبێت دابەزیتە ناو ژیانەوە، دابەزیتە ناو مرۆڤەکانەوە، تۆ تاکەی وەکو باڵندەیەک بەسەر ئەو درەختانەوە دەژیت، گەر نەبیتە مرۆڤێکی ئاسایی کەس عاشقت نابێت». نەسرەدین، سیامەند لەگەڵ خۆیدا دەگێڕێت، دەیباتە گوندە دوورەکان، لە دوورەوە شار و دەریاچەکانی نیشاندەدا،

ڕێگا قیرتاوەکان، شارۆچکە بچکۆلانەکان، فێری ماناکانی ژیانی دەکات، وانەی عەشقی پێدەڵێت، لە سووتاندن و وێرانکردنی کێڵگە و باغەکان دووریدەخاتەوە، بەڵام لەگەڵ هەموو ئەو ڕەنجەشدا، نەسرەدین هەست بە بوونی ئەو باڵندە کێوییە دەکات لە ڕۆحیدا، باڵندەیەکی گۆشەگیر و سەرکێش و دەستەمۆنەکراو. دەینێرێتە شار، بۆلای گۆڤەند و فەرەیدونی مەلەک، دەینێرێتە شارۆچکەکان بۆلای عاشقی تر، دەینێرێت بۆلای پیرەمێردێکی شاعیر کە وەستایەکی گەورەی چاککردنەوەی شێتێتییەکانی عەشقە، لە ڕیزی پێشمەرگەکانی خۆیدا دەینوسێت، دەیکاتە تەتەری ڕێگا دوورەکان، لەو ماوەیەشدا سیامەند بەجۆرێ دەگۆڕێت، کەس نایناسێتەوە کە پاش ماوەیەک دەگەڕێتەوە بۆ گوند و خەڵکی بەو جلە تازە و پاڵتۆ درێژ و قژە شانەکراو و چەکە بێقۆناغەوە دەیبینن، زۆربەیان باوەڕناکەن کە ئەم گەنجە بە هەیبەتە، کە سامی مرۆڤ و سامی باڵندەکانی لە نیگای خۆیدا کۆکردۆتەوە، هەر ئەو منداڵە شێت و کێوییە بێت کە چەند وەرزێک پێشتر دەغڵەکان و پاوەنەکانی گرِدەدا. لە هەمان ئەو وەرزەدا کە تێیدا سیامەند وەکو بەگزادەیەک دەگەڕێتەوە، مەعسومە وەکو کیژێکی نەخۆش و پەککەوتە لە پیکابێکی کۆندا لە شارەوە دەیهێننەوە، مەعسومە دواتر گووتی: «ئەزمونە تاڵەکانی عەشق لەگەڵ کوڕە بێوەفاکانی شاردا، منیان گەیاندبووە سەرەمەرگ، کە گەڕامەوە حاڵم گەلەک خراپ بوو... عەشق منی کوشتبوو». لەو وەرزەدا سیامەند بە قژە کورتە شانەکراو و پاڵتۆ ڕەش و بووتە سەربازییە درێژەکانییەوە لە ژیانی مەعسومەدا دەردەکەوێتەوە. مەعسومە کە لە بینینەوەی شار بێزارە، لە گەڕانەوە بۆ ئەو ئامادەییە داڕوخاوەی کشتوکاڵ بێزارە، نایەوێت چیدی بچێتەوە بۆ ناو کوڕە بە توانج و کیژە بە هەواکانی ئەوێ. ڕۆژێک لە نزیک ئاوایی بە سیامەند دەڵێت: «جێگایەکی عاسی بدۆزەرەوە، کە کەس نەماندۆزێتەوە، کە دووربێت لەم لادێیە بێڕەحم و شارییە نەرمەلیقانە، شوێنێ بدۆزەرەوە

دووردەست، پەنا، فەرامۆشکراو، نە کەس ڕێگای تێبکەوێت و نە کەس پیاتێپەڕێت. من لەگەڵتدا دێم». سیامەند کاتێ ئەو قسانە بۆ نەسرەدینی بۆنخۆش دەگێڕێتەوە، نەسرەدین بەسەرسامی دەڵێت: «چەند سەیرە، ئەو کیژەش وەکو من بیردەکاتەوە... کوتومت وەکو من بیردەکاتەوە». لەو ساتەوە ئیدی دۆزینەوەی خاکێکی عاسی، دۆڵێکی چەپەک، لێرەوارێکی یادکراو، دەبێتە خولیای یەکەمی سیامەند و نەسرەدینی بۆنخۆش... بەڵام کە سیامەند و مەعسومە یەکەمجار لەو پەیژەیەوە دادەبەزن، تەنهایی و ترسێکی سەیر لەگەڵ خۆیاندا دەهێنن، مەعسومە بە ئەستەم سیامەند دەناسێت، سیامەندیش جگە لە وێنەیەکی خەیاڵی کە خۆی بۆ مەعسومەی دروستکردوە هیچی دیکە دەربارەی ئەو کچە نازانێت، هەر لە یەکەم شەوەوە مەعسومە تێدەگات کە ژیان لەگەڵ باڵدارێکی وەکو سیامەنددا چەند ئەستەمە، کە هێدی هێدی عاشقەکانی دیکەش دادەبەزنە جەنگەڵ، مەعسومە بە تورەییەوە دەڵێت: «من داوای خاکێکم لێکردویت نە کەس پیا تێپەڕێت و نە کەس ڕێگەی تێبکەوێت... تۆ مەرجی گەورەی ئەڤینەکەمانت شکاند». سیامەند هەر لە سەرەتاوە دژی هەموو ئەو پیاوانە دەوەستێتەوە کە وردە وردە قەراغ چۆم و بن درەختەکان داگیردەکەن، بە مەعسومە دەڵێت: «من و تۆ دوور لەوان وەکو دوو باڵندە دەژین». بەڵام تا دێت درندەتر و کێویتر هەڵسوکەوتدەکات، تا دێت بێڕەحمتر و بێدەنگتر و وێرانکەرتر دەردەکەوێت، نەسرەدین ڕۆژێک دادەبەزێتە دارستان و پێیدەڵێت: «سیامەند، دەبێت وەکو هەموو عاشقەکانی دیکە کاربکەیت، دەبێت لەو وەرشەیەدا بەردەستیبکەیت». بەوەشدا کە سیامەند ترس و مەحەبەتێکی زۆری بۆ نەسرەدین هەیە، گوێڕایەڵی فەرمانەکانی دەبێت، بەڵام هەرگیز نابێت بە یەکێک لەو مەعشەرە، هەرگیز گوێ لە وتارە دوور و درێژەکانی گۆڤەند ناگرێت لەسەر ڕاستی و جوانی و ئیمپراتۆریەتەکانی عەشق و سوورەتەکانی ئەڤین، هەرگیز لەگەڵ هیچ پیاوێکدا دانانشێت، تاکە

مەخلوقێک کە پەیوەندی لەگەڵیدا دەبێت مەعسومەیە کە لە هەوڵێکی بەردەوام و سەیردا دەبێت بۆ گۆڕینی بۆ باڵندەیەک... مەعسومەش لە شەوە درێژ و ترسناکەکاندا هێندەی بۆ دەکرێت لە دەستی هەڵبێت و بڵێت، من دەستگیرانی تۆ نیم، من خۆشەویستی تۆ نیم، تۆ مەرجی گەورەی ئەڤینەکەمانت شکاند... هیچ شتێک من بە تۆوە نابەستێتەوە.
سیامەند تا زیاتر گوێی لەو هاوارانە دەبێت، زیاتر شێتدەبێت، زیاتر سروشتە ترسناک و وێرانکەرەکەی بۆ دەگەڕێتەوە، وەحشیانەتر پەلی مەعسومە ڕادەکێشێت بۆ سەر درەختەکان و ئەویش جگە لە هەڵهاتن هیچی بۆ نامێنێتەوە، لەو شەوانەدا مەعسومە خۆی لە نابەینی ئەو دوو کیژەدا قایمدەکات، سیامەندیش هەرکاتێک لەگەڵ ئەو دوو خانمەی دیکەدا دەیبینێت، بە بێدەنگ سەردەکەوێتەوە سەر درەختەکان و هیچ ناڵێت.

مەعسومە لەو شەوانە سەر دەخاتە سەر سینەی پەروانە و دەڵێت: «هەرگیز سیامەندم خۆشنەویستووە... هەرگیز». پەروانە دەست بە قژیدا دەهێنێت و فرمێسکەکانی بۆ دەسڕێت و لە ژێر مانگەشەوەکەدا، لە ژێر بارانی تریفەکاندا، لە بێدەنگی ترسناکی دارستاندا، دەست دەخاتە سەر لێوی و دەڵێت: «مەعسومە، ئێستا گوێ لە حکایەتی من بگرە، حکایەتی منیش وەکو چیرۆکەکەی تۆ لە گەڕان بەدوای عەردێکی دیکە و دنیایەکی دیکەوە دەست پێدەکات».

شەوەهای شەو ئەو سێ کیژە، لە قووڵایی دارستاندا، لە ژێر درەختێکدا دادەنیشتن و چیرۆکی ژیانی خۆیان دەگێڕایەوە، میدیا، لەسەر کاغەزە سپییەکان و ئەوانیش بە زارەکی... شەوەهای شەو، بە چەندەها شێوە. لە دەیەها گۆشەنیگای جیاوازەوە تا بەیانی سەربوردی ژیانی خۆیان و یەکتریان تاووتوێدەکرد... هەر لەو شەوانەشدا میدیا بە حەسرەتێکەوە نوسی: «کڵپە هەرگیز منی وەکو خۆم، وەکو میدیای بێدەنگ خۆشنەویستووە». پەروانە بە ترسێکی گەورەوە ئەو ڕستەیەی

دەخوێندەوە و دەیگووت: «خودایە، ئەمە مانای چی؟ مانای چی؟... دەبێت هەموو عاشقەکانی ئەم دونیایە دەستخەرۆین و عەشق تەنها چەند ساتێکی کورتی وەهم و خەیاڵ و وڕینە بێت». پەروانە وەکو شێت بەناو گیا و پەرژین و هەرێزە کێوییەکاندا هەڵدەهات، وەکو شێت لە ناو با و تریفەکانی شەودا تاکدەبووەوە و دەیگووت: «واتە هەموو خۆمان لە خشتەدەبەین، خۆمان فریودەدەین، کەس لێرەدا عاشقی کەس نییە».

میدیا بۆی دەنوسی: «لەو ساتەوە کڵپە دەزانێت من ناتوانم قسە بکەم، لەوساتەوەی کە دەزانێت من تەنها دەنوسم، ڕقی لێمە... ئەو چیتر ئەو ئاوازانەش لێنادات کە من حەزیان پێدەکەم».

پەروانە سەرنجیدەدا، کە میدیا و کڵپە وەکو دوو گیانی نامۆ بەیەکتر دەژین، شەوان کڵپە لەسەر هەرزاڵێکی تەنها دەخەوت و میدیا دەکەوتە گەڕان بەدوای مانگدا... ئێوارانیش کڵپە لەسەر بەردەکان مۆسیقای لێدەدا، شەویش لەو ئەڵقەیەدا لەدەوری گۆڤەند دادەنیشت و پاڵیدەدا بە درەختێکەوە و بە چاوێکی خەواڵوو سەیری پیاوان و ژنانی جەنگەڵی دەکرد، میدیا و کڵپە هەردووکیان لە قەسابخانەکانی عەشق هەڵهاتبوون، یەکێ لە گەنجە ئیماندارەکان چەندین کاغەزی میدیای لە کونج و کەلەبەرەکانی دەوروبەری ماڵ لە شقارتە چکۆلەکاندا دەرهێنابوو و خستبوویە بەردەست ئەو پیاوەی چاوەدێری پەیوەندییە حەرامەکان بوو لەو ناوچەیەدا... کە قەسابخانەکانی عەشق دەستیپێکرد، میدیا و کڵپە نەیاندەزانی ناویان لە ناو لیستی ئەو عاشقە خراپەکارانەدایە کە دەبێت بکوژرێن، ئەوان تا ئەو کات ڕووبەڕوو یەکتریان نەبینیبوو، ڕاستە هەموو گەڕەک دەیانزای کڵپە ئەو مۆسیقا قەشەنگە بۆ میدیا بەدەم دەژەنێت، مۆسیقایەک لە ئاوازی ئامێرەکان سازگارتر بوو، لە کەمان و چەلۆ و فلوتە ڕاستەقینەکان بەئاهەنگتر بوو، بەڵام هەمووش دەیانزانی کە میدیا لەمێژە لەماڵ نەچۆتە دەرێ، دەیانزانی میدیا لەو شەوەوەی کە بەدوای مانگدا هاتەدەرێ و

کتێبێکی دۆزییەوە و ئەو کتێبە نەخۆشی خست، ئیتر نەچۆتە دەرێ و تەنها لە سەربانی ماڵەوە بۆی هەبوو بۆ مانگ بگەڕێت. کە دوو کچیان لە گەڕەکەکەدا سەربڕی، کەس لەو باوەڕەدا نەبوو کە سێهەمین عاشق کە دەبێت بکوژرێت مێدیای لاڵە، چەند سەعاتێک بەر لەوەی پیاوکوژەکان بە خۆیان و چەقۆ و تێزابەکانیانەوە چواردەوری ماڵ بگرن، هاوڕێیەکی دێرینی، کڵپە لە هەمووشتێ ئاگاداریکردەوە.

کە ئەو شەوە کڵپە، میدیای لەتەک خۆیدا فڕاند نەیدەزانی ناتوانێت قسەبکات، ئەو کوشتەی ئەو نامە دوور و درێژانەی میدیا بوو کە تیایدا بە شێوەیەکی سەیر باسی شیعر و مۆسیقا و مانگی دەکرد، بەڵام کە دڵنیابوو میدیا ناتوانێت قسەبکات، تووشی پەشیمانییەکی ترسناک هات. هەر هەمان شەو سەریدەدا بە دیوار و زەوی بەردەکانی دەوروبەری خۆیدا و دەیگووت: «کەواتە لەبەر کچێکی بێزمان خۆم تووشی گێژەنی مەرگ کردوە». دەتلایەوە و دەیگووت: «تا دەمرم دەبێت لەڕێگای پارچە کاغەزەکانەوە، قسەت لەگەڵدا بکەم، تا دەمرم مەحکومم بە بێدەنگی، من کە خەونم بە دەنگتەوە دەبینی، خەونم دەبینی و لە خەونەکانمدا ئەو وشانەی ناو نامەکانتم بە دەنگت دەبیست، شەیدای ئەو ئاوازە سیحراویانە بووم کە لە خەیاڵی خۆمدا ڕەسممکردبوو، ئێستا دەبێت چیبکەم... من سیحری ونبووی دەنگی تۆم خۆشدەویست... سیحری ونبووی دەنگت». بەڵام تازە هیچ یەکێ لە میدیا و کڵپە ڕێگای پاشەکشەیان نەبوو.

شەوی ئەو حکایەتانە بۆ پەروانە دەبوو بە مۆتەکەی ترسناک، ئەو بەدرێژایی شەو حکایەتی مردنی عەشقەکان و دیمەنی وێرانبوونی سۆزەکانی دەبینی، ئاوڕی لە چارەنوسی مەخلوقەکانی تر دەدایەوە و هەمووشتێکیش لەبەردیدەیدا ڕەش بوو. بەیانیان کە دەگەڕایەوە بۆلای فەرەیدون ڕۆحێکی سارد و سڕی هەبوو، هەستیدەکرد کە دەست و دڵی و دەمارەکانی خاڵین لە هەموو هەستێ، دەیزانی کە ژیان و جەستە و سۆزەکانی بەر

لـە فەرەیدونـی مەلـەک بـە دونیـای دەیەهـا پیـاوی دیکـەدا تێپەڕیـووە کـە هەمـوو ئێسـتا بوونـەوەری غەریـب و دوور و بێسـیما و بێیـادگارن، یادچوونـەوە فڕاندوونـی. دەشـیزانی ئـەو لەشـە لاواز و مانـدووەی فەرەیـدون کـە بـە بێدەنگـی لەپاڵیـەوە ڕادەکشـێت و بیـر لـە شـتە سـەیر و نادیارەکانـی نـاو خەیاڵـی خـۆی دەکاتـەوە، هەمـان شـێوە، دڵ و جەسـتەیەکە کـە دەیەهـا جـار عەشقی تەپوتۆزاویـی کۆڵانەکانـی شـاری تاقیکردۆتـەوە، کەچـی ئەمـڕۆ سـڕ و غافـڵ و شـەکەت هەمـوو یادگارەکانـی خـۆی بیرچۆتـەوە... دەیزانـی، ئەو بۆیە فەرەیدونـی خۆشویسـتووە تـا بـەرەو دنیایەکـی دیکـە بیبـات، دنیایـەک پڕبێـت لـە کێڵگـە، پڕبێـت لـە ئاوەدانـی و ئـازادی، دووربێـت لـە سـێبەری ئـەم ئـازارە قـووڵ و کوشـندانەی مـرۆڤ، دەشـیزانی فەرەیـدون بۆیـە خۆشـیدەوێت، چونکە لـە پەروانـەکان دەچێـت، چونکـە بەشـێکی سـەر بـە جنسـی پەپولەکانـە.

ئـەو بـە هێمنـی لەتەنیشـت فەرەیدونـەوە ڕادەکشـا و سـەیری ئـەو نیگایانـەی دەکـرد کـە بـە هێمنـی پێیدەگـووت: «پەروانـە، تـۆ لـە کوێیـت، لـە کوێیـت؟ تـۆ گەلێـک دووریـت... مـن ناتبینـم». پەروانـە دەیزانـی کـە ناتوانێـت لـەوە زیاتـر لەیەکتـری نزیکبـن، دەیزانـی ئـەو ڕوناکییـە تەلیسـماوییەی شـەوان بـە شـەوارەیدەخات، جگـە لـە شـێوەیەکی تـری ئـەو ویسـتە شـەیتانییەی نـاو ڕۆحـی خـۆی زیاتـر هیچـی تـر نییـە، ویسـتی گۆڕیـن، ویسـتی شـڵەقاندنی ژیـان، ویسـتی تێکشـکاندنی ئیقاعـی لەیەکچـووی شـوێنەکان و کاتـەکان، ویسـتی دۆزینـەوەی دونیایەکـی دی لـە ژێـر ڕووپۆشـی ئـەو بێزارییـەوە، بـەڵام فەرەیـدون پەروانـەی دەبینـی دەڕوات، پەروانـەی دەبینـی دەبێتـە غوبـار، دەبێتـە ئـەو تـۆزە نەرمـە و لـە هـەوادا پەخشـدەبێتەوە، تـا زیاتـر پەروانـە دووریکەوتایەتـەوە، تـا زیاتـر ببوایـە بـە گـەرد، فەرەیـدون پتـر لایەنی ئەفسـانەیی و ناماقووڵەکانـی ئـەو عەشـقەی بـۆ دەردەکـەوت کـە ڕۆژێـک وەکـو چارەیـەک بـۆ هەمـوو ڕووبـەرە خاڵـی و پوچەکانـی ژیانـی تەماشـایکردبوو.

فەرەیـدون لـە شـەوە سـەیرەکانی دارسـتاندا، بیریدەکـردەوە و لـەو باوەڕەدابـوو

کە نەگەیشتنی بە هیچ لە هەموو پەیوەندییە ئینسانیەکانی پێشتردا پاڵیپێوەناوە بەدوای یەکێکدا بگەڕێت لە ناو بازنەکانی خەیاڵدا. دوای کەوتنە خوارەوەی ڕەزای دڵخۆش، پرسیارێک کە لای فەرەیدون دروستبوو، ئەوەبوو: «مرۆڤ ئەگەر بشفرێت بۆ کوێ دەچێت؟». شەوە درێژەکانی مەستی و مەیخواردنەوە و گۆرانیگووتنیش لەگەڵ ئەو چەند مەقامبێژەدا کە دواجار فەرەیدونی گەیاندە ئەم دارستانە، فێریانکرد مرۆڤ لە شتە پچوک و سادە و ئاساییەکان دەتوانێت بەختیاری گەورە بسازێنێ، فێریانکرد بەختیاری دەشێت تەنها گۆرانییەک بێت، دەشێت ژیان بێت دوور لە ترس، دوور لە هەڕەشە بەردەوامەکانی مەرگ، دەشێت بەختیاری شتێک بێت ئاساییتر لە هەموو شتە ئاساییەکان، کە هاتیشە ئەو دارستانە بۆ ئەو بەختیارییە دەگەڕا. ئەو گوێی لە خەونی زۆر گەورە گرتبوو، بەڵام فەرەیدون ئێستا لەپشت هەموو ئەو خەونە گەورانەوە، لەپشت ئەو خەیاڵە بێسنوورانەوە کە خۆشی ڕۆژێک لە ڕۆژان لە تخوبە تاریکەکانیان نزیکبووبووەوە هەمیشە دەگەڕایەوە بۆ مانای ژیان وەکو نزیکبوونەوەیەکی هەمیشەیی لەگەڵ شتێکدا کە خۆشیدەوێت. سەرەتا لەوباوەڕەدابوو کە ئەم جەنگەڵە دەرفەتی ئەو پێکەوەژیانەی بۆ دەڕەخسێنێ، لەوباوەڕەدابوو دەتوانێت لەگەڵ پەروانەدا بەیەکەوەبن. بەڵام پەروانە دەڕۆیشت، پەروانە شەوان ڕوناکییەکی نهێنی بەرەو قووڵایی جەنگەڵ دەیفڕاند، لەوێ لەگەڵ ئەو خانمانەی دیکەدا لە ژیان و لە چارەنوس و لە عەشق وردەبوونەوە. پەروانە هێدی هێدی دەبووە غوبار، دەبووە تەم، بەیانییان کە دەگەڕایەوە فەرەیدون لەوباوەڕەدابوو کە جگە لە تارماییەکی تەنک هیچی تر نابینێت، جگە لە ستوونێکی باریک و ڕوونی گەرد هیچی تر نابینێت، بە لەشێکی ماندوو و ڕۆحێکی سڕ و جووتێ چاوی نیمچە خەواڵووەوە دەگەڕایەوە، فەرەیدون پێیدەگووت: «پەروانە تۆ لە کوێیت؟». پەروانەش ماندوێتییەکانی شەو و کارکردنی ڕۆژ و مەراقە قووڵەکانی کچانی جەنگەڵ

لەگەڵ خۆیاندا دەیانبرد، ئەو بە هێمنی باوەشی بە فەرەیدونندا دەکرد و دەیگووت: «تۆ لەوباوەڕەدایت، ژیانمان لێرەدا کۆتاییبێت...؟». فەرەیدون دەستی دەدایە دەست پەروانە، بەڵام وای هەستدەکرد دەستدەداتە هەوا، دەستدەداتە هەڵمێکی سپی دەمەوبەیان. دەستی بە قژیدا دەهێنا و دەیگووت:«پەروانە جیهان هەمووی تەنراوە، سەرسنوورەکان یەک پارچە ئاگرن، دەبێت چاوەڕوانبین».

بەڵام فەرەیدون شەو لە دوای شەو زیاتر هەستی بە جیابوونەوە و دوورکەوتنەوەی بێدەنگی پەروانە دەکرد. تا زیاتریش ئەو هەستە تیا بچەسپایە، زیاتر بیری لە مانای ڕاستەقینەی پەیوەندی خۆی بە ئافرەت و جوانییەوە دەکردەوە، کە لە ناو درەختەکاندا دەگەڕا و تێدەفکری دەیبینی کە ئەو لە منداڵییەوە هەوڵدەدات بە شێوەیەکی ئەیوبانە، جوانی مرۆڤ، جوانی ئافرەت، جوانی ژیان پێکەوە کۆبکاتەوە... ئەو هەموو ڕەنج و جەنجاڵی و تەقەلایەکی بۆ ئەوە بوو، دەیزانی مرۆڤ جوانییەکی تایبەتی هەیە، لە هەموو ئەو جوانییانەش کاریگەرتر توانایەتی لەسەر بەختیاری، ئافرەتیش جوانییەکی قووڵتر و سەیرترە. جوانی ئافرەت، جوانی ویساڵە لەگەڵ گەردوندا، جوانی ئامادەگی هەموو سیحری سروشتە لە ناوەڕاستی ژیاندا. فەرەیدون بیریدەکردەوە و دەیزانی کە خوێندنەوەی شیعرەکانی کتێبفرۆشییەکە چەندە یارمەتییانداوە تا لەو شتانە تێبگات، بیریدەکردەوە کە گۆران، ئا، گۆران، نەبزی هەموو نهێنییەکانی ئەم گەردونەی لە ئافرەتدا بینیوە، بەڵام فەرەیدون دەیزانی کە کاتێک دەمانەوێت بەو نهێنییانە بگەین، ئافرەت ناتوانێت یارمەتیمانبدات، ئافرەت مەخلوقێکی زیندووە ناتوانین یاری پێبکەین، فەنتازیای لەسەر بکەین... ئافرەت چەندە مەخلوقێکی فەنتازی بێت، ناتوانین فەنتازیای لەسەر بکەین، چونکە ئەو لەدەرەوەی ئێمە ژیانی خۆی دەژی، دواجاریش ئێمە چەندە ئافرەت بکەینە نمونەی باڵای خۆمان، هیچ لەوە ناگۆڕێت کە ئافرەت خۆی

ژیانێک و ئارەزوویەک و خەونێکی دیکەی هەیە کە دەشێت دژی هەموو فەنتازیاکان بێت. هەستیدەکرد لاوازبوونی پەیوەندی ئەو بە پەروانەوە دەگەڕێتەوە بۆ ئەوەی کە ئەو پەروانەی بەردەوام لە دیدە خەیاڵییەکانی خۆیەوە بینیوە، ئەو مەخلوقێکی تایبەتی فەنتازیا کردوە... فەرەیدون لەویادا دەوەستا و دەیپرسی کامەیانە جوانی راستەقینەی ژیان؟ جوانی ڕۆحلەبەرە فەنتازی و خەیاڵییەکان یاخود جوانی مرۆڤە ڕاستەقینەکان، ئەوانەی دەمرن و دەژاکێن، ئەوانەی لێمان بێزاردەبن و فەرامۆشماندەکەن یان ئەوانەی جاویدانە و نەگۆڕن؟ فەرەیدون وەڵامی پێنەبوو، بەڵام دڵنیابوو کە نوشوستی و تەنهاییەکانی خۆی ڕۆژێک بۆ دوور دەیبەن، بۆ جێگایەک تەنیا خۆی و خەیاڵەکانی دەمێننەوە، ئێستا هەستیدەکرد سەرکەوتنی پلەپلەی ئەو بە ژیاندا، گەشتی دوورکەوتنەوەیەکی هێمنە لە مرۆڤەکانەوە بەرەو خەیاڵ، سەیریدەکرد و پێیسەیربوو کە ئەو هەر خۆی فەرەیدونی مەلەکە، هەر خۆی یاریزان، مەلەوان، چەقۆکێش، ڕاوکەری پەپولەکان، ڕاوکەری کچە تۆزاوییەکانی قەراغشار بووە، هەستیدەکرد ئەو بۆ خاکێکی دیکە عەودالە، هەڵبژاردنی بۆ پەروانە و نزیکبوونەوەی لە گۆڤەند هەمووی ڕێگای جیاوازجیاوازبوون بۆ جیابوونەوە لە جیهانی مرۆڤەکان و سەرکەوتن بەرەو مەلەکوتی بێسنووری «خەیاڵ»... تا پتریش لەم جەنگەڵەوە دەئاڵا، تا پتریش لە ئاڵۆزییەکانی جیهان و سیاسەت و هاوڕێتی و عەشق نائومێد دەبوو، بیری لەوە دەکردەوە هێڵێکی ئەستوور لەنێوان ژیان و خەیاڵدا بکێشێت و نەهێڵێت تێکەڵاوی یەکتربن... خۆیشی بە هەموو توانایەوە بەرەو قووڵایی ئەو خاکە تەماویانەی فەنتازیا سەردەکەوت... ئیدی ڕۆژ بە ڕۆژیش گۆشەگیرتر دەبوو، گۆشەگیرییەک کە پێشتر لە ناو هەموو شتەکاندا سەرنجیدابوو.

کە نەسرەدینی بۆنخۆش دەهات، ئەو هەموو شتێکی بۆ دەگێڕایەوە، بەڵام نەسرەدین باوەڕی نەدەکرد، ڕۆژێک لە ڕۆژان فەرەیدون بخزێتە

ئەو خەڵوەتە بێبنەوە. دواتر مەعسومە لە شەوانی دوور و درێژی قوتابخانەی خوشکە تۆبەکارەکاندا بەمنی گووت: « ئەو وەرزە ڕۆژ و ڕۆژگارێکی سەیری لەگەڵ خۆیدا هێنا، هەموو وامان هەستدەکرد دونیا لە یەکتری دەترازێت، دونیا پارچەپارچە دەبێت و ئێمەش هەریەکەمان دەبینە دوورگەی پەرتەوازە و گۆشەگیر. هەموو دەمانزانی ژیانمان مانایەکی نییە، تا زیاتریش لە یەکتر دووربکەوتینایەتەوە، تا زیاتر پیاوەکان لە جیهانی خۆیان و ئێمەش لە جیهانی خۆماندا نوقمبووینایە، زیاتر شەو و ڕۆژەکانی ئەو دارستانە دەبوون بە مۆتەکە».

ڕۆژگارێک وای لێدێت پیاوان بۆ خۆیان لە دەوری ئاگرێکی گەورە دادەنیشن، قسەدەکەن، گەمەدەکەن، لەسەر ڕوقعەیەکی بچکۆلانە لە شەترەنج و دامەکردنێکی بێکۆتاییدا وندەبن، هەموو دەکەونە شەڕی دۆڕان و برانەوە، دەکەونە ڕقەبەرێی لێزانین و لێنەزانین. لەلایەکی دیکەشەوە ژنان لە جیهانی ژێر کەپر و قەراغ چۆمەکەدا شەو و ڕۆژە درێژەکانی خۆیان پێکەوە دەبەنەسەر، میدیای غەمگین بەردەوام لە دەفتەرەکانی دەستیدا حکایەتی دوورکەوتنەوەی مرۆڤەکان دەنوسێتەوە، حکایەتی ژیانی ڕۆژانەی ژنان و منداڵان، حکایەتی گەشە و مردنی گوڵەکان، حکایەتی ئاوەکان و باڵندەکان، لە جێگایەکدا دەنوسێت: «هەمووشتێ خێرا دەڕوات، وەرزەکان کورت و خێرا دەڕۆن، هاوین بەرەو کۆتایی دەڕوات، من هەست بە بێدەنگی دونیا دەکەم، بێدەنگییەکی ترسناک، هەستدەکەم وەرزێکی تر بەڕێوەیە».

دوای ئەو ڕۆژانە، دوای ئەو پێشبینییە تاریکەی میدیاش زۆرنابات کە سەرەتای وەرزێکی نوێ دەردەکەوێت، وەرزێک کە کەس چاوەڕوانی نەکردوە، وەرزی گۆشەگیری.

لە ئێوارەییەک لە ئێوارەکانی سەرەتای پاییزدا، ئەو گەنجە چاوشینە لە شارە دوورەکان گەڕایەوە و هەواڵێکی گەلێک خراپی پێبوو. ئەو هەموو

پیاوانی جەنگەڵی کۆکردەوە و گووتی: «چیتر تاشینی پەیکەری ئەو عاشقانە سوودی نییە، جەنگ لە هەموو جێگایەکدا هەڵگیرساوە، زەوی ئاگریگرتووە، لە جۆرە زەمانێکی وادا کەس ئامادە نییە پەیکەری عاشقان بکڕێت، من چەندینَ ڕۆژە بەو تورەکانەوە دەگەڕێم، کاتێکی زۆرە شارەو شار دەکەم، بەڵام چیتر کەس سەیری ئەم پەیکەرانە ناکات». ئەو دوای بێدەنگییەکی کورت تورەکەکەی دانا و بەردەوامبوو لەسەر قسەکردن: «من پانزدە ڕۆژی دیکە دووبارە دەگەڕێمەوە، لەماوەی ئەو پانزە ڕۆژەدا دەبێت ئێوە بیرتان لە شتێکی دیکە کردبێتەوە، هەر شتێکی دیکە بێت بۆ من گرنگ نییە... من خۆم هیچ گلەییم لە کەماڵی ئەو پەیکەرانە نییە، بەڵام پێناچێت خەڵکی چیتر توانای تەماشاکردنی دوو عاشقیان هەبێت».

گۆڤەند ئەو ڕۆژە کە نائومێدی لە چاوانی پیاوانی جەنگەڵدا دەخوێندەوە، کە دەیزانی ئەو هەواڵانەی گەنجە چاوشینەکە ترسێکی گەورەی خستۆتە دڵی هەمووانەوە، کە پێیانوابوو لەگەڵ هاتنی زستاندا پێویستیان بە ئازووقەی زۆرتر، جلوبەرگی ئەستوورتر، ماڵ و قۆخەڵەی قایمتر هەیە. لەبەردەم هەمووانیدا سەیری ئاسمانی دەکرد و دەستەکانی بەرزدەکردەوە و دەیگووت: «دەبێت باوەڕمان بە عەشق بەهێزبێت». گۆڤەند، بەنێو درەختەکاندا دەڕۆیشت و دەیگووت: «دەبێت نائومێد نەبین، ڕۆژێک دێت هەموو میللەتەکان لەسەر سفرەی عەشقی یەکتری یەکدەگرنەوە، دیانەتەکان لەسەر خوانی مەحەبەت کۆدەبنەوە، دوژمنەکان لە باغی ئەڤیندا باوەش بەیەکدا دەکەن».

ئەو دەڕۆیشت و دەیگووت: «ڕۆژێک ئاسمان درزدەبات و عەشق و مەحەبەت لە مەلەکوتە دوورەکانەوە دەڕژێت. کێڵگە خۆی ڕادەوەشێنێت و لە لاسکی ڕووەکە سەوزەکان شەونمی ئەڤین دەبارێت، زەوی عەشق دایدەپۆشێ، مرۆڤ لە خۆشەویستی زیاتر کارێکی دیکەی نامێنێت، هەر

ئینسانە و دێت و سۆز بەسەر ئەویتردا دەڕژێنێت، هەر عەشقە و گەورە دەبێت... بە ئەندازەیەک ئیدی جگە لە عەشق هیچ وشەیەکی دیکە نامێنێت، مرۆڤ پێویست ناکات زمان بزانێت، چونکە عەشق دەبێتە تەنها زمان. مرۆڤ پێویست ناکات هیچ بەهرەیەکی هەبێت، چونکە عەشق دەبێتە تەنها بەهرە، مرۆڤ پێویست ناکات کاربکات، چونکە عەشق دەبێتە تەنها کار».

ئەو ئێوارەیە گۆڤەند بە ئەندازەیەک لەگەڵ ئومێدەکانیدا دەڕۆیشت، هەمووان هەستیان بە گەرمی هەناسەکانی دەکرد، هەستیان بەو عارەقە سارد و ناوەختە دەکرد لەسەر نێوچاوانی، هەستیان بەو نیگا پەرێشان و دەنگە گڕ و چاوە سوور هەڵگەڕاوانەی دەکرد، لەگەڵ ئەوەشدا کەس هیچی نەدەگووت. ئەو شەوە هەمووان زووتر لە وادەی خۆیان بڵاوەیان لێکرد، گۆڤەندیش زووتر ڕوویکردە ئەو چۆمەڵانەی لەوێدا بایەکی بەهێز یاری بە درەختەکانی دەکرد.

گۆڤەند ئەو شەوە چەند بیریدەکردەوە نەیدەزانی بۆ وەها گەشبینە، ئەو لەو ڕۆژەوە کە بڕیاریدابوو ببێتە پەیکەرتاش بەشێوەیەکی سەیر چارەنوسی خۆی بە جوانییەوە گریدابوو، بەڵام دوای تەواوکردنی خوێندن و گەڕانەوەی بۆ شار، ژیان لەو ژینگە تاریک و دوکەڵاویانەی ئەوێدا هەموو شتەکانی لێ شێواندبوو، ئەو لەوێ جوانی وەکو ژەهرێک بینیبوو کە دژ بە وەرزیی دەیخواتەوە. ئەو لە مەیخانەکانی شاردا هاواریکردبوو: «جوانی بەبێ عەشق، ژەهرێکی هێمن و لەسەرخۆیە، بە بێدەنگ دەمانکوژێت». دواجار دوای سەفەرێکی درێژ لە ناکامی کە تیایدا هونەر و شەراب و بێزاری، گۆشە ئاوەدانەکانی ژیانی ئەو بوون، عەشقی دڵارام لە دۆزەخی ئەو هەموو مەستییە ڕزگاریکردبوو. کە هاتبووشە دارستان سەر لە نوێ توانیبووی هەموو پەیوەندییە نهێنییەکانی عەشق و جوانی و بڕوا بەجۆرێکی سەیر پێکەوەگرێبدات. ئەو لە شەوانی دوور و درێژی تێفکرین و تێڕامانـدا

گەیشـتبووە ئـەو بڕوایـەی کـە عەشـق دەبێـت پردێکـی گـەورەی لەگـەڵ ئیمانیشـدا هەبێت، ئیمـان بـە مـرۆڤ و بـە مەزنییەکانـی. ئـەو لـە ئێـوارەی ئـەو جەنگەڵـەدا بـە پیاوەکانـی گوتبـوو: «دەبێـت عەشق وەکـو دیانەتێکـی نـوێ تەماشـابکەین، جوانیـش دەبێـت دەرکەوتـەی شـکۆکانی ئەڤیـن بێـت، نـەوەک هەرێمێکـی دوور و جـودا بـۆ خۆشـاردنەوە و هەڵهاتـن... چونکـە جوانـی گـەر پەیوەندییەکـی قووڵـی بـە عەشـقەوە نەبێـت، دەبێتـە یارییەکـی کوشـندە، یارییـەک کـە گۆشـەگیریی و تەنهایـی مرۆڤـەکان قووڵدەکاتـەوە».

بـەڵام فەرەیـدون لـەو ڕۆژەوەی کـە هاتبـووە بنـی ئـەم هەڵدێـرەوە، لەبەرامبـەر ئـەو گەشـبینییەی گۆڤەنـددا ترسـێکی گـەورە لـە ڕۆحیـدا دروسـتبووبوو، ئـەو منداڵـی خەونـە دوور و درێـژ و ئاڵۆزەکانـی جـاران کـە هەمیشـە گۆڤەنـدی بـە مامۆسـتای خـۆی دەزانـی، لـە کاتـی کارکردنیشـدا لـە وەرشـەکەدا خـۆی وەکـو سـێبەرێکی ئـەو پیـاوە تەماشـادەکرد، ئێسـتا سـەیری لـەوە دەهـات بـۆ ئـەو پیـاوە ناتوانێـت ئـەو دونیایـەی چـواردەوری خـۆی ببینێـت؟ بـەڵام گۆڤەنـد سـەیری هەمـوو شـتە لەیەکچووەکانـی دەوروبـەری خـۆی دەکـرد و گەشـبینییەکی قـووڵ و لەنـاکاو ڕۆحـی دەگەشـانەوە، ئـەو کۆبوونـەوەی عاشـقانی بـە سـەرەتای دونیایەکـی دیکـە لەقەڵەمـدەدا، سـەرەتایەک کـە تیایدا عەشـق دەبێتـە دەسـەڵات، دەبێتـە یەکخـەر و ڕێکخـەری مرۆڤـەکان، دەبێتـە وزەیەکـی خوڵقێنـەر بـۆ مانـەوە و شـەڕکردن. لـە وەرشـەکەدا دەوەسـتا و دەیگـووت: «بڕوانـن عەشـق هەموومـان دەگۆڕێتـە سـەر یـەک مـرۆڤ، یـەک مرۆڤـی مـەزن و بەتوانـا و گـەورە، هـەر خۆشـی ئـەو مرۆڤـە گەورەیـە دەگۆڕێتە سـەر هونەرمەندێکـی داهێنـەر و بلیمـەت». لـەو ساتانەشـدا کـە گۆڤەنـد تەنیـا دیـوی لێکچووی مرۆڤـەکان و شـتەکانی دەبینـی، فەرەیـدون بـە گومانێکـی گـەورەوە سـەیری شـتەکانی دەکـرد، ئـەو لـە ناخـەوە جیاوازییـە کوشـندەکان هەڵیاندەتەکانـد، ئـەو پێیوابـوو کـە گۆڤەنـد دەیەوێـت ئـەو قـەوارە بەشـەرییە بەجۆرێ بتاشـێت کـە لەگـەڵ خەیاڵەکانـی خۆیـدا بگونجێـت. وەلـێ فەرەیدونـی

مەلەک کە لەو دنیایەدا ڕۆژ دوای ڕۆژ پتر هەستی بەنامۆیی دەکرد، ڕۆژ دوای ڕۆژ زیاتر نەگونجان و بێزاربوونی ئادەمیزادەکانی لە یەکتر دەبینی، شەوێک لە شەوەکان بە گۆڤەندی گووت: «من چەندە کوڕی مەحەبەتم، ئەوەندەش کوڕی کینەم، چەندە کوڕی ناو قەرەباڵغی و جەنجاڵی بازاڕەکانم، ئەوەندەش کوڕی تەنهاییم، چەندە کۆنە عاشقێکی تۆزاویم، هێندەش کۆنە چەقۆ وەشێنێکی پیرم... دەتوانم ڕق لە قووڵترین و تاریکترین شوێندا ببینم». ئەو بە جەنگەڵدا دەگەڕا و دەیبینی ئەو پیاوانە کەسیان لەوی دیان ناچێت، کەسیان وەکو ئەوی تر سەیری ژیان ناکات، کەسیان ئاسمان وەکو ئەوی تر نابینێت، کەسیان وەکو ئەوی تر ناڕوانێتە دارستان، کەسیان ئاو وەکو ئەوی دی تەماشاناکات، کەسیان وەکو ئەوی تر لە عەشق ناگات. ئەو هەندێ شەو دەچووە گفتوگۆی درێژەوە لەگەڵ گۆڤەنددا، هەندێ شەو کە پەروانە لە ناو دارەکاندا وندەبوو، وەکو جاران تاکە دڵنەوایی خۆی لای گۆڤەند دەدۆزییەوە، بەڵام شەو دوای شەو هەستیدەکرد گەشبینیەکانی گۆڤەند لەسەر خەون بونیادنراوە، خەونێک کە لە خورافاتەوە نزیکە. فەرەیدون ئێستا لەو باوەڕەدابوو، هەر کەسێک بیەوێت خەونەکانی خۆی بەسەر مرۆڤەکانی دیکەدا و بەسەر مێژوودا بسەپێنێ، ترسناکە، چونکە خەون ناوازەترین و تایبەتیترین بەرهەمی تەنهایی مرۆڤە... ئەو پێیوابوو تەنهایی و خەون، نائومێدی و خەون، بونبەست و خەون لەیەکدی جیانابنەوە. بەڵکو هەتا عەشق و خەونیش لەیەکدی جیانابێتەوە و مرۆڤی هەمیشە عاشقیش ئەو کەسەیە کە هەرگیز بەئاگانایەتەوە. مرۆڤی عاشق ئەو کەسەیە کە خۆشەویستی لەپشت دیوارەکانی خەونەوە قایمدەکات و لەدەست جیهان دەیپارێزێت. فەرەیدون دەیگووت «گۆڤەند، ئێمە هەمووماں وەکو تۆ ڕۆژگارێک وەرزێکی سەیرمان لە ئومێد و هیوا و خەون بڕی، فەسڵێکی درێژمان لە خەیاڵاتدا تەیکرد، من لە هەر کەس زیاتر خەونم بە سەفەرێکەوە دەبینی لەگەڵ مەعشوقدا،

سـەفەرێک بـە هەمـوو زەویـدا بمبـات، سـەفەرێک بـەرەو شـاری خەیاڵـی هەڵمگرێـت، دەمویسـت سـنوورەکان هەمـوو ببـڕم، سـنوورەکانی کۆمـەڵ و دیانـەت و سیاسـەت، سـنووری شارسـتانیەتەکان، لەگـەڵ ڕەزای دڵخۆشـدا چەندەهـا وەرز تەنها بـە غایلـەی بینینـی دونیایەکـی تـر دەژیایـن. بـەڵام کـە وەرزی ئـەو خەیاڵاتانـە بەسـەرچوو، تێگەیشـتم کـە هێـزی خوێـن و کینـە و جەنـگ لـە هەموو ئـەو خەیاڵاتـە پچوکانـە بەهێزتـرە، ئیـدی تەنیـا بیـرم لـە ڕزگارکردنـی خـۆم و پەروانـە دەکـردەوە، ڕزگارکردنێـک کـە دەشـێت ئەویـش بەشـێکبێت لـە پاشـماوەی ڕۆژگاری خەیـاڵات». فەرەیـدون، تـا دەهـات زیاتـر تێدەگەیشـت کـە گۆڤەنـد کاتـێ قسـەدەکات بـاس لـە خـۆی دەکات، بـاس لـەو ئومێـد و خەونانـە دەکات کـە خـۆی پێویسـتی پێیەتـی... ئـەو بـەو دەنگـە پێغەمبەرانەیـەی خۆیـەوە، دەیەوێـت هەمـوو ئـەم خەڵکانـەی دەورووبـەری لەسـەر ئـاوازی خـەون و ئومێدەکانـی ئـەو سـەمابکەن، دەیەوێـت ببـن بـە پارچەیـەک لـەو هەرێمـەی ئـەو خەونـی پێـوە دەبینـێ. تـا پتـر سـەیری ئـەو مامۆستایەشـی بکردبایـە بـە دیوێکـی تـر و بەڕێگایەکـی تـردا زیاتـر دەگەڕایەوە نـاو خـۆی. تـا شـەوێک لـە شـەوان هەسـتیکرد بـە جـۆرێ لـە تێگەیشـتنیدا لـە مامۆسـتاکەی جودابۆتـەوە، ئیـدی لێکچوونێـک لەنێوانیانـدا نەمـاوە. فەرەیـدون کـە وێرانبوونـی عەشـقەکانی دەبینـی بـە گۆڤەنـدی دەگـووت: «مامۆسـتام گوناهـی ئێمـە ئەوەیـە کـە شـتی زۆر لە عەشـق داوادەکەین، داوادەکەین عەشـق پـردی نێـوان ئێمـە و خـودا بێـت، عەشـق پـردی نێـوان ئێمـە و نیشـتمان بێت، عەشـق ڕزگارکـەری ئێمـە بێـت لـە بێـزاری شـارەکان، لـە سـاردی ئاینـەکان، لـە ماندوێتـی نـاو کێڵگـە و کارگـەکان، لـە دەربەدەربوونمـان لـە دونیـا، لـە نامۆیمـان و پەراوێزبوونمـان لـە جیهـان... داوادەکەیـن عەشـق باڵمـان بداتـێ، توانامـان بداتـێ، هێـزی داهێنانمـان بداتـێ، بـەڵام عەشـق خـۆی لـە جیهانێکـی وەکـو ئـەم جیهانـەی ئێمـەدا، لـە شـارێکدا وەکـو ئـەو شـارەی کـە ئێمـە لـە کوچـە و کۆڵانەکانیـدا گەورەبوویـن، جگـە لـە دیلێکـی بریـندار هیچـی تـر نییە،

جگە لە زامێکی گەورە و شاردراوەدا هیچی تر نییە کە هەتا ناوێرێت خوێنی خۆی نیشانبدات... لە هەر شوێنێکەوە دەرکەوت دەپێکرێت، بەڵام بڕوانە دنیا بەجۆرێ مەخلوقاتەکان و مرۆڤەکان و میللەتەکانی لە یەکتر دابڕیوە کە عەشق ناتوانێت پێکەوە گرێیان بدات، سەیرکە... سەیرکە، مامۆستام، هەندێ کەس هەرگیز عاشق نەبوون، بەڵام پێیانوایە عاشقن، ئەمەش ژیان دەگۆڕێتە سەر جەهەنەم، هەندێکیش ئومێدی وا گەورە بە عەشق دەبەستن، کە خۆیان و عەشقیشی پێوە وێراندەکەن».

ئەو ڕۆژە کە دەلیلە چاوشینەکە هات و گووتی کە پەیکەری عاشقەکان نافرۆشرێت بۆ شەوەکەی فەرەیدونی مەلەک، گۆڤەندی لە ناو درەختەکاندا گرت و گووتی: «گۆڤەند، مامۆستام... عەشق دەمرێت، عەشق لەم دونیایەی ئێمەدا دەمرێت، هێدی هێدی دەبێتە توحفەیەکی کۆن و بێمانا... تۆ هیوات بە چییە؟». گۆڤەند ماتدەبوو و دەیگووت: «هیوام بە عەشق و خۆشەویستی خۆیەتی». فەرەیدون وەکو شێتێک کە لە دوای وەڵامی پرسیارێک بگەڕێت، دەیگووت: «ئەی ئەم هەموو گۆشەگیرییە چی؟ ئەم هەموو بێدەنگی و تەنهاییە چی؟ سەیرکە گۆڤەند، سەیری گەورەیی ئەم وڵاتە بکە، سەیری گەورەیی ئەم عەردە بکە، سەیری مەزنی ئەم گەردونە بکە، ئێمە چیدەکەین لە پەراوێزی ئەم وجودەدا، چیدەکەین لێرەدا؟ بەڵام بڕوانە هێشتا هەر تەنهاین، سەیرکە «پەروانە» هەموو شەوێک دەڕوات. ئەم بێدەنگییە، ئەو بازنە گەورە و خاڵییانەی دەوروبەرمان، پوچی ئەو بۆشاییە سەوزانەی لەم دارستانەدا گەمارۆماندەدەن، لەیەکدیمان جیادەکەنەوە... مامۆستام، ئەوەتا هەریەکەمان دەبێتە مرۆڤێک بۆ خۆی، بەتەنها بۆ خۆی، مرۆڤێک کە بەتەنها بۆ ترس و دوودڵی و ڕاڕایی و خولیا و مۆتەکەکانی خۆی دەژی... مامۆستام، من دەمەوێت فریای خۆم بکەوم، دەمەوێت خۆمێکی جوان دروستبکەم... دەمەوێت لەزەتێک بۆ تەنهاییەکانم پەیدابکەم». گۆڤەند هەرگیز لەوەوبەر فەرەیدونی بەو

جۆرە نەبینیبوو، قژی تەواو ئاڵۆزکاو و چاوانی تەواو مەست و جوڵەکانی تەواو پڕ ترس و گومان بوون. فەرەیدون هەمیشە گەنجێکی هێمن بوو، بەڵام لەناکاو وەکو بیەوێت عاشقان لەو مەترسیانە ئاگاداربکاتەوە کە دەیانبینێت، لەو تەنهاییە ئاگاداریانبکاتەوە کە هەستی پێدەکات، شپرزە و نامۆ، بە ترسێکی لە ئەندازە بەدەرەوە لە ناو دارەکاندا وێڵدەبوو. ئەو شەوە دوای جێهێشتنی گوڤەند بەناو جەنگەڵدا دەڕۆیشت و بەعاشقەکانی دیکەی دەگووت: «هەریەکەتان خۆی بۆ تەنهایی خۆی ئامادەبکات»، بەسەر کەپر و خانو و هەرزاڵەکاندا دەگەڕا و دەیگووت: «خۆتان بۆ تەنهایی و مردن ئامادەبکەن...». خەوتووەکانی ئاگاداردەکردەوە و دەیگووت: «گۆشەگیریی بەڕێوەیە، گۆشەگیریەکی ترسناک، گۆشەگیریەکی جوان کە مرۆڤ دەبێت لایەقی بێت، هەستن و پێشوازی لێبکەن». بەناو جەنگەڵدا دەڕۆیشت و دەیگووت: «عەشق مرد، دەرگاکانتان لەسەر خۆتان دابخەن و درۆ لەگەڵ مەحەبەتدا مەکەن».

جەنگەڵ هەمووی لە خەو هەڵدەستا و گوێی لە هاوارەکانی فەرەیدونی مەلەک دەگرت، کە وەک شێتێک دەیکێشا بەسەر و سینەی خۆیدا. کەس باوەڕی نەدەکرد فەرەیدون بەجۆرێکی وەها سەیر و لەناکاو، ئارامی و هێمنی خۆی لەدەستبدات. هەموو عاشقەکان دەهاتنە دەرێ و لەو نائارامییەی فەرەیدونیان دەڕوانی. پەروانە دەگەیشتە لای، دەستی بە قژیدا دەهێنا، دەیویست ئارامیبکاتەوە، فەرەیدون دەستی ڕادەپسکاند و دەیگووت: «پەروانە، تۆش خەیاڵێک بوویت لە خەیاڵەکان... واهیمەیەک لە واهیمەکانی من... هەڵەیەک لە هەڵەکانی من بڕۆ، بڕۆ گۆشەگیرییەکی جوان بژی، بڕۆ درێژە بە سەفەرێک بدە کە هیچ لە نامۆیی تۆ ناگۆڕێت، دنیا هەمووی یەک گوندی دوکەڵاویی درێوە... تۆش ئەی پەروانە، ئەی واهیمەی شیرینی من، بڕۆ درێژە بە خەیاڵە شیرینەکانی خۆت بدە... بڕۆ...».

ئەو شەوە فەرەیدونی مەلەک تا دەمەوبەیان هاواریدەکرد، ڕۆژی دواییش زۆر درەنگ هێوربووەوە و خەوی لێکەوت، پەروانە کە ئەو پەشۆکانە لەناکاوەی فەرەیدون پەرێشانیکردبوو، بە هێمنی لەتەنیشتییەوە خەوت، ئەگەرچی ئەو لە قوولایی دڵییەوە دڵنیابوو کە فەرەیدونی خۆشویستوە، بەڵام ئێستا هەستیدەکرد ئەم پیاوە زۆر نامۆیە بە ڕۆحی و هەمیشەش بە غەریبی دەمێنێتەوە، سەیری لێدەهات کە بۆ بەو شێوە سەیر و کوتوپڕە لە سروشت و ئەتواری خۆی چووەدەرێ، فەرەیدون هەمیشە ئاڵۆزترین و سەختترین هەڵچوون و داچوونەکانی دەرونی خۆی دەخواردەوە، بەردەوام بێدەنگییەکی بێسنوور و بێئەندازە لە چاو و لە سیمایدا بوو، هەتا هەڵچوونە ڕووکەشەکانیشی بێدەنگ و هێمن بوون. نەسرەدین دەیگووت: «شەڕەکانی فەرەیدون و تووڕەبوونەکانیشی بە ئارامییەکی بێمانا بەڕێوەدەچوون». یەکێ لە هاوڕێکانی ڕۆژانی شەڕەچەقۆی جاران بۆ نەسرەدینی بۆنخۆشی گێڕابووەوە کە ئەو لە خوێناویترین شەڕدا ئارامی و ویقاری خۆی لەدەستنەداوە. پەروانە دەیپرسی: «نهێنی ئەم شەو، نهێنی ئەم نائومێدیی و تووڕەییەی فەرەیدون، ئایا ماندوبوونی ناو ئەم جەنگەڵەیە، یان گۆڕانێکی تەواوەتییە لە ژیانی ئەم پیاوەدا؟»، بەڵام هیچ وەڵامێکی پێنەبوو. گۆڤەند، بۆ ڕۆژی دواتر کاتێ ئارامبوونەوە و هێمنی فەرەیدونی مەلەکی بینی، هەناسەیەکی دڵنیایی هەڵدەکێشا، بۆ ئێوارێ هەمو عاشقەکانی بانگدەکرد تا تێکڕا لەسەر دۆزینەوەی چارەیەک قسەبکەن. گۆڤەند دەیزانی چیتر ناتوانن لەسەر ئەو پەیکەرە دێرینەی عەشق کاربکەن، دەبایە سەرجەم لەسەر شتێکی نوێ ڕێکبکەون، شتێک لەیەککاتدا هونەریش بێت و کاڵاش بێت و پڕ ماناش بێت. میدیا دەڵێت کەس لەویاوەڕەدا نەبوو، ئەو دانیشتنە ببێتە سەرەتای وەرزی لێکجودابوونەوە گەورەکان. ببێتە ئێوارەی جیابوونەوە و پەرتپەرتبوون. هەر لە سەرەتاوە دیاربوو ئەو پیاوانە بە هیچ ناگەن، هەر لەگەڵ

دەستپێکردنی قسەکردندا هەموو شەڕانگێزی ئەوانە دەرکەوت کە چیتر نەیاندەویست گوێ لە ئەفسانەکانی گۆڤەند بگرن. گۆڤەند هەموو سیحری دەسەڵاتی خۆی دەخستەکار، وەکو ڕەوانەکراوێکی ئاسمان قسەیدەکرد، وەکو ڕزگارکەرێکی عەشق دەیگووت: «خەڵکانی وڵاتی ئێمە هەمیشە و هەمیشە عاشقبوون، بابەتی غەزەلیشیان درەخت و باڵندە و گوڵ بووە، من پێشنیاری داتاشینی درەخت و باڵندە و گوڵ دەکەم، دەزانم کارێکی سەختە بۆ ئێوە، بەڵام گرنگ نییە، من سەرلەنوێ فێرتاندەکەمەوە، سەرلەنوێ لەگەڵتاندا ماندوودەبم... سەرلەنوێ دەست پێدەکەینەوە و بابەتەکانی غەزەل دەکەین بە بابەتی کارکردنمان». بەرلەوەی گۆڤەند قسەکانی تەواوبکات، پیاوان تووڕە دەبوون، دەنگیان بەرزدەکردەوە، یەکێک دەیگووت: «گوڵ و باڵندە نافرۆشرێت، ماندوودەبین و هیچمان چنگ ناکەوێت، ئەمڕۆ ڕۆژی شەڕە، ڕۆژی لەیەکدانی چەندەها گروپ و خێڵ و کۆمەڵەی سیاسییە، باشترین شت ئەوەیە دروشمی ئەو جەنگاوەر و هێزە شەڕکەرانە داتاشین و بینێرینە سەرێ و داوای نرخی زۆریش بکەین». کڵپە لە ناو ڕیزەکان دەهاتەدەرێ و دەیگووت: «ئەمە قسەیەکی پوچە، من لەگەڵ دروستکردنی شەترەنجدام، من لەگەڵ دروستکردنی گەمەیەکدام خەڵکی کەمێک سەرقاڵبکات و ئازارەکانیان لەبیرباتەوە...». دارتاشێک قسەکانی بە کڵپە دەبڕی و دەیپەیڤاند: «کێ لە ڕۆژی وادا سەری دەپەرژێتە سەر شەترەنج؟ کێ خەیاڵدەداتە گوڵ و باڵندە؟ کێ پێویستی بە ئاڵا و دروشم هەیە؟ دەبێت ئێمە بیر لە شتێ بکەینەوە خەڵکان پێویستیان پێبێت. من پێشنیاری دروستکردنی بێژەنگ و قەڵبیر و بلوێری منداڵ و کەوچکی ماستاو دەکەم، کە کەرەستەی ئەزەلین و هەمیشە بازاڕێکی باشیان هەیە». وەلێ عەزیزی تیرئەنداز ڕادەپەڕێ و دەیگووت: «باشترین شت ڕاوکەرێکە بە تفەنگەکەیەوە، ئەوەتەی دونیا دونیایە کوردان هەر ڕاوکەربوون و هەرواش دەمێننەوە...». لە ناو ئەو

دەنگە دەنگەدا، لە وچانێکی ئێجگار کورتدا، فەرەیدونی مەلەک بە هێمنی هەڵدەستا و سەیری هەمووانی دەکرد و دەیگووت: «من تەنها پەپولە دروستدەکەم، لە مێژە بیرم لێکردۆتەوە، لە پەپولەکان زیاتر هیچی تر ناتاشم و کاریشم بەسەر کەسەوە نییە».

میدیا لە دەفتەرەکەیدا نوسی: « لەو ئێوارەیەوە وەرزی گۆشەگیری دەستپێکرد، وەرزێک کە یەکەیەکە لە ڕۆح و لە ژیانی هەموو پیاوان و ژنان و منداڵانی ئەو چڕ و زەبەندەدا دەرکەوتەوە». ئەو ئێوارەیەش پیاوان بڵاوەیان لێکرد بێئەوەی بە هیچ بگەن، هەریەکە و کوتە دوای خەیاڵ و فەنتازییەکانی خۆی، هەریەکە و جێگایەک و وێنەیەکی بۆ خۆی هەڵبژارد و لەوانی دیکە جیابووەوە، لەو ئێوارێیەوە ئیدی وەرزی وێران بوونی وەرشەکە و جەنگەڵیش دەستی پێکرد. ئەو شەوە فەرەیدون سەرسامانە سەیری دونیای دەوروبەریدەکرد و بیریدەکردەوە، بەناو کەپرەکاندا بێدەنگ دەڕۆیشت و دەگەڕایەوە، لە نزیک چۆمەکەوە دەردەکەوت و ونددەبوو، چەند جارێک لەو پردە دارینە نزیکدەبووەوە و دوردەکەوتەوە، بەڵام بێدەنگییەکی قووڵ باڵی بەسەر سیما و ڕەنگیدا کێشابوو. ئەو شەوە لە یەکێ لە پێچەکانی جەنگەڵەوە گۆڤەند دەرکەوت و بە هێمنی لەبەردەمی فەرەیدوندا وەستا، گۆڤەند دەیگووت: «فەرەیدون، فەرەیدونی مەلەک، تۆ کەی لە داوی ئەم پەپولانە ڕزگارتدەبێت؟ کەی؟». فەرەیدون بە زەردەخەنەیەکی سەیرەوە، بە بزەیەکی شەیتانییەوە وەڵامیدەدایەوە : «ئاه گۆڤەند، تۆ پێمبڵێ... چ دوو شتێک لەم دونیایەدا وەکو پەپولە و عەشق لەیەکدەچن، سەیری پەپولە بکە و بەراوردی بکە بە ئەڤین، سەیری نازکی، تەمەنی کورتی، هەڵوەرین و سووتانی بکە... سەیرکە، چەند لە عەشق دەچێت... پەپولە وەکو عەشق دەڕوات و کەس هەنگاوەکانی نابینێت، لە کۆنەوە وابووە، سەیری شیعرە کلاسیکییەکان بکە...». گۆڤەند دەیگووت: «ئاه فەرەیدون، فەرەیدونی هاوڕێم، ئەوەیە موسیبەتەکە، تۆ عەشق تەنها وەکو

نازکی دەبینێت، بەڵام عەشق جەنگە، عەشق وەکو هەموو جەنگێکی تر سەر دەست و ژێر دەستی تیایە، براوە و دۆڕاویی تیایە، عەشق جەنگە، جەنگە لەگەڵ هەموو دنیادا». فەرەیدون دەیگووت: «نا گۆڤەند... نا، عەشق ناتوانێت، جەنگاوەر بێت، عەشق پشوویەکی کورتە، کورت، دێت و هەڵدەوەرێت... عەشق شتێکە هێندەی گرتت مردووە، هێندەی لەگەڵیدا ژیایت ژەهراویدەکەیت، بەڵام موسیبەتی من ئەوەیە دەمەوێت بیگرم، دەمەوێت تا هەتاهەتایە لەنێوان پەنجەکانی خۆمدا بیگرم و یاری پێبکەم... چەندە دووریکەوێتەوە من دەبێت رێگای دیکە بدۆزمەوە تا بیگرم».

«گۆڤەند» کە بە جۆرێکی تر بیری لە خۆشەویستی دەکردەوە، گۆچانەکەی دەدا بە زەوی کەپرەکەدا و دەیگووت: «عەشق دەبێت نەمرێت، دەبێت ببێتە مەبەستێکی ناوەکی جیهان، دەبێت ببێتە مەبەستی مەخلوقات و مرۆڤ و میللەتەکان».

فەرەیدون کە ئێستا تەواو لەمجۆرە قسانەی گۆڤەند بێزاربووبوو بە خەندەیەکی تاریکەوە دەیگووت: «ئاه، عەشق تێکەڵاو بە خورافەتەکانی تری مرۆڤ مەکە، لێگەڕێ با وەکو خۆی چۆنە لەدایکبێت و بمرێت... موسیبەتی ئێوە ئەوەیە کە هەمیشە دەست لە عەشق دەدەن، تێکەڵاوی دونیای دەکەن، تێکەڵاوی دیانەت و شۆڕش و حوکم و کارکردنی دەکەن، عەشق کە دەستت لێدا دەمرێت، کە لەوە دەرچوو شتێک بێت لە دەرەوەی قووڵاییە تاریکەکانی مرۆڤ دەمرێت... عەشق بەجۆرێ بە تاریکستانی ناوەوەمان گرێدراوە کە هاتە دەرێ دەمرێت».

گۆڤەند دەیگووت: «دەمزانی، دەمزانی... خوێندنەوەی ئەو چەند کتێبە بێمانایەی ناو ئەو کتێبفرۆشییە پەڕپووتەی شار، بەرەو شوێنی ترسناکت دەبات... موسیبەتە، مرۆڤ کتێبەکان بخوێنێتەوە و خراپ تێیانبگات».

فەرەیدون بە غەمێکەوە سەیری گۆڤەندی دەکرد و دەیگووت: «ئاه.

گۆڤەند، تۆ باسی چی دەکەیت؟ من هیچ شتێکم نەخوێندۆتەوە، من ئێستا لەم جەنگەڵەدا لەگەڵ ئێوەدام... بەڵام دەزانم عەشق بەرگەی ئەم سەفەرە دوور و درێژانەی ڕزگاریی ناگرێت. سەیرکە... سەیری چواردەوری خۆتبکە، مرۆڤ لە جیهانێکی وادا ناتوانێت ڕۆحیش و جەستەشی ئازادبکات، خۆیی و عەشقیش ئازادبکات... ناتوانێت».

«گۆڤەند» بە قووڵی سەیریدەکرد و دەیپرسی: «فەرەیدون، فەرەیدونی مەلەک. ئەی کە عەشق مرد تۆ چی دەکەیت؟».

فەرەیدون تەماشایەکی گۆڤەندی دەکرد و دەیگووت: «لەگەڵ وەهمەکانیدا دەژیم، لەگەڵ سێبەرەکانیدا... چونکە هیچ چارێکی ترم نییە».

ئەو شەوە گۆڤەند و فەرەیدونی مەلەک بێئەوەی بگەنە هیچ، لەیەکدی جیابوونەوە، گۆڤەند بۆ ناو جیهانی پەیکەرەکانی خۆی و فەرەیدونیش بۆ ناو جەنگەڵ، بۆ ناو ئەو شوێنانەی کە ئیدی لەوێ بەدوای خەیاڵی پەپولەکانی خۆیدا دەگەڕێت. ئەو شەوە دواهەمین شەوی ئاسودەییە لە ژیانی فەرەیدوندا، ئیدی لەو شەوەوە بە تەنها لە ناو ئەو جەنگەڵەدا بەدوای کەرەستەی پەپولە خەیاڵییەکانی خۆیدا وێڵدەبێت. ئەو شەوە سەرەتای ماڵاوایی فەرەیدونی مەلەکە لە هەموو ئەو شتە بچوکانەی کە کەم و زۆر لە نیاز و خولیاکانی منداڵی دووریان خستبووەوە. فەرەیدون لەو ڕۆژەوە کەوتە دروستکردنی شورای مەملەکەتی پەروانەکان، ئەو مەملەکەتەی چارێکی تر لێی نایەتە دەرێ.

لەو بەیانییەوە کە فەرەیدون سەر بەسەر دروستکردنی یەکەمین پەپولەدا شۆڕدەکاتەوە، ئیدی بەدەگمەن سەر بەرزدەکاتەوە، لە یەکەم ئێوارێوە کە پیاوان دەگەڕێنەوە بۆ ژێر کەپرەکانی خۆیان، فەرەیدون ناگەڕێتەوە، کەسیش ناتوانێت دڵی بۆ گەڕانەوە دابێنێت. شەو لەگەڵ داهاتنی تاریکیدا لەسەر شەوقی قوتیلەیەکی بچکۆلانە لە ناوەڕاستی

ئەو وەرشەیەدا، بەردەوام لەگەڵ پەپولە تەختەکانیدا دەمێنێتەوە. لەگەڵ داهاتنی تاریکیدا پەروانە بێئارام، بەرەو ئەو وەرشەیە دێت، لەبەر دەرگاکەوە دەیبینێت، بێباکانە خەریکی ڕەنگکردنی پەپولە خەیاڵییەکانی خۆیەتی. پەروانە سەرەتا وا تێدەگات نوقمبوونی فەرەیدون لە ناو پەپولەکانیدا، تەنها پەتایەکی کوتوپڕ و تێپەڕە، بە درێژایی شەو تکا لە فەرەیدون دەکات پێکەوە بگەڕێنەوە، بەڵام تکاکانی سودێکیان نابێت. فەرەیدون نیمچە ئاگا و نیمچە بێهۆش پێیدەڵێت: « ئەم کۆمەڵە پەپولانە تەواودەکەم و دێم... ئەمانە پەپولەکانی عەشقن». بەڵام دوای هەر پەپولەیەک، بەرەو دروستکردنی یەکێکی دیکە دەڕوات، کە قسەشدەکات هێندەی وەڵامی دەنگێکی نهێنی ناو ڕۆحی خۆی دەداتەوە، وەڵامی ئەو ناداتەوە. ئەو شەوە پەروانە، نامۆ، تەنها، چاوبەگریان لە تەنیشت فەرەیدونەوە ڕادەکشێت، لە زوڵمەتی ئەو وەرشەیەدا تێدەگات کە ئێستا چەندێ لە یەکتر دوورکەوتونەتەوە، تێدەگات هەردووکیان وەکو دوو مەخلوقی تەنها و گۆشەگیر ژیاون و ئێستاش عەشق چیتر ناتوانێت لە یەکیان نزیکبخاتەوە، دەزانێت ئەڤین تەنها وەرزێکی کورتی ناو وەرزەکانی خەیاڵات بوو، ئەڤین سەرەتای شکاندنەوە بوو بەرەو وەرزە ساردەکانی گۆشەگیری و غەم. ئەو وەرزەی ئێستا لە هەموو لایەکەوە هێدی هێدی لەگەڵ گەڵا و گیا و سەوزاییەکاندا گەورەدەبێت... لەگەڵ شەو و شەماڵ و کزەی ساردی ئاوەکاندا هەڵدەکات.

ئەو شەوە و شەوانی دواتریش ژیانی پەروانە بەو جۆرە تێدەپەڕێ، فەرەیدون هەر ڕۆژە و ناوێک لە پەپولەکان دەنێت، ئەو چیتر ژیان و تەنهایی و خەیاڵ و بیرکردنەوەی خۆی لەڕێگای ئەو پەپولانەوە دەژی، هەموو ئەو جوانی و ترس و نامۆییەی کە نەیدەتوانی تێیانبگات و بیانگرێت دەیکردنە پەپولەی سەیر سەیر، پەپولەکانی شەوێک پەپولەی ئازادیین، شەوێکی دی پەپولەی غوربەت، شەوێک پەپولەی دۆزەخ و شەوێکی دی پەپولەی

بەهەشت، شەوێک پەپولەی شەیتان و شەوێکی دی پەپولەی خودا... گۆڤەند کە دونیای ئەو پەپولانە دەبینێت، دەڵێت: «ئەو بڕیاریداوە چیتر لەگەڵ سێبەری حەقیقەتەکان و جوانییەکاندا بژی».

ئەو کاتە پەروانە شەوان زۆربەی کات لە تەک فەرەیدوندا دەمایەوە، بەیانیانێک فەرەیدونی جێدەهێشت و گوێی لەو سروە ساردانەی سەرەتای پایز ڕادەگرت، ئەو لە هەموو جێگایەکدا تەنهایی دەبینی گەورەدەبێت، ترسی دەبینی گەورەدەبێت، سامێکی قووڵی لە چاوی ئەو ئافرەتانەدا دەخوێندەوە کە ئێستا کەمتر قسەیان لەگەڵ یەکدا دەکرد، ئێستا دەستیان زیاتر لە جاران دەلەرزی، زیاتر لە سێبەر و تارمایی دەچوون، زیاتر ڕەشێتی شەوەکان بە لەشیانەوە دەمایەوە. لەو ڕۆژانەدا پەروانە و میدیاش کەمتر یەکتریان دەبینی، شەوان پەروانە بە تەنها لە ناو جەنگەڵدا دەسوڕایەوە، یان لە سوچێکی وەرشەکەدا بەدیار فەرەیدونەوە دەوەستا، میدیاش هەمیشە بۆ مانگ دەگەڕا... هەمیشە لە نابەینی درەخت و پەڵە هەورەکانی پایزدا ئاسمانی بۆ مانگ دەپشکنی... لەو شەوانەدا میدیا دەیەها لاپەڕە لە وەسفی تاریکی و لە وەسفی ئەو ڕوحلەبەرە جیاوازانەدا دەنوسێت کە هەریەکەیان بایەکی ترسناک بۆ دوور دەیانڕفێنێت، کە جارێکی دیکەش لە ناو پێچاوپێچی درەخت و گیاکاندا بە پەروانە دەگاتەوە، لە ژێر شەوقی مانگەشەوەکەدا هێندە پیر و لاواز دێتە پێشچاوی وەکو ئەوەی لە زەویەکی دیکە گەڕابێتەوە و لە زەمانێکی ترەوە هەڵهاتبێت. میدیای غەمگین باوەش بەو خوشکە تەنهایەیدا دەکات و دەگری، پەروانە کە بە وەسفی میدیا لە حاڵەتی سەرلێشێوانێکی کوشندەدایە، ناتوانێت خۆی لە زیندانەکانی خۆی ئازادبکات و ناشتوانێت فەرەیدون لە تاریکییەکانی ڕۆحی دەربهێنێت، شەو دوای شەویش فەرەیدون بێدەنگتر و گۆشەگیرتر دەردەکەوێت، هێدی هێدی وای لێدێت ئیدی پەروانە ناناسێتەوە، بە ئەندازەیەک لە جیهانی پەپولەکانی خۆیدا نوقمدەبێت گوێی لە هیچ

دەنگێـک نامێنێـت، پەروانـە هەنـدێ شـەو ڕایدەوەشـێنێ و دەڵێـت: «مـن پەروانـەم»، بـەڵام سـوودی نییـە، لەسـەر دیوارەکانـی وەرشـەکە دەنوسـێت: «مـن پەروانـەم»، بـەڵام نوقمبوونـی فەرەیـدون لـە تـوێ تاریکەکانـی ڕۆحـی خۆیـدا بـە ئەندازەیـەک کوشـندەیە هیـچ هێزێـک ناتوانێـت یارمەتییـدات، ئـەو بەیەکجـار دەرگاکانـی ڕۆحـی خـۆی دادەخـات و ئیتـر نایەتـەدەرێ، دەچێتـە مەملەکەتەکانـی خەیـاڵ و ئیتـر لـە جیهانـدا پێویسـتی بـە جێگایەکـی دیکـە نامێنێـت.

پەروانـە لـەو شـەوە ساردانەدا بـە میدیـا دەڵێـت: «دەبێـت... دەبێـت جیهانێکـی دیکـەی باشـتر هەبێـت...»، بـەڵام میدیـا دەنوسـێت: « دوو ڕێگامـان لەبەردەمدایـە یـان بگەڕێینـەوە بـۆ شـار و هەوڵبدەیـن هەمووشـتەکان لـەوێ دەسـتکاریبکەین، یـان وەکـو فەرەیـدون تـا ئەوسـەر بڕۆیـن و دەرگاکانـی ڕۆحـی خۆمـان لەسـەر خۆمـان دابخەیـن».

وەلـێ پەروانـە هـەردوو چارەکـە بـە کوشـندە دەزانێـت. هەفتەکانـی دواتـر گەردەلوولـی غەمێکـی ترسـناک دێتـە نـاو جەنگـەڵ، وەرزێکـی ڕەشـی پـەژارە و غـەم، کـە وەرزی فرمێسـک و گریانەکانـی پەروانەیـە، کـە لەنـاکاو دەسـتدەکات بـە گریانێکـی بـە کـوڵ و بێکۆتایـی، بـە شـێوەنێک کـە وەکـو گەردەلـوول بەنـاو وجـودی هەمـوو شـتە زینـدوو و مردووەکانـدا تێدەپەڕێـت. کـە ژنانـی دارسـتان ئـەو ئـازار و تەنهاییـە لـە پەروانـە دەبینـن، وەکـو لـە دەوری ئازارێکـی بەرجەسـتەی نـاو ڕۆحـی خۆیـان کۆببنـەوە، لـە دەوری کۆدەبنـەوە. پەروانـە لەسـەر بـەردەکان دەگـری، لـە قـەراغ ئـەو ئاوانـە بـە هێمنـی دەگـری، لـە ژێـر درەختەکانـدا دەگـری، بەردەوامیـش ئـەو ژنـە تەنهایانـە وەکـو ئەڵقەیەکـی گـەورە لـە دەوری کۆدەبنـەوە و دەگریـن. گۆڤەنـد دوور بـەدوور گـوێ لـە گریانـەکان دەگرێـت و ئـەو کـۆڕی شـیوەنە گەورانـە بـە گەڕانـەوەی حەسـرەت دەزانێـت بـۆ جێگایـەک کـە دەیویسـت بیکاتـە بەهەشـت. دەنگـی گریانەکانـی پەروانـە بەسـەر دەنگـی باڵندەکانـدا زاڵدەبێـت، بەسـەر دەنگـی ئاوەکانـدا

زاڵدەبێت، بەسەر بێدەنگی قووڵ و ترسناکی گوڵەکاندا زاڵدەبێت. لە ناو شەپۆلی گریانە بەردەوامەکانی پەروانەشدا گۆشەگیری هەموو مەخلوقاتەکان چەندەها جار گەورەتر دەبێت... پیاوەکان لە بەرامبەر دۆزەخی ئەو شیوەنەدا درندانەتر دەردەکەون. «عەزیز تیرئەنداز» بە خۆی تفەنگەکەیەوە بە شێوەیەکی سەیرتر دەکەوێتە گیانی باڵندەکان، «مەهدی گوڵەباغ» زیاتر دەچێتە وێزەی گوڵ و گیا و هەرێزەکان، دوو عاشق کەپرەکانیان دەسووتێنن و بە زەحمەت ئاگرەکان خامۆشدەکرێت. بەڵام لە هەمووان ترسناکتر سیامەندی باڵندەیە کە لەو وەرزەدا بە شێوەیەکی سەیر دەکەوێتە ئازاردانی مەعسومە، مەعسومە پڕ بەو جەنگەڵە هاواردەکات و کەس ناچێت بەدەنگییەوە، خۆی لە عاسیترین شوێنی دارستاندا قایمدەکات، بەڵام سیامەند بە ڕاکێشان دەیهێنێتەوە، ئەو بەردەوام هەڵدێت و سیامەند لە کون و قوژین و بن بەرد و کەندەڵانەکاندا دەیدۆزێتەوە و بەناو بەرد و خۆڵ و لمی ئەو کەنار ئاوەدا ڕایدەکێشێت. بە دارەکانەوە دەیبەستێتەوە، فڕێیدەداتە ناو ئاوەکانەوە و دەریدەهێنێتەوە. هەموو جەنگەڵنشینانیش سەیری سیامەند دەکەن و کەس هیچ ناکات، پەروانە و میدیا دوور بەدوور ئەشکەنجەکانی مەعسومە دەبینن و بە بێدەنگ دەگەڕێنەوە بۆ ناو دونیای خۆیان. هەندێ جار «شەهلای خوداناس» بە خۆی و قورئانەکەی دەستییەوە لە سیامەند نزیکدەبێتەوە و پێیدەڵێت: «بیکوژە، ئەم سۆزانییە، بکوژە... ئەم خودانەناسە بکوژە». هەمیشەش بە نیگایەکی پڕ لە کینەوە سەیری هەمووان دەکات. گۆڤەندیش بەدوای شتەکاندا دەڕوات و هیچ ناڵێت، تەماشای ئازارەکانی مەعسومە دەکات و سەر دادەنەوێنێت و تێدەپەڕێت. بەڵام لەلایەکی ترەوە غەمەکانی پەروانە درەختەکان زەرددەکات، ڕەنگی ئەو چەو و لمە زۆرانەی قەراغ ئاوەکان دەگۆڕێت. هێلانە بە باڵندەکان دەگوازێتەوە، گەڵا وەریوەکان دەکاتە خۆڵەمێشێکی نازک. تامێکی تاڵ دەبەخشێتە مێوەکان. میدیا هەندێ

جار دوور بە دوور دوای دەکەوێت و ئێشکی دەگرێت، ئاگاداریشە پەروانە بەردەوام لە نزیکی ئەو بازنە سپی و بێدەنگانەی جیهانی فەرەیدونەوە دێت و دەچێت، ئاگادارە شەوان پڕ بەو وەرشەیە هاواردەکات، بەڵام فەرەیدون گوێی لێنیە. پەپولەکان دەشکێنێت، بەڵام نایبینێت. وردە وردە فەرەیدون وای لێدێت لە دەوروبەری خۆی ئاگای لە هیچ شتێک نامێنێت. شەو دوای شەویش پەروانە نائومێد و تێکشکاو لەو وەرشەیە دێتە دەرێ و هەموو شەوێکیش پیرتر و ماندووتر و تەنکتر لە شەوەکانی دیکە دێتە بەرچاو... پەروانە ئاگاداری ئەو پیرییە ناوەختەی خۆیەتی و لەسەر بەردەکان دەنوسێت: «زەمەن بە خێرایی دەڕوات». دەنوسێت: «هەفتەکان وەکو تێپەڕینی چەند دەقیقەیەک گوزەردەکەن». میدیا پێیدەڵێت: «ئێمەین بە خێرایی دەڕۆین... ئێمەین». پەروانە بێئەوەی تێبگات، چاوی لێکدەنێت و دەنوسێت: «چەند سەیر بەناو ژیاندا تا ئەوسەر دەڕۆم». میدیا وەک شێت پەلی ڕادەکێشێت و لەسەر دەفتەرەکەی دەنوسێت: «ئەو غەمە ترسناکەی تۆ دەچێتە ناو گەڵاکانەوە، دەچێتە ناو هێلکەی کوکوختییەکانەوە، دەچێتە ناو ڕۆحی نەمامەکانەوە... تۆ دەبێت لەو حوزنە بێیتەدەرێ». بەڵام پەروانە لە بازنەی ئەو غەمە ترسناکانە نایەتە دەرێ. هەموو شتەکانیش وەکو بازنەیەکی داخراو و چیرۆکێکی دووبارە دێتە پێشچاو، تا لە گەرمەی ڕۆژێک لەو ڕۆژە غەمگین و ساردانەدا، مەعسومە کە ترسی لە عەشق و باڵندەکان دەگاتە ئەوپەڕی، کە چیتر ناتوانێت بەرگەی ئەو هەموو برین و ترس و هاوارانە بگرێت، دەمەویەیانێکی تاریک، لە ساتێک لەو ساتە کەمانەی کە سیامەند تیایدا دەخەوێت... بەو پەیژە هەزار بەهەزارەدا سەردەکەوێتەوە و بە لەشێکی ماندوو و بریندارەوە بەرەو کێڵگە دوورەکان دەکەوێتە ڕێ... لە سەفەرێکی سەیردا، کە دواتر دەڵێت: «ئەو سەفەرە، سەفەر نەبوو، هێندەی سەرەتای وێرانکردنی خۆم و هەموو دونیا بوو».

# ١٦

زەینەبی کوێستانی دەیگووت:

«بۆ ئەوەی تۆبەبکەین، دەبێت لە تۆبە تێبگەین، بۆئەوەی لە تۆبەش تێبگەین، دەبێت لە ڕۆح و جەستەمانەوە دەست پێبکەین. سەرەتای هەموو سەرەتاکان مراندنی جەستەیە، ئەوەی ناتوانێت لەشی خۆی زیندانبکات، ناتوانێت تۆبە بکات. لەش وەکو ئەسپێکی ڕەش وایە، ئەسپێکی ڕەش کە دەتوانین یان لە تەویلەیەکی لە خۆی ڕەشتردا بیبەستینەوە بە جۆرێ لەو زوڵمەتەدا کەس نەیبینێت، یاخود دەکرێت وەکو ڕەشەبا ئازادیبکەین، لەگەڵ ئازادکردنیشیدا نەوەک تەنها پەیوەندی مرۆڤ بە خوداوە کۆتایدێت، بەڵکو پەیوەندی جەستە و ڕۆحیش دەپچڕێت. سەفەری کوشتنی ئەو هەستە کوشندەیە بە لەش، سەفەرێکی دوور و درێژە، سەفەرێکە بە ڕیشەکێشکردنی فیتنەکانی جوانی دەست پێدەکات، لەو ساتەوە کە مرۆڤ بیر لە جوانی خۆی دەکاتەوە، جوانی خودا لەیاددەکات. جوانی ڕێگای یەکەمەوە بەرەو لەزەت، ئەوەشی لەزەتی لە پاکی لا گرنگتربێت، گوناهبارە، لەزەت و پاکی دوو شتن پێکەوە کۆنابنەوە، مرۆڤ کە بیر لە جوانی دەکاتەوە، یان شەیدای خۆی دەبێت، یان شەیدای کەسانی تر، کە بیریش لە لەزەت دەکاتەوە تەنها بیر لە ئارەزووە بەدەکانی خۆی دەکاتەوە،

هیچ شتێ بۆ ئافرەتێکی ئیماندار لەوە گرنگتر نییە کە خۆی نەبینێت و تەنها چاو لە ئاسمان ببڕێت، هیچ شتێ لەوە گرنگتر نییە کە پێویستی بە ئاوێنە نەبێت. تۆبەکار کە دەڕوانێت دەبێت لەبری خۆی خودا ببینێت... بە پێچەوانەشەوە، گەر وا نەبوو، ئەو تۆبەکار نییە».

زەینەب لە یەکەم ڕۆژی ئەو سەفەری تۆبە و پاکبوونەوەیەدا بەو جۆرە قسەیدەکرد، دەنگی ساردییەکی سەیری تێدابوو، کە ژوورەکەی کردبووە زەمهەریر، ئێمە کەسمان نەدەجوڵاینەوە، کەسیشمان لەو کچانەی دوێنێ نەدەچووین، هەموو ئێستا جلە نوێکانمان لەبەردابوو، ئەو لەچکە ڕەشە قەترانییەمان بەستبوو، ئەو یەکەیەکە بەسەرمانەوە دەگەڕا و دەیگووت: «بۆئەوەی دەست بەسەر جەستەماندا بگرین، لە نیگاکانەوە دەست پێدەکەین، پرسیارەکە ئەوەیە، چۆن ئافرەتێک سەیری دونیا دەکات بێئەوەی لە چاویدا عەیاری و فیتنەیی دەرکەوێت. چۆن دەڕوانێت و ناهێڵێت بە چاو گوناه بکات... ئافرەت زۆربەی شتەکانی بە نیگا دەڵێت، بە نیگا عەشق دادەمەزرێنێت، بە نیگا لەشی خۆی پێشکەشدەکات، بە نیگا هاوارەکانی لەشی دەگەیەنێت، پیاوانی خەتاکار یەکەمین جار سەیری چاوی ئافرەت دەکەن. یەکەم پەیام و ترسناکترین پەیامی گوناه لە چاوەوە دەستپێدەکات، ئێمە لێرە دەبێت سەیرکردنەکانتان لە هەموو شەهوەت و غەمزە و دەلالێک پاکبکەینەوە.

لە نیگا بترازێت بۆنی جەستەتانە، شەیتان لە ئەزەلەوە بۆنێکی سەیری داوە بە جەستەمان، بۆنێک دەمانخاتە بازنەی گوناهەوە، ئێوە نابێت بۆنێکتان لێبێت شەهوەت بزوێنبێت، دەبێت بۆنی ئێوە لە بۆنی گوڵ و درەخت و مەخلوقاتە فیتنەبازەکانی سروشت نەچێت، دەبێت بۆنی ئێوە خاڵیبێت لە هەر شتێ لە خالیقمان دووربخاتەوە و تێکەڵ بە مەخلوقمان بکات... بۆنی جەستەتان بکوژن، لە ژێر جلەکانتانەوە

دیلیبکەن.

بەڵام لە نیگا و بۆن ترسناکتر، زمانە... ئا، هیچ شتێ لە زمان ترسناکتر نییە، بە یەک وشە بێئیمان و ئیماندار لە یەکتر جیادەبنەوە. وشە، دەتوانێت لە شەیتان بەدتر و لە تاریکی ڕەشتر و لە خوێن سوورتر بێت، وشەیە سەرە ماندوو و لاوازەکان پڕدەکات لە فیتنە و خەیاڵ، بەڵام هەر وشەشە، پیرۆز و بە شکۆ و بە جەلالە. وشەیە نوری ئیمان دەخاتەوە دڵ و دەرون، وشەیە کە پەیامی خودا بە ئێمە دەگەیەنێت... ئاە، کچانم، کچانی ئازیز و بەدبەختم، دەبێت زۆر ئاگاتان لە وشە بێت. وشە تۆپێکی کریستاڵی دوو دیوە، ئەگەر سەیری لایەکیتان کرد دەچنە جەهەنەم، ئەگەر سەیری لاکەی دیکەشتان کرد دەچنە بەهەشت... دەبێت زۆر ئاگاداربن، زۆر... وشە دونیای ئەوتۆ دەخوڵقێنێت نابێت بخوڵقێت، نیگاری ئەوتۆ دەکێشێت نابێت بکێشرێت، لە هیچ گوناە دروستدەکات، لە هیچ لەزەت دەخوڵقێنێت... ئێوە دەبێت هێندە وریابن فەرهەنگی خودا لە فەرهەنگی شەیتان جیابکەنەوە... وای لەو ڕۆژەی ئەو دوو کتێبە تێکەڵاودەکەن... وای لەو ساتەی کە ئەو مانا و پیت و دەنگانە تێکەڵدەکەن».

زەینەب ووچانێکی کورتی دەگرت و بە دەنگێکی غەمگین دەیگووت: «کچەکانم، جگە لە وشەش، دەبێت خەندەکانتان لە فریوو و سەرسەختی و درێوی پاکبکەنەوە، دەشێت خەندە شەماڵی بەهەشت بێت، وەکو چۆن دەشێت بانگەوازی فیتنە و لەزەتیش بێت، دەشێت تاقیکردنەوەی ڕۆح بێت بۆ پاکی خۆی، دەشێت تاقیکردنەوەی لەشیش بێت بۆ فریوی خۆی. دەبێت لەنێوان خەندەیەکدا کە لە پشتییەوە ئارەزوو و ئاڵۆشی لەش، وەکو ڕوناکییەکی بەد دیارە و لەگەڵ خەندەیەکدا کە نوری ئیمان و چاکەی لێهەڵدەستێت جیاوازیبکەین، دەبێت بزانین ئایا ئەوەی

دەخەنێت ئاڵۆش و شەهوەتە یاخود ئیمان و بڕوایە، من لە چاوی هەندێکتاندا خەندەیەک دەبینم جگە لە خەندەی چەواشەبوون و گومڕایی هیچی تر نییە، بزانن، ئازیزە بەدبەختەکانم، بزانن، خودا چۆن کردار و قسە هەڵدەسەنگێنێت خەندەش هەڵدەسەنگێنێت، چونکە هەندێجار خەندەیەک دەتوانێت عەرشێک بلەرزێنێت و هەندێجاریش دەتوانێت دەریایەکی تووڕە ئارامبکاتەوە. ئاه کیژە تۆبەکارەکانم، ئێوە کە ئەمڕۆ باوەشتان بۆ ئیمان کردۆتەوە، بزانن کە هەموو گیانتان دەشێت مایەی خەتا بێت، هەموو گیانتان... هەتا جوڵەی لەشتان، لەرەی دەنگتان. بزانن ئەهریمەن لە هیچ شوێنێکدا وەکو لەشی ئافرەت کاری نەکردوە، دەبێت فێرببین لە هەستان و دانیشتنماندا لەشمان بە ئەندازەیەک جڵەوبکەین کە بەدنیازیەک، ڕێوێڵکەرێک، سیانیشانەیەکی لێدەرنەچێت. لەرەیەکی سینە هەندێجار دەتوانێت هەموو یاسا و حیکمەتە ئاسمانییەکان بلەرزێنێت، شەپۆلێکی نازک لە گۆشتێکی شەهوەتبازەوە دەتوانێت لە گەردلوێک ترسناکتر بێت. ئێوە دەبێت لەبیربکەن کە لەشتان هەیە، لەبیربکەن سینەتان هەیە. تۆبەکردن مانای بەنجکردنی سەرچاوەکانی لەزەت، قووڵبوونەوە لە جڵەوکردنی هەموو تامەکاندا، خنکاندنی هەموو چێژەکان، چێژ ئەو ڕێگایەیە کە قووڵ قووڵ بەرەو ناوەڕاستی جەهەنەمتان دەبات، گەر چێژەکانتان نەکوژن ناتوانن ببنە تۆبەکار، نەشبن بە تۆبەکار پاکنابنەوە... وای لەوەی کە چێژەکانی زیندوون... وای لەوەی کە تامی دونیا دەکات و ئەبەدییەت فەرامۆشدەکات، وای لەوەی کە سفرەی دونیا دەکاتەوە و سفرەی قیامەت دەپێچێتەوە».

هەندێجار یەکێک لەو ژنە باوەڕانە دەهاتە ژوورێ و سەیریدەکردین و دەڕۆیشتە دەرێ، پێدەچوو ئەو خۆی فەرمانی کردبێت کەس قسەی پێنەبڕێت، کاتێک لە کۆتایی نزیکبووەوە گووتی: «ئەمڕۆ

ڕۆژی یەکترناسینی تەواوەتیمانە، من لێرە سزای کەس نادەم، ئێرە قوتابخانەی سزا نییە، بەڵکو شوێنی ورياکردنەوەی ویژدانە، ئەوەی دەبێت ئازار بچێژێت ڕۆحتانە، من ترسم لە سزا هەیە، ترسم هەیە لە قامچی و لێدانیش لەزەت وەربگرن... ترسم هەیە... بەڵام من لەمرۆوە لەگەڵتاندام، هەمیشە نزیکم لێتانەوە... بۆیە دەبێت یەکەیەکە بتانناسم، یەکەیەکە بزانم ئەو ژیانە سەیرەی لە ناو خەتادا ژیاون چۆن شێواندوونی، بەڵام دڵنیابن چەندە پێچاوپێچەکانی شەیتان ئاڵۆزتر و شەڕانگێزتر بێت، بۆ من کردنەوەیان و شکاندنیان و ڕێکخستنەوەیان گرنگترە. ئایین لە جەوهەریدا ڕێکخستنەوەی عەیبە سەختەکانی مرۆڤە، تۆبەکردنیش ڕاستکردنەوەی خوارییەکانێتی، بەڵام بۆئەوەی ڕاستببنەوە دەبێت خۆتان لە قووڵایی ڕۆحتانەوە ئامادەبن... دەبێت خۆتان دەست بۆ هانا و یارمەتی درێژبکەن».

لەو ڕۆژەوە دەبایە خۆی یەکەیەکە بمانبینێت، دەبایە یەکەیەکە بەسەرهاتی ژیانی خۆمان بگێڕینەوە، حکایەتی دایکە ئەتککراو و خوشکە ڕەدوکەوتووەکانمان بخەینە بەردەستی، هەرچییەکمان بینیوە ئاشکرایبکەین. لێی دەپرسین: «ئەی پیاوان... تامی پیاوانتان کردوە، ئەو لەزەتە شەیتانییەتان چەشتووە؟». کە هاتە سەر نۆبەتی من بەسەرهاتی ئەو شەوە عاجباتییەی ماڵی پورمم بۆ گێڕایەوە، نەشمدەزانی من تەنها کەسێک دەبم کە حەقیقەتی گوناهێک دەدرکێنم کە نابێت بدرکێنرێت. ئەو بەردەوام لێی دەپرسیم: «ئەو پیاوە ڕاستی بوو یان خەیاڵ، شەهوەتێکی ڕووت بوو کە خەیاڵی خۆت دروستیکردبوو یان هەر زوڵمەت بوو... زوڵمەت؟». من دەمگووت: «نازانم، خانمم، هەرسێکیان بوو زوڵمەت بوو، شەهوەتی من بوو، لەشێکی ڕاستەقینە و بە قەوارەش بوو... خانمم، هەموو شتەکان بوو

پێکەوە». کە قسەمدەکرد، هەستیدەکرد کە من پتر لەوەی بە ڕۆحی گوناهبارێک و بە ترس و سامی پەشیمانێک بدوێم، بە دەنگی کچێکی سەرکێش قسەدەکەم، هەمیشەش ئەو خەندە سەیرە لەسەر لێوم بوو، ئەو خەندەیەی لە بەیانی سووتانی کتێبخانەکەوە چووبووە سەر سیمام. ئەو دەیگووت: «ئاە، خەندانی چکۆلە، دنیا لە منداڵییەوە تۆی شێواندووە... چاوانت پڕن لە شەوقی سەیر، لە ئارەزووی سەیر، بەڵێ چاوانت هێمنن، لەکاتی ئاساییدا تابڵێی هێمن دیارن، بەڵام من لە هیچ شتێک ناترسم لە چاوانی هێمن نەبێت، هەموو چاوە هێمنەکان لەڕاستیدا ترسناکن، تا ئێستا نیگایەکی ئارام و لەسەرەخۆم نەبینیوە ئەو دیوی گوناە و خراپە نەبێت... زۆر جار هەستدەکەم ئەو هێمنییە، هێمنی ئارەزوویەکە دەتوانێت بەوپەڕی حیکمەتەوە هەوڵ بۆ ئامانجی خۆی بدات، بەوپەڕی ساردی و نەشڵەژانەوە کاربکات... ئاە، خەندان، خەندەکانیشت بەدتر نین لەو هێمنییەی ناو نیگات. خەندەیەکە لە پشتییەوە گاڵتەجاڕییەکی قووڵ دەبینم، گاڵتەجاڕیی بە جیهان، بە مەخلوقات، بە خودا. خەندەیەکە لە ڕۆحێکەوە دێت نایەوێت حورمەتی ئەم گەردونە و دروستکەرەکەی بگرێت، حورمەتی ئاین و یاساکان بگرێت. خەندان، دەبێت سەرەتا لە دەستەمۆکردنی خەندەکانتەوە دەست پێبکەین، لە کوشتنی ئەو خەندانەوە دەست پێبکەین تا نەتوانێت بۆنی پیاوان و وێنەیان و بوونیان بهێنێتە دونیای ئەم کیژە تۆبەکارانەوە».

هەر ئەو ڕۆژە و لەسەر دەفتەری ناوەکان، هەموومانی دەستە دەستە و بەپێی جۆری تۆبەکردنەکان دابەشکرد، ئەوانەی دەبووایە نیگاکانیان لە عەیاری پاکبکەنەوە هەندێ کچی منداڵبوون کە لە چاویاندا مەکرێکی سەیر دەبینرا، ئەوانەی دەبووایە بۆنی جەستەیان ڕکێفبکەن لە تەمەندا گەورەتر دیاربوون، بەڵام تاکە کەسێک خەندەکانی بە جۆرێکی ترسناک

ژەهراوییبوون، من بووم. هەموو کیژانی دیکە فریوی خەندەکانی خۆیان شاردبووەوە، هەمووان خەندەیەکی پاک و ئاسایی و ئارامیان نیشاندابوو، خەندەیەکی کورت و پڕ لە شەرم. لەگەڵ ئەوەشدا من لە ڕوویەکی دیکەوە بەختیاربووم، من لەنێو هەمواندا تاکە کچێک بووم لەبەر چکۆلەیی و لاوازیی، پێویستیم بەوە نەبوو لەشم لە فیتنە زیادەکانی سووکبکەم. ئەو ئێوارەیە بۆ یەکەمجار خشتەی وانەکانمان وەرگرت، یەکەم وانەش ژنێکی گەورەی دەموچاو درێژ سەبارەت بە ژیانی «موسا» پێیگووتین، کە ئیدی تا چەندەها ساڵ دواتر، خۆی بە تەنها ژیانی پێغەمبەران و ئەسحابە و خەلیفەکانی پێدەگووتین. وانەکانی دیکەمان تێکەڵەیەکی سەیربوو لە مێژووی مەزهەبەکان و فتوحاتەکان، وانەیەکمان هەبوو لەسەر شێوەی دەرکەوتنەکانی شەیتان، وانەیەکیش لەسەر ژنە خۆفیداکارەکان، عیلمی کەلاممان دەخوێند، چەند ڕۆژێکیش لەسەر جیهانی ناو گۆڕ و وەسفی دۆزەخ ژنێکی چکۆلە قسەی بۆ دەکردین، خاتوونێکیش کە لووتێکی خوراوی هەبوو تەفسیری قورئان و دەستووری ئیرسی پێدەگووتین، پیرەکچێکی ڕەنگزەردیش فەلسەفەی زەکات و ئادابی سەر سفرە و چۆنێتی وسڵدەرکردن و بیسمیلکردنی شتەکانی فێردەکردین. مامۆستاکانمان هەموو ئافرەتی هێمن و لەسەرخۆ بوون کە بە ئارامییەوە قسەیان لەگەڵ دەکردین، هەرگیز تووڕە نەدەبوون، ساردییەکی سەیر لە چاو و دەنگیاندا بوو، بەڵام هەرگیز هەستم بە وشەیەک یان لەرەیەکی ڕەحم و سۆز نەدەکرد، ئەوان هەموو شتەکانیان وەکو جۆرێک یاسای ئەزەلی و نەگۆڕ دەبینی کە مرۆڤ دەبێت بیزانێت و دوایبکەوێت، لە ڕێگای بێدەنگی و تێفکرینێکی قووڵەوە، بە نیگای زۆر سەیر و بە ڕستەی زۆر لەسەرخۆ ئێمەیان بەرەو ئەو شوێنانە ڕادەکێشا کە دەبایە بەزووترین کات بیگەینێ.

لە شەوانی هەفتەی یەکەمەوە، لە سالۆن و ڕاڕەوەکانی قوتابخانەدا دەستەی تۆبەکەرانی یەکەم دەرکەوتن. دووبارەبوونەوەی هەمیشەیی ئەو وشەیە «پاکی... پاکی... پاکی» لە ڕۆحی هەمووماندا هەستێکی سەیری دروستکردبوو، هەمووان هەستمان بە پیسێتی دەکرد، هەستماندەکرد هێندە پیسین دەبێت بەناو دەیەها ڕێگای ئالۆز و سروتی سەیردا تێبپەڕین تا پاکدەبینەوە. یەکەمجار ئەو هەستە لە «شنۆ»دا دەرکەوت کە چەند ژوورێک دوور لە ژوورەکەی ئێمە دەژیا، ئەو خوشکی یەکێ لە سۆزانییە بەناوبانگەکانی شار بوو، خۆیشی هەستیدەکرد بە ئەندازەیە گلاوە هیچ شتێ پاکی ناکاتەوە. شەوان لە تاریکییەکەدا کچانی قوتابخانەکە لێی کۆدەبوونەوە و ئەویش بە دەنگێکی نوزەڵ دەیگووت: «هیچ شتێ جگە لە ئاگر پاکمان ناکاتەوە. من دەبێت خەیاڵێکی تر، ڕۆحێکی تر قەرزبکەم، ئێوەش دەبێت لەشێکی تر بۆ خۆتان دروستبکەن، لەشێکی پاک...». کەمە کەمە کچانی تر لەدەوری شنۆ کۆدەبوونەوە، بە هێمنی و بە دەنگێک کە هەر لە سەرەتاوە هەستمدەکرد زۆر لە دەنگی مامۆستاکان دەچێت، باسی پاکبوونەوەیان دەکرد. لە هەفتەی یەکەمەوە، شەوانە شنۆ لە داڵانەکەدا لەسەر بەتانییەکی قەدکراو دادەنیشت و بە دەنگێکی ئارام قورئانی دەخوێند، هێدی هێدی کچانی دیکە لەدەوری ئەڵقەیان دەبەست، زۆرجار بەیانیان زوو هەڵدەستام و دەمبینی شنۆ لە هەمان جێگادا قورئان دەخوێنێت، کچەکانی دیکە دەیانگووت هەندێ شەو ناخەوێت، فەتانە بەردەوام بە چپەوە دەیگووت: «درۆ دەکات، من دەزانم چ قەحپەیەکە... دەیەوێت زوو لەم قوتابخانەیە بچێتەدەرێ...». بەڵام بۆ من ئەوە سەیربوو کە «لەیلا»ش لەو ئەڵقەیەی دەوری «شنۆ»دا دەرکەوت. شەوێک من و فەتانە لە پیاسەیەکی کورت گەڕاینەوە و گوێمانلێبوو «لەیلا»

دەیگووت: «لەشم بۆنێکی کوشندەی لێدێت، بەهۆی ئەو بۆنەوە پیاوان هەمیشە دوامکەوتون، خۆیان لێم نزیکخستۆتەوە، بۆنێک ئیتر تەحەمولی ناکەم». «فەتانە» ئەو شەوە دەستیگرتم و گووتی: «شتی زۆر خراپ بەڕێوەیە، با بڕۆین، با دووربکەوینەوە...». لەو شەوانەدا هەستمان بە دەرکەوتنی ئەو غەمە سەیر و ترسە بێئەندازانە کرد کە وایدەکرد کچەکان لە ژوورەکانی خۆیاندا ئۆقرەنەگرن، لە هەموو جێگایەکدا ئەو چپە ترسناکانەی «ئاگر»، «ئەهریمەن»، «تۆبە» و «شەهوت»م دەهاتە گوێ. فەتانە دەیگووت: «نابێت ئەم قسانە بمانترسێنێت، ئەگەر بترسین، دەبێت وردە وردە لەگەڵ هەموو شتەکاندا بڕۆین، هەزار ساڵە خەڵک بە بێ تۆبەکردن دەژین، بەڵام ئێستا ئێمە بووین بە تەڵەکەوە، لەگەڵ ئەوەشدا هیچ شتێک لەوە ئاسانتر نییە کە ئێمەش خۆمان وەکو تۆبەکەر نیشانبدەین، ئێمەش دەبێت وا دەربکەوین کە تۆبەمانکردوە». من گومانمدەکرد بتوانم وەکو فەتانە بکەم، دەترسام لە ساتێکدا هەموو شتەکانم لەدەست دەرچێت.

لەکاتێکدا کچەکانی دیکە بەگەرمی بیریان لەلای خۆ پاکژکردنەوەیەکی مەزن بوو، من لەو شەوانەدا سێبەری ئەو پیاوە گەڕایەوە بۆ ژیانم، خودایە... من لەو شەوانەدا کە دونیا تاریک تاریک دەبوو، کە هەمووشتەکان کپ و بێدەنگ و خامۆش دەمانەوە کە نوزەکانی «شنۆ» دەمرد، من لە خەو ڕادەچڵەکیم و هەستمدەکرد ئەو پیاوەی کە شەوێک لە تاریکییەکانی ماڵی پورمدا لەگەڵیدا خەوتبووم لەگەڵمدایە، هەستمدەکرد لە تاریکی ئەو قوتابخانەیەدا چاوەڕێمدەکات. لەو شەوانەدا هەستێکی سەیر ڕۆحمی دەخستە چنگی خۆی، هەستمدەکرد لەشم بیردەکاتەوە، بەئاگادەهاتمەوە و هەستمدەکرد جەستەم بەجیا لە خۆم خەیاڵدەکات. سەرەتا تارماییەکی بچوکم لە تاریکیدا دەبینی، لە ژێر لێفەکەمەوە سەرم

دەردەهێنا و دەمڕوانی و ئەو سێبەرەم دەبینی. سەرتاپای جەستەی ڕەش بوو، قەوارەیەکی سەیربوو لە زوڵمەت، لەگەڵ ئەوەشدا من دەمتوانی بیبینم و بیناسمەوە، خۆی بوو، هەمان ئەو پیاوەبوو کە پێشتر ئاشنای بووبووم... دەهات و یەکەیەکە تەماشای ژوورەکانی دەکرد، یەکەیەکە تەماشای کیژە خەوتووەکانی سەر قەرەوێڵەکەی دەکرد، دەستی لە جلەکانمان دەدا، دەستی لە کتێبەکانمان دەدا و دەڕۆیشت. بە جۆرێ بێدەنگ بوو چرپەی لێوەنەدەهات، بەڵام ئەو بۆن ڕێحانەیەی لە دالان و ژوورەکاندا بڵاودەکردەوە. هەندێ شەو من دوای ئەو بۆنە دەکەوتم، من لە تاریکییەکەدا هەڵدەستام و دوای هەنگاوەکانی دەکەوتم، تا بزانم لەکوێوە هاتۆتە ژوورێ، بەڵام بە جۆرێک لە ناو تاریکییەکەدا وندەبوو وەکو ئەوەی لە ناو شەودا توابێتەوە، بەسەر هەوادا دابەشبووبێت. من دڵنیابووم کە بینیوومە، دڵنیابووم، لەسەر قەرەوێڵەکەم دەهاتمەخوارێ و دوایدەکەوتم، ڕاڕەوەکانم بە چاوێکی خەواڵووەوە دەبڕی و لەشم دەلەرزی، ئارەقێکی ساردم دەردەدا، لەسەر پێپلیکەکان دەوەستام هەندێک جار جورئەتمدەدایە خۆم و بەدوایدا دەڕۆیشتم. ئەو دەچووە خوارێ بۆ ناو دەستشۆرەکان، بۆ ناو گەرماوەکان، بۆ ناو کلاسە خاڵییەکانی خوێندن، بەڵام من جگە لەو بۆن ڕێحانەیە هیچی ترم نەدەگرت، جگە لە هەناسەی نێرینەیەکی خودایی لە هەوادا، هیچی دیکەم چنگ نەدەکەوت.

ڕۆژێک هەموو بەسەرهاتەکەم بۆ زەینەبی کوێستانی گێڕایەوە، پێمگووت: «شەوان پیاوێک دێتە ناو ئەم قوتابخانەیەوە، پیاوێک من دەیبینم... پیاوێکە دێت و یەکەیەکە سەیری کچەکان دەکات، لە ناوەکان دەخواتەوە، لەبەردەرگای ژوورەکاندا دەوەستێت، دەست لە کتێبەکان دەدات». زەینەب سەیری چاوی دەکردم، سەیری ئەو دەستە

ساردانەی دەکردم، سەیری ئەو لاوازیی و پچوکییە بێمانایەی دەکردم و دەیگووت: «خەندان، خەندانی چکۆلە، «تۆبە» دەبێت لە قووڵایی قووڵایی دڵەوە بێت، تۆ هێشتا وەسوەسەی گوناهەکان یاریت پێدەکەن، تۆ هێشتا ئارەزووەکانت دەتجوڵێنن».

کەس باوەڕینەدەکرد، کەس وەکو من بۆنی ئەو پیاوەی نەدەکرد، شەوێکیان بە فەتانەم گووت: «ئەو پیاوە حەقیقەتە، ئەو پیاوە شتێکە من هەستی پێدەکەم، هەندێک شەو دێت، خەبەرمدەکاتەوە». فەتانە بە زەردەخەنەیەکەوە دەیگووت: «شەوان کە دەخەویت زۆر بیر لە پیاو مەکەرەوە، من کە دەخەوم بیر لە هیچ ناکەمەوە». بەڵام زەینەب هیوای وابوو مانەوەی زۆر لەو قوتابخانەیەدا، خوێندنی بەردەوام، نوێژکردنی بەردەوام ئەو خولیایانە لەسەرمدا بسڕێتەوە، بەڵام من هەموو بەیانییەک دەمگووت: «ئەمشەویش ئەو پیاوەم بینیوە... ئەمشەویش ئەو لێرەبوو... لێرە». تا زیاتریش وامبگووتایە ئەو پتر نوێژی پێدەکردم، زیاتر دەیگووت: «شەڕکردن لەگەڵ ئەو شەیتانەی ناو ڕۆحی تۆدا ئاسان نییە، بەڵام دواجار ئەگەر خۆت ئامادەبیت تێدابێت، ئەگەر ڕۆحی خۆت خاوێن بێت، ئەوا ئێمە سەردەکەوین و شەیتانەکان دەبەزێنین».

هێدی هێدی هەستمدەکرد لە کچەکانی دیکەم جیادەکاتەوە. ئەو ڕۆژەش کە زانی من دەستوخەتم خۆشە، گووتی: «خەندان، تۆ لەمڕۆوە، ئێوارە و شەوان لەسەر کارتۆنی گەورە ئایەت و سوورەت دەنوسیتەوە و هەر خۆشت لە ڕاڕەو و ژوور و ناو پۆلەکاندا هەڵیاندەواسیت». هەندێ شەو تا درەنگ، تا ئەو کاتەی من ماندوودەبووم بەدیارمەوە دەوەستا، خۆی یەکەیەکە ئایەتەکانی هەڵدەبژارد، خۆی پێیدەگووتم چۆن چۆنی بیاننووسم. دەیگووت: «هەوڵبدە، نەک تەنها بە پەنجە، بەڵکو بە

ڕۆح بیاننوسیت، هەوڵبدە وشەکان بچنە دڵتەوە، گوێ بۆ زرینگەی حەرفەکان ڕابگرە، ڕێگا بەرەو خودا ڕێگایەکی ڕوناکە، ڕێگایەکە گەر بە هێمنی سەیری ناوەوەی خۆمان کرد، دەیدۆزینەوە».

ئەو وای دەگووت و بەو نیگا ساردانەی تەماشای چاوانی دەکردم. دەیگووت: «خەندان، ئەو خەندەیەی تۆ، دەستەپاچەمدەکات، ڕەنگە هەر لەبەر ئەو خەندە سەیر و پڕ لە گوناهەی ناو چاوانیشت ناویاننابێتیت خەندان، کێ دەڵێت، بەمجۆرە زەردەخەنە شەیتانییەوە لەدایکنەبوویت. بەڵام خەندانی چکۆلە ئەگەر خودات ناسی هەمووشتەکان بە جۆرێکی تر دەگۆڕێت، ئەو کات زەردەخەنەکانت شێوەیەکی پاک و ئاسمانی وەردەگرن، نیگاکانیشت ڕەنگێکی دیکەیان دەبێت».

شەوان دایدەنام و پێیدەگوتم: « بنوسە... بنوسە». من یەک لەسەر یەک ئەو زەخرەفە ئاینییانەم دەکێشا، شەو دوای شەو کارتۆنی گەورە گەورەم دەنوسی، دواتر بەجووتە تەپڵەکێکمان هەڵدەگرت و یەکەیەکە ئایەتەکانمان هەڵدەواسی، کە تەواو دەبووین من بە ئەندازەیەک ماندوودەبووم نەمدەتوانی خۆم بەپێوە بگرم، ئەو سەرما ترسناکەش کە لە جەستە و ڕۆحی ئەو ژنەوە دەهات دەیتەزاندم. کەچی کە دەخەوتم، نیوەشەوان تارمایی ترسناکی ئەو پیاوە لە قووڵایی تاریکییەکانەوە دەهات و سەر لە نوێ خەبەریدەکردمەوە، سەر لە نوێ هەڵدەستام، سەر لە نوێ بە ژوور و ڕاڕەوەکاندا دوایدەکەوتم، سێبەرەکەیم دەبینی لەسەر دیوارەکان، لەسەر نوێنەکان، لەسەر قەرەوێڵەکان، لەگەڵ ئەوەشدا نەمدەتوانی بیگرم.

بەیانیان لاواز و نائومێد بە زەینەبی کوێستانیم دەگووتەوە کە دووبارە ئەو تارماییەم بینیوە، دووبارە ئەو ڕۆحە تاریک و زوڵمەتبازە لێرەدا دەرکەوتۆتەوە. زەینەب وای هەستدەکرد من دەمەوێت ماندوویبکەم، من

مەکرێکی لەگەڵدا دەنوێنم، تا لە ناو تۆڕ و واهیمە و هێماکانیدا ونبێت، بە زەردەخەنەیەکی سەیرەوە دەیگووت: «خەندان، مەترسە، مەترسە، من ئیشم گەلێک زۆرە بۆ تۆ».

ڕۆژێکیان بارێکی ئێجگار گەورە لە کتێب لەبەر دەرگای قوتابخانەکەماندا وەستا. زەینەب دەرگای ساڵۆنێکی گەورە گەورەی کردەوە کە پێشتر کەسمان پێمان تێنەخستبوو، ساڵۆنێکی گەورەی پڕ لە ڕەفە و دۆڵابی گەورەی کتێب و مێز و کورسی تایبەت بە خوێندنەوە، بەڵام هەموو سەر ڕەفە و ناو دۆڵابەکان خاڵیبوون. ئەو ئێوارەیە هەموومانی ڕیزکرد و پێیگووتین، سەفتە سەفتە کتێبەکان لەبەردەرگاوە بەرەو ئەو ساڵۆنە هەڵگرین کە دەکەوتە ژێرزەمینی قوتابخانەکەوە و پێشتر کەسمان هەستمان بە بوونیشی نەکردبوو. کە هەموو کتێبەکانمان گواستەوە، هەر ئەو شەوە من و فەتانە و دووکیژی دیکەی جیاکردەوە و کەوتینە ڕێکخستنی کتێبەکان. بۆ ڕۆژی دوایی بە من و فەتانەی غەمگینی گووت، دەبێت شەوانە دابەزینە ئەو ژێرزەمینەوە و پێکەوە فەهرەست بۆ ئەم کتێبخانە گەورەیە بکەین... شەوانێکی دوور و درێژ فەتانە ناوی کتێبەکانی دەخوێندەوە و من دەمنوسی، کەس نەبوو لە قوتابخانەکەدا بەئەندازەی من و فەتانە زمان و نوسینی عەرەبی باش بزانێت، هەڵبەت فەتانە لەو ڕووەوە زۆر لە من زیرەکتر بوو، ئەو هەموو ژیانی لەبەردەم زنجیرە تەلەفزیۆنییە میسرییەکاندا بردبووەسەر، بەهۆی ئەوەشەوە توانی لەتەک منەوە بێتە ناو جیهانی سەیر و سەمەرەی کتێبەکانەوە. سەیرترین شت ئەو پەیوەندییە سەیرە بوو کە ئێمە لەگەڵ ئەو کتێبانەدا دروستمانکرد. ئەو پەیوەندییەی تا کاتێک لە قوتابخانەی خوشکە تۆبەکارەکان دەرچووین، ئێمەی بەو کتێبخانەیەوە گرێدا. لەوەوبەر لە جیهانێکدا نەژیابووم، کتێبی زۆری تیابێت، تاکە ئەزموونم لەگەڵ کتێبدا

دەگەڕایەوە بۆ یادگاری ئەو شەوانەی پەروانە لەبری حەسرەت و گریان، کتێبێکی لە جانتاکەی دەردەهێنا و دەیخوێندەوە. لە یەکەم ئێوارەوە کە دەستم لەو کتێبانە دا هەستم بە لەزەتێکی سەیرکرد، لەزەتێک دەبایە هەمیشە بیشارمەوە و ئاشکرای نەکەم، دیمەنی ئەو حەرفە عەرەبییە قەشەنگانە و ئەو ناونیشانە سەیرانە، بۆ من لە دنیایەکدا کە گۆڕان و خەیاڵ و شادومانی تیانەبوو، دەروازەی جۆرە فەنتازیایەکی دیکە بوو. بەڵام فەتانە لە یەکەم ئێوارێدا گووتی: «من بیستوومە گۆشەگیری زۆر لەگەڵ کتێبەکاندا بەرەو شێتیمان دەبات». زەینەبی کوێستانی پێیگوت: «کتێب هەیە وەکو ئەمانە لە بەهەشتەوە دێن، کتێبیش هەیە شەیتان لە ژێر حەرفەکانیدا خەوتووە، هەندێ جار ئەهریمەن بەشێوەیەکی سەیر دەچێتە ناو کتێبەکانەوە، دەچێتە ناو خوێندنەوەکانەوە، دەچێتە ناو تەفسیرەکانەوە، واتە دەکرێت کتێبێک بەهەشتیانە نوسرابێت، بەڵام شەیتانیانە تەفسیربکرێت.».

من شەوێک دوای ئەو ماندوبوونەی ناو جیهانی کتێبەکان، لەگەڵ فەتانەدا لە دەستشۆرەکان لەو ئاوێنە بچکۆلانەیەدا سەیری خۆمم کرد، ئاه خودایە هێشتا هەر لە خەندانی چکۆلە دەچووم... هەر خەندانی چکۆلە بووم... ئەگەر چی هەستمدەکرد هێدی هێدی بەرەو دونیایەکی تر دەڕۆم و ڕووەو ڕۆحێکی دیکە دەگۆڕێم.

## ١٧

مەعسوم کە لە دارستانەکان هاتەدەرێ، تا چەندین ساڵ دواتریش پێی وابوو کە سیامەند باڵندە هەر بە دواوەیەتی. بە ئەندازەیەک دەتوانم بڵێم ژیانی مەعسوم ئەگەرچی بە گەلێ ڕۆژانی ناخۆش و تاریکتردا تێپەڕی، کەچی هەرگیز لە تارمایی ئەو پیاوە پاک نەبووەوە کە تا ئەمڕۆ کەس، هیچ هەواڵێکی ڕاست دەربارەی چارەنوسی نازانێت. لە ڕێگادا، ڕێگای هەڵهاتن بەرەو قەدەرێکی تاریک، مەعسوم هەستیدەکرد چەندین پۆلی گەورە و ترسناکی باڵندە بە دوایەوەن، وەکو چۆن خۆی لە مرۆڤەکان دەشاردەوە، خۆی لە باڵندەکانیش وندەکرد، ئەو ترسەی کە لەو سەفەرەشدا لە باڵندە تیا دروستبوو، تا مردن لەگەڵیدا بوو، دواجاریش ڕۆژێک بەر لە مردنی بە منی گووت: « هیچ شتێک منی نەکوشت، باڵندەکان نەبێت».

هەڵهاتن لەو هەموو پۆلە باڵدارە خورافییە ... هەڵهاتن لەو مەلە گەورانەی بە درێژایی ڕۆژ لەسەر درەختەکانەوە تەماشایاندەکرد، خۆشاردنەوە لەو پەلەوەرە سەیرانەی وەک بەسەر دوژمنێکدا بفڕن، بەسەریدا دەفڕین، دەیەها جار ئازاری ئەو هەڵهاتن و ڕێویلییەیان بۆ مەعسوم گەورەتر کرد. ئەو نەیدەزانی چەند ڕۆژە لە پێچاوپێچەکانی سروشت و پایزدا ونبووە، چەند ڕۆژە خۆی لە شوانەکان و ڕێبوارەکان دەشارێتەوە... تەنها شتێک لای ڕونبوو ئەوە بوو کە دەبێت ڕوو لە شار بکات و لەوێشەوە ئەگەر توانی سەری خۆی بەرەو جێگایەکی دیکەی دونیا هەڵبگرێت. بە ڕۆژ، هەتاو

دەیسووتاند و بە شەو سەرما و کزە ساردەکانی پاییز تێکیاندەشکاند، برسێتی چەندەها ڕۆژ، پشوونەدانی قووڵ لە ترسی باڵندەکان، برستیان لێ بڕیبوو. دەبایە بەردەوام خۆی لە قەرەقووڵی سوپاکان لابدا، خۆی لە مەفرەزەی ئەو پێشمەرگانە لابدات کە بەدەم گۆرانیگووتنەوە لە نێوان گوندەکان لەڕێگادا بوون. ڕۆژانێکی زۆر نەیدەزانی بە چ ئاڕاستەیەک دەڕوات، چ هەرێمێکی بڕیوە و بەرەو کوێ دەچێت.

مەعسوم دەیگووت: « چاوەڕوانم نەدەکرد سەفەرەکەم لە بێستانێکی کاڵەکدا دوابیێت، لەگەڵ ئەوەشدا دوای ئەو سەفەرە دوور و درێژە کە چەندەها شەو و ڕۆژی پڕ ترس و تاریکیم تیا تەیکردبوو، لە بێستانی گوندێکی قەراغ شاردا گیرسامەوە».

ئەو شەوێک دوای ئەوەی تێر زرکە کاڵەکی سەوزی خوارد، ماندوو شەکەت لە ناوەڕاستی بێستانێکدا خەوی لێکەوت، ئەو کات هەستی بە ئارامییەک کردبوو، کەمتازۆر سەرنجیدابوو کە چیتر باڵندەکان بەدوایەوەنین، ونبوون و کەمبوونەوەی باڵندە و مێروو و جانەوەرەکانیش بۆ ئەو نیشانەیەکی باش بوو. ئەو دەیزانی کە تا باڵندەکان بەسەرسەریەوە بن، مانای هێشتا لە سنووری شارە گەورەکان و ئاوەدانییە ڕاستەقینەکان دوورە. بەڵام ئەو شەوە دونیا هەمووی کپ بوو، خامۆشی و ئارامییەکی سەیر لەو کێڵگە گەورە و بەرینانەدا سەروەر بوو، هەر ئەو ئارامییەش بەرەو قووڵایی خەوێکی سەنگینی ڕاکێشا، خەوێک هەتاوی بەیانیش نەیشکاند. مەعسوم دەیگووت: «بەیانییەکی درەنگ بەئاگاهاتمەوە... کە چاوم هەڵهێنا، کار لەکار ترازابوو، تازە لەوە درەنگتر بوو بتوانم هیچ بکەم یان بە هیچ لایەکدا هەڵبێم». ئەو کە چاوی کردبووەوە دەیەها ئافرەت و کچی جووتیاری بینیبوو، بە کۆمەڵ سەریان بەسەردا شۆڕکردبووەوە، دەیەها ژن و کیژانی گوندنشین کە بەسەرسامییەوە لەو دیمەنە شپرزەیەی ئەو و لە جلکە دڕاو و سیما ڕەنگزەرد و تۆزاوییەی ڕامابوون. کە مەعسوم هەستابووە سەرپێ

و سەیری کێڵگەکانی دەوروبەری خۆی کردبوو، چاوی بە چەندین پیاویش کەوتبوو کە بە ڕاکردن بەرەو لای ژنەکان دەهاتن، ژنەکان بە چاوێکی پڕ گومان تەماشایاندەکرد، یەکێکی دەموچاو خاڵ خاڵ و دەستماڵ لە شانیان دەیگووت: «پێدەچێت لە مێردەکەی ڕایکردبێت». یەکێکی دیکەیان کە منداڵتر، بەڵام دڵڕەقتر و عەیارتر دەینواند، دەیگووت: «دوور نییە ڕەدوو نەکەوتبێت و عێشقەکەی لێرەدا جێینەهێشتبێت». یەکێکی دیکەش کە خاتوونێکی دەم هەراش دیاربوو، بە خێرایی لکی کراسەکەی دەپێچایەوە و دەیگووت: «نا، دەڵێن، سۆزانی گەڕۆک دروستبوونە، ئەمە یەکێکە لەوانە». خانمێکی کەمێک بەتەمەنتر، بەڵام لەوان شۆختر و جوانتر پێیگووتن: «گومانی خراپ مەکەن، کێ دەڵێت بەستەزمانێک نییە و خوانەناسێک خراپەی دەرهەق نەکردوە؟».

کە پیاوەکان گەیشتن هەمووان بە تێکڕا ئابڵوقەیاندا و بەرەو ناو دێ بردیان، مەعسوم نەیدەزانی لەکوێیە و دەبێت چیبکات... هەندێ لە ژن و پیاوەکان دەیانویست پەلاماریبدەن، دەیانویست بەردبارانیبکەن، دەیانگووت: «ژنێکی خراپمان لە بێستانی کاڵەکەکاندا گرتووە». منداڵەکان لەپێشیانەوە دەڕۆیشتن و دەیانگووت: «ژنێکی خراپ لە بێستانی کاڵەکەکاندا گیراوە.»... هەموو گوند دەهاتەدەرێ. هەندێ لە ئافرەتەکان نەعل و پێڵاوە لاستیکەکانیان دەگرتە مەعسوم، ئەویش بە هێمنی لەپێشیانەوە سەری دانەواندبوو و دەڕۆیشت. دواجار لە ناو ڕیزی ئەو گەنج و جاهێڵ و پیر و پەککەوتانەوە، ژنێکی تەمەن ناوەندی، کورتەباڵا، بەڵام بەدەسەڵات هاتەپێش و گووتی: «کەس پەنجە لەو ژنە نەدات، کەس پەنجەی بۆ نەبات، ئێوە چ جۆرێکن لە بەشەر، سەگن یان ئادەمیزاد؟ کەس هەیە غەریبەیەکی لێقەوماو بەو دەردە ببات؟».

هەندێ هاواریاندەکرد: «دایە تەلعەت، تۆ نازانی، ئەوە قەحبەیە... قەحبە». ئەو، منداڵان و جەهێڵانی دەتەکاندەوە و دەیگووت: «هەر زۆریش

بەد بێت بەقەد دایک و خوشک و پرکەکانی ئێوە بەدە. هەر زۆر قەحبە بێت وەکو دایکتان وایە».

ئەو ژنە چکۆلەیە دەستی مەعسومەی گرت و بەرەو ناو ماڵێکی ڕازاوە بردی. کە دواتر دەرکەوت ماڵی مەلایەکی بەڕەحم و دانایە. مەلا پیاوێکی ئارام و لەسەرەخۆ بوو بە هێمنی خەڵکانی ڕەوانەی ماڵی خۆیان کردەوە و پێیگووتن: «ئەم ئافرەتە گەر فریشتەیە یان شەیتان... گەر کۆترە یان چەقەڵ... گەر پەپولەیە یان دووپشک، کەسی خۆی هەیە، خێزانی خۆی هەیە، خودای خۆی هەیە کە حەشریدەکات. ئێمە دەبێت بە هێمنی بیریکەینەوە، ئەوسا بڕیار بدەین. تا خۆمان تووشی گوناە نەکەین...». کە ئەو هەراو هوریایە نیشتەوە، کە خەڵکی بڵاوەیان لێکرد، ئەو بە هێمنی بە ژنەکەی گووت: «بیحەوێنەوە، بیخەوێنە، نانی بدەرێ، جلی پاکی بدەرێ... ئینجا دەربارەی حکایەتی خۆی پرسیاری لێبکە».

لە نزیکی ئێوارێدا، مەعسوم، نانی خواردبوو، جلی نوێی لەبەرکردبوو، پشوویدابوو، هەموو حکایەتی خۆشی بۆ ئەو ژنە چکۆلەیە گێڕابووەوە کە بەدەم مەشکە ژەنین، چێشت لێنان، تەشیرپستنەوە گوێی لێ گرتبوو و سەری بۆ لەقاندبوو و لە هەموو وچانێکیشدا بە ڕەحم و مەحەبەتێکی زۆرەوە پێیگووتبوو: «جا بەقوربانت بم، بۆ واتکرد؟»... «جا بەقوربانت بم، بۆ ڕۆیشتیت؟»... «جا بەقوربانت بم، بۆ قبوڵت کرد؟». مەعسوم کە چیرۆکی خۆی گێڕابووەوە گوتبووی: «من کەسم نییە، لە هەرێمێکی دوورەوە هاتووم، نە دایکم هەیە، نە باوک، نە برا نە خزم، ناشمەوێت جارێکی تر بگەڕێمەوە بۆ ئەو هەرێمە».

مەلا کە حکایەتی مەعسوم و چیرۆکی ژیانی عاشقانی لەو جەنگەڵەدا بیست، سەرسام و دەستەپاچە شەوێکی درێژ تا بەیانی نەخەوت... دەیزانی کە ئەگەر خەڵکی گوند بە چیرۆکی ئەم کچە بزانن لەوانەیە بەزیندوێتی بیسووتێنن، دەشیزانی بێدەنگی لە گوناهێکی وا چ خەتایەکی ترسناک و چ

بێئیمانییەکی گەورەیە. بۆ ڕۆژی دوایی بۆئەوەی ویژدانی خۆی لە عاقیبەتی ترسناکی ئەم کچە بپارێزێت، هەموو پیاوانی گوندی کۆکردەوە و گووتی: «هەموو دەزانن ئافرەتێکی غەریب و سەرلێشێواو ڕوویکردۆتە ئەم گوندە، گومانی تیانییە خۆی ئافرەتێکی گوناهبارە... بەڵام ئەگەر گوێ لە من دەگرن بەڕەوای نازانم شتی خراپی دەرهەق بکەن، بەڕەواشی نازانم لە ناو خۆماندا گلیبدەینەوە، بەڕەواشی نازانم لێی بگەڕێین بەرەڵا بێت و گوناە و خراپە بکات و ئوباڵی بچێتە گەردنی ئێمە... لەبەرئەوە دەمەوێت هەمووتان لەگەڵ مندا بیر لە چارەیەک بکەنەوە». دوای چەندین سەعات قسەکردن، تاکە چارەیەک کە هەمووان پەسەندیانکرد، ئەو پێشنیارە بوو کە کوڕێکی بچکۆلانەی ڕیشنی ئیماندار پێشکەشیکرد، کوڕێکی منداڵکار و نیگانەگۆڕ و چاو بێئەفسون بوو، پەیوەندییەکی سەیری بە چەندەها پیاوی دیکەوە هەبوو، کە ئەوانیش بە تێکڕایی پیاوانی بچکۆلانە و ڕیشن و ئیمانداربوون. ئەو شەوە کوڕەکە دەرفەتێکی باشی بۆ ڕەخسابوو قسەبکات، دەرفەتێک لەمێژبوو چاوەڕوانیدەکرد، دوای وتارێکی درێژ سەبارەت بە ئیمان و ئەخلاق و بەخشندەیی دین و دینداران، هاتە سەر بەسەرهاتی ئەو کچە و گووتی: «ئەم کیژە خراپەکارانە، ئێستا وەکو جاران بەرەڵاناکرێن، ئێستا بواریان پێنادرێت، هەروا سووک و سانا شارە و شار و گوندا و گوند بکەن، ئەگەر بەرەڵاییکەین، بێگومان... بەڵێ، بێگومان و سەد جاریش بێگومان، هەر دەچێتەوە سەر پیشە کۆنەکەی خۆی و هەر ڕێگای... بەڵێ، هەر ڕێگای، گومڕایی دەگرێت، بۆیە بەرەڵاکردنی گوناهێکە و دەکەوێتە ئەستۆمان، ئەمڕۆ لەشکرێکی گەورە لە پیاوانی خواناس و ژنانی ئیماندار باوەش بۆ ئەم خەتاکارانە دەکەنەوە، کە دەیانەوێت بێنە سەر ڕێگای ڕاست و تۆبەبکەن. من دەتوانم، بەڵێ من دەتوانم، لەڕێگای ئەو خەڵکە خوداناسانەوە، داڵدە و پشت و پەنایەکی قایم بۆ ئەم زەعیفەیە بدۆزمەوە... بە مەرجێ تا دەیگەیەنمە شوێنی ئەمینی خۆی، دوو خانمم لەگەڵدا بنێرن، بەڵێ

دوو، چونکە نامەوێت لەگەڵ ژنێکدا کە تەنهایە و بە شەهوەتیشە، بەڵێ شەهوەت... زۆر بمێنمەوە و شەیتان لەبەینماندا بەزمێ سازبکات».

ئەو چەند ڕۆژەی مەعسوم لەو گوندەدا مایەوە بەردەوام لە پەنجەرەی ژوورەکەی خۆیەوە چاوەدێری ڕێگاکانی دەکرد و خۆی لەو باڵندانە دەدزییەوە کە بە پۆل لەسەر گوێسەبانە و لە ناو حەوشەکاندا دەنیشتنەوە، کە دواجاریش لە ماشێنێکی شکاودا گەیشتە شار، گەنجە پارسا و خوداناسەکە پێیگووت: «لێرەوە ئیتر پێویستناکات لە هیچ کەسێ بترسیت، ئیدی تۆ لەبەردەست کەسانێکی ئەمین و خوداناسدایت». یەکەم ڕۆژی لە شار، لە ماڵی مەلایەکی لاواز و بێحەوسەڵەدا مایەوە کە بەردەوام بە دەموچاوێکی ماندوو و ترشاوەوە بیریدەکردەوە و دەیگووت: «چی لەم ئافرەتە بکەین، چی؟... نازانم؟... من وای بە چاک دەزانم بیدەینە دەست دەوڵەت». کوڕە ڕیشنەکە کە لە قسەکانی ئەو مەلایە نائومێدبوو بوو، هەرزوو مەعسومی گواستەوە بۆ ماڵێکی دیکە و بۆ بەردەم مەلایەکی تر کە بەپێچەوانەی مەلای پێشووەوە، پیاوێکی ئارام و لەسەرخۆ بوو، زووزوو فووی لە سووتوی جگەرەکەی دەکرد و دەستی بە برۆیدا دەهێنا و دەیگووت: «کوڕم، خەمت نەبێت، تۆ خێرێکی گەورەت بۆ خۆت نوسیوە، من خۆم دواتر لەگەڵ مەلا کەوسەری باغەواندا قسەدەکەم، مەلا کەوسەر لە هەر مەلایەکی تری ئەم شارە زیاتر بە سەروکاری کاروباری تۆبەوە دەچێت... لەم ڕووەوە کەس وەکو ئەو نییە... کەس».

مەعسومە کە لە شەوانی قوتابخانەکەدا سەربوردی خۆی بۆ دەگێڕامەوە، هەمیشە لەو جێگایەدا ووچانێکی دەگرت و دەیگووت: «خەندانی خوشکم، خەندانی چکۆلە، زۆری نەبرد من خۆم لە دنیای گروهی ژنە دەفڕەنەکانی شاردا دۆزییەوە، ئەو دنیایەی کە بۆ ماوەیەکی کورت تیایدا میوان بووم... چونکە ئەوان گوناهبارێکی وەکو منیان بۆ زیکر و خەتم و دۆعاکردن نەدەویست، بەڵکو من بە نەزانی خۆم، نهێنی دنیایەکم بۆ ئاشکرادەکردن،

ئەگەر نەشبایە ئەوان دەبووایە دروستیبکەن».

مەعسومە کە ترسەکان وازیان لێنەدەهێنا، بۆئەوەی پشت و پەنایەک دژ بەو هەموو لەرزین و داچڵەکاندنە گەورانەی ناو ڕۆحی خۆی بدۆزێتەوە، دەگەیشتە بەردەم هەر خانمێک و هەر مەلایەک دەکەوتە گێڕانەوەی هەموو بەسەرهاتی خۆی.

مەلا کەوسەری باغەوان کە یەکەمجار گوێی لە چیرۆکی ئەو کچە بوو، حەپەسان و سەراسیمەبوون و تێنەگەیشتنێکی لەناکاو باڵی بەسەر ڕۆحیدا گرت. چۆن دەشێت دەیەها ژن و پیاو بێ هیچ شەرع و هیچ پەیوەندییەکی ئاینی لەم سەر زەوییەدا بژین و کەسیش پێیان نەزانێت؟ ئەو چەندین جار چیرۆکی ئەو دارستانەی بە مەعسوم گێڕایەوە، تا وایلێهات مەعسوم جار دوای جار بە ڕۆحێکی ماندووتر و هەستێکی ترسناکتر و پەشیمانترەوە باسی ئەو جەنگەڵەی بۆ دەکرد. مەلا کەوسەر کە پیاوێک بوو شەیدای بینینی هێزی ئیمانداران، شەیدای بەشداریکردن بوو لە فیستیڤاڵ و کۆبوونەوە ئاینییە گەورەکاندا، لەزەتێکی گەورەی دەبینی، کاتێک بڕوادارانی دەبینی بە کۆمەڵی گەورە گەورە کۆدەبنەوە، هەمووان پێکەوە ناوی خودا دەڵێنەوە، دەنگیان تا عەرشە دوورەکان بڵند دەبێتەوە، پێکەوە داوای کۆمەک و پشتیوانی یەزدان دەکەن. ئەو هەموو شەوێ خەونی بەو دەریا گەورەیەی مرۆڤەوە دەبینی کە ئاڵا سەوزەکانیان، شمشێرەکانیان، دەفەکانیان هەموو هاوکات و هاوئاهەنگ شەپۆلێکی گەورە دروستدەکەن و بە زەویدا دەکشێن... کە چیرۆکی مەعسومە و ئەو جەنگەڵەشی بیست، لە قووڵایی ڕۆحی خۆیدا دەیگووت: «هێزێکی گەورە نەبێت، ئەم گوناهانە ناسڕێتەوە... هێزێک وەکو یەک دەست، یەک ڕۆح، یەک چاو کاربکات». خۆشی دەهاتە پێش چاو، کاتێ لەبەر مینبەرەکاندا دەوەستێت و ئەو ڕۆحە گەورەیە جۆشدەدات، کاتێ ئەو هێزە بە پاڕانەوە

و دەنگ و وتارەکانی خۆی دەجولێنێت، هێزێک تا چاوبڕکات مرۆڤ و ئاڵا و شمشێرە... تا چاوبڕکات هاوار و پاڕانەوە و ترسە. ئەو لەو وەرزانەی دواییدا، ئاگاداری زۆر کردە و تۆڵەی خواناسانە بوو، پەیوەندی بە زۆر لەو گەنجانەوە هەبوو کە دەیانویست بە دەمی شمشێر ئەخلاق ڕاستبکەنەوە، خۆی پێشڕەوایەتی زۆر کۆبوونەوەی گەورە و زۆر چالاکی ئەهلی تەقوای کردبوو، بەلام تا ئەمڕۆ هیچ شتێ وەکو ئەو حکایەتە نەیترساندبوو.

مەلا کەوسەر ئەو شەوە مەعسومەی دەهێنا، بە هێمنی لەسەر کورسییەک بەرامبەری دادەنیشت و لێی دەپرسی: «کچم تۆ دەزانیت، تۆ چەند گوناهباریت؟» مەعسومە بە هێمنی سەری دەلەقاند و دەیگووت: «دەزانم». پێیدەگووت: «دەزانیت ڕێگای پاکبوونەوە چەندە قورسە؟». مەعسومە، بە نوزەیەکی پڕ لە شەرم و ترسەوە دەیگووت: «دەزانم». دەیگووت: «دەزانیت، لەوانەیە ساڵەهای ساڵ بخایەنێت تا تۆ دەبیتەوە بە مرۆڤێکی ئیماندار، لەوانەیە هەزارەها هەزار شەوی پێبچێت تا تۆ پاکدەبیتەوە؟»، مەعسومە سەری دەلەقاند و دەیگووت: «دەزانم». دەیگووت: «دەزانیت بۆئەوەی پاکببیتەوە دەبێت قوربانی گەورە بدەیت؟». «دەزانم». «دەزانیت، دەبێت ئەم چیرۆکەی تۆ بەشاردراوەیی نەمێنێتەوە، دەبێت ئەم بەسەرهاتە بۆ جیهان ئاشکرا بکرێت؟» «دەزانم». «دەزانیت کە پێویستە لەگەڵ مندا ئەم وڵاتە بگەڕێیت، لەگەڵ مندا، گەشتێکی دوور و درێژ بکەیت، ڕاستییەکان بگێڕیتەوە، حکایەتی ئەو جەنگەڵە بگێڕیتەوە؟»، دەیگووت: «دەزانم». «لە هیچی تر ناترسیت؟» «نەء، باوە کەوسەر، لە هیچ ناترسم». «لە قووڵایی ڕوحیشەوە، تۆبەدەکەیت و من هەرچۆنێک ڕێنومایمکردیت، بەدوامدا دێیت؟». «بەڵێ، باوە کەوسەر، هەمیشە بەدواتدا دێم... هەمیشە». «کەواتە ئێستا بڕۆ و بخەوە، بڕۆ و بە قووڵی و بە هێمنی بخەوە، دۆعابکە کە خودا ئارامی و دڵنیاییەکی قووڵت پێیبەخشێت، خۆت ئامادەکە بۆ ئەو ڕۆژانەی کە دادێن».

ئەو شەوە دەیەها شەوگاری دیکەش مەعسوم نەخەوت، هەرگیز تێنەگەیشت چ ترس و ئیفلیجییەک بەو ڕێگا سەیرەدا بردی، تێنەگەیشت چ هێزێک وا بە ئاسانی کڕنووشی پێبرد.

شەوی دواتر، مەلا کەوسەر، یەکەمین کۆبوونەوەی بچکۆلانەی خۆی سازکرد، ئەو شەوە ژمارەیەکی گەورەی لە مەلاکانی شار کۆکردەوە و هەر خۆی مەعسومی بە لەچکێکەوە هێنا و لە ناوەڕاستیاندا وەستا و وەکو هەمیشە چاویلکەکانی گۆڕیی و بە دەنگێکی زوڵاڵ گووتی: «گوێبگرن، گوێ لەم بەسەرهاتە بگرن، بزانن، ئێمە لە چ ڕۆژگارێکی پڕ شورەیی و شەرمەزاریدا دەژین. بزانن، ئێمە کە لێرەدا ئاسودە دانیشتوین، لە تەنیشتمانەوە چ وەحشستانێک هەستاوەتە سەرپێ، گوێبگرن و ئەگەر لەشتان لەشی لەخوانەترسێک نییە با موچڕکەی ترس و شەرمەزاری پیانەیەت، لەکاتێکدا ئێمە چەند وەرزە دەمانەوێت ئەم شارە بکەینە گوڵستانی ئیمان، دەمانەوێت بیکەینە ڕەوزەی پاکی، ئەوەتا بێئیمانان لە ناوماندان، هەر پارچە عەردێ لەولاتر، هەرێمێک دوورتر، زەویەکی تر و حەشارگەیەکی تریان کردۆتە نیشتەجێ... وای لە ئێمە و لە سزای خودا، وای لە ئێمە کە هێندە عەبدی پچوکین و چاومان و ڕۆحمان هێندە لە دیتنی خراپەدا لاواز و کز و نابینایە... وەرن خۆتان گوێ لەم مەخلوقە بچکۆلانە خەتاکارە بگرن با باسی ئەو خەتایانەتان بۆ بکات، با باسی ئەو گوناهە ترسناکانەتان بۆ بکات».

مەعسومە سەری دادەخست و لە ناوەڕاستی بازنەیەکی سپیدا دەوەستا، بە دەنگێکی شەرمن و ترساوەوە دەکەوتە گێڕانەوەی هەموو چیرۆکەکە، کاتێ باسی هەڵهاتنی کیژان و کوڕانی دەکرد بۆ ناو ئەو هەڵدێرە، کاتێ باسی منداڵە زۆڵ و بێچارەنوسەکانی دەکرد، کاتێ قسەی لەو وەحشەت و تەنهایی و خەمە دەکرد کە لەوێ بەرقەرارە، موچڕکێکی ترسناک بە لەشی هەموو پیاوان و ئیمانداراندا دەهات، بەرلەوەی ئەویش هەموو

چیرۆکەکە تەواویکات، فرمێسکەکان، لێوگەستنەکان، تەزووە ساردەکان، دەست لەرزینەکان لەسەر لەش و سیمای ئامادەبووان دەبینران... مەلاکان هەموو بە نائومێدییەوە هاواریاندەکرد: «مەدەد ئەی باریی گەورە، مەدەد ئەی خالیقی جوانی و درێوی، ئەی دانەری چاکە و خراپە». کەس باوەڕی نەدەکرد، هەموو بە دەنگی بەرز لە خودا دەپاڕانەوە و دەیانگووت: «ئاه، مرۆڤ کە عەبدێکی یاخی و بێمانایە، ئاه کە مرۆڤ جانەوەرێکی درێوە». «مەلا کەوسەری باغەوان» دووبارە دەچووە بەردەمی هاورێکانی و دەیگووت: «ئێوە هەموو دەزانن، هیچ شتێک لە ڕاوکردنی شەیتان سەختتر نییە... ترس و پەشیمانی و ئیفلیجبوون، هەموویان دەردی کوشندەی ڕاوکەرەکانن... لە مێژە ئێمە شەیتان ڕاودەکەین، لە مێژە لە ناو لەش و ڕۆح و ویژدانی ئادەمییەکان و ڕەعیەتەکانماندا شوێنپێکانی هەڵدەگرین، لە مێژە دەمانەوێت دنیا پڕکەین لە داو و تەڵەی ئەوتۆ کە لەگەڵ دەرکەوتنیدا گەمارۆی بدەین، پەلبەستیبکەین... بەڵام شەیتان نیچیرێکی درێو و سەختە، لە ناو گیان و شەهوەتەکانی مرۆڤدا خۆی دەشارێتەوە. لە ناو ڕۆح و بیرکردنەوەی مرۆڤدا سەنگەر دادەکوتێت. ئەوەتا، لەو ساتەدا کە ئێمە پێمان وایە شەیتانمان پەلبەستکردوە، ئەو بە ئازادی لە دارستان و کێوەکاندا مرۆڤەکانی بەرەو دامەزراندنی درێوترین نیشتەجێ و دروستکردنی خراپترین مۆڵگە ڕاکێشاوە... دەبێت هەموو دایک و باوکانی ئەم وڵاتە ئەم چیرۆکەیان گوێلێبێت، پێویستە هەموو ئەو پیاو و خێزانانەی ئافرەتیان هەڵگیراوە و کچیان ڕەدووکەوتووە و ئابڕوویان لکەدارکراوە، ئەم چیرۆکە ببیستن، دەبێت گوند بە گوند کەژاوەی ئیمان ئەم وڵاتە بگەڕێت و بڕواداران کۆبکاتەوە و بەرەو ئەو جەنگەڵە بکەونەڕێ، ڕاوکردنی شەیتان پێویستی بە هێزی ڕۆح و هێزی دەرونی هەمووومان هەیە... دەبێت لەمڕۆوە جیهادێکی گەورە بۆ ڕاوکردنی ئەو جانەوەرە تاریکە ڕابگەیەنین... جیهاد بۆ ڕاوکردنی شەیتان، ئەو شەیتانەی لەڕاستیدا لە دەرونی مرۆڤدایە و هەر

ئەویشە پاڵی پێوەدەنێت بۆ دروستکردنی لانکی بەد و مۆڵگەی دزێوی».

مەعسومە دەیگووت: «لەو شەوەدا کە من لە دارستان هاتمەدەرێ، نەمدەزانی دەکەومە ناو جەنگێکی وەها خوێناوییەوە لەگەڵ شەیتاندا، نەمدەزانی دەبم بە پێشەنگی کەژاوەیەک هەموو وڵات دەگەڕێت و لە هەموو جێگایەک دەیەها خەڵکی تووڕە، کە خۆیان بۆ جەنگ لەگەڵ شەیتاندا تەیار کردبوو، پەیوەندیم پێوە دەکەن». لەو شەوەی کە «مەلا کەوسەری باغەوان»، ڕاوکردنی شەیتانی ڕاگەیاند، خوشکە دەفبەدەستەکان مەعسومەیان برد و دەستێ جلی سەرتاپا سپییان لەبەرکرد و پێیانگووت: «ئەمشەو یەکەمین شەوی پاکبوونەوەی تۆیە...». ئەو لەو شەوەوە تا پاش کۆتاییهاتنی هەموو شتێکیش شوێنێک و نیشتەجێیەک و ماڵێکی نەبوو... لەو ڕۆژەوە خوشکە دەفژەنەکان دەیانبردە فیستیڤاڵ و زیکر و نوێژە گەورەکانی هەینی، لەو ڕۆژەوە بە دەستێ جلی سەرتاپا سپییەوە لەسەر کورسیەک دادەنیشت و بە سەرپۆشێکی شۆڕ و ئاودامانەوە لەبەر مینبەرەکاندا دەردەکەوت، دەبایە لەوێ بە هێمنی، بە دەنگێکی کز، دەنگی گوناهبارێک کە بۆ تۆبە و پاکبوونەوە دەگەڕێت، بەسەرهاتی خۆی بگێڕێتەوە، باسی ئەو هەڵدێرە بکات کە ژنان و پیاوان تیایدا بە ئازادی پێکەوەدەژین و دەخەون، باسی ئەو دارستانە بکات کە گەنجانی یاخی و عاشقانی هەڵهاتوو ڕووی تێدەکەن، زەوییەک کە دەشێت لە داهاتوودا ببێتە شارێک، شارێک لە داهاتوودا ببێتە هەرێمێک، هەرێمێک کە دەشێت یاساکانی ببێتە یاسای هەموو وڵات. لەو کۆبوونەوە گەورانەدا ترسی دایک و باوکان چەندین جار گەورەتر دەبوو، ترسی لەخواترسان لە پاشەڕۆژ دەگەیشتە سنوورێکی سەیر. ئەوانەی کچ و خوشک و کەسیان ونبووبوو لەبەردەم مینبەرەکاندا سەرەیان دەگرت و لە مەعسومەیان دەپرسی، ئەوانەشی دەیانویست بچنە ڕیزی کەژاوەی ئیمان و گەشتی ڕاوکردنی شەیتان دەستپێبکەن لە دەفتەرێکی گەورەدا ناوی خۆیان دەنوسی، مەعسومە بە

درێژایـی ئـەو ئاهەنـگ و فیسـتیڤاڵە گەورانـە بـە خـۆی و چارشـێوەکەیەوە، بەبێجووڵـە لەسـەر کورسـییەکەی دادەنیشـت و وەکو پەیکەرێـک نەدەجوڵایەوە، بـەڵام لـە ژێـر چارشـێوەکەوە بـەردەوام سـەیری ئـەو باڵندانـەی دەکـرد کـە پتـر لـە مرۆڤـەکان لێیـانَ دەترسـا. ئەمـڕۆ لـە مزگەوتێـک قسـەیدەکرد و بەیانـی لـە مزگەوتێکـی دی، مـەلا کەوسـەری باغـەوان لـە هەمووشـوێنێک لەگەڵیـدا بوو، خـۆی کۆبوونەوەکانـی دەکـردەوە، خـۆی خوتبەکانـی هەینـی دادەمەزراند، خـۆی دەیگـووت کـە سـەفەرێکی نوێمـان بەدەسـتەوەیە، سـەفەرێک کـە تەنها ئیمانـداره ڕاسـتەقینەکان دەبێـت تیـا بەشـداربیکەن، ڕاوێکـی گەورەمـان بەدەسـتەوەیە کـە ئیـدی بـە نومێدیـن شـەیتان لـەم زەوییـە دەرکەیـن، ئـەم هەرێمانـە لـە گوناهەکانـی پاکبکەینـەوە. «ڕاوکردنـی شـەیتان»، وشـەیەک بـوو سـیحرێکی سـەیری لـە دەرونـی ئیماندارەکانـدا جێدەهێشـت، کـە دەسـتە بـە دەسـتە نـاوی خۆیـان دەنوسـی... مـەلا کەوسـەر دەیگـووت: «بیریکەنـەوە، گـەر شـتەکان بەمجـۆره بـڕوات، دەگەیـن بـە کـوێ؟ بیریکەنـەوە گـەر ئـەو کێـوە عاسـییانە ببنـە مەڵبەنـدی خراپـەکاران، حاڵمـان بـە چ ڕۆژێـک دەگات، بیریکەنـەوە لـەو ڕۆژەی کچەکانتـان هەڵدێـن و پشتیشـیان بـە حەشـارگەیەکی گەوره قایمە، لەو ڕۆژەی لەشـی ژن و خوشـک و دایکەکانتان یاخود شـەهوەتی کـوڕ بـرا و باوکانتـان هەڵدەچێـت و ئیـدی سـنوورێک و بەربەسـتێک نابێـت بیگرێتـەوە... بیریکەنـەوە گـەر هەمـوو خەتاکارێـک دڵنیابێـت دەتوانێـت گوناه و خراپـە بـکات و لەهەمـان کاتیشـدا بـە ئاسـودەیی بژیـی، چـی ڕوودەدات؟ بیریکەنـەوە، چـۆن یاساکانی ئـەم دونیایـە هەمـووی لـە یەکدی دەپچڕێـت. نـا، نابێـت لـەم زەویـەدا عاشـقان و خودانەناسـان و خەیاڵبـازان و شەرعنەناسـان جێگایەکیـان هەبێـت. درزێـک لـە دیـواری ئیمانـی ئـەم وڵاتـەدا، دەبێتـە درز لـە ئیمانـی تاکەتاکـەی ئێمـەدا. هەمـوو گەردێـک لەسـەر شـەرەفی ئـەم عـەردە، گەردە لەسـەر شـەرەفی هەموومـان. هەمـوو ئافرەتێکـی زینـاکار، زینـا دەرهەق بـە هەموومـان دەکات، هەمـوو پیاوێکـی حەرامـزادە کاتـێ لەگـەڵ کچێکـی

ئێرەدا دەخەوێت، وەکو ئەوە وایە لەگەڵ هەموو کچ و ژنەکانی ئەم وڵاتەدا خەوتبێت، هیچ شتێ وەکو پزیسکی گوناه خێرا بڵێسە ناسێنێت... هیچ شتێ وەکو شەیتان توانای یاریکردنی نییە، شەهوەت و شەیتان ئەو دوو یاریبازەن کە دەبێت پەلبەستیانبکەین و لە دەرون و لە دنیا و لە دەوروبەرماندا ڕاویانبکەین، بەرەو ڕاو... بەرەو ڕاو... ئەی خوداناسان بەرەو ڕاو».

هەر ڕۆژێک «مەعسومەی گوناهبار» قسەیبکردایە، دەفژەنەکان ڕۆژێک پێشتر لە پرسەکانی ژنان و گۆڕستانەکاندا، پیاوان لە کاتی نوێژی بەیانیدا، گەنجان و قوتابیانی ئیماندار لە قوتابخانەکاندا هەواڵیان بڵاودەکردەوە... پێشتر هەموو شار ناوی مزگەوت و شەقام و گەڕەکەکەی دەزانی، بڵندگۆی مزگەوتەکان جاڕیاندەدا، بەر لە سەرکەوتنی مەعسومیش بۆسەر بڵندگۆکان، حەشاماتەکان شەپۆلیاندەدا، هەزارەها هەزار گوێگر، ڕادەوەستان و بە ملکەچییەوە گوێیان لە وتارە سەیر و ئاگرینەکانی باوە کەوسەر دەگرت، کە هێدی هێدی دەبووە ڕابەرێکی ڕۆحی گەورە و ڕاستەقینە. هەرکات قسەو وتارەکانی ئەو تەواو دەبوو، هەمووان تەزوویەکی گەرمی توڕەیی و پەشیمانی بە جەستەیاندا ڕادەبورد، هەمووان هەستیاندەکرد دەبێت شتێک بکرێت... سەدەها کەس، ناوی خۆیان لە کەژاوەی ئیماندا دەنوسی، دوای نوێژ و خوتبەش خانمە دەفبەدەستەکان لە زیکرێکی بەشکۆدا دەڕژانە سەر شەقامەکان، بە گەڕەکەکاندا دەڕۆیشتن و شار یەکپارچە دەهاتە جۆش و خرۆش.

ڕۆژێکیش مەلا کەوسەر و خوشکە دەفبەدەستەکان بڕیاریاندا ئەم کەرنەڤالە ئاینییە گەورانە بگوێزنەوە بۆ دەرەوەی شار، گوند بە گوند بڕۆن و ئیمانداران بەرەو ئەو جەنگەڵە بخەنەڕێ... لەپێشی ئەو کەژاوەیەشدا، هەمیشە باوە کەوسەر و مەعسومە لە ماشێنێکی نوێدا دەڕۆیشتن، کچان و کوڕانی گەنج و پیاوان و خانمانی پیریش بەدوایاندا. هەموانیش لە قووڵایی

ڕۆحیاندا ئەو بانگەوازە سیحراوییەی ڕاوکردنی شەیتان دەنگیدەدایەوە... هەمیشە تارمایی شەیتانێکی قژدرێژ و درێو لەپێشدەمیاندا بوو، وەهمی مەخلوقێکی شێواو کە دەتوانێت لە پێستی ئادەمیزاد و لە ڕەنگی مرۆڤە ئاساییەکاندا دەرکەوێت، ڕۆحیانی گەمارۆدابوو... شەوانێکی دوور و درێژ لەسەر ڕێگاکان دەمانەوە، لە قەراغ شەقامەکاندا دەواریان هەڵدەدا، لە ژێر ئەستێرە و شەو و کزە ساردەکانی پاییز و نمەبارانە لەناکاوەکاندا دادەنیشتن، نوێژیاندەکرد و دۆعایان دەخوێند. مەعسوم لەو شەوانەشدا ترس لە باڵندەکان نەیدەهێشت بحەوێتەوە، مەلا کەوسەر پێیدەگووت: «ئەوەی تۆ پێیدەڵێیت باڵندە، خودی شەیتان خۆیەتی... شەیتانە و لە شێوەی باڵندەدا دەرکەوتۆتەوە، شەیتانە و سیمایەکی نائاسایی وەرگرتووە... ئەم ترسەی تۆ، ترسێکە بەرەو پاکبوونەوەت دەبات».

مەعسومە دواتر دەیگووت: «کە گەیشتینە جیهانی گوندەکان، کە ئەو پیاوانەم بینی بە خۆیان و چەکەکانیانەوە دوامانکەوتن، کە ئەو ژنانەم بینی دەیانگووت: «دەبێت ئەو دارستانە بسوتێت» زانیم ئەوە منم دەبمە مایەی وێرانکردنی ئەو دنیایە و ئەوە منم ئەم جەنگە دەخەمەوە».

ساڵانێکی دوور و درێژ، من و فەتانەی غەمگین ویستمان مەعسوم لەو ڕاستییە تێبگات کە ئەویش وەکو هەر یەکێکی دیکە دەبایە لەسەر ئەو نەخشە ترسناک و سەیرانە ڕۆڵێکی هەبایە، دەبایە چارەنوسەکان بەجۆرێک لە جۆرەکان ئەو وازییەیان پێبسپاردایە... بەڵام ئەو هەرگیز لەو پەشیمانییە ڕزگاری نەبوو، ئەو پێیوابوو، مردنی پەروانە لە ئەستۆی ئەوە، هەر ئەوەش وای لە زەینەبی کوێستانی کرد، هەرگیز وەکو تۆبەکارێکی ڕاستەقینە و باوەڕپێکراو تەماشای نەکات...من ئەمڕۆ دوای ئەو هەموو ساڵە، دوای مردنی مەعسوم، دوای کۆچی دوایی مەلا کەوسەری باغەوان، کاتێ ئەم چیرۆکە دەنوسمەوە، دەتوانم بە دڵنیاییەوە بڵێم، کە ئەو لە لەدایکبوونییەوە تا مردن کچێکی بێگوناه بوو.

# ١٨

دوای ڕاکردنی مەعسوم، ئێوارەیەک سیامەندی باڵندەش هەموو شتەکانی پێچایەوە و بێئەوەی ماڵئاوایی لە کەس بکات جەنگەڵی بەجێهێشت... ئیدی کەسیش دواتر، هەواڵێکی ڕاستەقینەی دەربارەی چارەنوسی نەبیست. ساڵانێک درەنگتر کە نەسرەدینی بۆنخۆش بە زیندوویی لە جەنگ گەڕایەوە، سێ چیرۆکی جیاوازی سەبارەت بەو پیاوە کێوییە لەبەردەستدابوو، بەڵام دەیگووت: «هیچ کەس نازنێت، کامە لەو چیرۆکانە، بەسەرهاتی ڕاستەقینەی مردنی ئەون». چیرۆکی یەکەم، دەیگووت: سیامەند دوای هاتنە دەرەوەی لەو هەڵدێرە، دەست کۆمەڵێ دەروێشی گەڕۆک کەوتووە، کە لە تاقیکردنەوەیەکی سەیردا، سەریانبڕیوە و دواتر چەند ویستوویانە زیندوویبکەنەوە، بۆیان زیندوونەکراوەتەوە. چیرۆکی دووەمیش، دەڵێت: سیامەند لە سەفەرێکی درێژدا بەرەو گوندەکانی باشوور ڕۆیشتووە و لەوێ لە ناوچەیەکدا کەوتۆتە ناو شاڵاوێکی پاکسازی دەوڵەتەوە کە ئەو کات بە ڕەشبگیری گەورە، هەزارەها هەزار جووتیاری ئەو هەرێمانەیان ڕووەو بیابانەکانی باشوور ڕاپێچدەکرد و لە ژێر لمەکانەوە بەزیندوویی دەیانناشتن. چیرۆکی سێیەمیش، دەگێڕێتەوە: سیامەند لە کاتی پەڕینەوەدا لەسەر سنوور کەوتۆتە ناو کێڵگەیەکی گەورەی مینەوە و تەقینەوەی زنجیرەیەکی

درێژ لە فالمارا کوشندەکان، پارچەپارچەیانکردوە، دواتریش هیچ کەس نەیتوانیوە پارچەکانی لەو کێڵگە دوور و درێژەدا کۆبکاتەوە و بینێژێت.

میدیای غەمگین، ماوەیەک دوای ڕۆیشتنی سیامەند، لە دەفتەرەکەیدا نوسیوێتی: «ونبوونی مەعسوم و ڕۆیشتنی سیامەندی باڵندە، سەرەتای دەرکەوتنی نارێکییە گەورەکان بوون». نەسرەدینی بۆنخۆش ئەمڕۆ، چەند جارێک ئەو دێڕە دەخوێنێتەوە و دەڵێت: «نارێکییە گەورەکان... هەم هەم... نارێکییە گەورەکان، ڕاستە، ئەو قسەیە ڕاستی زۆر تیایە، بەڵام بە شێوەیەکی وردتر بیربکەینەوە تێدەگەین کە نارێکییەکان بەر لەوانیش هەر هەبوون... نارێکییەکان لە بنەڕەتدا هەر هەن، لە هەموو شوێنێکدا هەن، بەڵام زۆرجار ترس، لاوازی، تێنەگەیشتن و بێئیرادەیی مرۆڤ زیاتر بەرجەستەیاندەکەن و وادەکات مرۆڤ وا تێیانبگات کە کەوتۆتە ناو دەریایەکی نارێکەوە، لەکاتێکدا وانییە... سەیرکە، ئەمڕۆ دوای بەسەرچوونی ئەو هەموو ساڵەش، دوای ونبوونی ئەو عەرد و ئەو زەمانەش، جیهان هەر وەکو خۆیەتی، ڕێکی و نارێکیشی خەیاڵ و خولیای مرۆڤەکان خۆیانە».

هەرچۆنێک بێت پەروانە لە سەرەتاوە هەستێکی سەیری بە نارێکی ئەو دنیایە لا دروستبووبوو... بەڵام لەگەڵ سەرەتای وەرزیی گۆشەگیریی و لەگەڵ ڕۆیشتنی مەعسومەدا، هەستێکی بێڕەحمتر و وەسواسئاسا دەربارەی نارێکی و شپرزەیی و هەڵوەشاندنەوەی دونیا داگیریکردبوو. پەروانە لەو ڕۆژانەدا بێهیوابوو. تێکچوونی هەست و سۆز و تواناکان، تێکەڵاوبوونی عەشق و کینە نیشانەی سەیری ئەو گەڕانەوەیەی دونیای دارستان بوو بەرەو نارێکی، ئەمە لە حاڵێکدا کە گۆڤەند شێتانە لە مەملەکەتە گەشبینەکانی خۆیدا دەسوڕایەوە، وەکو پێغەمبەرەکان دەیگووت: «هونەر هێزێکی سیحراویی تیایە، ئەگەر بتوانین کاری

پێبکەین، دەمانخاتە سەر شەقامەکانی عەشق و تەبایی». ئاشکرایە گۆڤەند لەو ڕۆژانەدا هەمیشە بۆ پێشەوە ڕوانیوێتی، لەکاتێکدا پەروانە، ترسێکی گەورەی لە هەموو شوێنەکان و زەمانەکان هەبوو.

پەروانە کە لە دووریانی کاتەکان و شوێنەکاندا سەری لێشێوابوو، لەسەر بەردێکی گەورە لە ناوەڕاستی دارستاندا، بۆ میدیای نوسیبوو: «میدیای غەمگین... هاوڕێم، من نامەوێت بگەڕێمەوە بۆ دواوە، ناگەڕێمەوە بۆ ئەو شارانەی کە هەتاهەتایە هەر بەو شێوە دەمێننەوە کە هەن، ئەو شارانەی جارێکی تر کەس ناتوانێت دەستکاری نەخشەکانیان بکات، ئەو شارانەی گەر بوومەلەرزەش وێرانیانبکات، دووبارە لەسەر هەمان شێوە و لەسەر هەمان نەخشە دروستدەکرێنەوە، خاوەنماڵەکانیان لە هەمان جێگادا خانوەکانی خۆیان دروستدەکەنەوە، دوکاندارەکان لەسەر هەمان شەقام دوکانی خۆیان بونیاددەنێنەوە، پۆلیسخانەکان دەچنەوە هەمان جێگا، گۆڕستانەکانیش هەر لە شوێنی خۆیان دەبن... میدیا... موسیبەتی گەورە ئەوەیە، ئەو دونیایە تازە شێوەی ئەبەدی خۆی وەرگرتووە... موسیبەتی گەورە ئەوەیە من ناتوانم لەو شارانەدا و لەو دونیایانەدا بژیم کە شێوەی ئەبەدی خۆیان وەرگرتووە... لەوەش موسیبەتتر ئەوەیە ئەم جەنگەڵە، جەنگەڵێکە ناتوانێت شێوەیەکی هەبێت... هەستەکان، خەونەکان، پڕۆژەکان لێرەدا هێدی هێدی شێوەی خۆیان ووندەکەن... عاشقەکان لێرەدا نازانن چی لە عەشق بکەن، مرۆڤەکان نازانن چی لە خەیاڵەکانیان بکەن». پەروانە لەسەر ئەو تاشەبەردە گەورەیە دەینوسی و حەرفەکانی با دەیبردن، میدیای غەمگین چەند بیتوانیبایە خێراتر، ئەو ڕستە سەیرانەی پەروانەی دەخستە سەر دەفتەرەکانی خۆی و دەفتەرەکانیشی دەنا بە سنگییەوە و لە ترسی ئەو ڕەشەبا غەمگین و هەورە تاریکانەی پایز بە جەنگەڵدا ڕایدەکرد، میدیا

ئەو ماوەیە تەنها کاری بووبوو بە گوێگرتن لە دەنگی سروشت و لە دەنگی مەخلوقاتی ئەو نیشتەجێ چکۆلەیە، دەفتەرەکانی پڕبووبوو لە هەزارەها تێبینی ورد و تێپەڕ... یەکەیەکە باسی لە هەموو سەوزایی و دڕکەکان دەکرد، سەعات بە سەعات باسی لە گۆڕانکارییەکانی ئاسمان دەکرد... هەمیشەش ئەو دەفتەرەی وەکو دوا جێگای حەقیقەت دەنا بە سینگییەوە و لە سەعاتەکانی باران و ڕەشەبادا ڕایدەکرد، بەڵام ونبوونی مانگ و هاتنی پەیتا پەیتای هەورەکان، غەمێکی سەیریان دەخستە ناو نوسینەکانی میدیاشەوە، هەمیشەش لە ساتەکانی بێتاقەتیدا دەینوسی: «ئەی مانگ، تۆ لەکوێیت؟».

ئەو ڕۆژانە دارستان بەرەو مەرگ ڕۆیشتبوو، لەناکاو هەموو درەختەکان زەردبووبوون. سەر ڕێگا و ناو ئاو و ژێر کەپر و ناو ژوورەکان پڕبووبوون لە گەڵا، لەبەر ئەو هەموو گەڵایەی کە بە ملیۆنەها لە درەختەکانەوە دەوەرین، هەندێ ئێوارێ کەس کەسی نەدەبینی... بەڵام هەتا لەوپەڕی ساتەکانی گۆشەگیریشدا هەمووان هەستیان بەو خەمە قووڵ و گریانە بەکوڵەی پەروانە دەکرد کە شەوەکانی دارستانی تاریکتر دەکرد. میدیا و کڵپە لەو وەرزەدا وەکو دوو غەریبە مامەڵەیان لەگەڵ یەکتردا دەکرد، کڵپە بێباکانە بەلای میدیادا دەڕۆیشت و تەماشای نەدەکرد، بێباکانە پێیدەخستە ناو گەڵا هەڵوەریوەکانەوە و مۆسیقای نەیەکی غەمگینی لێدەدا، میدیا ڕۆژانە چەندەها سەعات دوور بە دوور گوێی لە مۆسیقاکانی کڵپە دەگرت کە تا دەهات غەمگینتر و غەمگینتر دەبوو... ئەو، سەرلێشێوان و تەنهایی خۆی و عاشقەکانی دیکەشی دەبینی. مەهدی گوڵەباخی دەبینی، شەو و ڕۆژ گەڵا وشکەکانی لادەبرد و لە ناو درەختەکاندا بێهودە بۆ گوڵ دەگەڕا، لە هەموو شوێنێکیشدا بە سیمایەکی شپرزە و نەخۆشەوە دەردەکەوت و دەیپرسی: «گوڵەکانتان

نەبینیوە؟». تاهیری تووتی دەبینی، هەموو ئێوارەیێیەک لەسەر بەردێکی گەورەی قەراغ چۆمەکەدا دەردەکەوت، بەڵام وەکو جاران نەیدەتوانی بەردەوام لاسایی دەنگی باڵندە و جانەوەرەکان بکاتەوە، لەوێ بە هێمنی لەسەر ئەو بەردە دادەنیشت و لە جەنگەڵ و ئێوارێ و خەزانە زەردەکانی دونیا وردەبووەوە، هەندێ جار، وەکو قەلەڕەشکەیەک دەیقاغاند، یاخود بۆ چەند چرکەیەک وەکو کوکوختی دەیخوێند و ئیدی بۆ ماوەیەکی درێژ کپ و هێمن دەکەوتەوە ناو بەحری خەیاڵاتە بێبنەکان. ئەو ڕۆژانە پاشماوەی دوا کۆمەڵە پەیکەری عەشقیش بە شکاوی و تورڕدراوی لە هەموو کونج و کەلێنێکی دارستاندا دەبینرا. منداڵەکان پەیکەری بێبازاڕی ئەو عەشقەیان دەگرت و هەڵیاندەدایە بن ئاوەکان. لەسەر زیخی کەنار چۆمەکەدا فڕێیاندەدا. پەیکەرەکانیان بە پەتی باریک بە درەختەکاندا شۆڕدەکردەوە... پەروانە شەوان بە دارستاندا دەگەڕا و گوێی لە دەنگی بەریەککەوتنی ئەو پەیکەرانە دەبوو کە باکان «تاق... شراق...تراق» یاریان پێدەکردن.

لەو ماوەیەدا پەروانە هەموو شەوێ دەچووە ئەو خەڵوەتە قووڵەی فەرەیدونی مەلەکەوە، کە ڕۆژ دوای ڕۆژ لاوازتر دەبوو، هەموو شەوێ خۆی نانی لە تەنوورە چکۆلەکانەوە هەڵدەگرت، خواردنی بۆ دەپێچایەوە و وەکو تارماییەکی تێشوو بە دەست، بەرەو وەرشەکە دەڕۆیشت، لەوێ هەموو شەوێک دوای چەند چینێک گریان، لەو سەعاتە کەمانەدا کە کەمێک ئارامی تێدەگەڕایەوە فرمێسکەکانی دەسڕی، بەرامبەر فەرەیدون دادەنیشت و قسەیدەکرد، هەموو شەوێک لەو وچانە درێژانەدا دەبایە قسە بۆ فەرەیدون بکات، ئەویش بێدەنگ لە دونیای خۆیدا خەریکی تاشینی پەپولەکان بوو، پەروانە قسەیدەکرد و فەرەیدونی مەلەک بێئەوەی سەر بەرزبکاتەوە ئیشیدەکرد... ئەو ڕۆژانە جوانی پەپولەکانی

فەرەیدون، پەروانەی سەرسامدەکرد... ئەو دەیگووت: «ئەم پەپولانە دوا جوانین... لەوانەیە کۆتایی هەموو جوانییەکیش بێت... فەرەیدون من تێدەگەم، من لە تۆ تێدەگەم، دەزانم لە سەرەتاوە هەموو شتەکان هەڵەبوون، من و تۆ پێکەوە لە دونیایەک هەڵهاتین هەموو شتەکانی پێشتر دیاریکرابوون، دونیایەک جەهەنەم بوو، من هەستمدەکرد تیا دەخنکێم، تۆش لێی بێزار بوویت، جگە لەوە دەشترسایت بگیرێیت و لەسەر چەند گۆرانییەک تیربارانکرێیت... ئاه، ئەوێ شارێک بوو، دەبوایە تێیدا هەمیشە لە شەڕدا بێت، منیش دەمویست بە خۆشەویستی یان جۆرە پەیوەندییەک کە ئێمە ڕاهاتووین پێیبڵێین خۆشەویستی، ژیانم بڕازێنمەوە... بەڵێ خۆشەویستی... خۆشەویستی... هەمیشە خۆشەویستی بێمانا و یەک لە دوای یەک. دەمویست بە ئەڤینی پیاوان شەڕ لەگەڵ ئەو بیابانە گەورانەدا بکەم... لە پیاوێکەوە بۆ پیاوێکی تر... لەویشەوە بۆ یەکێکی تر... هەمیشەش پیاوانی بێمانا و ترسنۆک کە نەیاندەویست خانو و باغچە و سەرکورسییەکانیان بەجێبهێڵن. ڕۆژێک کەوتمە سەر خەونی ڕۆیشتن... ڕۆیشتن بۆ دونیایەکی دیکە... بەڵام سەیرکە فەرەیدون... ترسناکترین شتی ئەم سەفەرە ئەوەیە کە هەستەکانمان هەموو مانا و ڕەنگ و شێوەی خۆی گۆڕی... لە یەکەم ڕۆژەوە کە دابەزیمە ئەم هەڵدێرە، مانای شەو و ڕۆژم ونکرد، ئازادیی و ئاسودەییم لەبیرچووەوە... شەو و تاریکی یاری بە سۆزەکانم دەکرد، تۆ دەتویست لێرەدا بە عەشق بەختیاربین و بڵێین: سوپاس بۆ خوا عاشقین و لەم لێرەوارەدا بە ئاسایش دەژین... لەبیرتە فەرەیدون کە ڕۆژانی یەکەم تۆ چەند ئاسودە بوویت، لەبیرتە، دەتگووت بەختیاری خەوێکی سادەیە، ئەگەر منیش وەکو تۆ بیرمبکردایەتەوە لەوانەبوو کامەرانتربم، بەڵام پێتدەڵێم ئەم جەنگەڵە و ئەم خێڵی عەشقە لەگەڵ

خۆیدا بردمی... پێشتریش من هەر مەخلوقێکی خەمخۆر بوومە. تۆ خۆت باشدەزانی، من لە سەرەتای قەسابخانەکانی عەشقەوە، چەندە خەمی ئەو مردووانەم دەخوارد، چەندە خەمی ئەو ئازار و ترسەم دەخوارد کە دەبایە عاشقان بیچێژن... چەندەها شەو دەنووستم، هەمیشە دەگریام، ئا، فەرەیدون، ئەم گریانە شتێکی تازە نییە لەگەڵمدا... من لێرەش ئەو ژنانەم بینی لە ناو بازنەی پوچی ئەم دارستانەدا پێستەکەیان رەشبۆتەوە، نەمدەتوانی ئاسودەبم، شەوانە بە دارستاندا وندەبووم و لەو بۆشاییە گەورەیە وردەبوومەوە، لەو هیچییە قووڵەم دەڕوانی کە لە دەورمانە، دەمگووت: چی ڕوودەدات ئەگەر هەموو خەڵک، هەموو... هەموو خەڵک بگەڕێنەوە بۆ جێگایەکی وا؟ چی ڕوودەدات ئەگەر هەموو دونیا بگەڕێتەوە و ژیان لە شوێنێکی وادا ببێتە تێڕامانێکی هەتاهەتایی لە زوڵمەتی بێبن و بێقەوارەی شەو، ببێتە چنینی سەبەتە و خۆهەڵخستن لەسەر زیخی چۆمەڵانێک؟... من لە سەرەتاوە هەستمدەکرد کە دەبێت زیاتر بڕۆین... دەمگووت: دەبێت زیاتر بڕۆین، بەڵام بۆ کوێ؟ نەمدەزانی. ئاه، فەرەیدون... ئاه، تۆ بۆیە منت خۆشویست، چونکە لە پەروانەکان دەچووم، پەروانەش لای تۆ مانای جوانی و مردن لە عەشقدا و چەندین شتی دیکە، پەروانە یانی هەموو خورافەتەکانی خۆم و خۆت، خورافەتە سادەکانی خۆم و خۆت... نا پێویستناکات، پێتبڵێم، ئەو خورافاتە چییە، بەڵام کە تۆ دەستت لە دیوارەکانی بێهوایی ئەم ژیانە دا، کە تێگەیشتیت مرۆڤ تەنها بە عەشق ناژی، کە عەشق لەوە لاوازترە شێوەیەک بداتە ئەم گەردونە، کە تێگەیشتیت ناتوانیت لەگەڵ مندا دنیایەک دروستبکەیت، ناتوانیت لەگەڵ پەروانەیەکی زیندوودا کە دەژی، هەستدەکات، هەڵدێت، دەگری، دنیایەکی ئارام دروستبکەیت، دنیایەکی هێمن، بەرەو دنیای پەپولە خەیاڵییە ڕەنگاوڕەنگەکانت ڕۆیشتیت...

لە ناو تۆشدا بەشێک لە خەیاڵ هەیە کە نامرێت، لەو کاتەوەی من تۆ دەناسم، خەیاڵێکی گەورەت پێیە، کەچی لەپاڵ ئەو خەیاڵە گەورەیەدا، تۆ خەونی زۆر سادەت هەیە، ئا، تۆ خەونی زۆر سادەت هەیە... زۆر... سەیرکە فەرەیدونی مەلەک موسیبەتەکە ئەوەیە دواجار تۆ هەر دەبێت دونیایەک بۆ خۆت دروستبکەیت و تیا بژیت، بەلام من... منیش وەکو تۆ هەمیشە خەونم بە سەفەر و عەشق و ئەمجۆرە شتانەوە بینیوە، بە پێچەوانەوە ویستوومە، ئەو دنیایە دروستکەم. من شەوێکیان لەو جەنگەڵەدا بە خۆمم گووت: «کە شوێنە جیاواز جیاوازەکان دواجار، وەکو یەک بن، هەموویان لە دواجاردا هەر ولاتی مردن و سەرلێشێوانبن، سەفەرەکانیش دواجار سەفەربن بەناو ئازاردا، باشترە مرۆڤ هەر لەسەرەتاوە و تا هەتاهەتایە جێگایەکی نەبێت». بەلام فەرەیدون مانای چی، مرۆڤ جێگایەکی نەبێت؟... سەیرکە، هەندێ جار هەستدەکەم من زۆر کەمفیکر و بێخەیاڵم... هەندێ جار وا قسەدەکەم کە من ئازادم و هەڵبژاردنی ڕێگاکان و ژیانەکان بەدەست خۆمە... من ئێستا تێدەگەم، ئەم دنیایە ڕێگامان پێنادات، جێگایەکمان نەبێت... کەس ئازادنییە لەوەدا شوێنێکی نەبێت، سەیرکە تۆش دواجار ماڵێکت بۆ خۆت هەڵبژاردووە... جێگایەکت دۆزیوەتەوە، کە دوورە لە هەموومان... ئەم شوێنەی تۆ، شێتییە یان جوانی؟ نازانم، بەڕاستی ناتوانم هیچ بڵێم، ئەوەندە دەزانم کە تۆ هەرگیز شێت نەبوویت، دەزانم بێدەنگییەکی قووڵ لە چاو و لە ڕۆحتدایە، بەلام هەستم نەکردوە ئەوە شێتی بێت، ڕۆحلەبەری جۆرا و جۆر لە دەروونتدا بووە، بەلام هەستم نەکردوە ئەوەش شێتی بێت، هەرچی پەیوەندی بەم خەڵوەتەشەوە هەیە لەگەڵ جوانیدا، ماڵێکی قەشەنگە. مرۆڤ دەتوانێت سەر ڕاوەشێنێت و بڵێت، ئێجگار جوانە... ئێجگار پیرۆزە، بەلام جوانی ناکرێت ببێت

بە ماڵی هەموومان. کێ دەڵێت من دەتوانم بێمە ماڵی پەپولەکانی تۆوە و تیا بەختیاربم؟... دواجار هەر کەسەو ماڵی خۆی هەیە، ماڵی جوانی وەکو ماڵی عەشق نییە، دوو ڕۆح لە خۆی بگرێت... ئەمە جگە لەوەی ژیان... ئەم ژیانە ترسناکە جوانی وێراندەکات، جوانی یەکەم سەنگەرە کە دەڕوخێت، هەر مرۆڤ کەوتە جەنگەوە، یەکەم جار دەبێت سەنگەری جوانی چۆڵبکات، کاتێکیش دەمانەوێت لە بازنەی هەموو جەنگەکان دەرچین، ئەو کات ئاساییە بگەڕێینەوە و بڵێین تەنها لەگەڵ جوانیدا دەژین، یان ئەو کاتەی کە دەمانەوێت بمرین... ئەو کاتەی خۆمان بۆ مردن ئامادەدەکەین، لەو کاتەوە دەکرێت خەڵوەتێکی ڕووت و قووت لەگەڵ جوانیدا سازبکەین. هەرچییەک بێت، بزانە کە ژیانی ئێمە ئەوەندە خوێناوییە، کەس ناتوانێت لە یادەوەری خۆیدا جوانی بپارێزێت، ترسی گەورەی من لە جوانی و نازکی و بێهێزی ئەوەیە کە لەیاددەچنەوە... تۆ بەختەوەریت شوێنێکت بۆ خۆت دروستکردوە و لە لەیادچوونەوەش ناترسیت، بەڵام من دەزانم پوچی ئەم دنیایەی ئێمە، پوچی ئەم یادەوەرییە بێمانایە ئەوەیە کە یادماندەکات... من خەمی گەورەم لەیادچوونەوەیە. شەوێکیان گەیشتمە ئەنجامێکی ترسناک، شەوێکیان لە جەنگەڵدا پیاسەمدەکرد و لەناکاو وەستام و سەیری چەند گوڵێکی مردووم کرد و هاوارمکرد: خودایە، من بۆ کوێ هاتووم، ئەم جەنگەڵە هەر بۆ خۆی لەیادچوونەوەیە، خزانی عەشق بۆ ئێرە، خۆی لەیادچوونەوەی دنیایە بۆ عەشق... ئەم گریانەی من گریانی لەیادچوونەوەی مرۆڤ و گەردون و دنیایە بۆ ئێمە... خزانمانە بۆ ناو بۆشایی و هیچی... فەرەیدون ئەم جەنگەڵە دەمرێت... هەموو ئەمانەش کە لێرەدان لەیاددەچنەوە... دەبنە سەراب... دەبنە تۆز... تۆزێکی ورد و بێمانا... دەبنە گەردێک کە کەمێک لەسەر بەردەکان، لەسەر

درەختەکان، لەسەر ڕێگاکان دەمێنێتەوە و دوایی بۆ هەتاهەتایە وندەبێت. گەردێک کە ئێوارێیەک دونیا داگیردەکات و شەو با دەیبات، گەردێکە هیچ لە ویژدانی ئەم مرۆڤانەدا جێناهێڵێت کە لە دونیا پچکۆکەکانی خۆیانەوە، خەریکی مەحکەمکردنی دیواری ژوورەکانی خۆیانن... خەریکی گەرمکردنی کونجەکانیانن، خەریکی ڕامکردنی لەش و ڕۆح و دەرونیانن تا لەگەڵ شوێنەکاندا بسازێت».

پەروانە شەوەهای شەو لەو جۆرە قسانەی بۆ فەرەیدونی مەلەک دەکرد، ئەویش بە درێژایی ئەو هەموو شەوگارە درێژانە هیچی نەدەگوت ... لەگەڵ ئەوەشدا فەرەیدون گوێی بگرتبایە یاخود نا، ئاگاداربووایە یاخود نا، پەروانە بەردەوام دەبوو لە قسەکردن، تا هێدی هێدی خەوی لێدەکەوت یاخود شەپۆلێکی گەرمی حەسرەت بەرەو ناو درەختەکان هەڵیاندەگرت، پەروانە لە سەعاتەکانی خەویشدا ئاسودە نەبوو. شەوانە جەنگەڵ پڕدەبوو لە دەنگی سەیر سەیر، سەوداسەرترین دەنگی ئەو شەوانە دەنگی شەهلای خوداناس بوو. دوای ڕاکردنی مەعسوم، ترسەکانی شەهلا لە گوناهەکانی خۆی دەیان جار گەورەتربوو، دەستپێکردنی پایز و هاتنی هەورەکان و دەنگی هەورەگرمەکان، ترسێکی گەورە و کوتوپڕیان دەربارەی نزیکبوونەوەی ڕۆژی سزا لە ڕۆحی شەهلادا داگیرساندبوو. شەوان کە بروسکە و گرمەگرمی هەورەکان بەرزدەبووەوە ئەو بە خۆی و کتێبەکەیەوە، بەناو پاشماوەی شێداریی گەڵاکاندا هەڵدەهات، نەیدەزانی خۆی لەکوێدا بشارێتەوە، لەبەر نمەبارانەکاندا خێراخێرا قورئانەکەی دەکردەوە و لەسەریەک ئایەتی جیاواز جیاوازی دەخوێند، ترس وای لێدەکرد منداڵەکانی فەرامۆشبکات. بەتەنها و لە ژێر باران و با و سەرماکانی شەودا بەجێیدەهێشتن. عەزیزی تیرئەنداز هەندێک شەو لە قووڵایی دارستاندا، منداڵەکانی هەڵدەگرتەوە و دەیگێڕانەوە

بۆ ماڵ. بەڵام وەرزەکانی گۆشەگیریی و غەم، ئەو ڕاوکەرەشیان گۆڕیبوو بۆ مرۆڤێکی تر، ئەو غەمەی پەروانە لە دارستانەکاندا دروستیکردبوو، باڵندە و ماسیەکانیشی دەکوشت. عەزیزی تیرئەنداز، ئەو ڕۆژانە بەدەگمەن باڵندەی زیندووی دەدۆزیەوە، ئێواران کاتێ لە ناو بێشە و چڕستانەکاندا وندەبوو، جگە لە باڵندەی مردوو، هیچی دیکەی نەدەبینی... منداڵە ڕووتەڵ و سەرمابردووەکانی جەنگەڵیش بەردەوام ئەو باڵندە چکۆلانانەیان کۆدەکردەوە و یاریان پێدەکردن. بە درەختەکاندا لەپاڵ پەیکەرە شکاوەکانی عەشقدا هەڵیاندەواسین. بەکۆمەڵ کۆیاندەکردنەوە و ئاگریان تێبەردەدان یان توڕیاندەدانە ناو ئاوەکانەوە. مردنی بەکۆمەڵی باڵندەکان و ماسییەکان، عەزیزی تیرئەندازیان تووشی شپرزەییەکی گەورە کردبوو، ئەو بەدرێژایی ژیانی لە ناو سروشتدا ژیابوو، شەوێک لەوپەڕی حەسرەتدا لە ناو درەختەکاندا پەروانەی گرت و پێیگووت: «پەروانە، تۆ بەم شیوەنەت، هەموو مەملەکەتەکانی من وێراندەکەیت، باڵندەکانم دەکوژیت، درەختەکان دەکوژیت». پەروانە دەیگووت: «گوێبگرە، عەزیزی تیرئەنداز... گوێبگرە، من هیچ شتێکم نەکوشتووە، ئەم دنیایە خۆی لەیاد دەچێتەوە، ئەم جەنگەڵە خۆی دەبێتە تۆز... ئەو شوێنانەی نابن بە شوێن و مەنزڵگای ڕاستەقینە، دەبێت ئاسەوەر لەسەر زەویدا جێنەهێڵن».

عەزیزی تیرئەنداز، بێئەوەی لە هیچ تێبگات، بێئەوەی لە زمانی ئەم کچە شارییە حاڵیبێت، کە خۆی و دونیای دەورووبەری خۆی گۆڕیبوو بۆ مەتەڵێکی ڕەش، حەسرەتی ئەو سروشتە مردووەی هەڵدەگرت و بەرەو پیری هاوارەکانی شەهلا دەچوو، کە لە خەڵوەتە شەوانەکەی خۆیدا دەپاڕایەوە و دەیگووت: «خودایە، بمبورە، خودایە... خودای من... پاکی کوا... پاکی کوا؟... خودایە، مەمخەرە بەردەستی عەبدە

گوناهبارەکانت... خودایە، مەمخەرە بەردەستی سزای ئینسان... خودایە، با هەرچییەک دەبێت لەنێوان خۆم و خۆتدا بێت، تەنیا خۆم و خۆت... خۆم و خۆت و بەس».

پەروانە هەندێک شەو گوێی لەو هاوارانەی شەهلا دەبوو، بە هەردوو دەست گوێیدەگرت و لە ناو گەلاّکاندا خۆی گرمۆلّە دەکرد، زۆرجار دەبایە میدیا دەستی بگرێت و لە گەلاّکاندا دەریبهێنێت، هەندێ شەو کاتێک خۆیان لەبەرامبەری دیوارە گەورە و بێئەندازەکانی شەودا دەبینییەوە، کە لەبەرامبەری ئەو دووبارەبوونەوە ترسناکەی بۆشایی و هیچیدا دەوەستان، پەروانە دەیگووت: «دەبێت بڕۆین، دەبێت لەم دنیایە بچینە دەرێ... ئەمە چ هەڵهاتنێک بوو ئێمە هەڵهاتین، لە دونیایەکی سادە و ساردوسڕ و خنکێنەرەوە بەرەو دنیای نارێکییە گەورەکان».

میدیای غەمگین هیچی نەدەگووت، بەڵکو تەنها دەینوسی، پێنەدەچوو چیتر چارەنوسی خۆی، وەکو چارەنوسی دەفتەرەکانی بەلاوە گرنگ بێت، ئەو بۆ پەروانەی دەنوسی: «هەمووشتەکان بەسەردەچن، دەبێت شاهیدێک بمێنێتەوە، شاهیدێک لە هەموو دونیاکان و وەرزەکان بەبەقاتربێت... پەروانە، ڕۆژی حەشر ئەو ڕۆژەیە کە مرۆڤ نەتوانێت بنوسێت، ڕۆژی ئاخیرەت، ئەو ڕۆژەیە کە نوسین کۆتاییدێت، کە ئیدی مرۆڤ ناتوانێت شتەکان ناوبنێت، دونیا وەسفبکات». پەروانە دەیگووت: «میدیای خوشکم، تۆش خۆشبەختیت، دونیای تۆ کۆمەڵێک وشەیە، بەلاّم پێمبڵێ لەم وەرزی نارێکی و تێکەلاّوبوونەدا وشەکان چۆن دەمێننەوە؟ گوێبگرە، تۆ دەبێت، ئەم دەفتەرانە ڕزگاربکەیت... دەبێت لەم دارستانە بڕۆینەدەرەوە و ئەم دەفتەرانە ڕزگاربکەین... میدیا، دوا ئومێد لەبەرامبەر ئەم یادچوونەوە و نەمان و تەفروتوونابوونەدا، ئەم دەفتەرانەیە... دەبێت ئەم دەفتەرانە بگەنە جێگایەکی دیکە، بگەنە

زەمانێکی تر و خاکێکی تر».

میدیا بە ترسێکەوە دەفتەرەکانی دەنا بە سنگییەوە و دووردەکەوتەوە، لەو ساتەدا میدیا نەیدەویست دەفتەرەکانی خۆی بۆ هیچ کەس و هیچ هێزێک بەجێبهێڵێت... لەو دونیایەشدا بڕوای تەواوی بە یەکێک نەبوو دەفتەرەکانی بداتێ و بەرەو زەمانێکی تر و عەردێکی تر هەڵیبگرێت. بەڵام، وردە وردە لەو تاریکستانەی جەنگەڵدا هەردوو ئەو کچە تەنهایە، هەردوو ئەو کچەی کە چەند لە یەکتر دووربکەوتنایەتەوە دووبارە بازنەکانی دارستان، دەیخستنەوە سەر ڕێگای یەکتر، باوەڕیانهێنا کە دەبێت بڕۆن و ئەم خاکە جێبهێڵن... لە هەموو ئەو شەوانەدا کە پەروانە و میدیا، باسی جێهێشتنی دارستانیان دەکرد، شەهلای خوداناس، وەکو شەیتانێک ڕەجمبکات، لە نزیکیانەوە دەوەستا و هەزارەها هەزار جار لەسەریەک ناوی «خودا»ی دووبارەدەکردەوە... بۆ هەر کوێیەک دەچوون، هاوارەکانی شەهلا، خودا... خودای ئەو بەدوایانەوە بوو: «خودا... خودا... خودا... خودا... خودا...». شەهلا دەڕۆیشت و هەمیشە ئەو وشەیەی دووبارەدەکردەوە. شەوێک پەروانە لەنزیک ئاوەکانەوە بە شەهلای گووت: «گوێبگرە شەهلا، من لە مێژە لە تۆ بێدەنگبووم، من ساڵانێکی زۆر لە پورێک هەڵهاتم کە ئەویش جگە لە گووتنەوەی وشەی خوا زیاتر هیچی تری نەدەزانی... بەڵام تێبگە، مرۆڤ تەنها بە بڕوا ناژی، وەکو چۆن تەنها بە عەشقیش ناژی، مرۆڤ تەنها بە خەیاڵ ناژی، وەکو چۆن تەنها بە حەقیقەتیش ناژی... دنیایەکیش کە هەموو سنوورەکانی دیاریکراوە، وەکو دونیایەک کە شێوەی نییە، سامناکە».

شەهلا هاواریکرد: «خراپکاران، ئێوە بێدەنگبن، گوێهەڵخەن، ئەوسا تێدەگەن چ غەزەبێک بەڕێوەیە، دەزانم ئێوە پەشیمانئنین...

پەشیماننین... خودایە، خودایە، سەیرکە... سەیرکە، ئەم بێئابڕووانە پەشیماننین... ئەم قەحبانە، پەشیماننین و من پەشیمانم».

شەهلا بە خۆی و قورئانەکەیەوە، بە خۆی و ترسە گەورە و نیگا شێتانەکەیەوە دەڕۆیشت، پەروانە باوەشی بە میدیای غەمگیندا دەکرد و دەیگووت: «دەبێت پێکەوە بڕۆین... پێکەوە لەم جەنگەڵە دەرچین... دەبێت یەکێک بێت و بزانێت، کە ئێمە چیتر نامانەوێت لێرەدا بژیین».

بۆ سبەی دەلیلە چاوشینەکە، لە پەیژەی هەزار بە هەزارەکە دادەبەزی، دیتنی ئەو پایزە سەیر و لەناکاوەی لە دارستاندا هەڵیکردبوو، تووشی پەشۆکانێکی سەیری دەکرد، لەو مەیدان و جەنگەڵەدا بێدەنگییەکی گەورە و ترسناک فەرمانڕەوابوو، دیمەنەکان بە جۆرێک گۆڕدرابوون، بۆ ماوەیەک باوەڕی نەدەکرد کە ئێرە هەمان ئەو خاکە بێت کە لەوەوبەر چەندین جار دیدەنیکردبوو... ئێستا کپییەکی کوشندە باڵی بەسەر هەموو ئەو زەوییەدا کێشابوو. دەلیلەکە بە دەریای ئەو گەڵا زەردانەدا ڕابورد، لە هیچ جێگایەک هێندە گەڵای مردووی نەبینیبوو، دەیگووت: «بەدرێژایی چەندین ڕۆژە، من بەناو پاییزدا سەفەردەکەم، بەڵام لە هیچ جێگایەک پاییزی وا غەمگینم نەبینیوە، پایزی وا تووڕە و ڕقاوییم نەبینیوە».

لە ناو ماڵەکاندا سەرنجیدەدا کە عەردی هەموو ژوورەکان بە گەڵای زەرد داپۆشراوە. سەرنجیدەدا کە باو بارانێکی کەم کەپرەکانی لەبەریەک هەڵوەشاندووە. یەکەمین جار لە گۆڤەندی دەپرسی و دەیگووت: «هاوڕێم، ئەم پایزە ناوەخت و ترسناکە چییە؟ ئەم غەمە کوتوپڕە چییە؟ ئەم زەردی و پەشموردەییە لەکوێوە هاتووە؟».

گۆڤەند دەیگووت: «هیچ نییە، هیچ نییە... زۆرجار خەڵکی لە ژیانی خۆیان بێزاردەبن، بەڵام دێنەوە هۆشی خۆیان، زۆرجار تێناگەن

کە چیان دەوێت، بەڵام زوو وریادەبنەوە و تێدەگەن کە دەبێت بۆچی هەوڵبدەن، زۆرجار بڕوایان بە عەشق و جوانی لەق دەبێت، بەڵام زوو دەگەڕێنەوە و باوەڕ بە مەزنی و گەورەیی خۆیان دەکەن».

پێناچێت دەلیلەکە هەرگیز بڕوای بەو قسانە هێنابێت، ئەو دەیگووت: «ئەو ساردی و مردنەی ڕوویکردۆتە ئەم جەنگەڵە، لەوە گەورەترە بەم قسانە تەفسیربکرێت... زۆر لەوە گەورەترە». ئێوارەی ئەو ڕۆژە، لەکاتێکدا ئەویش وەکو ڕۆحێکی وێڵ و سەرلێشێواو بەناو وێرانەی دارستاندا دەسوڕایەوە، پەروانە لەبەردەمیدا وەستا و پێیگووت: «زۆر لە ناو ئەم درەختانەدا مەمێنەوە، زۆر لێرە ڕامەوەستە، زۆر بەم دارستانەدا پیاسەمەکە، چونکە لەوانەیە غەمێکی ئەوتۆ بچێتە ڕۆحتەوە تا هەتاهەتایە دەربازت نەبێت. تۆ گەنجێکی دڵخۆشیت، هێشتا بەختیاری و شادومانی زۆرت لە پێشدەمدایە، مەهێڵە ئەم غەمە بتکوژێت... بڕۆ و نەسرەدینی بۆنخۆش، لە خەڵوەتەکانی خۆی دەربهێنە، با بێتە ئێرە. تۆ نازانیت ئێمە چەندە پێویستمان پێیەتی، پێویستمان بەو پیاوەیە، با بەرلەوەی سێبەر و سەرما و تەنهایی بمانکوژێت... بمانبینێت».

گەنجەکە، تا زیاتریش بمابایەتەوە ئەو خەندە گەشەی سەر ڕوومەتەکانی زیاتر و زیاتر دەژاکا. لای ئێوارە... لەو پەردە دارینە بچکۆلانەیە دەپەڕییەوە، سەیری ئەو تەمە سپی و لەناکاوەی دەکرد کە لە ئێوارەی ئەو دارستانەدا بەرزدەبووەوە... لە قووڵایی خەیاڵیشیدا، خەیاڵێک کە پڕبوو لە شیعری کلاسیکی، خەیاڵێک کە شیعر قانیدابوو بە حەسرەتەوە دەیگووت: «ئاخر ئەم دنیایە ئەمری دێتە سەر ئاخر ببە». کەمێک دەوەستا و بە خەمەوە بیری لە بەیتی دووهەمی شیعرەکە دەکردەوە و دەیگووت: «یەعنی بەس ئەی فاحیشە عالەم بەقڕدە یەک بە یەک».

بە پەیژەکەدا سەردەکەوتەوە و لەوێوە تۆزێکی نەرمی دەبینی، تۆزی ئاوابوونی دونیایەک کە ڕۆژێک لە ڕۆژان نەسرەدینی بۆنخۆش پێیگووتبوو دەبێت بە «جەنەتی عەشق». سەیریدەکرد و غەمێکی کپی لەسەر درەختە زەردەکان دەبینی، دوکەڵی ئاوابوون و کوژانەوەی ئاگرێکیش لە پەنایەکی دارستانەوە بەرزدەبووەوە، هەستیدەکرد تا ئەم زیاتر بەرزببێتەوە، هەورە تورەکانی پاییز زیاتر نزمدەبنەوە، تا ئەم بە پەیژەکەدا سەربکەوێت، هەوا و ئاسمان و کزە ساردە دوورەکان زیاتر دادەبەزن... ئێستا کە لەوێوە سەیری ئەو جەنگەڵەی دەکرد، هێندەی لە خاکێک دەچوو کە دەبێت لەیادیبکات، لە خاکێک نەدەچوو کە دەبێت پاشەڕۆژی خۆی پێوە ببەستێتەوە و یادگارەکانی هەڵبگرێت.

## ١٩

هەموو بەیانییەک دەبایە خەونەکانی خۆمان بۆ زەینەبی کوێستانی بگێڕابایەتەوە، من هەمیشە قسەم لەسەر سێبەری ئەو پیاوە دەکرد، باسی ئەو تارماییەم دەکرد کە هەندێ شەو لە ڕاڕەو و ژوورەکانی قوتابخانەدا دوای دەکەوتم. ڕۆژانی دوور و درێژی فەهرەستسازی بۆ کتێبەکان سوودێکی ئەوتۆیان نەبوو، زۆربەی دیوارەکانی قوتابخانەکەشمان پڕکردبوو لە سورەت و زەخرەفەی گەورە گەورە، بەئەندازەیەک چیدیکە جێگایەک نەمابوو بۆ هەڵواسینی یەکێکی دیکە... من ئیدی زوو زوو لەو پارچە ئاوێنەیەی فەتانەی غەمگیندا، سەیری خۆمم دەکرد... من لەو باوەڕەدابووم کە هێشتا هەر لە خەندانی چکۆلە دەچم، لەگەڵ فەتانەدا بڕیارماندابوو بە وردی تەماشای یەکتری بکەین، بە وردی چاوەدێری شێوە و سیمای یەکتر بکەین، فەتانەش زووزوو دڵنیایدەکردمەوە، کە من هەر لە خۆم دەچم، من هەر خەندانی چکۆلەم، بەڵام ئەوەی منی دەترسان، ئەو دڵنیاییەی زەینەبی کوێستانی بوو. زەینەب ئەگەرچی هەمیشە گومانێکی قووڵی بەرابەرم هەبوو، بەڵام پێدەچوو لە تاریکییە دوورەکانی دەروونمدا شتێک ببینێت، کە من ناتوانم بیبینم. ئەو هەموو بەیانییەک سەیری نێوچاوانی دەکردم و دەیگووت: «خەندانی چکۆلە، ئارەزووەکانت وەکو هەمیشە بەدواتەوەن، کچم، ئەو پیاوە جگە لە سێبەری ویستە شەیتانییەکانی خۆت هیچی تر نییە». کە قسەیدەکرد

بەردەوام یاری بە تەزبێحەکەی سەر سنگی دەکرد، هەموو بەیانییەکیش سەیری چاومی دەکرد، من هەستم بە ماندوبوونێکی سەیردەکرد، ئەو هەموو جار، دەیگووت: «سەیرمکە با نیگاکانت ببینم». بە قووڵی دەیڕوانی و دەیگووت: «وەکو سەرەتا خراپ نییە، هێدی هێدی نیگاکانت ئەو نازەی جارانی تیانامێنێت، بەڵام تا ئێستا باوەڕم بەم زەردەخەنە سەیرەت نییە، کە نازانم لە جبوولیەتی خۆتەوە هەڵدەقووڵێ یان عادەتێکی بەدە و لەگەڵتدا گەورە بووە». خاتوو زەینەب بەوە ئامۆژگاریدەکردم کە خەڵوەتی دوور و درێژ لەگەڵ خۆمدا سازبکەم، لەو خەڵوەتانەدا بڵێم: «من خەتاکارم، خودایە فریامکەوە... بێکەسم، حەبیبم تۆ کەسم بە... زەلیلم یارەب، هیمدادم بە... لاوازم، ئەی باریی نەجاتمدە... پیسم ئیلاهی، پاکم کەرەوە».

دەبایە شەوان لە ژووری عیبادەتەکاندا، مۆمێک داگیرسێنم و سەدەها جار ئەو ڕستانە بڵێمەوە. شەوانێک خۆی لەپشتمەوە لە تاریکییەکەدا دەوەستا و بێئەوەی بیبینم دەیگووت: «ڕوونتر و بە دەنگێکی بەرزتر بڵێ: پیسم ئیلاهی پاکم بکەرەوە... پیسم ئیلاهی پاکم بکەرەوە... پیسم ئیلاهی پاکم بکەرەوە». هەندێ جار سەعاتێک تێدەپەڕی کە من بەو ئیقاعە خێرا و بەردەوامە ئەو ڕستەیەم دەگووتەوە، بەجۆرێ هەندێجار کە مۆمەکەشم خامۆشدەکرد و ماندوو بە ڕاڕەوەکەدا دەگەڕامەوە بەردەوام هەر ئەو ڕستەیەم دووبارەدەکردەوە، بە پلەکەکاندا سەردەکەوتم و هەر دەمگووت: «پیسم ئیلاهی پاکم بکەرەوە... پیسم ئیلاهی پاکم بکەرەوە». فەتانە کە دەیبینیم، ڕایدەوەشاندم و دەیگووت: «خەندان، خەندان، تەواو، چیدی کەس گوێی لێت نییە... تەواو».

بە تەنها من نەبووم کە ئەو حاڵەتە سەیرانە دەژیام، هەندێ ئێوارێ کە لەگەڵ فەتانەدا بە ڕاڕەوەکاندا دەسوڕاینەوە، ئەو کچە بێهۆش و ڕەنگزەردانەمان دەبینی کە وەکو تارمایی ماندوو و سپی ڕەنگ،

بەلاماندا تێدەپەڕین و هەریەکەیان لەبەرخۆیەوە ڕستەیەکی دەگووتەوە. ئەو هەستە کە ئێمە کۆمەڵێک ڕوحلەبەری چەپەڵین، هێدی هێدی دەچووە ناو ڕۆحمانەوە، تەنها فەتانە نەبێت کە دەیتوانی لە ناو هەموو گەمەکانیشدا بێت و لە ناویشیدا نەبێت... ئەو بەردەوام شەوان، یان لە ئێوارانی کتێبخانەدا، حکایەتەکانی «سەندباد»ی بۆ دەکردم، ئەو زنجیرە تەلەفزیۆنییە سەیرانەی بۆ دەگێڕامەوە کە من نەمدیبوون، ژیانی ئەکتەرە میسری و گۆرانیبێژە ئێرانییەکانی بۆ باسدەکردم، باسی زیندەگی خێزانەکانی ناو گەڕەکەکەیانی دەکرد. هەموو شەوێکیش ناچاریدەکردم کە لەو پارچە ئاوێنەیەدا سەیری خۆم بکەمەوە. من زۆر شەو دەمگووت: «فەتانە، فەتانەی ئازیز، من گۆڕاوم... سەیرکە لە جاران لاوازترم... ڕەنگم زەردتربووە، پەڵەیەکی ڕەشی ماندوێتی و بێخەوی لە دەوری چاومە». بەڵام فەتانە دڵنیایدەکردمەوە و دەیگووت: «نا، وانییە، تۆ هەر لە خەندان دەچیت... هەر لە خەندان دەچیت». من لەو شەوانەدا زۆر بیرم لە پەروانە دەکردەوە... بیرم لەو کێڵگە و ئاسمان و درەختانە دەکردەوە کە پەروانە لە ناویاندا دەژی.

زۆر شەو من هیمدادم لە پەروانە دەخواست، بێت و یارمەتیمبدات. دەمزانی ئەگەر ئەو لەگەڵمدابووایە زیاتر لەم دونیایە تێدەگەیشتم. هەندێ جار هەستمدەکرد کە زەینەبی کوێستانی دەیەوێت بزانێت کە ئایا بیر لە خوشکەکەم دەکەمەوە، من بێدەنگ سەرم دەخستە ناو دەستەکانم و دەمگووت: «مامۆستام، ناتوانم، ناتوانم، بیری لێنەکەمەوە». زەینەب هەندێ جار بە هەڕەشەوە پێیدەگووتم: «لەیادیکە... تا ئەو خوشکە زینابازانەتان لەیادنەکەن، پاکنابنەوە». هەندێ جاریش بە ئارامی گوێی لێدەگرتم و دەیگووت: «گەر ناتوانیت فەرامۆشیبکەیت، لە خودا بپاڕێرەوە ڕزگاریبکات، لە خودا بپاڕێرەوە، پاکی و هیدایەتی پێببەخشێتەوە». من لەو ساتانەدا سێبەری ڕۆحێکی ترم لە زەینەبی کوێستانیدا دەبینی،

هەستمدەکرد زەینەب نایەوێت ئازارمانبدات، هەستمدەکرد لەپاڵ ئەو جەستە سارد و زەمهەریرییەیدا، گیانێکی گەرم و بەسۆزی هەیە کە زەینەب بەزۆر دەیکوژێت و بە فشارێکی سەخت دەیشارێتەوە... زۆر جار هەستمدەکرد ئەو ئێمەی خۆشدەوێت، ئێمەیش ئەومان خۆشدەوێت، بەڵام هەریەکەمان لەبەر هۆی جیاواز و بە شێوەی جیاواز... ئەو هەستەش بۆ من دواتر سەرەتای ئەو گۆڕانکارییە قووڵانە بوو کە ساڵانێکی درێژ منی لەو تۆبەخانەیدا هێشتەوە.

لەو ماوەیەدا شەوانە لەیلا وەکو جاران دەچووە ناو ئەو کچانەی لەدەوری شنۆ کۆدەبوونەوە، هەندێک شەو من لە ڕاڕەوەکەدا لەنزیکیانەوە دەوەستام و گوێمدەگرت، شنۆ زیاتر لەسەر ئازارەکانی ناو گۆڕ دەدوا، لەسەر گۆڕەوشار و ئەو فریشتانەی کە نامەی پاداشت و سزات بۆ دەخوێننەوە. لەیلا خۆی دەدا بەسەر قەرەوێڵەکەدا و دەیگووت: «مەگەر دۆزەخ، ئەم لەشە گوناهبارەم پاکبکاتەوە». هەندێ جار هەڵدەستا و بەناو ژوورەکەدا دەگەڕا و سەری بادەدا و وەک هەمیشە دەیگووتەوە: «هیچ شتێ پاکم ناکاتەوە... هیچ شتێ...». ئەو ترسە گەورەیە لە پاکنەبوونەوە ڕۆژ دوای ڕۆژ گەورەتر دەبوو، هەر شەوەی کچێک دەکەوتە هاوار و گریان و ڕاکردن بە ژوور و ڕاڕەوەکاندا، هەموو پێمان وابوو کە شەیتانەکان بەجۆرێکی سەیر ئابلۆقەیانداوین. شنۆ کە خۆی لە هەموان زیاتر دەترسا، دەیگووت: «بیرمەکەنەوە، کە بیرتانکردەوە یادگارەکانتان زیندوودەبێتەوە». بەڵام کەس نەیدەتوانی بیرنەکاتەوە، کەس نەیدەتوانی خەون نەبینێت و بیر لە ڕابوردوو نەکاتەوە. هەندێ لە کچەکان هێدی هێدی سڵیان لە هەمووشتێک دەکردەوە، لە هەوای شەوانی قوتابخانە دەترسان، هەندێک گەیشتبوونە ئەو بڕوایەی کە جێگاکانیان گڵاون، دۆشەکەکان بۆنی ئەهریمەنی لێدێت، دەیانگووت: «پێخەفەکان پێشتر پێخەفی کەسانی خراپەکار بوون». هەندێ لە کچەکان، دەیانگووت:

«خەونەکانمـان پـڕە لـە گوناهـ». کاتێکیـش لـە خـەو ڕادەچڵەکیـن، نەیاندەوێرا بچنـەوە نـاو پێخەفەکانیـان و لەسـەر زەوی ژوورەکان دەخەوتـن. هەندێک شـەو لەبـەر قووڵپـی گریانـی ئـەو کیژانـە خەومـان لێنەدەکـەوت کـە لـە شـوێنی جیاجیـاوە دەستیاندەکردە گریانێکـی بەکـوڵ. زەینـەب بەیانیـان بـەر لـە دەسـتپێکردنی وانـەکان تەماشـایدەکردن و دەیگـووت: «بگریـن، تـا قووڵتـر بگریـن، ئـەوە نیشـانەی ئەوەیـە کـە ئێـوە پتـر هەسـت بـە گوناهەکانـی خۆتـان دەکـەن، تـا قووڵتـر بگریـن مانـای زیاتـر پیسـی خۆتـان دەبینـن». دواجاریـش وتـارە درێژەکانـی لەسـەر بـەدکاری، وانـە قـووڵ و سـەیرەکانی لەسـەر وێنـە جـۆرا و جۆرەکانـی شـەیتان، تاقیکردنەوەکانـی لەسـەر نیشـانەکانی پیسـی، هەمـوو ژیانمانـی بـەرەو ڕێگایەکـی داخـراو بـرد، ڕێگایـەک کـە پچوکتریـن خەیـاڵ، تارمایـی هـەزاران جنۆکە و درنـج و دەعجانی تیـا دروسـتدەکردین. هەموومـان ئـەو چـی بگووتبایـە دەمانکـرد، لەشـمان لـە شـەیتانەکان بسـمیلدەکرد، ئـەو سـورەتەمان دەخوێنـد کـە ئەهریمەنـەکان دەردەکات. هەمـووان تووشـی ئـەو دەردە ترسـناکەی بیسـمیلکردنی خۆمـان و شتەکان و لەشـمان بووبوویـن، ئـەو پەتـای پاکژبوونەوەیـە لـە قوتابخانـەدا هێـدی هێـدی وەکـو درمێکـی کوشـندە بڵاودەبـووەوە، خۆشـتنی بـەردەوام، جلشـتنی بەردەوام، دەسـتنوێژگرتنی یەک لەسـەر یەک «چونکە شـەیتانەکان لـە وچانەکانـدا زەفەریـان لـە پاکێتیمـان دەهێنـا»، دوورنەکەوتنـەوە لەسـەر بەرماڵـەکان، خـۆ بەدوورگرتـن لەبەریەککەوتـن لەگـەڵ هەمـوو مەخلوقاتەکانـی تـردا... ئـەوە ژیانـی ڕۆژانەمـان بـوو، ئـەو کاتانـە لەیلا کەمتـر قسـەی لەگـەڵ هەرسـێکماندا دەکـرد، لەکاتێکدا مەهتـاب بـە جۆرێکـی تـەواو جیـاواز دەژیا. مەهتـاب وەکـو هەموومـان دەهاتـە وانـەکان، بـەڵام پێنەدەچـوو هیـچ شـتێ لـە سـەرجەمی ئـەو یارییـە تێبگات. من لـە هەفتەکانـی سـەرەتاوە سـەرنجی ئـەو برسـێتییە سـەیرەمدا، کـە ئـەو کچـەی بـە جۆرێکـی نائاسـایی بـەلای خواردنـدا کێشـدەکرد. مەهتـاب، هەمـوو پاشـماوەکانی ئێمەشـی کۆدەکردەوە،

ناوکـی دەرکـراو و توڕدراویـی سەموونەکانیشـی هەڵدەگرتـەوە، زۆربـەی کاتیـش بـە تەنهـا لـە ژێـر بەتانییەکـەوە دەمایـەوە و کـەم دەهاتـەدەرێ، بەیانیـان بـە هێمنـی بـە زەینەبـی کوێسـتانی دەگـووت: «وازم لێبهێنـە، خـەوم نەبینیـوە». ئەویـش کـە ئـەو سـیما بێبـاک و کەمێـک گێژۆکەیـەی مەهتابـی دەبینـی هیچـی نەدەگـووت و بـە ئامازەیەکـی هێـواش و لەسـەرخۆ لـە ژوورەکـە دەیکـردە دەرێ. دەبێـت بڵێـم کـە مەهتـاب ساڵەهای سـاڵ هـەر بـەو جـۆرە مایـەوە، هەتـا دوای ئـەو چارەنوسـە ترسـناکەی لەیـلا، مەهتـاب بـۆ چەنـد مانگێـک نەخۆشـکەوت و لێمـان دوورکەوتـەوە، بـەڵام دواتـر کـە گەڕایـەوە بـۆ قوتابخانـەی خوشـکە تۆبـەکارەکان، هـەر هەمـان کچـی تەنهـا و بێحەوسـەڵە بـوو کـە زیاتـر لـەو کاتانـەدا دەهاتـە قسـە گـەر یەکێـک لەسـەر چارەنوسـی دایکـی بیدواندایـە، هەرگیزیـش وازی لـەو مەیلـە نائاسـاییە نەهێنـا بـەرەو خـواردن و خـەوتـن، کـە ڕۆژانێـک بـوو بـە خولیـای هـەرە گـەورەی ژیانـی.

لـە شـەوێک لـەو شـەوانەدا، زەینەبـی کوێسـتانی بەجۆرێکـی چاوەڕوان نەکـراو منـی بانگکـرد و کردمـی بـە لێپرسـراوی ئـەو کتێبخانـە گەورەیـە، تـا سـاڵانێکی دوور و درێژیـش لـەو نهێنییـە تێنەگەیشـتم کـە بـۆ لـە نـاو ئـەو هەمـوو کیژانـەدا منـی هەڵبـژارد، ئایـا دەیویسـت زیاتـر بـە جیهانـی ئـەو تۆبەخانەیـەوەم ببەسـتێت؟ خێراتـر بمخاتـە سـەر ڕێـگای تۆبەکـردن؟ نەمدەزانـی. بـەڵام دواتـر بەرلـەوەی لـەو قوتابخانەیـە بێمـەدەرێ، کـە لێـم پرسـی: «خاتوونـی مـن، بـۆ ئـەو کتێبخانەیـەت دایـە دەسـتم و هەرگیزیـش پاشـگەزنەبوویتەوە، بـۆ؟ دەزانـی ئەگـەر نەچووبامایەتـە ئـەو کتێبخانەیـەوە لەوانەیـە بەختیارتـر بـم؟». ئـەو گووتـی: «گوێبگـرە، خەنـدان، مـن دەمزانـی تـۆ تاکـە کەسـێکیت کـە تەنهـا لەڕێـگای عەقڵتـەوە، لـە ڕێـگای لێوردبوونـەوە و زانینـی زۆرەوە دەتوانیـت خـودا بدۆزیتـەوە. مـن سـاڵانی دوور و درێـژی هەڵسـوکەوت لەگـەڵ تۆبەکارانـدا فێریکردبـووم، کـە هـەر کەسـە

و بە ڕێگای خۆی دەتوانێت خودا بدۆزێتەوە، تۆش سیمای خوێنەر و گوێگرێکی وریا لە شێوەتدا بوو. من دەمزانی تۆ ڕۆحێکی یاخیت هەیە، بەڵام زۆر بیردەکەیتەوە. دەمزانی تەنها ئەو بیرکردنەوەیەش ئەو یاخیبوونەی ناو خەیاڵت ئارامدەکاتەوە... دواجاریش تەنها ئەو کتێبانە دەستەمۆیانکردیت».

بەڵام سەرەتا پەیوەندی من بەو کتێبخانەیەوە جۆرێکی تربوو. کە یەکەمجار وەکو لێپرسراوی بەخشین و وەرگرتنەوەی کتێب لەسەر مێزێکی بچکۆلانە دادەنیشتم، گەرمەی ڕۆژانی ترس و خۆپاککردنەوە بوو. من ئێواران لە دوای نوێژی عەسرەوە، دەبایە دەرگای کتێبخانەکە بکەمەوە و لەوێ لە بەر مێزێکی بچکۆلانەی ڕەش دانیشم. من هەرزوو دەرکم بەو ڕاستییە کرد کە ئەم کتێبخانەیە جێگایەکی سەرسوڕهێنە بۆ جیابوونەوەم... هەر لە یەکەمین ئێوارێوە لەزەتێکی بێوێنەم لە پێچاوپێچەکانی ئەو ساڵۆنەدا بینی کە دۆڵابەکان چەندەها ڕاڕەویی درێژ و تەریبیان تیا دروستکردبوو، دەشمزانی دونیای ئەم کتێبانە ئیدی جیهانی من لە جیهانی ئەو کچانە جیادەکاتەوە کە سەفەری تۆبەکردن کردبوونییە کۆمەڵێ مەخلوقاتی زامدار، کە لە باسی ئاگر و گۆڕەوشار و قیامەت زیاتر هیچی دیکەیان نەدەزانی. فەتانە کە مەکرێکی ژێرەوانکێ و زیرەکانەی بەکاردەهێنا، پاش چەند هەفتەیەک، دوای یەک دوو تەقەلای سەرنەکەوتوو، توانی زەینەبی کوێستانی ڕازیبکات، ئێواران لەگەڵ مندا لە کتێبخانەکەدا کاربکات.

هاتنی فەتانە وایکرد کە چیتر ئەو چەند سەعاتە، پێویستیمان بە کەس نەبێت. کتێبخانەکە زۆربەی کات چۆڵ بوو، سەرەتا پێکەوە لەگەڵ فەتانەدا بیرمان لە خوێندنەوەی یەکێ لە کتێبەکان کردەوە، بەڵام نەماندەزانی لە چ کتێبێکەوە دەست پێبکەین. من دواتر زانیم کە سەختترین شت لە ژیانی مرۆڤدا، هەڵبژاردنی کتێبێکە بۆ خوێندنەوە.

من لەگەڵ فەتانەدا چەندەها جار، دەستماندەدایە کتێبێک و دواتر پەشیماندەبووینەوە. چەندەها لاپەڕەمان هەڵدەدایەوە و دواتر کتێبەکەمان دادەخست و دەکەوتینە قسەکردن، فەتانە دەیگووت: «گەورەترین لەزەتی ژیان، قسەکردنە نەوەکو خوێندنەوە». کە باسی میدیای خوشکی دەکرد دەیگووت: «ئەو هیچی دەربارەی، چێژی قسەکردن نەدەزانی». لەو ئێوارانەدا من و فەتانە دادەنیشتین و ئەو درێژەی بە حکایەتەکانی خۆی دەدا، درێژەی بە گێڕانەوەی فلیم و زنجیرە تەلەفزیۆنییەکان دەدا... تا ڕۆژێک شتێکی ئێجگار سەیر ڕوویدا.

ڕۆژێک کە کتێبخانەکە وەکو هەمیشە چۆڵ بوو، لەکاتێکدا من بە شەوقەوە گوێم بۆ یەکێ لە حکایەتەکانی فەتانە گرتبوو، ئەویش بەوپەڕی خەون و خەیاڵەوە قسەیدەکرد، لەناکاو وەستا و چاوی بڕییە جێگایەکی سەیر لە قووڵایی کتێبخانەکەدا و بە دەنگێکی خۆشحاڵ گووتی: «خەندانی چکۆلە... پەپولەیەک لە کتێبخانەکەدایە... پەپولەیەک لێرەیە».

من کە لە مێژبوو پەپولەم نەبینیبوو، گووتم: «فەتانە تۆ درۆدەکەیت... لەم پاییزەداو پەپولە، پەپولە چۆن دەگاتە ئێرە؟... تۆ درۆدەکەیت». بەڵام فەتانە کە سەرنجی هەموو کون و کەلەبەرەکانی دونیای دەدا، لە درزێکی بچکۆلانەی بنمیچی کتێبخانەکەدا پەپولەیەکی ئێجگار قەشەنگی بینیبوو. من کە پەپولەکەم بینی، لە خۆشیدا هاوارمکرد: «نا، فەتانە ... تۆ ڕاستدەکەیت ... راستدەکەیت، سەیرکە چ پەپولەیەکە ... سەیرکە چ نازکییەکە». ئەو ڕۆژە هەردووکمان بە زەحمەت پەپولەکەمان هەڵفڕاند، بەناو پێچاوپێچەکانی کتێبخانەکەدا دوایکەوتین. پەپولەکە لە ناو کتێبەکاندا دەفڕی، بەسەر چراکانەوە دەنیشتەوە. دەچووە سەر مێزەکان. من و فەتانە بەردەوام بەدوایەوەبووین، لە هەر جێگایەک بەشێ لە گەردە ناسکەکەی خۆی دەوەراند، تا دواجار لەسە

ڕیزێک کتێب گرتمان. فەتانە پەپولەکەی خستە ناو یەکێ لە کتێبەکانی تەفسیرەوە و کتێبەکەی لەسەر داخست و گووتی: «سبەینێ بیکەرەوە، ئەوسا دەبینیت چەندە قەشەنگە».

ڕۆژانی دواتر ڕاستییەکی سەیرمان دۆزییەوە. ئەو پەپولەیە، تاکە پەپولەیەک نەبوو لەو قوتابخانەیەدا... بەڵکو کون و کەلێنەکانی ئەو خانوە گەورەیە پڕبوو لە پەپولە، ئەو پەپولانە لەکوێوە دەهاتن، چۆن لەم پایزە ساردەدا دەردەکەوتن، تەفسیرێکمان بۆی نەبوو. بەڵام دواتر من و فەتانە هەموو پەپولەکانمان لە کتێبخانەکەدا کۆکردەوە، تا هێدی هێدی ئەو پەپولانە بوونە گەورەترین نهێنی ژیانمان. ڕاوکردنی ئەو پەپولانەی کە جگە لە من و فەتانە هیچ کەسێکی دیکە نەیدەبینین، جۆرە لەزەتێکی سەیری بەخشی بە هەموو ئەو ڕۆژانەی لەسەر تەقویمی ژیان دەکەوتنە پێش ئێوارەی پەروانە. هەرگیز نهێنی ئەو پەپولانەشمان لەبەردەم زەینەبی کوێستانیدا نەدرکاند، بەڵکو هەموو ئەو کتێبانەش کە ئەوانمان تیاهەڵدەگرت، بە جۆرێ دەمانشاردنەوە کە کەس دەستی پیانەگات.

لەگەڵ دەستپێکردنی سەرمادا، ئێواران سۆبەکەمان دادەگیرساند و لە گەرمی کتێبخانەکەدا بە نهێنی سەیری پەپولەکانمان دەکرد، بەدەگمەن یەکێک بهاتبایەتە کتێبخانەکە، هەندێ لە مامۆستاکان جار جار کتێبێکیان دەبرد و هەرزوو دەیانهێنایەوە. زەینەبی کوێستانی هەر لە یەکەم ئێوارەوە کتێبێکی هەڵگرتبوو و هەردەم لە تاقەکەیدا لەتەنیشت قورئانێکەوە بە کراوەیی جێیدەهێشت. ئەو ئێوارانە شادترین ئێوارەکانی ژیانی من بوو، لەو قوتابخانەیەدا، بەڵام هەمیشە لە یادمان بوو لەکوێ دەژیین، دەمانزانی سەعاتەکانی عیبادەت و وانەکانی تۆبە دەستیان پێکرد، دەبێت هەموو قسە و نهێنییەکانی خۆمان لەیادبکەین. فەتانە هەندێجار بەترسەوە دەیگووت: «خەندان بڕوانە، هەموومان ڕۆژ دوای ڕۆژ

سپیتر دەبین». من جگە لەو سپێتییە هەستمدەکرد دەموچاوەکانیش بەشێوەیەکی سەیر درێژدەبێت و چاوەکان بە جۆرێکی بێمانا تروسکایی ژیانیان تیا دەکوژێتەوە، هەستمدەکرد مرۆڤەکان زیاتر و زیاتر ڕەنگی مردوو دەگرن. بەیانیان لەبەر دەستشۆرەکاندا ئەو تارماییە سپی و سەیرانە کۆدەبوونەوە، ئەو مەشقە درێژانەی ڕۆیشتن و زەردەخەنە و نیگاکردن هەموومانی گۆڕیبووە سەر کۆمەڵێک مەخلوقات کە بە نیگایەکی سارد و سیمایەکی نەگۆڕەوە، بەلای یەکدیدا تێدەپەڕین. لەو شەوە درێژانەدا، هەمیشە یەکێک لەناکاو دەیکرد بە هاوار هاوار، دەمانزانی کە شەیتان هەر لێرەیە و وازناهێنێت، بەڵام لەبەر ڕۆشنایی چراکاندا دەمبینی چۆن ئەو کچانە، شانی یەکدی دەگرن و پێکەوە هاوار لە کیژە ترساوەکان دەکەن: «بیسمیلا بکەن... بیسمیلا بکەن... بیسمیلا...». دەنگدانەوەی ئەو هاوارە سەیر و یەک لە دوای یەکە، خەوی لێ حەرامدەکردم. «فەتانە» هەرگیز ئەو ناڵە و گریانانە خەبەریان نەدەکردەوە، بەڵام من فزولێکی شەیتانی پاڵی پێودەنام بە چرایەکەوە بچمە دەرێ و سەیری ئەو دەموچاوانە بکەم. دواتریش کە شتەکان ئارامدەبووەوە، من بەزەحمەت دەمتوانی بخەوم. زۆربەی شەو لەو ساتە ئارام و بێدەنگ و تەلیسماوییانەدا، ئەو پیاوە دەهاتە سۆراغم. لەگەڵ هاتنی شەوە ساردەکانی بارانیشدا، شەوقێکی سەیرم تیا دروستدەبوو، بۆئەوەی ئەو سەرمایە لێمبدات، حەزێکی سەیری بێمانا بۆ ئەوەی بڕۆمە دەرێ و لەو دەشتاییە سەیرانەی بەردەمی قوتابخانەکەدا پیاسەبکەم. دەمزانی ئەو ئارەزووانە چەندە کوشندەن، دەمزانی کە چەندە حەرامە و چەندە دژی یاساکانی ئەو تۆبەخانەیەن، بەڵام نەمدەتوانی بیریان لێنەکەمەوە. شەو لە دوای شەو من کەمتر و کەمتر دەخەوتم، هەتا لەو ساتانەشدا کە هەموو کچە تۆبەکارەکان دەخەوتن هەر وریابووم، گوێم لە ئیقاعی شەو دەگرت، لەنێوان ژوور و ڕاڕەوەکاندا، گوێم لە قسەی ئەو کچانە

دەگرت کە بەدەم خەوەوە قسەیاندەکرد، تارمایی ئەو کچانەم دەبینی کە بەدەم خەوەوە دەڕۆیشتن و دەگەڕانەوە، هەر لەو شەوانەشدا ڕاچڵەکان و خورپە سەیرەکانی لەیلام بینی، لەیلا لە هەمووان خێراتر لاواز دەبوو، ڕەنگیشی بە ئەندازەیەک بەرەو سپێتی دەچوو، چیتر بەزەحمەت لەگەڵ سپێتی دیوارەکاندا جیادەکرایەوە. بەیانیانیش کە خەونەکانی خۆمان بۆ زەینەب دەگێڕایەوە، لەیلا هەمیشە بە چاوێکی فرمێسکاوییەوە لەو ژوورە دەهاتەدەرێ و دەیگووت: «هیچ شتێک سودی نییە... سودی نییە».

نیوەشەوێکیان، لەناکاو لە خەو ڕاچڵەکی، من ئەو کات لە ناو جێگاکەی خۆمەوە سەیرمدەکرد و سێبەرەکەیم بە ڕۆشنی دەبینی. شەوێکی تاریک بوو، هەستا و لەسەر لێواری قەرەوێڵەکەی خۆی دانیشت، لەوەوبەر نەمدیبوو شەوان بەو جۆرە هەستێت، بەڵام بە هێمنی هەستا و سەری خستە ناو دەستییەوە و بەئارامی دەستیکرد بە «گریان»، من لە تاریکییەکەدا بە دەنگێکی هێمن لێم پرسی: «لەیلا... بۆ دەگریت؟». لەڕاستیدا چاوەڕوان نەبووم وەڵاممبداتەوە، بەڵام گووتی: «لەبەرئەوەی سوودی نییە، من گوناهبارم و بە گوناهباری دەمێنمەوە». من بە ئەسپایی گووتم: «تۆ لە خۆشکە تۆبەکارە باشەکانیت». گووتی: «هەمووی درۆیە... درۆ... من هەموو شەوێ خەوی ناخۆش دەبینم، هەموو شەوێ هەموو شتەکانی ڕابوردوو دەبینمەوە، من ناتوانم تۆبەبکەم». لەیلا بەڕاستی دەیویست تۆبەبکات، بەڵام نەشیدەتوانی لە لەشی خۆی ڕزگاری بێت. ژمارەیەکی زۆری دیکەش لە کیژەکان دەیانویست تۆبەبکەن و هەموو شتێک لەبیر خۆیان ببەنەوە، وەلی کەس وەکو لەیلا نەبوو، ترس و پەشیمانییەکانی لەیلا لە «شنۆ»شی تێدەپەڕان کە ئەو کات لە هەمووان زیاتر لە ترس و ئەشکەنجەدا دەژیا. لەیلا لە دوای ئەو شەوەوە حاڵەتی زۆر ترسناکی بەسەردەهات، تای زۆری لێدەهات، بەشێوەیەکی سەیر لەرز دایدەگرت، ئیدی بەیانیان نەیدەتوانی هەستێت، نەیدەتوانی

بێتە پۆلەکان، نەیدەتوانی خواردن وەربگرێت، ڕۆژێک زەینەبی کوێستانی و مامۆستاکان هەموو هاتنەسەری، من جورئەتمکرد و گووتم: «پێویستە ببرێت بۆ نەخۆشخانە»، بەڵام زەینەب گووتی: «بڕوا و گوناه بە جۆرێکی سامناک لە ڕۆحیدا لە شەڕدان... لێی گەڕێن خۆی هێدی هێدی یەقین دەدۆزێتەوە». لەو شەوانەدا هەندێ جار مەهتابی خوشکی هەڵدەستا و دەستی دەخستە سەر نێوچاوانی، بە بێدەنگ عارەقەکانی بۆ وشکدەکردەوە، بە بێدەنگ دایدەپۆشی، بە بێدەنگ ئاوی دەکرد بەدەمییەوە، بۆ تاکە جارێکیش چییە، نەمدی پێکەوە قسەبکەن، ئەو گونجان و خۆشەویستییەیان بۆ یەکتر تەنها لە بێدەنگیدا بەرقەراردەبوو، هەرکاتێک قسەیانبکردبایە بەشەڕدەهاتن. هەندێک شەو تەنها من و لەیلا دەماینەوە، لەو شەوانەدا کە دڵنیابووایە هەمووان خەوتوون، یەکەیەکە دەکەوتە گێڕانەوەی خەونەکانی خۆی. ئەو خەونی بە شاری سپییەوە دەبینی، شار کە سەرتاپای درەخت و ماڵ و ئادەمییەکانی سپی بوون. خەونی بە کۆمەڵێ پیاوەوە دەبینی کە چاویان تەنها سپێنەی هەیە و بەس، سەرما لە خەونەکانیدا لە هەر شتێکی تر کوشندەتر بوو. هەمیشە لە خەونەکانیدا گوڵەکان لەسەرما دەمردن، باڵندەکان لەسەرما دەمردن، گیانەوەرە کێوییەکان لەسەرما دەمردن. من سەرەتا وامهەستدەکرد کە پەتای ئەو سەرما کوشندەیە هەر جەستەی لەیلای داگیرکردوە، بەڵام ڕۆژانی دواتر سەلماندی کە چەندەها کیژی دیکەش ئەو هەستە سەیرەیان بە ساردی لا دروستبووە. لە قاتەکانی سەرەوەش چەندین کچ تووشی ئەو لەرز و ساردبوونەوە کوتوپڕە هاتبوون، هەندێ شەو هەموو بەتانی و لێفەکانی خۆمان پیادەدا بەڵام ئەو هەر دەلەرزیی، گەر تا بەر دەستشۆرەکەش لەگەڵیدا بچووبایناییە، دەستی بە جۆرێ ساردبوو سەرپەنجەکانمانی دەتەزاند. شەوێک بە منی گووت: «لەو ئاگرەدا نەبێت، ناتوانم بحەوێمەوە... لە ئاگردا نەبێت نازیم». ڕۆژێکی

دیکەش بە زەینەبی کوێستانی گووت: «مەیلێکی زۆرم بۆ ئاگر هەیە، تەنیا ئاگر دەتوانێت چاکمبکاتەوە». من نازانم زەینەب چەند لەو دەردە سەیرەی لەیلا تێدەگەیشت، بەڵام دەمزانی ئەم قوتابخانە بەدە بەجۆرێکی سەیر ساردە، بەجۆرێکی سەیر بێدەنگە... نەخۆشکەوتنی لەیلاش بەشێوەیەکی بێمانا، نائومێدی و ترس و کپییەکانی قوتابخانەی قووڵکردبووەوە. فەتانە دەیگووت: «تاکە ڕێگایەک لەبەردەمماندا بێت ئەوەیە پەپولەی زیاتر بدۆزینەوە، تا زیاتر پەپولە بدۆزینەوە، زیاتر هەستدەکەین شتێکی خۆمان هەیە». من و فەتانە ڕۆژانە بە نهێنی کاتێکی زۆرمان لە گەڕاندا بەدوای پەپولەکاندا بەسەر دەبرد، ژمارەی پەپولەکانیش لەوە زیاتر بوو کە چاوەڕوانماندەکرد، فەتانە دەیگووت: «پەپولەکان هەمیشە زۆربوون. لەمەوبەر چاوی ئێمە نەیبینیبوون، بەڵام ئێستا دەتوانین بیانبینین». پەپولەکان لە هەموو شوێنێک بوون، لە ڕاڕەوەکاندا، بە بنمیچەکانەوە، لە ژێر مێزەکاندا، لەسەر فەرشەکان، لەسەر لێواری پەنجەرەکان، بە پەردەکانەوە. من زۆر جار دەترسام یەکێک بەو پەپولانەوە بمانبینێت و لای زەینەبی کوێستانی شکاتمان لێبکات، چونکە تەواو نەمدەزانی ئایا کۆکردنەوەی پەپولەکان دژی تۆبەیە، یاخود نا. فەتانەش دەیگووت: «نازانم، لەوانەیە قەدەغەبێت... وا هەستدەکەم قەدەغەبێت». بەڵام فەتانە نەدەترسا و دەیگووت: «گرنگ ئەوەیە شوێنێکمان هەیە پەپولەکانی تیا بشارینەوە».

ئێوارێیەک کە بە نهێنی سەیری پەپولەکانمان دەکرد، فەتانە بە ئەسپایی گووتی: «لەوانەیە بینینی ئەم مێرووە قەشەنگانە، لەیلا چاکبکاتەوە... کێ چوزانێت، شتێکی جوان نابێت بە دەلیلی». ڕۆژێک لەسەر قسەی فەتانە، چیرۆکی پەپولەکانمان بۆ لەیلا باسکرد، بە هیوای ئەوەی کە ڕاوکردنی پەپولەکان کەمێک لەو جیهانە ساردە بیهێنێتەدەرێ، بەڵام ئەو هەرگیز تێنەگەیشت، ئێمە باسی چی دەکەین.

چەندین ئێوارە دەمانبردە کتێبخانەکە و کتێب بە کتێب، گەنجینەی پەپولەکانمان نیشاندەدا، پێماندەگووت: «لەیلا، بڕوانە، ئەم پەپولانە، بڕوانە... لەوانەیە سەیرکردنی ئەم شتە قەشەنگ و پچوکانە، ئەو ترس و ساردییەت لەبیربەرێتەوە». دەمانگووت: «ئەم پەپولانە ئێمەی لە دەریای گەورەی ترس و وەڕزیی دەرهێنا». هەندێک جار کەمێک شادومان دەبوو، هەندێک جار بریسکەیەکی خۆشی و زەردەخەنەیەکی پڕ نهێنی دەکەوتەوە سەر لێوی، بەڵام دوای چەند ساتێک ئەو ترس و لەرز و نائومێدییە سەرلەنوێ دەگەڕایەوە سەر سیمای. کە سەریشدەکەوتەوە بۆ دونیای ساڵۆنەکان، ترس و تەنهایی و بێزاریی لە خۆی و لە دونیا زیادیدەکرد، بە جۆرێک هەمیشە دوای سەردانی کتێبخانەکە، لەیلا حاڵی خراپتر دەبوو. دواجار فەتانە گووتی: «مەرج نییە هەموو کەس لە پەپولەکان تێبگات». ئەو تا دەهات سەرما زیاتر تەنگی پێهەڵدەچنی. من دەمگووت: «هەموو ئەوانەی بەڕاستی تۆبەدەکەن، لەشیان زیاتر و زیاتر سارددەبێتەوە، زیاتر و زیاتر سەرما ئازاریاندەدا». بە فەتانەم دەگووت: «ئەو ساردییەی لە جەستەی زەینەبی کوێستانییەوە دێت، خورافەت نییە، درۆ نییە، ئەوە تەنیا ساردی ڕووت و قووتی نیگاکانی نییە، بەڵکو ساردی لەشێکە تۆبەیکردوە».

شەوێک لەو شەوانەدا، لەناکاو لەیلا هەستا و لە ژوورەکەی چووەدەرێ. ئەو کات من لە ناوەڕاستی ڕاڕەوەکەدا سەیری تارمایی ئەو پیاوەم دەکرد کە لە نزیک پلەکانەوە چاوەڕوانیدەکرد، کە لەیلام بینی ئەو تارماییەم بەخشی بە شەو و دوای لەیلا کەوتم کە بە بێدەنگ بە پلەکاندا چووەخواری و منیش بەدوایدا. ئەو شەوە چەند سەیرم لێهات کە ئەوم بینی بە هێمنی چووە ناو مەخزەنی هەڵگرتنی سووتەمەنییەکانی قوتابخانە، مەخزەنێکی چکۆلەبوو دەکەوتەپاڵ چێشتخانەکەوە، ئەو بە ئەسپایی دەرگاکەیکردەوە و لە ناوەڕاستی تەنەکە نەوتەکاندا وەستا،

وەکو ئەوەی بۆ شتێک بگەڕێت، چاوی بەو دەورووبەرەدا گێڕا و لە ناو بەرمیل و تەنەکە و کەبرگە گەورەکاندا خۆی گرمۆڵەکرد و دانیشت. ئەوە سەرەتای ئەو شەوە سەیرانەبوو کە لەیلا، لە ناو ئەو مەخزەنەدا بە نهێنی دەیبردنەسەر. من ئەو کات هۆیەکم شک نەبرد ئەو لەزەتەی لێزەوتبکەم، لەبەرئەوە بە بێدەنگی گەڕامەوە بۆ ناو جێگاکەم و بەتانییەکەم دایەوە بەسەر خۆمدا و خۆشبەختانە تا کاتی نوێژی بەیانی خەوتم.

ئەو شەوانەی کە لەیلا لە ژوورەوە نەدەخەوت، من دوای ئەوەی کە گوێم لە چیرۆکەکانی فەتانە دەگرت، دەربارەی پەیوەندییە سەیرەکانی «میدیا» و «مانگ» باشتر دەخەوتم... بۆ ساتێکیش لەوباوەڕەدا نەبووم. چارەنوسێکی وا ترسناک چاوەڕوانی لەیلا بکات، ئەو کاتانەش بوو یەکێ لە مامۆستاکان بەردەوام باسی سیفەتە گەرم و ساردەکانی شەیتانی دەکرد. هەندێ شەو لە ناو جێگاکەدا هەوڵمدەدا مانای ئەو وانانە بە ژیانی خۆمەوە گرێبدەم، هەوڵمدەدا لەڕێگای ئەو دابەشکردنەوەوە لە لەیلا تێبگەم... بەڵام هەر زوو ئەو شەوە ترسناکە هاتە پێشێ، کە ئێستاش دوای ساڵەهای ساڵ لەبەرچاومە و بەردەوام ترسەکانی دەژیم. لە بەدبەختیدا من ئەو شەوە خەوتبووم و لەسەر دەنگی هاوار و ڕەنگی ڕوناکییەکی گەورە بەئاگاهاتمەوە، هاوار و قیژە قیژی کچان ڕایچڵەکاندم، فەتانە بەر لە من لە ژوورەکە چووبووە دەرێ. کە بە پلەکاندا چووینە خوارێ، هەموومان ئەو مەخلوقە بەستەزمانەمان بینی بە گڕەوە لە ناوەڕاستی ڕاڕەوەکەدا، چەند مەترێک دوور لە دەرگای ژوورەکەی زەینەبی کوێستانییەوە وەستابوو، نە هاواریدەکرد، نە هەڵدەپەڕێ، بەڵکو لەویادا وەستابوو و تەماشایدەکردین، لەیلابوو، سەرەتا کەس نەیناسییەوە من نەبێت، هاوارمکرد: «لەیلایە... لەیلا». زەینەب و مامۆستاکان هەموو بە قژی ئاڵۆزکاوەوە و بێسەرپۆش هاتبوونەدەرێ و سەیری ئەو پارچە گڕەیان دەکرد کە هێمن لێماننزیکدەبووەوە، گڕەکە بە ئەندازەیەک کڵپەیسەندبوو،

کەسمان نەماندەتوانی لێی نزیکببینەوە، لەسەرخۆ دەهاتە پێشێ و تا زیاتریش بهاتبایەتە پێشێ لە ناو کڵپەکاندا لەیلام جوانتر دەبینی، هەمان شێوەی هەبوو وەکو ئەو شێوەیەی یەکەم ڕۆژ لەبەر هەتاوی حەوشەکەی پشتەوەدا بینیبووم، بۆ ساتێک لە ناو گڕەکەدا دەستیبرد بۆئەوەی دەرگای یەکێ لە ژوورەکان بکاتەوە، بەڵام وەکو ئەوەی تینی ئاگرەکە سەری لێشێواندبێت دەستی کێشایەوە. لەو کڵپانەدا فەتانە تاکە کەسێک بوو هۆشی بەوەبوو بەتانییەکی تەڕ بهێنێت و بەپرتاو هەوڵبدات بیدات بەسەر گڕەکاندا. تاکە کەسێک بوو لەنێوانماندا دیمەنی ئەو ئاگرە ئیفلیجی نەکردبوو، دەیقیژاند: «بیکوژێننەوە... بیکوژێننەوە». بەڵام چیتر لە ناو ئەو دوکەڵ و بۆکرووزی سووتانەدا هیچ نەدەکرا. پاش ساتێک من ئیدی لەیلام نەدەبینی، تەنها فەتانەم دەبینی کە هەڵدەپەڕیی و هاواریدەکرد: «بیکوژێننەوە...». یەک لەسەر یەکیش بەتانی لە ژوورەکان کێشدەکرد و دەیدا بەسەر ئاگرەکەدا، بەڵام پاش تۆزێک بەتانییەکان دەسووتان و لە ژێرەوە کڵپەکان هەڵدەستانەوە. لەیلا کە سەرەتا وەکو پارچە بەفرێکی سپی لە ناو ئاگرەکەدا دیاربوو، وردە وردە وندەبوو، وردە وردە بۆکرووزێکی کوشندە و ترسناک بە تۆبەخانەکەدا بڵاودەبووەوە. ئەوەی بەلای منەوە سەیربوو، ئەو ترس و پەشۆکانەی زەینەب و مامۆستاکان بوو، ئەو خۆ بەدوورگرتن و شڵەژانە سەیرەبوو کە تووشیان هاتبوو... تا لەیلاش لە ناو کڵپەکاندا توایەوە و بووە خۆڵەمێشێکی ورد و ڕەش لێی نزیک نەکەوتنەوە... بە درێژایی ئەو کاتەش یەکێک لە دواوە لە ناوقەد و کەمەرمەوە منی گرتبوو، من هۆشی ئەوەم نەبوو بزانم چییە یان کێیە؟ دواتر کە ئاوڕمدایەوە بینیم «مەهتاب»ـە، کە تەماشای سووتانی خوشکەکەی دەکرد و دەلەرزی، بە ددان لێوی خۆی دەکرۆشت و نەیدەتوانی هاواربکات، بەجۆرێک بە لێوی خۆیدا دەنووسا هەموو جلەکانی من و خۆیشیشی خوێناویکرد،

دواجار بەر لەوەی من بتوانم دەستی بگرم و ئارامیبکەمەوە بێهۆش لە پێشدەممدا کەوت و بە بوراوەیی بەلاداهات.

خۆسووتانی لەیلا کە دواتر زەینەب دەیگێڕایەوە بۆ ئەو نەخۆشییە کوشندەیەی لە وڵاتدا بڵاوبۆتەوە، نەخۆشی خۆسووتانی کچان و ئافرەتان، تەنها غرووری زەینەبی لەقنەکرد، بەڵکو وەکو ئارەزوویەکی نهێنی و مەیلێکی قووڵ بەرەو مردن، لە هەمووماندا دەرکەوتەوە. ئەو بەیانییە دوای ئەوەی پاشماوەی لاشە خەڵوزینەکەی لەیلامان پاککردەوە، دوای ئەوەی چەند پۆلیسێکی بچکۆلانە کە هەموویان بەشێوەیەکی سەیر کورتەباڵا و قەڵەوبوون پرسیاریان لە هەمووومان کرد، من کە بۆنی سووتانی لەیلا هەمیشە لە هەناسەمدا بوو، گێژ و ترساو لە جێگاکەی خۆمدا دەستمکرد بە گریان، فەتانە بەردەوام دەیگووت: «ئەگەر یەکێکی دیکەم لەگەڵدا بووایە، نەمدەهێشت بمرێت... نەمدەهێشت وا بسووتێت». ئەو ڕۆژە هەموومان تا ئێواریێ دەگریاین، فەتانە نەبێت کە لەسەر جێگاکەی خۆی دانیشتبوو و بێدەنگ سەیریدەکردین، مەهتابیان لە ماشێنی پۆلیسەکاندا برد بۆ خەستەخانە و تا چەند مانگێک نەگەڕایەوە. نزیک نوێژی عەسر، زەینەب کەمەکێ هاتبووەوە سەر خۆی، کۆیکردینەوە و پێیگوتین: «سنوورێک لەنێوان تۆبەکردن و خۆوێرانکردندا هەیە، سنوورێکی باریک و نەبینراو، سنوورێکە تەنها ڕۆحێکی ئیمانداری ڕاستەقینە دەیدۆزێتەوە... ئەوەی ئەو سنوورە ببڕێت دەکەوێتەوە ناو کوفر... مەبەست لە تۆبەکردن جڵەوکردنی ڕۆح و فێربوونی ملکەچییە، نەوەکو خۆفەوتاندن... هەر خودا خۆشی، تەنها بەتەنها بۆی هەیە ئەو ڕۆحانەی کە دروستیکردون، بیباتەوە بۆ دیاری خۆی... خۆسووتاندن ئارەزوویەکی شەیتانییە، شەهوەتەکان هەموو گەرمن، ئارەزووەکان هەموو گەرمن، بەڵام هەندێ جار ئارەزووەکان گەرمی خۆیان دەبەخشن بە شتەکانی تر، هەتا تۆبەکردن دەبەستنەوە بە گوناهەوە... مرۆڤ

ناتوانێت بە خۆسووتان لەدەست شەهوەتەکانی ڕزگاریبێت، بەڵکو تەنها بە زەلیلکردنی لەش و پچووککردنەوە و ڕامکردنی لە عیبادەتدا، دەتوانێت کاری وابکات».

من ئەو ڕۆژە نەمتوانی تا سەر گوێ لە زەینەبی کوێستانی بگرم، غەمێکی سەیر ڕۆحمی ئازاردەدا. فەتانە پێیدەگووتم: «خەندان، خەندانی چکۆلە، غەمگین مەبە... تۆبەکردن بریتییە لەوەی ببین بە مرۆڤێکی غەمگین... بزانە غەم یان بەرەو مردنمان دەبات یان تۆبەکردن». من ئەو ئێوارەیە بێئەوەی هیچ لە قسەکانی فەتانە تێبگەم، پارچە ئاوێنەکەم لێقەرزکرد و بە پەلە ڕامکردە دەستشۆرەکانەوە، لەوێ لە تەوالێتێکی چکۆلەدا سەیری خۆمم کرد، ئەو زەردەخەنەیەم نەبینی. دوای سووتانی لەیلا ئیدی ئەو زەردەخەنەیە لە ژیان و لە سیمامدا سڕایەوە... تەنها ساڵانێکی زۆر درەنگ و لە ژێر فشاری ئەو ڕۆحە زیندووەی فەتانەدا جارێکی دی توانیم زەردەخەنە بگرمەوە، لەو ئێوارێیەوە خەندەکانم مردن، ئەو خەندانەی کە هەندێ جار دەمتوانی لە ڕێگایانەوە ژیان وەکو گەمەیەک تەماشابکەم.

# ٢٠

که نەسرەدینی بۆنخۆش هەواڵی گەیشتنی کەژاوەی ئیمانی پێگەیشت، لە گوندێکی بچکۆلانەدا لە ناو چیا عاسییەکانی باکوردا، خەریکی ڕێکخستنی دواهەمین بەشەکانی «کەشکۆڵی عاشقان» بوو... بە ئەندازەیەک بێخەم بوو، هەندێ ڕۆژ جگە لە کارکردن و پێداچوونەوە بەسەر تراژیدیای عەشقە کۆنەکاندا، ئیشێکی دیکەی نەبوو. کاتێکیش نەسرەدینی بۆنخۆش ڕۆژەکانی لە ناو بەحری کەشکۆڵە سەیرەکەیدا دەبردەسەر، کەژاوەی ئیمان بە خۆی و سەدەها لە خوداترسی دڵسۆزەوە، لە کاروانێکی درێژدا گوند بە گوند لە باشوورەوە بەرەو ناوچە عاسی و شاخاوییەکان سەردەکەوت، گوند دوای گوندیش ئەو لەشکرە تادەهات گەورەتر و گەورەتر دەبوو. ئەو کات مەلا کەوسەری باغەوان هەموو هێز و توانای خۆی دەخستەگەڕ تا ڕۆحێکی نوێ، هوشیارییەکی تازە لە دڵی ئەو گوندنشینانەدا دروستبکات، هەرچەندە ئەو زەمانێک بوو لەو باوەڕەدابوو کە ژیانی ناو سروشت، کەمی خوێندەواری، فەسادی تاقمە سیاسییەکان، ڕەوشتی ئەم گوندنشینانەیان شێواندووە. بەڵام لەگەڵ هەموو گومانەکانی مەلا کەوسەریشدا، هەموو ئەو تایەفە و خێڵانەی کە کچیان تووشی گوناه بووبوو، بە گەرمی پێشوازیی کاروانەکەیان دەکرد.

ئەو پێشمەرگەیەی کە هەواڵی کەژاوەی ئیمانی بۆ نەسرەدین هێنا، بە حەماسێکی منداڵانەوە باسی کچێکی سپی پۆشیشی بۆ گێڕایەوە

کە لەبەر مینبەری مزگەوتەکاندا، بە هێمنی لەسەر کورسییەکی سپی دادەنیشێت و بەسەرهاتی دارستانێک دەگێڕێتەوە کە بۆتە نیشتەجێی عاشقانی یاخی. بەوەدا کە پێشمەرگەکە ناوی ئەو کچەی یادکردبوو، نەسرەدین وەکو سەرەتا نەیدەزانی، دەبێت کامە کیژ بێت هەڵهاتبێت و دواتر بووبێت بە چاوساغی ئەو کاروانە... هەمان شەو کە بۆنخۆش بە چیرۆکەکەی زانی، بەفرێکی قورس بەسەر هەموو هەرێمەکەدا باری. بەڵام نەسرەدین، بێئەوەی سڵ لەو گەردەلوولە ساردانە بکاتەوە کە لە خۆرهەڵاتەوە دەهاتن، پوزەوانەکانی هەڵکێشا و درەنگوەختێ گوندی جێهێشت و بەرەو باشوور کەوتە ڕێ... ئەو کات توانایەکی سەیری بۆ بەناو بەفردا ڕۆیشتن و شەو تەیکردن هەبوو. ئەو شەوە تا نیوەڕۆی ڕۆژی داهاتووش نەسرەدین جگە لە چەند گوندییەک کە ئافرەتێکی نەخۆشیان دەبرد بۆ شارۆچکەیەکی نزیک، هیچ کەسی نەبینی، بەڵام کە زیاتر بەرەوخوار کشا، لەدەمی ڕێبوارەکانەوە شوێن و ئاڕاستەی کەژاوەی ئیمانی دۆزییەوە. نەسرەدین دەمەو ئێوارە گەیشتە ئەو گوندەی کە دوو ڕۆژ بوو ئیمانداران لە هەموو لایەکی ئەو هەرێمەوە پۆل پۆل ڕوویان تێدەکرد، تا لە ئێوارێی مزگەوتە سپییە گەورەکەیدا، گوێ لە وتارە بە جۆشەکانی مەلا کەوسەری باغەوان بگرن. لەگەڵ گەیشتنیدا بە گوندەکە، لە زاری چەندەها کەسەوە، بەچەندەها شێوەی جیاواز، چیرۆکی ئەو کەنیشکەی بیستەوە کە لە «جەنگەڵی شەموەتەکان» یان لە «هەڵدێری زینا» ڕایکردبوو... ئەو دەبایە چەند سەعاتێک لەبەر دوکانۆچکەیەکی تەنەکەدا چاوەڕوانبکات تا کۆبوونەوەکە دەستپێدەکات، حەوشی مزگەوتەکە هەر لە زووەوە پڕبووبوو لە سەدەها ژن و پیاو کە زۆریان لە گوندەکانی دیکەوە هاتبوون، نەسرەدینیش وەکو هەر غەریبەیەکی تر شوێنی گومان و پرسیاری کەس نەبوو، بەتایبەتی بە بێدەنگ و بێ هیچ قسەیەک کە گومان بورووژێنێت دەیپرسی و

گوێیدەگرت.

لەگەڵ دەستپێکردنی مەراسیمی وتاردابەستن و زیکر گەرمکردندا، لە ناو دەیەها ژنی دەفبەدەستدا کە چەندین ڕۆژ بوو هاوڕێی کاروانەکە بوون، نەسرەدینی بۆنخۆش، مەعسومەی لە جلێکی سپیدا بینییەوە. نەسرەدین دواتر دەیگووت: لە ژیانیدا کەم لە ساتەکانی نائومێدی، بەئەندازەی ئەو ساتە ئازاریانداوە. بینینی مەعسومە و دڵنیابوونی نەسرەدینی بۆنخۆش لە ئاشکرابوونی حەشارگە نهێنییەکەی عاشقان، جگە لە نائومێدی، ترسێکی بێسنووریشی دەربارەی چارەنوسی عاشقەکانی دی خستە دڵیەوە. ئەو لە دوێنێ شەوەوە دەیویست لە تەواوی حکایەتەکە بگات، ئێستاش خۆی لە بەردەم ئەم مزگەوتەدا هەلی بۆ ڕەخسابوو، بەگوێی خۆی وتارەکانی مەلا کەوسەری باغەوان ببیسێت، کە ئەو عەشقستانەی بە شەیتانستان ناودەنا، بە گەروویەکی پڕ لە سۆز باسی چارەنوسی ڕەشی زیناکاران و بەچە زۆڵەکانیانی دەکرد، باسی ژنانی ناشەرعی و پەیوەندییە حەرامەکانی دەکرد، هاواریدەکرد: «وەرن ئەم باغی زوڵمەتە کرتێبەردەین... وەرن خۆری گیراوی شەرەف بەرەڵا کەین... وەرن گوڵستانی ئەخلاق ئاوبدەین».

نەسرەدین کە ئەو جۆش و خرۆشەی خەڵکانیشی دەبینی، کە چاوی بە سەدەها چەکبەدەست دەکەوت کە هەریەکەیان لە خێڵێکی جیاواز و هۆزێکی جیاواز و عەشرەتێکی جیاوازەوە هاتبوون، کە ئەو ژنانەی دەبینی کە هەندێکیان لە چیا بەرزەکانی کوێستان و هەندێکیان لە گوندەکانی گەرمیانەوە خۆیان گەیاندبووە ئەم کەژاوەیە، دەیزانی کە هیچ چارەیەکی نییە ئەوە نەبێت کە بەر لە خۆرئاوابوون بکەوێتەوە ڕێگا و هەموو ئەو عاشقانە دەربازبکات. نەسرەدین ئێستاش بە غەمێکی گەورەوە دەڵێت: «دوا هیوام ئەوە بوو ڕزگاریانبکەم». ئەو دەیزانی کەژاوەکە بە هێمنی گوندەکان دەبڕێت، لە هەموو گوندێک وچاندەدات،

چەکدار کۆدەکاتەوە، ئیماندارانی داخ لە دڵ لەگەڵ خۆیدا دەبات، کیژ و کوڕانی گەنج لە بانگهێشتە شەیتانییەکانی شەهوەت ئاگاداردەکاتەوە... ئەوەش هەمووی ماوەیەکی باش بوو، بۆئەوەی ئەو عاشقانە جەنگەڵ چۆڵبکەن، بەڵام بەرەو کوێ؟... نەیدەزانی. ئەو ئێوارەیە نەسرەدین بەرلەوەی تا کۆتایی ئەو مەراسیمە بوەستێت، بڕیاریدا پێش گەڕانەوەی گوندییەکانی دیکە بکەوێتە ڕێگا و وەک پیاوێکی نەناسراو بە دزییەوە ئەو هەرێمە تەیبکات و بچێتە عەشقستان.

ڕۆژی دووهەم، نزیکی نیوەڕۆ لەو پەیژە هەزار بە هەزارە دابەزی، بەڵام کە هەر لە ملەی هەڵدێرەکەوە تەماشای ئەو زەوییەی کرد و ئەو ڕەنگە زەرد و ژاکاوەی بینی کە لە هەندێ شوێندا مەیلەو خۆڵەمێشی دەیپڕوانی، نائومێدییەکی قووڵ و کوتوپڕ بەر سینەی گرت، ئەو هەرگیز ئەو خاکەی بەو جۆرە پەشموردە و غەمگین نەبینیبوو، هەواش وەکو جاران پڕ نەبوو لە ڕەنگ و نەخش و پاشماوەی عاجباتی زەمانە بەسەرچووەکان، بەڵکو ئەوی ڕۆژ هەوایەکی سارد و بێڕەحم لەهەر چوارلاوە هەڵیدەکرد و جارجار لە هەندێ شوێنیشدا دەبووە گەردەلوولێکی گەورە، تا زیاتریش دادەبەزیی و گوێی ڕادەدێرا جگە لە دەنگی تورەیی ئاوەکان، نە دەنگی باڵندەیەک، نە شوێنەواری زیندەوەرێک دیارنەبوو، هەتا بۆ ئێستێک نەسرەدین وای خەیاڵکرد کە دەشێت بەر لە دابەزینی ئەو، عاشقان جەنگەڵیان چۆڵکردبێت، بەڵام هێندەی دابەزیی و لەو پردە دارینە بچکۆلانەیە پەڕییەوە، دیمەنی زەوییەکی غەمگین و خۆڵەمێشی لێدەرکەوت کە ڕەنگی فەنابوونێکی کوتوپڕی لێنیشتبوو. پیاوان و ژنان و منداڵانی ئەو زەوییە لە هەر کاتێکی دیکە ترساوتر و تەنهاتر و کەمدووتر دەهاتنە بەرچاو، هەر لە سەرەتاوە پچڕپچڕ و تێکەڵاو هەموو بەسەرهاتەکانی ئەم چەند مانگەی دواییان بۆ گێڕایەوە... چیرۆکی پەیکەری فەرامۆشکراوی

عاشقان، چیرۆکی شیوەنەکانی پەروانە، چیرۆکی بێدەنگی فەرەیدون، مردنی باڵندەکان، هەڵهاتنی مەعسوم و ڕۆیشتنی سیامەند... نەسرەدین تا ئەمڕۆش بێئەوەی هیچ لەو وێرانبوونە لەناکاوە تێباگات، هەمیشە سەربادەدات و دەڵێت: «نەدەبایە حاڵی جەننەتی عاشقان بەو جۆرە بێت». کە یەکەمین جار پەروانەی بینی، ئەو بە ئەندازەیەک لاواز و خەفەتبار بوو وەختەبوو نەیناسیتەوە، دواتریش دەیگووت: «پەروانە، وەکو مەخلوقێکی غوبارئاسا، وەکو کچێک کە تراویلکەکانی چاو دروستیانکردبێت، لە ناو درەختەکانەوە دەرکەوت». پەروانە سەرەتا پێیوابوو کە منداڵە چاوشینەکە، نەسرەدینی بەرەو ئەم دۆڵە ساردە ڕەوانەکردوە، بەحەسرەتێکی زۆرەوە چیرۆکی بێدەنگی فەرەیدون و غەمە بێسنوورەکانی خۆی بۆ گێڕایەوە، دواتریش بەناو عەردێکدا کە پێدەچوو هێدی هێدی شیببێتەوە، عەردێک کە لیتاوی بەفرانباری پێشوو داپۆشیبوو، بەرەو وەرشەکە ڕۆیشتن. کاتێک نەسرەدینی بۆنخۆش فەرەیدونی لە ناو پەپولە چکۆلەکاندا بینییەوە، شتەکانی وەکو ئەفسانەیەک هاتەپێش چاو، ئەفسانەیەکی بێمانا. تاماوەیەک جگە لە تێڕامان لەو پەپولانە هیچی دیکەی بۆنەکرا، پەپولەکان هێندە زۆربوون نەسرەدین نەیدەتوانی یەکەیەکە سەیریانبکات، هەندێکیان بە ڕۆحێکی هێندە عاشقانە ڕەنگکرابوون کە پێدەچوو تەنها هەناسەیەکیان پێویست بێت بۆئەوەی ببنە مەخلوقاتی زیندوو، بەڵام دیتنی فەرەیدون لەو حاڵەدا بە جۆرێ دڵی نەسرەدینی ڕاچڵەکاندبوو کە ساڵانێکی دواتریش، کاتێ وەسفی ئەو ساتەی دەکرد، دڵی پڕدەبوو لە گریان. ئەو ڕۆژە چوار سەعاتی ڕەبەق لەبەردەمیدا وەستا، قسەی بۆ کرد، ڕایوەشاند، بەسەر شانیدا گریا، باسی یادگارە هاوبەشەکانی بۆکرد، باسی نیوەڕوانی حەوزی مەلەکە، ئێوارانی بەر کتێبفرۆشییەکە، مەستبوونی سەر کارێزەکان، سەیرانەکانی بەهار، شەڕەچەقۆکانی

هەرزەکاری، فاقەنانەوەی دەشتەکان، لگاوکردنی ڕۆژانی جەژن، دڵدارییە تێپەڕەکان، تیپەکانی دووگۆلی، یاریکەرەکانی برادەریان... بەڵام هیچی سوودی نەبوو، فەرەیدون هەتا بۆ جارێکیش سەری بەرزنەکردەوە بزانێت کێ قسەی بۆ دەکات. ئێوارەیەکی درەنگ لە وەرشەکە هاتەدەرێ، نیمچە گێژ، نائومێد، بێبڕست، تێکشکاو، لە نزیک بەردێکی گەورەوە، بەرامبەر پەروانە و میدیای غەمگین دانیشت، کە چەندین سەعات بوو لە دەرەوەی وەرشەکە چاوەڕوانیاندەکرد. نەسرەدین بە خەمەوە گووتی: «هیچ شتێک سودی نییە ... من... من ئێستاکە لەخەیاڵی خۆمدا دەگەڕێم، ڕستەیەکی گەلێک دووری فەرەیدونم دێتەوەیاد، ڕستەیەک لە دانیشتنێکی شەوێکی ستۆدیۆکەدا لە شار بە من و گۆڤەندی گووت، کەسمان ئەو کات گوێمان بەو جۆرە قسانە نەدەدا، بەڵام ئەمڕۆ... تەنها ئەمڕۆ، تێدەگەم فەرەیدون مەبەستی چی بوو... ئەو ئەو کات گووتی: ڕۆژێک دێت، هەموو خۆشییە بچوکەکان جێدەهێڵم و لەودیو دیوارێکی ئەستوورەوە کە هێندە ئەستوورە هیچ کەس ناتوانێت بیبڕێت، خۆم بۆ عیبادەتێکی تایبەت تەرخاندەکەم، بۆ ژیان لەگەڵ خەیاڵاتەکانمدا... ئاشکرایە ئەمڕۆ ئەو ڕۆژەیە، ئیدی هیچ کەسێ، هیچ هێزێک ناتوانێت دەستی بگرێت و لەودیو ئەو دیوارانەوە ڕایکێشێتە دەرەوە، لەبەرئەوەی هیچ کەس دەستی ناگاتە ناو ئەو جیهانەی ئەو تیا دەژی... ئێمەش جگە لەوەی کە دەتوانین بۆی بگرین، هیچی دیکەمان پێناکرێت».

نەسرەدین ئەو ئێوارییە دڵنیابوو کە دەبێت ئەو جەنگەڵە چۆڵبکرێت، دەشیزانی دواجار فەرەیدون بەتەنها لەو دارستانەدا دەمێنێتەوە. پەروانە پێیوابوو دوای ئەو پشتهەڵکردنە سامناکەی فەریدون لە هەموو دونیا، ئەو لە ناو ئەم داروبەردە ترسناکەدا هیچی نەماوە بۆی بژێ، میدیاش لەسەر دەفتەرە سپییەکانی دەنوسێت: «خۆشەویستی مرد، با بۆ شتێکی تر بگەڕێین». لەڕێگای گەڕانەوەدا نەسرەدینی بۆنخۆش بەردەوام

حەسرەتبارانە بیریدەکردەوە، پەروانە دەیگووت: «نەسرەدینی بۆنخۆش، ژیان وەکو ئاوێک وایە، هەر دڵۆپێک کە لەبەری دەڕوات دەبێت دڵۆپێکی دیکە جێگای بگرێتەوە، بەڵام لەم دارستانەدا، دەقیقەکان دەڕوات و هیچ شتێ نایەتەوە جێگای... وەرزەکان دەڕۆن و بۆشاییەکی ترسناک لە دوای خۆیان جێدەهێڵن، ڕۆحی ئێمە چین دوای چین دەڕوات و سپێتییەکی ڕەها جێگەی دەگرێتەوە»

بەناو درەخت و جەنگەڵ و کەپرە فەرامۆشکراو و تێکشکاوەکاندا دەڕۆیشتن، بەناو ماڵە قوڕین و تلیساوەکاندا تێدەپەڕین، پەروانە دەیگووت: «ئاسمان لێرەدا قورسترە، بروسکەکان لێرەدا بەشێوەیەکی ئاسانتر ئاسمان و زەوی و ئاوەکان دابەشدەکەن، ژنان بە هێمنی دەبن بە پەڵەیەکی ڕەش، هیچ شتێکیش لێرەدا، لەم عەردەدا خۆی ناگرێت، وشەکان با دەیانبات، پەیوەندییەکان با دەیانبات، خەونەکان با دەیانبات... بەڵام بۆ کوێ؟ کەس نازانێت».

ئەو ئێوارەیە نەسرەدین هەموو ئەو خێڵە کۆدەکاتەوە، دەیەوێت ڕاستییان پێبڵێت، بەڵام سەرەتا تابڵێی دەستەپاچەیە، نازانێت لە کوێوە دەستپێبکات، هەموو هەست بەو غەمگینی و شڵەژانە قووڵەی نەسرەدین دەکەن. ئەو بە ئەسپایی باس لە هەڵهاتنی مەعسوومەوە دەکات، دەنگیشی تابێت نائومێدتر و ترساوتر دەبێت، باس لە گرتنی مەعسوم دەکات لەلایەن ئیماندارەکانەوە، باس لەو کەژاوە گەورەیە دەکات کە بەڕێوەیە، بە هەموویان دەڵێت: «قافڵەیەکی درێژ بۆ وێرانکردنی ئەم هەوارە بە ڕێگاوەیە» پێیاندەڵێت: «چەند ڕۆژێکی تر نابات لەو پەیژەیەوە و لە چەندەها پەیژەی ترەوە پیاوانی چەک بەدەست، دەڕوێشی شمشێروەشێن و ژنانی دەفژەن دێنەخوارەوە، ئەو کات کاتتان نابێت منداڵەکانتان بپەڕێننەوە بۆ ئەوبەر ئاوەکان، کاتتان نابێت لەو گەمارۆیە دەرچن کە بە دڵنیاییەوە هەموو ئەم خاکە دەتەنێتەوە،

ئەو کات وەکو ئەتککراوێک گوند بە گوند دەتانگێڕن، تا دەتانگەیەننە شارە گەورەکان، لە مردن و ڕیسواییش زیاتر هیچ چارەنوسێکی دیکە چاوەڕێتان ناکات. دڵنیابن کاتێکیش نەماوە بۆ بیرکردنەوە، کاتێک نەماوە بۆ پەشیمانی، بزانن ئەم عەردەش بستێکی تیا نەماوە، لە هیچ جێگایەکی دیکە دووبارە نیشتەجێیەکی تری لەمجۆرە دروستبکەین... تەنها چارە پەرتەوازەبوونێکی خێرایە... ڕەوینەوەیەکە وەکو هەور، وەک پەرشبوونەوەی چنگێ لم لە زیخەڵانێکدا. نە کات هەیە، نە زەوی... ئەمە ئەو ڕاستیەیە کە دەبووایە زووتر بمانزانیایە، بەڵام تەواو... ئێستاکە زەنگەکانی ترس لێدەدەن، با بڕۆین. شتەکان بپێچنەوە و با بڕۆین، ئەوەی هەڵناگیرێت فڕێیبدەنە ئەو ئاوەوە، با ئەم چەمە بیانبات بۆ جێگایەکی دوور، لێگەڕێن با خانو و کەپرەکان لە جێگای خۆیان بن، تەنها ژیانی خۆتان بدەن بە کۆڵتاندا و سەرکەون و بگەڕێنەوە بۆ ناو ئەو دونیایە، با هەریەکەشتان ئاڕاستەیەک بگرێت... هەریەکەتان ڕێگایەک بدۆزێتەوە، ئەگەر لە ڕێگا پرسیان بۆ کوێ دەچن، بڵێن بەرەو ڕووی ئەو کاروانە دەچین کە بەرەو جەنگەڵی زیناکەران دەچێت. چونکە سەر ڕێگاکان پڕن لەو خەڵکانەی دوای ئەو کەژاوەیە کەوتون».

قسەکانی ئەسرەدینی بۆنخۆش بە ئەندازەیەک هەمووانی شڵەژاند کە چیتر جەنگەڵ بە قیامەت دەچوو. یەکەمین کەس کە لێی نزیکبووەوە گۆفەند بوو، گۆفەند ئێستا تەواو لە پیاوێکی ناساغ دەچوو، چاوانی پڕبوو لە زەردەخەنە، بەڵام لەهەمان کاتدا شێوەی ڕۆحێکی نەخۆشی هەبوو... گۆفەند بە جۆرێکی سەیر دەست و قژ و باڵای دەجوڵاند، هەندێ سات بە پێغەمبەرێکی دەکرد و هەندێ ساتیش بە پیاوێکی سەرلێشێواو و نائاسایی. گۆفەند دەیگووت: «لێگەڕێن با بمرین... با بمرین، من ئێرە بەجێناهێڵم، ئێرە دونیایەکی ترە... تۆ بڕۆ... بڕۆ، بە هەموویان بڵێ ئێرە سنووری خاکێکی دیکەیە، بۆیان نییە پێی

تێبخەن».

نەسرەدینی لەوەوبەر گوڤەندی تەنها لە حاڵەتی ویقاردا بینیبوو، هەتا تووڕەبوون و گریان و نائومێدییەکانی ویقاریان تیابوو، بەڵام ئەمڕۆ گوڤەند بە جۆرێکی سەیر قسەیدەکرد کە جگە لە سێبەری شێتی و سەوداسەری هیچی دی تیانەبوو. نەسرەدین بە هێمنی دەستی دەخستە سەر شانی هاوڕێی ڕۆژانی شار و دەیگووت: «گوڤەند، ئەمە یەکەمجار نییە خەڵکی ناچاربن واز لە خەونەکانیان بهێنن، ئێمە لە ڕۆژگارێکی ترسناکدا دەژین، کە مرۆڤ دەبێت بتوانێت دەستبەرداری خەونەکانی بێت و بژی، دەبێت فێربین ژیانمان لە ناو ئەم ئاگرانەدا، بەریەست لە پشتی بەربەست، ئاودیوبکەین... کە خەونەکان دەکوژرێن، تەنها شتێک کە مانای هەیە ژیان خۆیەتی، کەرامەتی تایبەتی ژیان و هەقی تایبەتی مرۆڤەکانە لەسەر زیندوێتی... هەندێ قۆناغ هەیە لە مێژووی ئەم وڵاتەدا، زیندوێتی تیایدا هەموو شتێکە، گرنگ ئەوەیە بژیت... ئێستا و لێرەدا گرنگ ئەوەیە بژین... من هەمیشە بۆ عەشق سووتاوم، بەڵام ئەو شەرەفەی کە مرۆڤ زیندووبێت، شەرەفێکی کەم نییە...». گوڤەند لەو خێڵە ترساوە جیادەبووەوە و بەرەو ناو دونیای پەیکەرەکانی خۆی دەڕۆیشت، بەرەو ناو زیندەوەرە خورافییەکانی دەڕۆیشت، نەسرەدینی بۆنخۆش و دلارامیش لە دوایەوە بوون، ئەو دەستی لە کۆترە نارنجییەکانی دەدا و دەیگووت: «ژیان لە جوانی ئەم پەیکەرانەی من گرنگتر نییە، ژیان لەم عەشقە گەورانە گەورەتر نییە کە من دەیبینم، ژیان لەو شارانە گەورەتر نییە کە لە خەیاڵی منداییە... نەسرەدینی بۆنخۆش، هاوڕێم، ڕاستی بڵێ، ژیان زۆر جار لە ئێمە بچوکترە... ڕاستی بڵێ، بڕۆ، بڕۆ و پێیانبڵێ: ژیان لە من بچوکترە».

گوڤەند وەک شێت، دارەکەی دەستی بەرزدەکردەوە و دەیگووت: «ژیان لە ئێمە بچوکترە... ژیان لە من بچوکترە...». بەناو جەنگەڵدا

دەڕۆی، خۆی لە پێچاوپێچی پەیکەر و درەخت و تاریکییەکاندا ونده‌کرد. زوڵمەتی سەرەتاکانی شەو دایدەپۆشی، بەردەوام باسی ئەو عەشقانەی دەکرد کە بە هیچ شتێ فەنانابن، باسی ئەو سۆزە قووڵانەی دەکرد کە مرۆڤ لە پوچێی و نائومێدیی و ڕەشبینی ڕزگاردەکەن، دەیگووت: «عەشقێکی ترسنۆک، عەشقێک کە خەون نەبینێت، عەشقێک کە نازانێت چۆن بمرێت، عەشقێکی مردووە. نەسرەدینی بۆنخۆش تۆ بوویت ئەم خاکەت دۆزییەوە، تۆ ئەم خەونەت لە مندا چاند کە بەحرێک خەیاڵاتی لادروستکردم، ئێستا دەتەوێت کێ ڕزگاربکەیت... هاوڕێم، وەرزێکی درێژە، ئەم عاشقانەی تۆ هەموو مردوون، بڕۆ... ئێستا بڕۆ لاشەی مردووەکانت هەڵبگرە و ئەم دارستانە بەجێبهێڵە و دەست لە بەرۆکی من بەردە».

لە ناو کزەباکانی شەودا، دڵارام دەیگووت: «گوڤەند من تۆم خۆشدەوێت، بۆ مەرگ، بۆ جەهەنەم، بۆ عەردی ئیبلیسەکان لەگەڵتدا دێم». گوڤەند قسەیدەکرد و لەنێوان وچانێک و وچانێکی دیکەدا دڵارام دەیگووت: «بەرەو ئاگر، بەرەو زەوییەک کە هەمووی درک بێت، تا ناو جەرگەی فەنابوون، تا ئەوسەری دونیا، تا کۆتایی هەموو شتەکان لەگەڵتدا دەمێنمەوە».

لە پێچێکی دارستانیشدا هەردووکیان دەستیان دەخستە ناو دەستی یەکتر و دەیانگووت: «ماڵاوا... ماڵاوا ئەی هاوڕێمان... ماڵاوا»، ئیدی چیدیکە نەسرەدینی بۆنخۆش کەسیانی نەدەبینییەوە، ئەو بە تەنها هەموو ئەو تولەڕێ باریکانەی دارستانی دەپشکنێ و هیچ دیارنەبوو، کون و قوژبنەکانی ئەو چواردەورە دەگەڕا بەڵام سوودی نەبوو، پڕ بە جەنگەڵ هاواریدەکرد: «گوڤەند من نامەوێت بمرن، من نامەوێت گوناهی مردنی کەس هەڵبگرم... من پەشیمانم... با پێکەوە بڕۆینەدەرێ». بەڵام جگە لە کزە ساردەکانی شەو، جگە لە قەڵبەزەی شەتاوەکان

هیچ وەڵامێکی نەدەبیست، نەسرەدین هێندە هاواریکرد تا ماندوودەبوو. تێدەگەیشت بە تەنها دەرەقەتی ئەو هەموو تاریکی و بێدەنگییە نایەت، لەگەڵ پیاوەکانی دارستان بە چەندەها چراوە، دەکەوتە دوای شوێنپێکانی گۆڤەند و دلارام، چەندین سەعات بە هەموو ئاراستەکاندا دەگەڕان... نەسرەدین لە هەموو جێگایەکیش پڕ بە دارستان هاواریدەکرد: «شەرەفی زیندوێتی، شتێکی ناچیز نییە، گۆڤەند وەرەدەرێ». بەڵام گۆڤەند وەڵامی هیچ هاوارێک ناداتەوە، ئەو هاواردەکات و شەو و سەرما و ڕەشەباکان هاوارەکانی دەبەن... نەسرەدین بۆ ئێستێک دەوەستێت و هەستدەکات چیدی هاوارەکانی ناگەنەجێ، دەنگی بەشێوەیەکی سەیر پەرتدەبێتەوە، حەرفەکانی با دەیانبات. نەسرەدین تا ئەمڕۆ لە تەلیسمەکانی ئەو شەوە تێناگات، لە نهێنییە قووڵەکانی ناو ڕۆحی ئەو عاشقانە تێناگات، هەندێ جار دەڵێت: «لەوانەیە هۆکەی ئەوەبێت کە من هەرگیز خۆم عاشق نەبووم.» هەندێ جاریش هەموو بەسەرهاتی گۆڤەند بەشێوەیەکی سەیر تەفسیردەکات، هەندێ جار لە گەرمای ستۆدیۆکەدا هەڵدەستێت و دەڵێت: «خەندان، ئێستاکە بیردەکەمەوە، دەڵێم گۆڤەند دەبایە وایبکردایە، ئەو بەرلەوەی بکاتە ئەو هەڵدێرە، لێرە، لەم شارەدا ڕۆژانی زۆر ڕەش و بێئومێد ژیابوو... کە ئومێدی ئەو وڵاتە خەیاڵییەی عەشقیش پەڕییە سەریەوە، ئیتر پێیوابوو کە بۆ هەتاهەتایە هیوایەکی دۆزیوەتەوە، ئاخر هەندێ هیوا هەن، مرۆڤ چەند پیربێت، چەندە وردبینتربێت ناتوانێت دەستبەرداریان بێت. هەندێ هیوا هەن لە تاعوون کوشندەترن، من ئێستا دەڵێم کە گۆڤەند دەیزانی گەر واز لەو ئومێدانە بهێنێت، دەبێت ڕووبەڕووی ئەو سپێتی و پوچگەراییە ببێتەوە کە ئەو کات هەموو عاشقان تیا دەژیان، پوچییەک دڵنیام گۆڤەند ئامادەبوو بمرێت و ڕووبەڕوو تەماشای نەکات».

ئێستاش کاتێک باسی ئەو شەوە دەکات، بە دڵتەنگی و

پەشۆکانێکەوە لەسەر جێگاکەی خۆی هەڵدەستێت و دەڵێت: «خەندان، من چیم لەدەست هات کردم، نەمدەویست کەس لەوێدا بەدیار مەرگەوە دابنیشێت، من گوناهێکم نەبوو، هەموو دارستان گەڕام و درەخت بە درەخت هاوارمکرد، بەڵام کات نەمابوو، شەو تا دەهات درەنگتر و درەنگتر دەبوو، سایەقەیەکی ترسناکیش بەڕێوەبوو، دەمزانی گەر ڕێگاکان ببنە سەهۆڵ، ئەو خێڵە بەئاسانی لە پێچاوپێچی ئەو چیایانە دەربازیان نابێت... نا خەندان گوناهم نەبوو».

ئەو شەوە جەنگەڵ بوو بە حەشرستانێکی چکۆلە، هەموو شتێک تورێدرایە ناو ئەو چەمە تورەیەوە، ئەویش لەگەڵ شەپۆل و قەڵبەزە هارەکانی خۆیدا بردی. دایکەکان لە پارچە قوماشی دڕاو و بچکۆلانە خێرا بەرهەڵبێنیان بۆ منداڵەکانیان دروستکرد و لە شانی خۆیان بەست، دەنگی هاواری ئەو پیاوانەی کە بە حەسرەتەوە خۆیان بۆ سەفەرێکی درێژ لە ناو بەفردا ئامادەکردبوو لە هەموو لایەکەوە دەنگیدەدایەوە. شەوێکی ساردبوو، بەڵام تابڵێی ڕوناک. پەروانە سات دوای سات زیاتر هەستیدەکرد کە دەبێتە گەردێکی برۆنزی و درەوشانەوەیەکی زیوین لە دەوری خۆی دروستدەکات، ئەو گەردەی لە جەستەی ئەو هەڵدەستا، هەموو درەخت و بەرد و مەخلوقاتی دەوروبەری خۆی داپۆشیبوو، هێدی هێدیش ئەو خێڵە شڵەژاوە دەکەوتنەڕێ، نەسرەدین یەکەیەکە بەسەر هەمووانددا دەگەڕا، باوەشیدەکرد بە هاوڕێکانیدا، پێیدەگووتن کە دەیاندۆزێتەوە و جارێکی دیکە یەکتردەبیننەوە، هەندێکیان لەسەر شانی یەکتری دەگریان و هەندێکیشیان بێباکانە و بێئاوڕدانەوە لە هەموو ئەو دارستانە لەو پردە دارینە بچکۆلانەیە دەپەڕینەوە و بە پەیژەکەدا سەردەکەوتن. پەروانە دواهەمین کەس بوو کە لە جەنگەڵ چووەدەرێ، تا دواسات خەریکی ئامێزکردن بوو بە فەرەیدوندا، بەڵام سوودی نەبوو، دواهەمین جار لەو نیوەشەوە ساردەدا، دواهەمین ماچیکرد، ماچێک

ڕەشەباکان ئەفسوونەکەیان دەفڕاند و لە پێچاوپێچی بازنەکانی جەنگەڵدا دەیانشاردەوە. پەروانە ئیدی هیچی نەگووت، پەلی میدیای گرت کە وەک شێت تەماشای مانگی دەکرد و خەریکی نوسینەوەی هەموو شتەکان بوو، وەک شێت بەدوای تریفەکان و حەرفەکاندا ڕایدەکرد، وەک شێت بەدوای هاوارەکان و دیمەنەکان و دەنگی ڕەشەباکاندا دەڕۆیشت. تا دوا دەقیقەش کە پەروانە ڕایکێشا و بەرەو قەراغی هەڵدێرەکە بردی، دەستی لە نوسین هەڵنەگرت... میدیا لەو جەنجاڵییەدا، کڵپەی لە ناو پیاوەکاندا دۆزییەوە، ئەو دەیزانی ئەوە دواهەمین شەوی یەکتر بینینیانە، بەڵام پێناچێت کڵپە بە درێژایی ئەو شەوە ترسناکە جارێکیش چییە بیری لە میدیا کردبێتەوە، ئەو بێئەوەی بیر لە هیچ بکاتەوە، بێدەنگ چاوەڕوانی سەرکەوتنی دەکرد. شەهلای خوداناسیش لە ناوەڕاستی ئەو قیامەتەدا، بە خۆی و قورئانەکەیەوە هەمیشە هاواری لە خودا دەکرد، یەکەیەکە بەسەر عاشقەکانەوە دەگەڕا و دەیگووت: «ئەمشەو شەوی خودایە... شەوی زەبرە کوشندەکانی ئەوە، تۆبەبکەن... دەبێت تۆبەبکەن... ئەمشەو شەوی دابەزینی نورە... شەوی تۆڵەیە...». پەروانە تا زیاتر گوێی لەو هاوارانە دەبوو، زیاتر دەترسا و دەبووە گەرد، میدیاش زیاتر سەیری ئەو وەحشەتە لەناکاوەی چاوانی کڵپەی دەکرد کە بەتەنها سەیری ئاسمان و ئەستێرە و لێواری ئەو خەرەندەی دەکرد، شەهلا تا سەردەکەوت، تا دەنگی لە ئاسمانی ئەو جەنگەڵەدا ئاوابوو، هەر ناوی خودای دەگووتەوە، کڵپەش لە ئێستێکدا بێئەوەی ئاوڕ لە هیچ بداتەوە، بێئەوەی دواجار هەتا وەکو عەشقێکی مردووش تەماشای میدیا بکات، سەردەکەوتە سەر ئەو پەیژەیە و زوڵمەتی ئاسمانە بەرزەکان هەڵیاندەکێشا و تا ئەبەد میدیای بە بۆشاییەکی سارد و تاریک دەسپارد. ئەوانەی لەو شەوەدا پێشتر بە پەیژەکەدا سەردەکەوتن و دەگەیشتنە سەرەوە، بێئەوەی چاوەڕوانی هیچ بکەن

ڕێگایەکیـان هەڵدەبـژارد و دەڕۆیشـتن. بەجـۆرێ کـە میدیـا و پەروانـە و بۆنخـۆش گەیشـتنە سـەرەوە کەسـیان نەبینـی... میدیـا تـا ئـەو کاتـەش بـاوەڕی وابـوو کڵپـە لەسـەرەوە لەبـەردەم پەیژەکـەدا چاوەڕوانیـدەکات، بـەڵام کـە سـەرکەوتن کـەس لـەوێ نەبـوو... بۆشـاییەکی گـەورە، بایەکـی سـارد کـە لـەو عـەرد و پێدەشـت و چیایانـە هەڵیدەکـرد پێشـوازیکردن، بـە هەمـوو لایەکـدا ڕوانیـان، بـەڵام وەکـو ئـەوەی شـەو و سـەرما و هـەورە سـپییە لەنـاکاوەکان ئـەو خێڵەیـان قووتدابێـت، لـە هیـچ لایەکـەوە نیشـانە و ئاسـەواری مرۆڤێـک دیارنەبـوو. بێدەنگییەکـی سـامناکیش باڵـی بەسـەر ئـەو چیـا و خەرەندانـەدا کێشـابوو، نەسـرەدین دەسـتەپاچە بەدیـار ئـەو دوو ئافرەتـەوە وەسـتا، یەکێکیـان تەماشـای مانگـی دەکـرد و یەکێکیشـیان بەئەندازەیـەک هێمـن بـوو، پێدەچـوو مردبێـت. نەسـرەدین دەیگـووت: دەبێـت هەمـوو شـەو بەپـێ بڕۆیـن، دەبێـت دۆعابکەیـن بـەر لـە خۆرهەڵهاتـن بگەینـە ئاوەدانییـەک. پەروانـە بـە بێدەنـگ و بـۆ دواجـار لـە لێـواری ئـەو هەڵدێـرەدا دەوەسـتا، سـەیری ئـەو تاریکییـە هـەزار بـە هـەزارەی دەکـرد کـە فەرەیدونـی مەلـەک لەبنیـدا، لـە خاکـە بەریـن و بێکۆتاییەکانـی کۆتاییـدا، درێـژەی بـە سـەفەرەکانی خۆیـدەدا. دوا نیـگای لـەو زوڵمەتـە قووڵـە دەگـرت کـە هێزێکـی وەک گێـژەن بـەرەو ئـەوێ ڕایدەکێشـایەوە، بـەڵام فریـوی ڕێـگاکان، زەنگـی تەلیسـمە دوورەکانـی ئـەو چیایانـە، شـەهوەتی گۆڕینـی شـوێن و کاتـەکان، سـەرلەنوێ پەروانەیـان دەفڕانـد و دەیانخسـتەوە سـەر ڕێـگا. نەسـرەدین دەترسـا کـە هیـچ یـەک لـەم دوو مەخلوقـە لاوازە بەرگـەی گەردەلوولـی نـاو گـەرووی دەربەنـدەکان و گێـژاوە سـاردەکانی شـەو نەگـرن. لـە ڕێـگا بـەردەوام باسـی ماڵـی ئـەو پیرەمێـردەی بـۆ دەکـردن، کـە ئەگـەر خێـرا بـڕۆن دەمەوبەیـان دەگەنـە بەرقاپییـان، دەیگـووت: «پیرەمێردێکـی سـەیرە، خولیـای ئەوەیـە خەڵکانـی هەڵهاتـوو داڵدەبـدات، ئیـدی بەلایـەوە گرنـگ نییـە لەبەرچـی هەڵهاتـوون، لەبـەر عەشـق یـان لەبـەر سیاسـەت، یـان

لەبەر گوناهی دیکە». پێنەدەچوو هیچ یەک لەو دوو کچە گوێیان لە قسەکانی «بۆنخۆش» بێت، میدیا دەفتەرەکانی خۆی لەسەرپۆشێکی سپییەوە پێچابوو و بە شەرمەوە سەیری ئەو پیاوەی دەکرد کە لەم شەوەدا بەناو جەنگەڵ و کێڵگە و تاریکیدا دەیبردن.

شەو بێشەرمانە درێژدەبووەوە، ڕێگاکان بەجۆرێکی بێمانا بۆنی وەرزێکی نەناسراویان لێدەهات، کاتێ ئەو سێ غەریبەیەش بەلای ڕووەکە خەوتووەکاندا تێدەپەڕین، شێی مردنێکی کوتوپڕ لەسەر گەڵا غەمگینەکانیان دەنیشت... نەسرەدین هەستیدەکرد هەندێ جار پەروانە دەگری و هەندێ جار بێدەنگ دەبێت، بەلای کێڵگەی ئێجگار فراوان و کراوەدا دەڕۆیشتن کە جگە لە هەستێکی سارد بە مەودا بێسنوور و بەرینیەکانی شەو، هیچ شتێکی دی لە ڕۆحدا دروستنەدەکردن، بە هەورازی بەرزدا سەردەکەوتن کە هێشتا نرکەی ماندوێتی هەموو ڕێبوارەکانی پێشتری هەڵگرتبوو، لەسەر بڵندایيەکانیش هەستیان بە قورسایی ئاسمان دەکرد لەسەر ئەستۆیان. ئەو دوو کچە بەشێوەیەکی ترسناک لەو هەوا و ئاسمان و ڕێگایانە دەترسان، هەرچەند هەردووکیان کچی شەو و شەونخونییە درێژەکان بوون، بەڵام ئێستا بەو جیهانە نامۆبوون، بۆنی ئەو گەڵایانەی لەنابەینی بەردی چیاکاندا مردبوون، سێبەری لەناکاوی تاشەبەردە سەراسیمەکان، پشووی کوشندەی زوڵمەت لە قەراغ گومیچکەکانی پاییزدا، بۆ ئەوان کوشندەبوو. لەساتێکدا ئیدی ئولفەتی خۆیان لەگەڵ هەموو شتەکاندا دۆڕاندبوو... سەرما و کزەی باکانیش ئیدی تەحەمولنەدەکران.

پەروانە هیچی نەدەگووت. نەسرەدین کە لە هەمووان زیاتر ئەو پوچییەی دەبینی کە شەو هەنگاو بە هەنگاو لەگەڵ خۆیدا دەیهێنا، وەکو ئەوان هەستی بە جووتبوونەوەی جەمسەرەکانی سەفەرێکی نهێنی دەکرد لە ڕۆحیدا، هەستی بە مردن و ساردبوونەوەی ئاگرێکی گەورە

دەکرد لە دڵیدا، تا دەهاتیش ئاشکراکردنی زیاتر و زیاتری شەو بۆ فیتنەکانی لەشی خۆی، ڕۆحی نەسرەدینی پتر لە خۆڵەمێشی ئەو زەمانە ئاگاداردەکردەوە کە هەمووان تیا دەخنکێن. هەندێ جار بە خێرایی گومان بەسەر بەردەڵان و پێدەشت و ڕێگا کوتراوەکانی زوڵمەتدا دەڕۆیشتن، هەندێ جاریش بە هێمنی مەرگ هەنگاویاندەنا. نەسرەدین تیشکێکی برونزی دەبینی لە پەروانە هەڵدەستا، تیشکێکی مەیلەو زێڕین، تیشکێک درەوشانەوەیەکی سەیری دەبەخشی بە پاشماوەی بەفری شەوەکانی پێشوو... کەس هیچی نەدەگووت، نەسرەدین دەیزانی ئەمشەو شەوی گۆڕانێکی گەورەیە، لە قووڵایی ڕۆحیدا تەنها بیری لە چیرۆکی ئەو وەرزانەی دوایی دەکردەوە، بیری لەو قەسابخانانە دەکردەوە کە بۆ عەشق دانرا، بیری لە خولیاکانی خۆی دەکردەوە بۆ ئاسانکردنی دەردەکانی ئەڤین، لە قووڵایی ڕۆحیدا دەنگێک پێیدەگووت: «تۆ ڕۆحی خۆت بە هەندێ شتەوە بەستەوە کە هەرگیز تێیان نەگەیشتیت، هەرگیز...». ئاوڕی لەو دوو جەستە تێکشکاوەی دوای خۆی دەدایەوە و هەستیدەکرد هەردووکیان قوربانی یارییەکی سەیرن کە ئەو لە ناو خەیاڵات و خولیای خۆیدا دایمەزراندووە، ئەو هەرگیز بیری لەوە نەکردبووەوە کە دەرەنجامی ئەو هیوایانەی خۆی بەو جۆرە ترسناک لەسەر چارەنوسی مرۆڤەکان بشکێتەوە... هەمان ئەو دەنگەش پێیدەگووت: «تۆ دەبایە بە قووڵی لە دونیا تێبگەیت ئینجا خەون ببینیت».

نزیکی دەمەویەیان دونیا هەمووی دەبوو بە سەهۆڵ، هەندێ جار میدیا بەستەی دەفتەرەکانی لێدەکەوت، هەندێ جاریش پەروانە لەنێوان حەقیقەت و تارمایی بووندا وندەبوو. نەسرەدین هەستیدەکرد، هێزێک هاتنی بەرەبەیان دوادەخات... ئەو هەرێمە سەیرانەش کە دەیانبڕی پێدەچوو نوقمبوونێکی ئەزەلی لە شەودا نوقمبووبن، نەسرەدین ئەمڕۆ

دەڵێت: «بەدرێژایی ئەو شەوە پەروانە تەنها یەک پرسیاریکرد، ئەوەیش ئەوەبوو : نەسرەدینی بۆنخۆش، دەبێت زەویەکی باشتر هەبێت، ولاتێکی باشتر هەبێت ئێمە بۆی بچین؟...»». نەسرەدین، نەیدەزانی چی وەلامی پەروانە بداتەوە. هەندێ جار بۆنەوەی بێدەنگی دوور و درێژی شەو و سروشت و زیندەوەرە خەوتووەکانی گەردون بشکێنێت، دەیگووت: خێراکەن، بەرلەبەیان، دەبێت بگەینە جێگایەکی دی و شوێنێکتان بۆ بدۆزمەوە. هەندێ جاریش بە غەمەوە دەیگووت: موخابن کە ئەمشەو هیچ هەوارێکمان نەبینی، ئەگەر هاوین بایە، لەوانەبوو چەندەها ڕەشماڵی ماڵانی کۆچەر بکەوتباناية سەر ڕێگامان. بەڵام نەسرەدین هەستیدەکرد قسەکانی بێدەنگی و تەنهایی و گۆشەگیری خۆیی و ئەو کیژانەش قووڵتردەکاتەوە. خۆی خێراتر لەو دونیای دەوروبەری تێدەگەیشت، کە قسەکانی چەند مایل بە مردن و پوچیین، کە ڕستەکانی چەندە زوو مانا و سەنگی خۆیان دەدۆڕێنن. دواجار شەو بەرەو کۆتاییهاتن دەکشا، نەسرەدین دەیبینی کە کشانی شەو لەوە خێراترە کە چاوەڕوانیدەکرد، لەناکاو وەکو هەڵبوونی چرایەک جیهان ڕوناکدەبووەوە... ڕوناکییەک خەمی ناو ڕۆحی خۆیان و ناو سروشتی دەیان جار قووڵتردەکردەوە.

بەر لە خۆرهەڵاتن گەیشتنە ئاوەدانییەکی بچوک و دوردەست لە ناو چیاکاندا، سێ کەسی نامۆبوون بەو هەرێمە، نەسرەدین پێشتر چەند جارێک هاتبووە ئەم گوندە، بەڵام بۆ ماوەیەکی درێژ تیانەمابووەوە، ئەو بەیانییەش دیمەنی ئەو پیاوەی کە بە تفەنگێکی سەیر و زەردەخەنەیەکی ژنانەوە لەو گوندەدا لەگەڵ دوو کیژی ماندوودا دەرکەوت، سەرنجی ئەو نوێژکەرانەی ڕاکێشا، کە هەندێکیان هێشتا سەرمای حەوزەکانی وسڵدەرکردن لە لەشیاندابوو، نەسرەدین بێئەوەی سەیری کەس بکات، بێئەوەی لە کەس بپرسێت، بەرەو ماڵی پیر موسای خەزانناس ڕۆیشت، ئەو پیرەمێردەی کە پێیاندەگووت: «داڵدەدەری شەیتانەکان». ئەو لە

كۆنەوە بەوە ناسرابوو بەرامبەر پارەیەكی كەم، خەڵكانی هەڵهاتوو و گومان لێكراو لە پشتیرێكی چوارگۆشەدا حەشاردەدات، بەڵام ساڵانێكی دوور و درێژبوو، بە هۆی ترس و وەحشەتەكانی دونیاوە وازی لەو كارە هێنابوو... لەوكاتەوەی كە شەڕی نێوان گروپە سیاسییەكان بووبوو بە شەڕی یەكدی قڕانكردن، گوردانەكانی سوپا بووبوون بە تیپی دڕندەی وێرانكردن و قەڵاچۆكردنی مرۆڤ، دیندارەكان یاساكانی شەریعەتیان پڕاوپڕ بەسەر گوناهباران و زیناكەراندا دەچەسپاند، ئیدی پیرموسای خەزانناس، كەسی لە خۆی نەدەگرت، بەڵام نەسرەدین هێشتا باوەڕی زۆری بە دڵگەورەیی ئەو پیرەپیاوە نورانییە هەبوو. ئەوان دەمێ لەمەوبەر لە شار یەكتریان ناسیبوو، یەكترناسینەكەشیان دەگەڕایەوە بۆ ئەو ڕۆژەی پیرموسا بە خۆی و كەوا و سەڵتەیەكی درێژەوە خۆی كرد بە ستۆدیۆكەی نەسرەدینی بۆنخۆشدا. سەردانێك وێنەیەكی فۆتۆگرافی زۆر قەشەنگی لێكەوتەوە، كە دواتر لەپێش جامخانەی ستۆدیۆكەدا جێگیربوو، وێنەكە بە ئەندازەیەك هەیبەت و سیحری ئەو پیرەپیاوەی دەردەخست، كە تا ساڵانێكی دوور و درێژ سەرنجی هەموو ئەو ڕێبوارانەی ڕادەكێشا كە ڕۆژانە بەو شەقامەدا هاتوچۆیاندەكرد. دواتریش هەر ئەو وێنەیە پیرموسای گۆڕیی بۆ كەسایەتییەكی ناسراو، پیرموسا لەو كاتەوە هەستی بە قەرزارباریيەكی قووڵدەكرد بۆ ئەو ڕەسمچییە. كاتێكیش نەسرەدین هاتە شاخ، هەندێجار دوور بە دوور نامەیان دەگۆڕییەوە، نەسرەدین لە سەفەرە درێژەكانیشیدا بەدوای عاشقان و حكایەتەكانیاندا چەند جارێك و بە ڕێبواری چووبووە ماڵی خەزانناس، ئەو پیرەمێردەی لە ڕۆژانی هەرزەكاریدا جارێك لە جاران لە ناوەڕاستی جوانترین بەهاری ئەو زەمانەدا پێشبینی هاتنی پایزێكی كوتوپڕی كردبوو، پایزێك كە لەناكاو یەك لە دوای یەكی وەرزەكانی تێكدابوو، هەر لەوەشەوە نازناوی خەزانناسی پێبڕابوو.

ئەو بەیانییە خەزانناس بە بۆنخۆشی گووت: «نەسرەدین، ئەوەتەی مـن لەدایکبـووم، وەرزی وەکـو ئـەم وەرزە ترسـناک و ڕەشـم نەبینیـوە، بـەڵام بۆنخـۆش هێنـدە قەرزاربـاری تـۆم ناتوانـم هیـچ داوایەکت بـۆ جێبەجێ نەکـەم... ئەمـە جگـە لـەوەی کـە ئـەم دوو زەعیفەیـە دەبێـت لـە شـوێنێکدا بحەوێنـەوە... بـەڵام دڵنیابـە، مـن لـە گوندێکـدا دەژیـم پیاوانـی پـاک و دڵگـەورەی تیـا نـاژی، مرۆڤـەکان ئەمـڕۆ لێبوردنـی جارانیان نییە، زۆریشـیان مـن وەکـو حەشـاردەری دز و شـیوعی و شـەیتانەکان تەماشـادەکەن، لەبەرئـەوە گـەر دەزانـی مەترسـی تیایـە، بەرلـەوەی کار لـە کار بترازێـت، شـوێنێکی باشـتریان بـۆ سـۆراغبکە... ئێسـتاش مـن ئـەو تەنهـا ژوورە بچکۆلانەیـەم هەیـە، بـڕۆن و بحەوێنـەوە».

نەسـرەدین ئـەو ڕۆژە بـە کەیفێکـی منداڵانـەوە لـەو ماڵە هاتـەدەرێ، دوای ئـەو شـەوە ترسـناکە، ئێسـتا دڵخـۆش بـوو کـە پەناگایەکـی بـۆ ئـەو دوو کچـە تەنهایـە پەیداکـردوە، بڕیاریدابـوو کـە بگەڕێتـەوە و دوای چارەنوسـی عاشـقەکانی دیکـە بکەوێـت... بگەڕێتـەوە و گـەر فریاکـەوت سـەرلەنوێ دابەزێتـەوە بـۆ عەشقسـتان و هەوڵێکـی دیکـە لەگـەڵ گۆڤەنـد و فەرەیدونـی مەلـەک بـدات، بـڕوات و لـەو گونـدە بـەرزەی کـە تیـا دەژی کەشـکۆڵەکەی هەڵگرێـت... ئـەو بەیانییـە دەیزانـی ڕێگایەکـی زۆر درێـژی لەبەردەمدایـە، بەنـاو بـاغ و باغـات و پەڵـە چنـارە بەرزەکانـدا تێپـەڕێ، لەوبـەری گونـد نەخشـەی سـەفەرێکی درێـژی لـە خەیاڵـی خۆیـدا کێشـابوو... سـەفەرێک چیـا بـە چیـا، پەروانـە و میدیـا بـەرەو وڵاتێکـی دیکـە بفڕێنێـت و لەوێـوە ڕەوانـەی کیشـوەرێکی تـر و دونیایەکـی تریـان بـکات... نەخشـەیەک هەرگیـز سـەرینەگرت.

ئـەو بەیانییـەش پەروانـە و میدیـا، وەکـو دوو تارمایـی، وەکـو دوو ڕۆحلەبـەر کـە بۆنـی شـەو لـە لـەش و هەناسـە و جلەکانیـان هەڵدەسـتا، لـەو ژوورەدا، بەرامبـەر یەکتـری وەسـتان، میدیـا بەسـتەی دەفتەرەکانـی خسـتە

تاقێکەوە، پەروانەش کە گەرمای بەیانی کەمێک خاویکردبووەوە، بە ئارامی لەسەر لبادێکی درێژ ڕاکشا... پاش کەمێک لە بێدەنگی قووڵ، پاش کەمێک لە تێڕامان لە کۆڵەکە گەورەکانی بنمیچەکە، هەردووکیان خەویان لێکەوت... خەوێک کە لە خەونی ئەو کەسانە دەچوو، کە چاوەڕوانی مەرگ دەکەن... ئارام و بێترووسکە و بێئومێد... لە جێگایەکی سپیشەوە، لە شەقامێکی دووریشەوە، لە قووڵایی جەنگەڵ و چیاکانەوە، لە ڕاستە ڕێگای شارەکانەوە، مەرگ بە هێمنییەکی سەیر، بە لەسەرەخۆیی شاعیرێک لەنابەینی باغەکاندا، بەرەو ئەو ژوورە بچکۆلانەیە دەهات، هاتنێک هەموو دەیانبینی، هەموو هەستیان پێدەکرد، هەموو گوێیان لە چپەکانی بوو، کەسیش هیچی لە ئیقاعی ژیانی خۆی نەگۆڕی، کەسیش پێینەگووت: ئەی مەرگ، لێرەوە مەیە و لە ڕێگایەکی دیکەوە بڕۆ.

# ٢١

ئەو شەوە کە زەینەبی کوێستانی منی بانگکرد و دەربارەی خەندەکانم پرسیاریکرد، گووتی: «مەرج نییە خەندەکانت بە حوکمی قووڵبوونەوەی ئیمانت، بە حوکمی ترس لە خودا بە حوکمی ڕێز لە شتە موبارەکەکان ونبووبێت...». من دەمزانی کە غەم و تووڕەیی خەندەکانمی کوشتووە، هەستمدەکرد بۆ یەکەمجارە لە ژیانمدا بەو جۆرە توڕەم، لەگەڵ ئەوەشدا کە زەینەب بانگیکردم و گومانی خۆی دەرهەق بەو ڕوخسارە تازەیەم خستەڕوو، هیچم نەدرکاند، هێندە نەبێت گووتم: «سووتانی لەیلا هەموومانی پەرێشانکردوە... لە دوای ئەو شەوەوە، هەستدەکەم هەموومان گۆڕاوین». دڵنیام زەینەب خۆشی ئەو ڕاستییەی دەزانی، خۆیشی لە جاران نائارامتر و توندتربوو لەگەڵماندا، هەندێجار کە قسەیدەکرد دەستەکانی دەلەرزین، لێوانیشی پەشێویی و نائارامییەکی سەیریان پێوەدیاربوو... زۆربەی بەیانییەکان بەر لە هیچ قسەیەک، هاواریدەکرد: «ئێوە چین؟ چ جنۆکەیەک لەسەرتاندایە، چ ئیبلیسێک ڕەگی لە دەروونتاندا داکووتاوە؟». بەڵام من قسەکانی زەینەب، ئازاریان نەدەدام، فەتانەیش وەکو هەمیشە هیچ هەڕەشەیەکی ئەو نەیدەترساند، ئەو بەردەوام بیری لە ڕێگای پێچاوپێچ دەکردەوە، بۆ خۆ لادان لە فەرمانەکانی زەینەب. لەو نێوەندەدا هاوشان بە زیادبوونی ترس و توڕەییەکان، ئەو پەپولە ڕاستی و خەیاڵیانەی دەمانخستنە ناو کتێبەکانەوە بەردەوام لە زیادبووندابوون...

زۆرجار گەر پەپولەی ڕاستەقینەمان نەدۆزیبایەتەوە، فەتانە توانای هەبوو کە پەپولەی خەیاڵی دروستبکات، پەپولەی خەیاڵی کە تەنها من و ئەو دەمانبینی، ئەوەش تەنها تروسکایی ژیانمان بوو. لەولاترەوە جگە لە تورەبوون و هەڵچوونە لەناکاوەکانی زەینەبی کوێستانی، ژمارەی وانەکان و ئەرکە سەختەکانی سەرشانمان بەردەوام لە زیادبووندابوون، ڕۆژانە جگە لە فاسیلە دوور و درێژەکانی عیبادەت، دەبایە درێژەبدەین بە خەتمکردنی ئایەتەکان و لەبەرکردنی وتەکانی پێغەمبەر و خوێندنەوەی ژیانی ئەسحابەکان... وەسواسی خۆشتن و دەستنوێژگرتن و داوێنپاکیش شەو دوای شەو دەبووە دەردێکی کوشندەتر و نائاساییتر. من لە هەندێک لەو شەوانەدا، زووتر لەوادەی خۆی بە فەتانەم دەگووت: «فەتانە، بۆئەوەی هەمووشتێ لەیادکەم چیرۆکی میدیای غەمگین و مانگم بۆ بگێڕەوە». فەتانە بە هەمان ئەو دەنگە سەراباوییەی خۆی، دەیگووت: «میدیای غەمگین، لە منداڵییەوە، لەو ڕۆژەی کە لەدایکبوو، حەزی لە مانگ بوو، هەر شەوێک مانگ دیاربووایە، دەبایە میدیا بیبینێت، بەجۆرێکیش عاشقانە لە مانگ وردەبووەوە، کە دواتر پزیشکەکان بە باوکمیان گووت: هۆی قسەنەکردنی دەگەڕێتەوە بۆ ئەوەی کە میدیا دەزانێت ناتوانێت لەگەڵ مانگدا قسەبکات، دەزانێت هەرگیز دەنگی بە مانگ ناگات... لەبەرئەوە بە بێدەنگی درێژە بە عەشقی خۆی دەدا».

من هەموو شەوێک بەرلەوەی فەتانە چیرۆکەکەی تەواوبکات خەوم لێدەکەوت، فەتانە خۆشی بە ئارامی بێدەنگدەبوو و هێدی هێدی دەخەوت. بەڵام من شەوانە پاش چەند سەعاتێک ڕادەچڵەکیم و ترپەی پێی ئەو پیاوە نەبینراوەی ناو تاریکی بەرەو دەهلیزە بێدەنگەکانی قوتابخانەی ڕادەکێشام. لە دوای سووتانی لەیلاوە هەندێجار ئەو پیاوە کامەرانی گەورە و هەندێجاریش وەڕزییەکی بێسنووری لە ڕۆحمدا دەسازاند، هەندێ شەو دەپاڕامەوە کە زووتر بگەمە ناو دونیای باغە ڕەیحانەکانی ئەو، کە

لەو زوڵمەتەدا تەنها بۆنە سیحراوییەکەی مەستیدەکردم، هەندێ شەویش هەستمدەکرد، ئەو پیاوە مایەی بەدبەختییەکانی منە، لەو شەوانەدا دەمگووت: «ئەی تارمایی بەد، ئەی تارمایی بێناونیشان، بڕۆ و جارێکی تر مەگەڕێوە ئەم قوتابخانەیە، ئێرە جێگای تۆ نییە، تێدەگەیت ئەی گەمژە، ئێرە شوێنی تۆ نییە».

هەر لەو شەوانەدا، لەو شەوانەدا کە هەستمدەکرد ڕۆحم لە ناو چەندەها هێز و چەندەها خەون و چەندەها ترسدا دابەشبووە، دەنگێک لە ڕۆحمدا پێیدەگووتم کە دەبێت لێرە بەدواوە ئەو یارییە بکەم کە پێشتر هەموو مرۆڤەکانی دی کردویانە، گەمەیەک بکەم تا پاشماوەکانی ئەو مەخلوقەی کە پێیاندەگووت خەندان لە بەحری ئەو هەموو ترس و خەونانە ڕزگاربکەم، بەڵام پێدەچوو زەینەب هەموو ئەو بیر و تێفکرینە تازانەم بخوێنێتەوە. ئەو دەیزانی ئێستا لەبری ئەو خەندە کوژراوانەی سەرسیمام، تووڕەییەکی گەورە پەڕیوەتە ناو ڕۆحم، بەڵام لەترسی ئەو چاوە پڕگومانانەی ئەویش ئارامم نەبوو. تادەهات زیاتر حەزم بە خۆشاردنەوە دەکرد، پتر خولیای ونکردنی ڕوخساری ڕاستەقینەی خۆم دەکەوتە سەرم، کە ئەو کات لای زەینەبی کوێستانی هێشتا ڕوخسارێکی شەیتانی بوو. شەوان لە تاریکییەکەدا هەوڵمدەدا جۆرە نیگا و ڕوانینێکی دیکە بۆ خۆم داتاشم، دەمویست ڕوخسارێکی نوێ دروستبکەم، سیمایەک هێند ساویلکانە نەبێت تەنها بە نیگایەک هەمووشتێ ئاشکرابکات. تا خواستی خۆشاردنەوەم زیاتر گەورەبووایە، زیاتر دەترسام، تا زیاتریش بترسامایە، زیاتر تووڕەدەبووم. ئەو ڕۆژانە فەتانە بەردەوام دەیچپاند بەگوێمدا کە تووڕەییەکانم دەرنەخەم، کە دەموچاوی ڕاستەقینەی خۆم لە ژێر تەمێکی سپی و ساردوسڕدا داپۆشم، هەر ئەویش فێریکردم بە وریایی و لەسەرەخۆیی سەردانەوێنم و بڕۆم، فێریکردم کە هەنگاوەکانم وادابنێم کە ترسی خودایان تیا ببینرێتەوە. پاش ماوەیەکی کەم لە

مەشق و خۆماندووکردن بۆ دووبارە دروستکردنەوەی خۆم بە جۆرێک ببم بە گیانێکی دوو سیما و دوو ڕەنگ، فێربووم ڕێک بڕۆم و ڕێک بگەڕێمەوە، بێئەوەی ئەو فزوڵە ڕاستەقینەی ناو ڕۆحم لە چاوانمدا دەربکەوێت... ئەو مەشقە دوور و درێژانەی بەر ئاوێنە چکۆلەکەی فەتانە فێریکردم، شێوەم لە ڕۆحم جیابکەمەوە، بەڵام دەبایە بە دەوری گومانە کوشندەکانی زەینەب دا پێچبکەمەوە، کە ڕۆژانە چەند سەعاتێک لەسەر هەیاهوی شەهوەتەکانمان قسەیدەکرد، لەسەر دەنگەدەنگی شەهوەتەکانمان لە قوبەی بەتاڵی جەستەماندا دەدوا. من شەوانە هەموو فەنتازیاکانی خۆم بەکاردەهێنا بۆئەوەی خەونی ئەوتۆ دروستبکەم کە چیدی زەینەب گومانی لێنەکات، سەرەتا خەونەکانم تەواو خاڵیکردەوە لە پیاوان، چەندین ڕۆژ لەسەریەک دەمگووت و دەمگووتەوە، چیتر وەک جاران خەون بە پیاوانەوە نابینم و لەبری ئەوان کەوتمە دروستکردنی جانەوەری خەیاڵی، کەوتمە گێڕانەوەی خەونی سەیر سەیر لەسەر پشیلەی فرەسەر، گوربەی سوور و ئاگراوی، ئەژدیهای پێکەوەنووساو، بۆقی باڵدار، پاساری گەورە کە لەسەر سەران هێلانە دەکەن، بەڵام زەینەب بە گومانێکی قووڵترەوە دەیڕوانی و دەیگووت: «زۆرجار شەهوەتەکان شێوەی خۆیان دەگۆڕن بۆ شێوەی جانەوەر، موسیبەتی شەهوەتەکانی تۆش ئەوەیە شێوەیەکی دیاریکراویان نییە، من دڵنیام ئەو جانەوەرانەش جگە لە جۆرێکی تری شەهوەتەکانت، هیچی تر نین».

دواتر خەونەکانم پڕدەکرد لە گوڵ و باغ و سەوزی و درەخت و تاڤگە، بەڵام زەینەب بەهەمان گومانەوە سەیریدەکردم و دەیگووت: «ئەم مەملەکەتە جوانانە چیدەکەن لە خەونەکانتدا... پێمبڵێ تۆ تا ئێستا هیچ نرخێکی تایبەت بۆ جوانی دادەنێیت یان نە؟». ئەو کاتانە سەرم لێدەشێوا و نەمدەزانی چی بڵێم... دەبایە خەونەکانم ئاڵۆزتر و تێکچڕژاوتر بکەم، تا ئەو بەئاسانی تێیان نەگات. فەتانە یەکەمین کەس بوو ئەو

دەرگایەی بۆ دۆزیمەوە کە دواتر بووە مایەی هەموو ئەو ڕووداوە سەیر و سەمەرانەی ڕوویانداا. فەتانە ئێوارەیەک لەبەر دەستشۆرەکەدا گووتی: «باشترین شت ئەوەیە خەونی ئەوتۆ ببینین کە تەفسیرنەکرێت، خەونێک کە لە کتێبی تەفسیرەکانی ئەودا نەبێت». چەندین ڕۆژ لە کتێبخانەکەدا ئێواران کەوتینە تەماشاکردنی هەموو ئەو کتێبانەی لەسەر تەفسیری خەون هەبوون، من دەمزانی زەینەب هەندێ لەو کتێبانەی لە ژوورەکەی خۆیدا پاراستووە و بەردەوام دەیانخوێنێتەوە. من ئەو کات زۆر خراپ و نیوەیی لەو کتێبانە تێدەگەیشتم، بەڵام فەتانە هەمیشە یاری بە چەمکی لەچکە ڕەشەکەی دەکرد و دەیگووت: «خەندان من لە هەمووی تێدەگەم... لە هەمووی». فەتانە وەکو عادەتێکی بەد و مندالآنەی خۆی بەردەوام خەتی بەژێر ئەو دێڕانەدا دەهێنا کە بەلایەوە گرنگبوون، ماوەیەک دوای ئەوە فەتانە لە یەکێ لە بەیانییەکاندا خەونێکی گێڕایەوە کە بۆ یەکەمجار زەینەبی تووشی گومانکرد... فەتانە بە دەنگێکی ئەوتۆ کە ئەفسون و سەرسامی بجوڵێنێت، دەیگووت: «من خەونم بە پەتی سێدارەیەکەوە بینیوە، چەندەها پەپولەی ڕەنگاوڕەنگ بەسەریەوە نیشتوونەتەوە». ئەو ڕۆژە زەینەب چەندین جار ئەو خەونەی بە فەتانە گێڕایەوە، بەوەدا کە فەتانە لەو کچانە نەبوو بەئاسانی سەری لێ تێکبچێت دەیتوانی کە کۆی دیمەنەکە لەشێوەی خەونێکدا بگێڕێتەوە.... من چەند ڕۆژێک دوای ئەوە خەونێکی ترم بۆ گێڕایەوە کە پتر شپرزەیکرد، باسی فولکەیەکی خالّیم بۆ کرد کە بەفر بەسەریدا دەبارێت و دوای ئەوە خۆر هەڵدەکات، بەفر دەبارێت و خۆر هەڵدەکاتەوە، دەمگووت: لەناکاو فولکەکە پڕدەبوو لە باڵندە و ڕێبواران و لەناکاو دەبوو بە چۆڵەوانییەکی گەورە. پێدەچوو ئەو جۆرە خەونانە بە خەیاڵەکانی زەینەب سەیربێت کە هەموو شتەکانی بە دابەشکردنی سەیر لەنێوان شەیتان و فریشتە یان شەهوەت و پاکیدا دابەشکردبوو. لێی پرسیم: «ئەو فولکەیە فوارەی تیابوو؟». گووتم:

«نا، هیچی تیا نەبوو». ئەوە سەرەتای سەرلێتێکچوونە گەورەکانی ئەو بوو کە بە ئاسانی قەبوڵی نەدەکرد، بەوەدا ئەو لەوەوبەر لەو جۆرە خەونانەی نەبینیبوو، بەوەدا کە ئەو باوەڕی نەدەکرد مرۆڤ لەمجۆرە خەونانە ببینێت، لێرەوە گومانێکی گەورەتری لە جاران دەرهەق بە من و فەتانە لا دروستبوو. من لە یەکەم ڕۆژەوە بە فەتانەم گووت، چیتر زیاتر نەڕۆین و لێرەدا بوەستین، بەڵام فەتانە کە یارییەکە بە جۆرێکی سەیر مەستیکردبوو دەیچرپاند: «خودایە پێم نەگووتیت ئەو ناتوانێت ئەم خەونانە تەفسیربکات، پێم نەگووتیت، ئەگەر وریابین دەتوانین لە بەحری گوماندا بیخنکێنین». بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا ئەوە هیچی لەوە نەدەگۆڕی کە ئێستا وەسواسێکی کاریگەر لەناخەوە زەینەبی دەجولاند... ئەو ئێستا دەیویست بگاتە سەرچاوەی خەونەکانمان. فەتانە ڕۆژێکی دیکە دەیگووت: «خەونم بە گورگێکەوە بینیوە کە مانگ لە ژوور سەریەوەبوو، گورگێک بەناو ڕەز و باغ و بێستانەکاندا ڕایدەکرد و مانگیش لەتەکیەوە دەڕۆیشت، گورگێک کە بە چەمەکاندا دەپەڕییەوە و مانگیش بە نزمی بەسەر سەریەوەبوو». منیش دەمگووت: «خەونم بە کۆمەڵێ ڕیزی یەک لە دوای یەکی جلەوە بینیوە کە بە تەنافەکانی حەوشێکی درێژدا هەڵواسراون و سەر تەنافەکانیش هەموو باڵندە و پاساری و پەلەوەری جۆرا و جۆر بووە». دەمگووت: «خەونم بە ڕەشەباوە بینیوە، ڕەشەبای خاڵی لە هیچ شتێک، ڕەشەبا کە بەسەر خاکە بۆر و بەیارەکانی دونیادا هەڵیکردوە». دەمگووت: «خەونم بە هەنارەوە بینیوە، هەناری سوور وەکو خوێن، لەنابەینی کێل و چەتر و گڵکۆی گۆڕستانێکی سپییدا هەڵڕژاون». زەینەب تا دەهات لەبەردەم خەونەکانماندا دەستەپاچەتر دەردەکەوت، لەکاتێکدا ئێمە لەجاران زیاتر خۆمان وەکو دوو خوشکی تۆبەکار نیشاندەدا، لەچکەکانمان توندتر دەکرد، دەموچاومان باریکتر و ڕەنگزەردتر لە دەموچاوەکانی دی نیشاندەدا، سووکتر بەسەر زەویدا

دەڕۆیشتین، لەگەڵ ئەوەشدا هەستماندەکرد مامۆستاکان و زەینەب زیاتر لە جاران چاوەدێریماندەکەن، دوای وانەکانیش کە ئێواران دەچووینە کتێبخانەکەوە گەلێک وریابووین کەس لەو گەمە سەیرەمان لەگەڵ پەپولەکاندا تێنەگەیەنین، بەڵام فەتانە زۆرجار خۆی یاساکانی سەلامەتی فەرامۆشدەکرد... لە لایەکی دیکەشەوە فەتانە ڕۆژ بە ڕۆژ دڵنیاتر دەبوو کە بێتوانایی زەینەب لە تەفسیرکردنی خەونەکانماندا شەڕانگیزتری دەکات، دڵنیابوو کە زەینەب خەونەکانمان دەنوسێتەوە و مامۆستاکانی دیکەشی لێ ئاگاداردەکاتەوە، تا بەیەکەوە تەفسیرێکی بۆ بدۆزنەوە. من دەمگووت: «ئێستا زەینەب بەلایەوە گرنگ نییە گەر خەونەکانمان خەونی شەیتانی بن یا فریشتەیی، بەڵکو ئەوەی مەبەستە، تێبگات ئایا خەونەکانمان ڕاستن یاخود درۆ؟». ئەو لەوە دەترسا ئێمە لەنێوان کوفر و ئیماندا ڕێگایەکمان گرتبێت کە توولەڕێیەکی نەزانراو تاریک بێت و ئەو لێی تێنەگات، لەوە دەترسا هەموو ئەو فەلسەفەی ئاموزشەی کە خۆی باوەڕی پێیەتی شتێکی دی بخولقێنێ جیاواز لەوەی کە خۆی دەیەوێت. هەر ئەو ڕۆژانەش بەردەوام فەتانە پەپولەی جۆرا و جۆر و سەیر سەیری دەدۆزییەوە و بەپرتاو و بە خۆشییەکی زۆرەوە دەیهێنایەوە بۆ کتێبخانە، هەندێجار هێندە خۆشحاڵدەبوو لە شادیدا لەیادیدەکرد کە پەپولەکانی خستۆتە نێوان چ کتێبێکەوە... من دەمگووت: «ڕۆژێک تووشی بەڵایەکی گەورە دەبین». لەگەڵ ئەوەشدا گەرچی فەتانە هەموو مەترسییەکانی دەزانی، بەڵام نەیدەتوانی بەسەر ساتەکانی کامەرانی و خۆشحاڵیدا سەرکەوێت. کە تازە چووبووینە ئەو تۆبەخانەیەوە، بەردەوام ئەو منی ئاگاداردەکردەوە کە خۆم نەخەمە پێش چاوی ئەو مامۆستایانە، بەڵام لەپاڵ هەموو مەکربازیی خۆشیدا، هەندێ سات بەشێوەیەک نوقمی خەیاڵ و خۆشییە منداڵانەکانی خۆی دەبوو، من تەواو هەستم بە مەترسیدەکرد، هەستمدەکرد گەر لەو ساتانەدا زەینەب ببینێت، عاقیبەتێکی ترسناکی

دەبێت... تا جارێک لە جارەکان ئەو پێشهاتە ترسناکە ڕوویدا و شتەکان هەمووی بە شێوەیەکی بێمانا بەسەریەکدا قڵپبوونەوە.

ئێستاش بیردەکەمەوە، بۆ ئەو پێشهاتە سەیرە، تەنها یەک شەو بەر لە ئێوارەی پەروانە ڕوویدا؟ ئایا دەبێت لە سەرەتاوە ڕووداوەکان بە جۆرێک هەڵکەوتبن، تا بە کۆ من بەرەو لێواری ئەو دووکەرتبوونە کوشندەیە بەرن کە تا ئەمڕۆ ناتوانم خۆمی لێ ئازادبکەم. ئێوارەیەکی زۆر سارد، دوای تەواوبوونی وانەکانمان، من و فەتانە بۆ ماوەیەک لە پەنجەرەیەکی ناو ڕاڕەوەکەوە سەیری پرۆشەی ئەو بەفربارینەمان دەکرد، کە بایەکی هێمن بەسەر حەوشی پشتەوەی قوتابخانەکەدا بڵاویدەکردەوە، دواتر پێکەوە چووینە کتێبخانەکە. هەموو شتێ ئارام و لەسەرخۆ دەینواند، ڕاڕەوەکان بەدەگمەن یەکێکی پیادا دەڕۆیشت، دەرگای ژووری مامۆستاکانیش هەموو داخرابوون... من دەمگووت: «لەوانەیە دوای ماندوێتی ئەم ڕۆژە ساردە هەموو پشوویەکی درێژ بدەن». فەتانە لە ڕۆژانی سەرمادا گەلەک کەیفی بە گەرمای ناو کتێبخانەکە دەهات. کە چووینە ناو کتێبخانەکەوە، بۆ ماوەیەک سەیری خەزنەی پەپولەکانی خۆمانمان کرد. فەتانە ئەو ڕۆژە وەکو بەدەم خەوەوە قسەبکات یەک لە دوای یەک پەپولەی خەیاڵی بۆ دروستدەکردم، بە خەیاڵ ڕەنگی باڵەکان و ڕەنگی خاڵە پچوکەکان و ڕەنگی گەردە ئاوریشمییەکانی هەڵدەبژارد، تێکەڵ بە سیحری شەفەقی دەکردن، لە شەودا و لە ژێر زیوی وەریوی مانگەشەوە پایزییەکاندا ئازادیدەکردن. دەیگووت: «ئەم پەپولانە بۆ ڕۆژگارە دێرینە خۆشەکان جوانن، ئەمانەش بۆ ئێوارێ ساردەکانی مردن». دواجار من دەمگووت: «فەتانە، ئەم ئێوارێ ساردانە، ئێوارێی چیرۆکە، بۆ چیرۆکێکم لە چیرۆکەکانی خۆت بۆ ناگێڕیتەوە». ئەو ئێوارەیە فەتانە بە پێچەوانەی ئاساییەوە، بە پێچەوانەی شێوازی خۆی لە گێڕانەوەی حکایەتەکاندا، کتێبێکی تەفسیری خەونی گرتبوو بەدەستییەوە و لە نابەینی دۆڵابە پڕ

لە کتێبەکاندا دەسوڕایەوە، حکایەتی ئەو کچە پادشایەی دەگێڕایەوە کە لەنێوان کەنیزەکەکانیدا کوڕێک لە جلی کچدا دەشارێتەوە، تا شەوان لەگەڵیدا بخەوێت. فەتانە بەجۆرێک هەوای چیرۆکەکە دەیبرد کە چیتر تەنها ئەوەی لا گرنگ بوو، بیگێڕێتەوە و بیگێڕێتەوە، لەزەتی گێڕانەوە سنووری هەموو مەترسییەکانی لەلا دەشکاند، ترس لەبەردەم عەشقی گێڕانەوەدا مانای نەدەما، لەو ساتانەدا هێزی گێڕانەوە لەلای فەتانە لە هێزی مردن گەورەتر و بەتواناتربوو. من چەندین جار، گووتم: «فەتانە بە سووکی». بەڵام ئەو دەیگووت: «با یەکجار حکایەتێک بە دەنگی بەرز بگێڕمەوە». لە ناو کتێبەکاندا دەسوڕایەوە و وەسفی جیهانی خەیاڵی ئەو کچە میرەی دەکرد کە توانیوێتی هەموو پادشا و میرەکان بخەڵەتێنێت، شوو بە کوڕی وەزیر و قەڕاڵەکان نەکات و لەبری ئەوە بۆ شەوە خۆش و ئازاد و نهێنییەکانی خۆی بگەڕێت. لەو ساتەدا کە ئەو دەیگووت: «کچی پادشا شەوە تاریکەکانی خۆی بە عەرشە زێڕینەکان نەدەگۆڕییەوە، شەوە پڕ لە نهێنییەکانی بە جاهوجەلالی مەملەکەتەکان نەدەدا، ئەو سیحرەی کە لە لەزەتی شاردراوە و نهێنییدا دەیبینی نەیدەگۆڕییەوە بە هیچ لەزەتێکی ئاشکرا، چونکە دەیزانی نهێنی لەزەت و لەزەتی نهێنی لە هەموو لەزەتەکانی تر گەورەترن، دەیزانی شتێک نییە ناوی لەزەتی ئاشکرا یان لەزەتی حەڵاڵ بێت». لەو کاتەدا وەکو هەوا دەلاقەی تێکەوتبێت، و یەکێک لەو دەلاقەیەوە دەرکەوتبێت، زەینەب لەبەردەممدا دەرکەوت. ئەو هاوارە خنکاوەی لە گەرومەوە بەرزبووەوە بەسبوو بۆئەوەی فەتانە تێبگات شتێکی گەورە ڕوویداوە، کە فەتانە زەینەبی بینی بێئەوەی خۆی تێکبدات بە زەردەخەنەیەکەوە گووتی: «ئاه، مامۆستام چیرۆکی ئەمیرەیەکی خیانەتکارم دەگێڕایەوە...». زەینەب کە پێدەچوو هەموو چیرۆکەکەی گوێ لێبووبێت بەشێوەیەکی سەیر ڕەنگی سپی بووبوو، من لەوەوبەر کەسم نەبینیبوو هێندە شێواو

و شپرزە و ترساو بێت. لەگەڵ دەرکەوتنی ئەودا سەرمایەکی کوشندە هاتە ژوورێ، سەرمایەک کە جەستە و گیان و هەناسەکانیشی دەتەزاند، سەرمایەک کە نازانم واهیمەیەکی من بوو یان حەقیقەت بوو.

کە زەینەب تۆزێک هۆشی بەخۆیدا هاتەوە، بەتوڕەییەوە هاواری لە هەموو مامۆستاکان کرد و ئەوانیش لە چاوتروکانێکدا لەسەرمان حازربوون... زەینەب بە ترسێکی زۆرەوە هەموو ئەو قسانەی گێڕایەوە کە لەدەمی فەتانە بیستبووی، بەدەم قسەکردنەوە بەردەوام قۆڵی فەتانەی گرتبوو، وەکو ئەوەی لە هەڵهاتنی بترسێت، موسیبەتە گەورەکەش ئەو کاتە قەوما کە زەینەب ئەو کتێبی تەفسیری خەونانەی بەدەستی فەتانەوە بینی و لەدەستی سەند و کەوتە هەڵدانەوەی پەڕەکانی... فەتانە پێدەچوو هێشتا هەر مەستی مەملەکەتی ئەو ئەمیرەیە بێت، کە شازادە و پادشاکانی بە هیچ گرتبوو، ترسێکی ئەوتۆی پێوە دیارنەبوو، ئەو بێباکییەی فەتانە زەینەبی زیاتر دەترساند... کە زینەب یەکە یەکە پەڕەی کتێبی تەفسیرەکانی هەڵدایەوە و ئەو خەتە کێشراوانەی لە ژێر هەندێ برگە و جێگای گرنگدا بینی، توڕەییەکەی گۆڕدرا بۆ گومانێکی قووڵ. یەکەمجار زەینەب، بەرلەوەی هیچ بڵێت دەیویست بگاتە سەرچاوەی گومانەکانی خۆی، دەیویست بگاتە دۆزینەوەی درۆی خەونەکان، تا زیاتر پەڕەکانیشی هەڵبدایەتەوە، زیاتر تووشی هیستریایەکی سەیر دەبوو، زیاتر تێدەگەیشت کە ئێمە لەم کتێبخانەیەدا بەدوای یاساکانی خەوندا گەڕاوین، بەدوای پێچکردنەوەیەکی شەیتانیدا گەڕاوین لە تەفسیرەکان، ئەوەشی بە گەمەیەکی هێندە مەکریازانە دەزانی کە دەیگووت: «باوەڕم نەکردوە گیانێکی بەمشێوەیە شەڕانی و زیانبەخش و گوناهبار لە پشت ئەم سیما و نیگایانەوە بێت کە خۆیان وەکو تۆبەکار نیشاندەدا». مامۆستاکانی دیکە، یەکەیەکە چی کتێبی تەفسیر هەبوو دەریانهێنا و کەوتنە هەڵدانەوە و پشکنینی، لە

هەموو جێگایەکیشدا ئەو خەتە کێشراوانەی فەتانەیان دەدۆزییەوە، کە هەندێجار هەر بە خەیاڵەوە بێ هیچ مەبەستێک کێشابووی، یەکەمین کەسیش کە یەکەم پەپولەی دۆزییەوە، ئەو مامۆستا دەموچاو درێژە بوو کە ژیانی پێغەمبەرەکانی پێدەگووتین. من خۆم یادم نییە پەپولەم خستبێتە نابەینی کتێبی تەفسیرەکانەوە، فەتانەش دواتر دەیگووت کە ئەویش هەرگیز پەپولەی لە ناو تەفسیرەکاندا هەڵنەگرتووە. ساڵانێکی دوور و درێژیش هەموو شەوێک من و فەتانە لە سەر ئەوە دەمانکردە دەنگەدەنگ و قاوە، من ئێستاش سوورم کە فەتانە لە ساتەکانی خۆ فەرامۆشکردندا ئەو پەپولەیەی خستۆتە نابەینی کتێبی خەونەکان و ئەویش سوورە کە من لە ئێوارێکانی تورەییدا و بۆ نیشاندانی چاونەترسی ئەو پەپولەیەم داناوە. لەو ئێوارەیەدا دۆزینەوەی ئەو پەپولەیە بەسبوو بۆئەوەی هەمووان شێتانە، یەکە بەیەکەی کتێبەکان بگەڕێن و پەڕە بە پەڕە ئەو جڵدە ئەستوورانەی حیکمەت و بڕوا هەڵتەکێنن و هەموو پەپولەکانمان بدۆزنەوە. زەینەب کە ئەو هەموو پەپولانەشی بینی، هێندەی تر تورەیی و گومان و سەرسامییەکانی گەورەبوون، ئیدی من و فەتانەی لە کونجێکدا ڕاگرت و لە دوای شتی خراپتر کەوتنە پشکنینی گیرفانەکانمان، ئەو کاتە بوو پارچە ئاوێنەکەشیان دۆزییەوە. زەینەب ئیدی شێتانە و ئاشکرا و بە دەنگێکی سەیر باسی بەرجەستەبوونی شەیتانی دەکرد لە گیان و ڕوخسارماندا... بە دەنگێک کە هەموو قوتابخانەکەی بەسەرماندا دەورووژاند باسی ئەو خەونانەی دەگێڕایەوە کە لەو مانگەی دواییدا هەڵمانبەستوون، باسی ئەو دەمامکی درۆیەی دەکرد کە کردومانەتە سەرمان، دەیگووت: «من فێری ئیمانم کردون و ئەم دوو گوناهبارە، فێری دەمامکسازی بوون... فێربوون دوو ژیان و و دوو گیان و دوو دەموچاویان هەبێت... دەمامکەکانیان نوێژیکردوە و عیبادەتی کردوە، بەڵام ڕۆحیان لە ژێرەوە بێخەوش سەرقاڵی ئارەزووە

شەیتانییەکانی خۆی بووە، ئەمە ئەو شتەیە کە من لێی دەترسم... ئەمە ئەو شتەیە کە من هەموو جەستەم لەبەردەمیدا دەلەرزێت... چەند ترسناکە دەمامکەکانی مرۆ ببێتە خوداپەرست و جەوهەریشی لەگەڵ ئەهریمەنەکاندا لۀوازی و گەمەدابێت... وای چەند ترسناکە...».

ئا لەو ساتەدا کە ئەو بەو دەنگە غەمگین و تێکشکاوە قسەیدەکرد، من هەستمکرد زەینەب بەرلەوەی باس لە ئێمە بکات باس لە خۆی دەکات... باس لەو یارییە سەیرەی دەمامکەکان دەکات کە دڵنیابووم بەدرێژایی هەموو ژیانی خۆی لێی ترساوە... بەڵام لەو ئێوارە ساردەدا کە هەموو تورەیی و ڕق و نائومێدی ئەم دواهەمین وەرزە سەختەی ژیانی بەسەر ئێمەدا دەڕژاند، کچەکانی دی بێدەنگ و ترساو سەیری ئەو پەلکێشکردنەی من و فەتانەیان دەکرد، سەیری هەڵوەراندنی پەپولەکانیان دەکرد لەلایەن مامۆستاکانەوە... پەپولەکان هەڵدەوەرینە سەر زەوییەکە و هەموان پێیان پیادەنان. زەینەب هاواریدەکرد: «سەیری کەرەستەی سیحر بکەن، سەیری جادوو و جادووبازیی بکەن لە تۆبەخانەی یەکەمی وڵاتدا». ئاوێنە چکۆلەکەی گرتبوو بە دەستییەوە و لە تۆبەتێکی هەڵچووندا دای بەقەد یەکێ لە دیوارەکاندا و پارچەپارچەیکرد. لە نێوان قسە و وەعز و تورەبوونەکانیدا فەرمانیدا پێخەف و نوێنەکانمان هەموو داگرنەخوارێ، چونکە هەموو بەجۆرێک شەیتانی بوون چیتر بەکەڵکی خەوتن نایەن، فەرمانیدا جلەکانمان لەبەر داماڵن، چونکە ئەو جلانە جگە لە جبەی شەیتان هیچی تر نین و پەیوەندییەکیان بە تۆبەوە نەماوە... دوو مامۆستا بەخێرایی پێخەفەکانیان ڕاکێشایە خوارێ، چەندین مامۆستای دیکەش، لەگەڵ چەند خوشکی تۆبەکاردا کە بەردەوام دەیانگووت: «استغفرالله العظیم، من کل ذنب عظیم» جلەکانیان داماڵیین و نیمچە ڕووت بە ساڵۆنەکەدا بردیانین. من دەمویست هاواربکەم، دەمویست پڕ بەدڵ پێبکەنم یان بگریم، بەڵام بە جۆرێ سڕبووبووم هیچم بۆ نەدەکرا،

هەستمدەکرد فەتانە وردە وردە ئەو دڵنیایی و ئارامییەی یەکەمجاری لەدەستداوە و ترسێکی کوتوپڕ لە عاقیبەت و کۆتایی شتەکان بە دەموچاوییەوە دیارە... کە بەلای خوشکە تۆبەکارەکان و مامۆستاکاندا تێدەپەڕیم، گوێم لێبوو دەیانگووت: «شەیتانەکان پەلاماری قوتابخانەیان داوە». یان دەیانگووت: «مەسەلەی جادوو و جادووبازی لەگۆڕێیە». بەو ئێوارە بەفراوییە، مامۆستا و خوشکە تۆبەکارەکان ئێمەیان ڕاکێشایە حەوشەکەوە، دۆشەک و بالیفەکانیان ڕاکێشاین، جلەکانمانیان ڕاکێشا. زەینەب بە خێرایی بەناو قوتابییانی تۆبەخانەکەدا دەهات و دەچوو، دەیگووت: «تا شەیتان زیاتر سەرسەختی بنوێنێت، دەبێت ئێمەش لەگەڵیدا توندتربین... ترسی ئەبەدی من لە دەمامکەکانە، من تۆبەکارێکی دەمامک لەسەرم ناوێت، تۆبەکارێکم ناوێت وەکو یەک ڕێگا بە خودا و ئەهریمەن بدات».

کە گەیشتە حەوشەکە من و فەتانە دەبایە بە پێخاوسی لەسەر بەفرەکە بوەستین، سەرمای ئێوارە بەجۆرێکی کوشندە دەچووە ئێسکەکانمەوە، هەموو شتەکان بەخێراییەکی سەیر ڕوویاندەدا، من چیتر لەسەرماندا توانام نەبوو گوێ لە زەینەب بگرم، کە وەک هەمیشە ئەو ڕستانەی دووبارەدەکردەوە کە لەو سێ مانگەدا من چەندین جار گوێم لێبووبوو... دەمزانی وەک هەمیشە پەنادەباتە بەر ئاگر، دەمزانی وەکو یەکەم بەیانی هاتنمان بۆ قوتابخانە سەرلەنوێ هەمووشتەکانمان دەسوتێنێتەوە. هەموو کیژە حەپەساو و تووڕە و ترساوەکان لە بازنەیەکی گەورەدا ئەڵقەیانگرت، من و فەتانە لە ناوەڕاستدا لەگەڵ مامۆستاکاندا وەستابووین، زەینەب خۆی بە دەستی خۆی نەوتی کرد بە بالیف و جلەکاندا، من دەموچاوم خستبووە ناو دەستمەوە و نەمدەویست تەماشابکەم، فەتانەش بێدەنگ بێئەوەی هیچ بڵێ یەکەیەکە سەیری کیژەکانی دەکرد، زەینەب بە جۆرێکی سەیر و بێهۆشانە دۆعای دەخوێندەوە، قورئانێکی بچکۆلانەی

لە سنگیدا دەردەهێنا و ئایەتەکانی تۆبە و لێبوردنی بە دەنگێکی بەرز دەخوێندەوە، دۆعایدەکرد خودا ئێمە و هەموو کیژانی دیکەش بخاتە بەر ڕەحمەتی خۆی. دۆعایدەکرد، خودا هێز و تینی پێببەخشێت، تا بەسەر ئەو شەیتانانەدا سەرکەوێت کە چۆتە دڵمانەوە... شتەکان ئاگریان دەگرت، من کەمێک خۆشحاڵبووم بەو تین و کڵپەیە کە بۆ ماوەیەک سەرمای کوشندەی ئەو ئێوارەیەی لە دەورم دەرەواندەوە... من دەمزانی لەو ساتەوە ئیتر وەکو دوو مەخلوقی گڵاو و نەخۆش سەیرماندەکەن، وەکو دوو ڕۆحلەبەری گومانلێکراو. هەر ئەو شەوە دوای ئەوەی کە کیژەکانی دیکەیان گێڕایەوە بۆ سەرەوە، ئێمەیان لە ژوورێکی دیکەدا جیاکردەوە، ژوورێک بوو دەکەوتە جێگایەکی پەناوە لە ژێرزەمینێکدا و تەنها چەند مەترێک لە کتێبخانەکە دووربوو، زەینەب دەیگووت: «لە ئێستادا ترسناکترین شت ئەوەیە ئەم دوو ڕۆحە شکستە، تێکەڵاو بەو دەروونانە بکەینەوە کە قۆناغێکیان لە پاکبوونەوەدا بڕیوە... دەبێت لەگەڵ ئەم دووانەدا لە سەرەتاوە دەست پێبکەینەوە». من و فەتانە نەماندەزانی سەرەتا کوێیە؟ سەرەتا کەیە؟ من هەرگیز لە ژیانمدا وا تووڕە نەبووبووم، فەتانەش بەردەوام دەیگووت: «خەندان، لەوانەیە سبەی بە تەواوەتی لە یەکتریمان جیابکەنەوە». من بە درێژایی شەو گینگڵمدەدا، فەتانە ئارامییەکی ڕەزاقورس لەسەر سیمای نیشتبوو، بە هێمنییەکی قووڵ، بەڵام بێمانا بە ژوورەکەدا دەگەڕا و دەیگووت: «خەندانی چکۆلە... چیتە... نەخۆشیت، سەرماتە؟». پرسیار و قسەکانی زۆر بێمانابوون بۆ من، دەمقیژاند: «نا، نەخۆش نیم، سەرمام نییە، هیچم نییە». دەمزانی لەشم و ڕۆحیشم پێویستیان بە هەوایەک هەیە شتەکان ببزوێنێت، هەوایەکی بەهێز، هەوایەک ئەو فشارە سەیرەی شەو و تاریکی ژوورەکە لە سەر ڕۆحم هەڵبگرێت. هەڵدەستام هەموو هاوار و دەنگەدەنگەکانی ئێوارێ لە سەرمدا دەنگیاندەدایەوە، هەستمدەکرد ئەو ژوورە لەوە چکۆلەترە ئەو

هەموو هاوارانە بگرێت. یەکەیەکە دیمەنی کچە تۆبەکارەکانم دەهاتەوە پێشچاو، قسەکانی زەینەب، پەپولە هەڵوەریوەکان. پەروانەم دەبینییەوە، پەروانەی هەموو ڕۆژەکان، پەروانەی شەوانی پێکەوەخەوتن لە ژوورێکی بچکۆلانەدا، پەروانەی سەر شەقامەکان، پەروانەی دواهەمین بەیانی سەفەر. لەیلام دەبینییەوە لە ناو گڕەکەدا، خۆم دەبینییەوە لە پارچە شکاوەکانی ئەو ئاوێنە بچکۆلانەیەی فەتانەدا، هەستمدەکرد هێندە تووڕەم دەتوانم هەموو شتەکان ئاوەژووبکەمەوە... دەمقیژاند: «بۆ دەبێت لێرەدا بژین... لە چی تۆبەبکەین؟». فەتانەم دەبینی بەرەو ڕووم دێت، بەڵام نەمدەزانی دەڵێت چی... فەتانە دەیگرتم و دەیویست ئارامبکاتەوە، بەڵام هێزێکی گەورە لە ناوەوە پاڵیپێوەدەنام، لەگەڵ فشاری ئەو هێزەدا شتەکان هەموویان دەجوڵان، دەمبینی پەنجەرە چکۆلەکانی ئەو ژوورە دەکرێتەوە، بایەکی بەهێز دەرگاکە دەدا بەیەکدا، من لە ژوورەکە دەهاتمەدەرێ و ئەو بایەش لەگەڵمدا دەهات، دەهاتمەدەرێ و فەتانەش بەدوامدا دەهات، دەچوومە ڕاڕەوەکەوە لەدوامەوە جەنجاڵی باکان دەکشا و لە پێشمەوە هەموو شتێک ئارام بوو، هەموو ئەو قوتابخانەیە لە بێدەنگیدا نوقمبووبوو، من دەهاتمە دەرێ و ئەو بایەش لەگەڵمدا دەهات، بەرەو کتێبخانەکە دەکشا، بەرەو ناو ڕاڕەوەکان، بەرەو ناو ژوورەکان، من بەو دەنگە خنکاوە دەمگووت: «زەینەب، بۆ پەپولەکانت برد... زەینەب، وەرەدەرێ، کوا پەپولەکانم». من هەستمدەکرد دەنگم دەرنایەت، کەچی لە هەمان کاتدا گوێم لە سەدای حەرفەکانی خۆم بوو کە لە هەوا و ڕەشەبا و ڕاڕەوەکاندا دەنگیدەدایەوە، تا من زیاتر هاوارمبکردایە ڕەشەباکە زیاتر هەڵیدەکرد و خێراتر و بەهێزتر دەرگا و پەنجەرەکانی دەدا بەیەکدا، لرفەی باکە بە ئەندازەیەک ترسناکبوو، هەموو شتەکانی لەگەڵ خۆیدا دەبرد، کتێبەکان لە قەفەزەکانیان دەکەوتنەخوارێ و با بە خێرایی بە ڕاڕەو و ژوورەکان و داڵانەکاندا دەیڕفاندن، پەردەکان با دەیبردن،

من لە باکەدا دەمقیژاند: «زەینەب، پەپولەکانم بەرەوە». هەموو ئەو قوتابخانەیە لەسەر لرفی ئەو با ترسناکە بەئاگادەهاتەوە. هێدی هێدی ئەو با ترسناکە بە هەموو لایەکدا بڵاودەبووەوە، دەگەیشتە نهۆمەکانی دیکەی قوتابخانە، دەگەیشتە ژوورەکانی سەرەوە، متیلەکانی هەڵدەگرت و پێخەفەکانی بەرزدەکردەوە، کتێبەکانی دەدا بە دیوارەکەدا، پەرداخ و قاپەکانی دەخستەخوارێ، جلەکانی دەفڕاند، من دەگەیشتمە نهۆمی یەکەم و لەوێدا لە ژێر شەوقی گڵۆپێکی زەرد و کزدا زەینەب بە ترسەوە لە ژوورەکەی خۆی دەهاتەدەرێ، بەرەو دەرگاکان ڕایدەکرد تا یەکەیەکە کلیلیان بدات، پارچە کارتۆنی نوسینە دڕاوەکان، بە سیمایەوە دەنووسان، کتێبەکان لەپێشدەمیدا دەکەوتن، متیلەکان لە قاچی دەئاڵان، ئەو هاواریدەکرد: «بسم الله الرحمن الرحیم». من دەمقیژاند: «زەینەب پەپولەکانم بەرەوە». ئەو دەیقیژاند: «استغفر الله العظیم، لا الە الا انت سبحانک... لا الە الا انت سبحانک...». من دەمگووت: «زەینەب پەپولەکانم...». مامۆستاکان هەموو بە قژی بژەوە لە ژوورەکان دەهاتنەدەرێ، با، ناواخنی دۆلاب و بوخچەکانیانی بەتاڵدەکردەوە و لەگەڵ خۆیدا لە هەوای قوتابخانەکەدا گێژیدەدان، ڕەشەباکە ڕەفتەی کچەکانی دەفڕاند، پەنجەرەی هەموو نهۆمەکانی دەشکاند. من لەویادا لەسەر پلەکەکاندا دەوەستام، لەو جێگایەوە دەمبینی چۆن باکە یاری بە هەموو مەخلوقەکانی ئەو قوتابخانەیە دەکات، چۆن گڵۆپەکان دەشکێنێت، چۆن هەندێ لە ڕاخەرەکان لوولدەدات. کچەکان وەکو چەند بوکەشوشەیەک، لەنێوان داڵان و ژوورەکاندا با دەیهێنان و دەیبردن، زەینەب لەسەر عەردی یەکەمین نهۆم لە متیلەکانەوە ئاڵابوو، مامۆستاکان بە سامێکی لەڕادەبەدەرەوە دەیانویست کۆنترۆڵی دەرگا و پەنجەرەکان بکەن، کە هێندە خێرا و بەتەکان دەیاندا بەیەکدا، کێلون و شوشەکانیان پارچەپارچەدەبوو. ئێستا کچەکان و مامۆستاکان بە جۆرێک دەیانقیژاند،

من گوێم لە دەنگی هاوارەکانی خۆم نەبوو، هاواری من بۆ پەپولەکان... لە ناو خودا خودای ئەواندا و لە گفەی باکاندا ونبوویوو، من جگە لە هاوار و تورەیی گریانیشم دەهات. کە زەینەبم دەبینی لە نابەینی متیل و کتێب و چەرچەفەکاندا دەتلێتەوە، کە مامۆستاکانم دەبینی تەزبیحەکانیان لە گەردنیان ئالاوە، کە ڕەفتەی کیژەکانم دەبینی بە بنمیچەکان و بە شیشی ئاقاری پەنجەرەکانەوە گیرساونەتەوە، گریانم دەهات... بەلام لەگەڵ شکانی گلۆپەکان و خەفەبوونی مۆمەکاندا، قوتابخانە تاریکتر دەبوو، تا زوڵمەت زیاتربووایە من زیاتر ماندوودەبووم، هەستمدەکرد ئەو با ساردە عارەقێکی ڕەشم پێدەکاتەوە، عارەقێک هەمووی تنۆکی تاریکییە... من هاوارمدەکرد و دەگریام، بەلام سەرم بەرزدەکردەوە و هەستمدەکرد کە هەمووان هاواردەکەن و دەگرین. ئیدی نەمدەزانی من گوێم لە دەنگدانەوەی ڕۆحی خۆمە، یان من تەنها دەنگدانەوەیەکی کپی ئەو ڕۆحانەی ترم کە هاواردەکەن و دەگرین. من دەمقیژاند و هەنسکم هەڵدەدا، بەلام نەمدەزانی دەڵێم چی، ئەوەی دەمبیست تەنها دەنگێکی خنکاوبوو، لە گەروویەکی زامدارەوە دەهاتەدەرێ. لەگەڵ هەموو قریشکەیەکیشدا لاوازتر و لاوازتر دەبووم، لەگەڵ هەموو فرمێسکێکدا کەمتر دەمتوانی خۆم بەپێوە ڕابگرم، تا منیش لاوازتربوومایە باکان ئارامتر دەبوونەوە، تا زیاتر خاودەبوومەوە، ڕەشەباکان لەگەڵمدا زیاتر خاودەبوونەوە، سەرم بەرزدەکردەوە و هەستم بەو سستییە کوشندەیە دەکرد لە جەستەمدا، هەستمدەکرد دەکەوم و باکانیش لەگەڵ ئەژنۆکانمدا دەکەون، من هەرەسدەهێنم و باکانیش لەگەڵ ئەژنۆکانی مندا هەرەسدەهێنن، من دەکەوتم و گوێم لە هاوار و دەنگە دەنگی خوشکە تۆبەکارەکان دەبوو بە کۆمەڵ بە پلەکەکاندا دەهاتنەخوارێ، بەسەر لەش و سەر و ڕۆحی سڕبووی مندا ڕایاندەکرد. چاوم لێکدەنا و ئەو تاریکییە گەورە و پڕ لە ژانەم دەبینی کە بە لرفەیەکی ترسناک لەگەڵ خۆیدا

دەیبـردم، شـەوەزەنگێکی سـەیرتریش لـە دوورتـر بانگیدەکـردم، دەکەوتمـە نـاو ڕەشـێتییەکی گـەورەوە، ڕەشـێتییەکی موتڵەقـەوە، ڕەشـێتی دونیایـەک کـە نـە ئاڕاسـتەی تیابـوو نـە ڕێـگا، نـە بینینـی تیابـوو نـە بیسـتن، نـە پەپولـەی تیابـوو، نـە شـەیتان.

مـن نازانـم چـۆن بەئاگاهاتمـەوە، بـەڵام کـە بەئاگاهاتمـەوە بەیانییەکـی سـاردبوو، گوێـم لـە دەنگـی پـورم و باوکـم بـوو، لەودیـو دەرگای ژوورەکەمـەوە لەگـەڵ زەینەبـی کوێسـتانیدا قسـەیاندەکرد. گوێـم لێبـوو پـورم دەیگـووت: «خەنـدان، خـۆی کچێکـی بچکۆلانەیـە، بـەڵام ئیلهامـی ئـەم هەمـوو سەرکێشـییەی لـە پەروانـەوە بـۆ دێـت، پەروانـەش دەمرێـت... بەڵـێ ئەمـڕۆ پەروانـە دەمرێـت». مـن هێشـتا بـە تەواوەتـی تێنەدەگەیشـتم «پەروانـە دەمرێـت» یانـی چـی. سـەرم بەرزدەکـردەوە و لـە پەنجەرەکـەوە دەمڕوانـی، بەفرێکـی زۆرم دەبینـی لـە حەوشـەکەدا کەوتـووە... خودایـە، دوێنـێ شـەو، لـە دوای بێهۆشـبوونی مـن، بەدرێژایـی شـەو بەفـر بـاری بـوو، کـە زیاتـر لامدەکـردەوە فەتانـەم دەبینـی بـە جلـی تەواوەتییـەوە لەنێـوان چەنـد کەسـێکی غەریبـەدا لەبـەردەرگای قوتابخانـە وەسـتاوە. دەمگـووت: «خودایـە، ئـەم فەتانەیـە، چ کچێکـی سـەیرە، بـەم بەیانییـە سـاردە چـی دەکات لەبـەردەرگا». لـە هەمانکاتـدا یەکێـک دەرگای ژوورەکـەی دەکـردەوە و بـە دەنگێکی کەمێـک بێسـۆز دەیگـووت: «خەنـدان... خەندانـی چکۆلـە... هەسـتە، مـن دەزانـم بەئاگایـت... هەسـتە... هەسـتە و بابڕۆیـن».

# ٢٢

لەو کاتەوەی دەستمان بە سەفەر کرد، بە چەندەها هەرێم و زەوی سەیردا ڕابوردین، خاکمان بڕی سەرتاسەری بەردبوو، زەویمان بینی لەمێژبوو خاڵیکرابووەوە لە مرۆڤ، بەتەنیشت کۆڵەکەی ئاوەدانییە نغرۆکان و شارۆچکە وێرانەکاندا ڕابوردین. ئەو ڕۆژە من و فەتانە لە دوای ماشێنەکەوە سواربووبووین، ئەو ئامۆزا بچکۆلانەیەی پەروانەش کە جێبەکەی لێدەخوڕی لەتەک پورم و باوکمدا لەپێشەوە بە بێدەنگی تەماشای دەرەوەیان دەکرد. هێندێکی زۆرنەبوو دەڕۆیشتین، کە وردە وردە سەرەتای دارستانە سووتاوەکان دەرکەوت، بە هەرێمێکدا تێپەڕین کە شۆفێرە بچکۆلانەکە دەیگووت: «هەفتەی پێشوو گۆڕەپانی شەڕێکی گەورەبووە، لەنێوان چەندەها سوپای جیاواز جیاوازدا» . من سەرنجمدا، ماوەیەکی درێژبوو ماشێنەکەمان تەنها بەناو خوێندا دەڕۆیشت... ژمارەیەکی زۆر کوژراو لە قەدپاڵ و نزارەکاندا کەوتبوون، پێدەچوو ئەو بەفرە زۆرەی کە چەندین جار بەسەر لاشەکاندا باریبوو، نەیتوانی بێت جۆگەلەی ئەو خوێنانە دابپۆشێت کە لە بەرزاییەکانەوە دەهاتن و دەڕژانە سەر شەقام و ناو کێڵگە تەختەکان، چەند ساتێکی دوور و درێژ، من لە خوێن زیاتر هیچی ترم نەدەبینی... خوێن و بەفر... هەتا باڵندە چکۆلەکانیش کە دادەبەزین، لەسەر گومیچکە خوێنەکان دەوەستان، دیمەنی ئەو هەموو خوێنە بەشێوەیەکی سەیر منی بەرەو

ئەو ئێوارە دوورەی سەرەتای بەهارێکی دی ڕادەکێشایەوە، کە من و پەروانە بەناو خوێنی قوربانییەکاندا ڕۆیشتین و لە دەرگای ماڵی فەرەیدونی مەلەکمان دا، ئەو ئێوارەیەی کە پەروانە ویستی خوێناویی نەبێت و بە پاکیٔ بگەڕێتەوە ماڵێ.

شۆفێرەکە بە خێراییەکی سەیر بەناو گۆمیچکەکاندا لێی دەخوڕیی، پریشکە خوێنەکانیش هەندێجار دەگەیشتنە پەنجەرەکانی ماشێنەکە. شۆفێرەکە ناوی ژمارەیەکی گەورەی لە کوژراوەکان دەزانی و بە لەزەتێکی گەورەوە دەیگووتنەوە، ناوەکان تێکەڵەیەکی سەیربوون لە ناوی کوردی و فارسی و عەرەبی، هەرچەند سەد مەترێک و پەنجەی بۆ جێگایەک ڕادەکێشا و دەیگووت: «ئا لەویادا عەقید سەعید کوژرا... ئا لەویادا تابووری ڕائید مەحمود تەفروتووناببوو... لەبن ئەو بەردەدا سەرتیپ شێخۆ شەهیدبوو... لە ژێر ئەو درەختەدا سەرهەنگ عەلی ئابادیی خۆی کوشت...». گەنجەکە بەشێوەیەکی سەیر لە ناو دونیای خۆی و مردووەکانیدا دەژیا، دەبایە زۆرجار پورم یادیبهێنێتەوە کە ئێمە بۆ کویٔ دەچین و دەبێت چ ڕێگایەک بگرین. لای نیوەڕۆ گەیشتینە سەر کانییەکی ساف لەنزیک کەلاوەکانی مزگەوتێکی کۆن و ڕووخاو کە تەنها بەستی نوێژکردنەکەی بە سافی لە شوێنی خۆیدا مابوو. هەمووومان نوێژمانکرد، سوپاسی خودامان کرد بۆ نیعمەتە بێسنوورەکانی، پاش داکرماندنی چەند سێوێک و هەڵقوڕاندنی چەند چایەک، کەوتینەوە ڕێگا. لە ڕێگا چەندەها جار وەستاین، چەندەها گۆڕی چکۆلەمان ڕەجمکرد کە گۆڕی کافرانی زەمانەکانی دیکە و سەردەمەکانی دیکە بوون، پێدەچوو پورم شارەزای هەموو ئەم گۆڕانە بێت، دەیگووت: «ئەمە گۆڕی «باوەنووری مردووخۆرە» کە گۆشتی گیانداری مردارەوەبووی خواردوە. ئەمە گۆڕی «نووری بزەڵە» کە لە سزای خراپەکانیدا، هەموو شەویٔ لە دوای نوێژی شێوانەوە بووە بە بەراز، ئەمە گۆڕی

«وەیسی جنۆکە»یە کە تاعوون و دەردی ڕەشی بڵاوکردۆتەوە».

من و فەتانە لەوکاتەوەی لەبەر تۆبەخانەکەدا سواربووبووین هیچمان نەگووتبوو، بەردەوام لەبیری ئەو دوو خوشکەماندا بووین کە دەبایە لە ئاهەنگی مردنیاندا ئامادەبین. ترس و غەمبارییەکی قووڵ لەسەر دڵی من و فەتانە نیشتبوو کە لەگەڵ ئەو ئاسودەییەدا نەدەگونجا کە لەلای پورم و بابم و شۆفێرەکە هەستم پێدەکرد. من وای بۆدەچووم کە ڕێگاکە بەردەوام درێژدەبێتەوە و ناگاتە کۆتایی... بە خاکێکدا تێپەڕین کە تێیدا ئێسکی هەزارەها هەزار سەر ئاژەڵ، لە قەراغی شەقامەکەوە تا ئەوسەری ئاسۆکان کەڵەکەبووبوون، شۆفێرەکە دەیگووت: «ئەم جەڵەبە گەورانە لە زەهر بارانەکانی پاردا فەوتاون». لەو خاکە عاجباتیانەدا ئێسکی مرۆڤ و ئێسکی ئاژەڵەکان بەجۆرێکی سەیر تێکەڵاوی یەکتربوون، چاوم دەنوقاند و دەمگووت: «خودایە کەی دیمەنی ئەم هەموو مەرگە دواییدێت؟ خودایە کەی لەم دەریای ئێسک و لاشانە دەچینە دەرێ؟». لەگەڵ ئەوەشدا بەحری بێسنووری ئێسک و لاشەکان دوایی نەدەهات... دواجاریش کە گەیشتینە ئەو گوندە پێنەدەچوو لەو دەریایە هاتبێتمە دەرێ، بەڵکو دەنگێکی ترسناک لە ناوەوە پێیدەگووتم: «ئێستا تۆ لە ناو مردندا وەستاویت».

چەندین ڕۆژ بوو گرتنەوەی ئەو عاشقانەی کە لە عەشقستان ڕایانکردبوو بووبوو بە پەتایەکی گەورەی ئەو هەرێمانە، هەر لە ناو ئەو شەپۆلەشدا سووسەکەران هەواڵی نیشتەجێبوونی دوو کچی پەرتەوازەیان لە ماڵی پیر مووسای خەزانناس بە کەژاوە گەڕۆکەکانی ئیمان ڕاگەیاندبوو «کە لەو هەفتەیەدا بەدوای شوێنپێی عاشقاندا بەسەر چەند کەژاوەیەکی جیاوازجیاوازدا دابەشبووبوون». دوای چەند ڕۆژێک لەو بەیانییە ساردەی کە نەسرەدینی بۆنخۆش، پەروانە و میدیای لە ماڵی خەزانناسی هاوڕێیدا بەجێهێشت، چەند پیاوێکی دەفتەر

بەدەست گەیشتنە گوند و پەروانە و میدیایان لە ژوورێکی بچکۆلانەدا دەستبەسەرکرد، ئێوارەی هەمان ڕۆژیش بە قاسیدێکی تایبەتیدا پورم و باوکی فەتانەیان لە هەموو شتێ ئاگادارکردەوە... ئێمە نیوەڕۆیەکی درەنگ وەخت گەیشتینە گوندەکە، کە لە ماشێنەکە دابەزیم و ئەو قەرەباڵغییە گەورەیەم بینی، تێگەیشتم کە هاڵاوێکی مەنگی مردن لە هەموو شتێکی ئەو گوندەوە هەڵدەستێت، من لەگەڵ دابەزینمدا مردنم وەکو باڵندەیەکی ڕەش لەسەر گاشەبەردێکی زۆر گەورە بینی، بە فەتانەم گووت: «فەتانە سەیرکە، ئەو باڵندەیە، باڵندەی مردنە». فەتانە گووتی:«خەندان ئەم ئێوارەیە، ئێوارەی چیرۆک نییە... ئێوارەی خەیاڵ نییە». بەڵام من ترس دەیکوشتم. لەگەڵ دابەزینمدا لە ماشێنەکە، ساردییەکی وەحشەتناک و وێرانکەر، ساردییەک لە گیانکێشانی دوای پیکانێکی لەناکاوی خەنجەر دەچوو، چووبووە گیانمەوە، دەمگووت: «فەتانە، من هیچ کات بەئەندازەی ئێستا، پێویستیم بە خەیاڵ نەبووە، هیچ کات بەم شێوەیە هەستم نەکردوە کە ناتوانم ڕووبەڕوو سەیری دونیا بکەم، بەڵام بینینم بۆ مردن خەیاڵ نییە، ئەوە باڵندەی مردنە و هیچی تر...». من هەستمدەکرد کە مردن لەوێیە، مردن لە جێگایەکی زۆر نزیکە و لەتەنیشتمانەوە ڕاوەستاوە، دەمتوانی بەجۆرێکی سەیر لە هەوادا بۆنیبکەم، لە ڕۆیشتنمدا بەریبکەوم. کە گەیشتمە ناوەڕاستی گوند جەنجاڵییەکی بێسنوور ئاپۆرەی بەستبوو، بەڵام من جگە لە قەوارەیەکی ترسناکی دەنگ و ڕەنگ هیچی دیکەم بۆ جیانەدەکرایەوە. من لە بێهۆشییەکی سەیردا بووم، هەتا کاتێک پورم پەلیگرتم و بەناو ئەو جەنجاڵییەدا بردمی، نەمدەزانی بەرەو کوێ و بە چ ئاراستەیەک دەڕۆین، نیوەئاگا و نیوەبێهۆش بە هەموو توانام پەلی فەتانەم گرت و لە دوای خۆم کێشمکرد، کە کەمێ دەهاتمەوە سەرخۆم، دەمبینی پورم بە هەموو هێزی خۆی بەسەر ڕێگایەکی نیمچە هەورازدا ڕامدەکێشێت،

خەڵکێکی جۆرا و جۆریشم دەبینی کە هەندێکیان چەک و هەندێکیان دەفیان پێبوو، هەموو بە کۆمەڵ لەملاولای ڕێگاکەدا وەستابوون. فەتانە دەیگووت: «خەندانی چکۆلە، بەرەلامکە، خۆم دەڕۆم... خوایە، خۆم دەتوانم بڕۆم». من دەمگووت: «فەتانە، ئەگەر دەست لەیەکدی بەربدەین، وندەبین، دەست لەدەستم بەرمەدە». پورم وەکو بایەک هەڵیگرتبێت دەڕۆیشت و بە ئێمەی دەگووت: «بێدەنگبن و سەرتان داخەن... سەیری کەس مەکەن... ئاورمەدەنەوە». بەلام فەتانە بەردەوام دەیگووت: «ئەگەر لەسەرەخۆ نەڕۆن، دەکەوم، من ناتوانم وەکو ئێوە بڕۆم». پورم گوێی لە سکالاکانی فەتانە نەدەگرت، منیش بە نیگایەکی پەرێشان سەیری هەموو دیمەنەکانم دەکرد، دواجار پیاوێکم دەبینی، هەموو گیانی لە فیشەکدا ئاڵتونی دەینواند، دەمگووت: «فەتانە سەیرکە ئەوە مردنە، ئەو پیاوە مردنە... ئەگەر ئەو باڵندەیەی پێشوو مردن نەبووبێت، ئەم پیاوە مردنە».

لەبەردەم ماڵێکی بچکۆلانەدا براکانم بینییەوە، هەموویان لە ڕیزی یەکدی وەستابوون، بەلام وەکو ئەوەی شەیتانێک یاری بە دیمەنەکان بکات، وەکو یەکێک چەندین ئاوێنەی نەبینراوی دانابێت، شتەکان دووبارەدەبوونەوە و بەناویەکدادەچوون... سیماکان تێکەڵاوی یەکتر دەبوون و بەسەریەکدا دەشکانەوە. من دەمڕوانی و ڕیزێکی درێژم لە پیاوان دەبینی کە هموویان بە براکانم دەچوون، هەمان جلیان لەبەردابوو، هەمان نیگایان هەبوو... دەڕۆیشتن و کۆلانەکانیش بە هەمان جۆر دووبارەدەبوونەوە، بە گوزەرێکدا ڕادەبوردین و پێچماندەکردەوە بۆ گوزەرێکی تر، بەلام وەکو بەناو شکانەوەی ئاوێنەیەکدا ڕابوردبێتین دووبارە دەکەوتینەوە هەمان شوێنی پێشوو، دەڕۆیشتین و جارێکی دیش لە سەرەتای هەمان دیمەن و هەمان ڕێگادا خۆمان دەبینییەوە، دەمانبینی چاوەکان هەموویان بە هەمان سەرنج و لۆمە و گومانەوە

تەماشـاماندەکەن. مـن دەمگـووت: «فەتانـە، سـەیرکە، براکانـم بۆنـی مردنیـان لێدێـت». فەتانـە بێئـەوەی وەڵاممبداتـەوە، دەیچرپانـد: «خەنـدان، مـن خەیاڵـم لای شـێوەی ئـەم گوندەیـە، خەیاڵـم لای ماڵەکانـە، دەڵێـم پەنجـەرەکان بـۆ وەهـا بچکۆلانـەن، دەرگاکان بـۆ بـەو ئەندازەیـە نزمـن، گوێسـەبانەکان بۆ بـەو شـێوەیە نەویـن». بێئـەوەی دەرفەتـی وەڵامدانـەوەم بـدات، خـۆی دەیگـووت «خەندانـی چکۆلـە، نـا، ئـەم ماڵانـە لـە گـۆڕ دەچێـت... ئـەم حەوشـانە دیمەنـی قەبرسـتانم دەهێننـەوە یـاد». پـورم کـە دەیزانـی ئێمـە چرپەچرپمانـە، خێراتـر دەڕۆیشـت، توندتـر و بێڕەحمانەتـر دەسـتی منـی ڕادەکێشـا، زیاتـر و زیاتـر بەناو دونیای شـکاوە و بەیەکداچووی پیـاوە خەنجـەر بەدەسـتەکاندا دەیسـوڕاندینەوە. مـن دەمگـووت: «فەتانـە ئـەم پیاوانـە وەکـو ئـەوەی لـە هـەور یـان لـە غوبـار، یـان لـە تۆزێکـی ڕەش خوڵقابـن، تێکـەڵاوی یەکتردەبـن... دەموچاویـان لـە ناویەکـدا دەشـکێتەوە، لەشـیان بـە جۆرێکـی ناماقـووڵ تێکـەڵاوی یەکتـر دەبێت، سـەیریانبکە، ئەوان خۆیـان نیـن، بـەڵام لەگـەڵ ئەوەشـدا جگـە لـە خۆیان کەسـی دیکـەش نین».
فەتانـە بـە بێزارییەکـەوە دەیگـووت: «خودایـە، خـودای میهرەبـان، ئـەم ئێوارەیـە ئـەم کچـە بـەم وڕێنانـەی دەمکوژێـت. خودایـە ئەمـڕۆ فریامکـەوە، بـە هیـچ نەمـرم بـە بیسـتنی ئـەم وڕێنانـە دەمـرم». پـورم ئەمجـارە دەیقیژانـد: «بێدەنگبـن، ناتوانـن بـڕۆن و قسـەنەکەن... ناتوانـن؟». مـن لـە وەڵامەکـەی فەتانـە و هاوارەکانـی پـورم کەمێـک زویردەبـووم. فەتانـە بـە دەسـتووری خـۆی، هەرکاتێـک بێزانیبایـە دڵـی یەکێکـی ئازارداوە، قسـەکانی دەگـۆڕی و بۆ وەدەسـتهێنانەوەی دڵنەوایـی هەنـدێ شـتی نوێـی دەگـووت...
فەتانـە دەڕۆیشـت و دەیگـووت: «خەندانـی چکۆلـە، تـۆ زۆر قەرزاربـاری منیـت، تـۆ بـۆ بـە منـت نەگـووت، دەتوانیـت ڕەشـەباکان دروسـتبکەیت... بـۆ بـە منـت نەگـووت؟ خودایـە دوێنـێ شـەو چ شـەوێکی قەشـەنگ بـوو، وای چ شـەوێکی قەشـەنگ بـوو... لەیادتـە چـۆن شـتەکانت تێکەڵاوکـرد،

چۆن سەرتاپای دونیات دا بەسەریەکدا، ئەوەی هەبوو و نەبوو خستە بەر گەردەلوولێکی تاریک وگێژ... لەیادتە... ها، لەیادتە؟ ئاە، خەندان، لەوانەیە هەر بەکاری ئەو ڕەشەبایەی ناو سەرت بێت، دەموچاوەکان بەو جۆرە دەبینیت». من بە توڕەییەوە دەمگووت: «ئاە، فەتانە، من هیچ پەیوەندییەکم بە ڕەشەباکانەوە نییە». فەتانە دەیگووت: «خەندان، نا، ناتوانیت، گاڵتەم پێبکەیت، تۆ ئەو گەردەلوولەت دروستکرد، هەموکەس دەزانێت، کە تۆ گەردەلوولەکەت دروستکرد». پورم دووبارە بێبزە و بێبەزەیی سەیریدەکردین و دەیگووت: «بێدەنگبن». من بێدەنگدەبووم و بیرم لە پورم دەکردەوە، دەمزانی لە جیهانی ئەودا، لە شەریعەتەکانی ئەودا، ڕەحم و بەزەیی جێگایان نابێتەوە، ئەو لای وابوو مرۆڤ دەبێت شەریعەتەکان بچەسپێنێت و ئیدی خودا بۆ خۆی بڕیار لەسەر شتەکان دەدا، ئەو بڕیاردەدا کە کێ دەکەوێتە بەر نەفرەت و کێ دەکەوێتە بەر ڕەحمەت، بەڵام ئەو لەبەر هۆیەکی نەزانراو پێیوابوو کە سزادانی پەروانە و پاکێتی من پەیوەندییەکی قووڵیان بە چارەنوس و ئیمانی ئەوەوە هەیە، لەو باوەڕەدابوو گەر پەروانە بە سزایەکی گەورە نەگات، ڕۆحی ئەو بە فیردەوس و ئارامی شادنابێت. ئەو پاشنیوەڕۆ ساردە کاتێک بەسەر بەفری ئەو کوچەیەدا سەردەکەوتین، دڵنیابووم ئەو بە شێوەیەکی سەیر دوای خولیای بەهەشت کەوتووە. من لە بەیانییەوە سەیری چاویم دەکرد و دەمبینی، تەماحەکانی بۆ بەهەشت بە ڕوونی لە گلێنەکانیدا دەبریسکێنەوە، دەمبینی یەک پارچە گڕ و شەوقە بۆ جێبەجێکردنی پەیمانێک کە لە دڵەوە لەگەڵ خودادا بەستبووی. چەمکی تەڕی جبە درێژەکەی بەرم هەڵدەکرد و دەڕۆیشتم، کزەیەکی کوشندە دەیتەزاندم، لەگەڵ ئەو کزەبایەدا تێدەگەیشتم کە تەماح لە بەهەشت دەشێت هەڵبگەڕێتەوە سەر خودانەناسییەکی قووڵ، دەشێت ئارەزووی چوونە بەهەشت، بکەوێتە دژایەتی هەموو یاساکانی مرۆڤ و خودا.

دواجار گەیشتینە ماڵی پیر مووسای خەزانناس، بەڵام دواتر بۆمدەرکەوت کە هەموو ماڵێکی ئەم گوندە بە شێوەیەکی بێمانا بە ماڵەکانی دیکەوە گرێدراوە، بە جۆرێک لە هەموو ژوورێکەوە دەروازە هەیە بۆ ژوورێکی دیکە و لەوێشەوە دەروازە هەیە بۆ هەموو جێگاکانی دیکە. لەبەردەم دیوارەکانی ئەو ماڵەدا دووبارە براکانم بینییەوە، بەڵام ئەمجارە لە ناو چەندەها چەکدار و چەندەها مامۆستای ئاینیدا ونبوویبوون. فەتانە دەستی بۆ دەرگایەک درێژکرد و چپاندی بە گوێمدا: «خەندان، میدیا و پەروانە لە یەکێ لەو ژوورانەدان... لەوێن». دەنگە دەنگێکی گەورەبوو، مامۆستاکان هەندێکیان لە ژێر لێویانەوە سڵاواتیان دەخوێند، تەقەی بەریەککەوتنی چەکەکان زۆرجار بەسەر دەنگەکاندا زاڵدەبوون، لە خەیاڵی منیشدا دەموچاوەکان بە ئەندازەیەک ئاڵۆزکابوون کە چیدی بە ئاسانی لەیەکدی جیانەدەکرانەوە، من بە قووڵی بیرم لەو قسەیەی فەتانە دەکردەوە و دەمگووت: «ئاخۆ بەڕاست دەبێت ئەو ڕەشەبایە لە هۆش و نیگامدا هەڵیکردبێت؟ خوای گەورە شتی وا دەبێت ... شتی وا دەبێت؟»، نەمدەتوانی لە دەنگەکانیش تێبگەم، چەندەها خاتوونی دەفڕەن لەپشت دیوارێکی نزمەوە دەفیان لێدەدا، من دەمڕوانی و دەمپرسی: «خوایە، کامانەن میوانەکان و کامانەن دانیشتوانی گوند؟». وەڵامم چنگ نەدەکەوت، سیماکان هەموو نەبینراو و نەناسراوبوون... وا هاتە خەیاڵم کە هەتا براکانیشم ناناسم و نەمبینیوون.

هەر دەستێکم دەبینی، دەمگووت: «ئەمە دەستی مردنە». هەر بۆنێکم دەکرد، دەمگووت: «ئەمە بۆنی مردنە». هەر دەنگێکم دەبیست، دەمگووت: «ئەمە دەنگی مردنە». کاتێک هەندێجار هەموو پیاوەکان بە کۆمەڵ دەجوڵانەوە، هەستمدەکرد، زەوی کەم کەم لە ژێر پێیاندا دەخزێت. لەودیوەوە و لەبەر خۆرەتاوێکی کزی دەمەوعەسردا کە هیچی لە کزەی ئەو سەرمایە کەمنەکردەوە. لە حەوشێکی چکۆلەدا، ژنان

بەدیار چەندەها مەنجەڵی گەورە گەورەوە دانیشتبوون. من لەوەوبەر دیمەنی لەو شێوەیەم نەبینی بوو، بە فەتانەم گووت: «ئەو مەنجەڵانە پڕن لە خوێن...». فەتانە دەیگووت: «درۆیە، وانیە... ببێت و نەبێت، ئیماندارێکی پارەدار، مەسرەفی هەموو ئەم میوانانەی کێشاوە. ئەو مەنجەڵانە پڕن لە شلەیەک کە بە شلەی مەولوو دەچێت». من وەک گەمژەیەک کە نازانێت دەڵێت چی، دەمپرسی: «نان دەخۆن، ئەوسا دەیانکوژن؟». فەتانە کە لە من ڕوونتر و سافتر شتەکانی دەبینی، دەیگووت: «لەوانەیە بیانکوژن، ئەوسا نان بخۆن، هەندێکیان لە برسی ناچن، بەڵام هەندێکیان شەکەت و دەستەپاچە دێنە بەرچاو». من هەموو ترسێکم دەخستە لاوە و لە پورمم دەپرسی: «پەروانە لەکوێیە؟». بۆ یەکەمجار پورم بە ئاشکرا وەڵامیدەدامەوە و دەیگووت: «لەو ژوورە دەرگا سەوزەوە دەتوانی بچیتە لای...». دەمگووت: «دەتوانم بیبینم؟». دەیگووت: «دەتوانیت بیبینیت، بەڵام ناتوانیت قسەی لەگەڵدا بکەیت». پورم پەلیگرتین و بردینیە ناو ژوورێکی گەورەوە کە پڕبوو لە ژنان، بەڵام هەموویان خەوتبوون. کچێکی بچکۆلانە بەرەو ڕوومان هات و ئاگاداریکردینەوە: «ئەم خاتوونانە بەدرێژایی شەو بەڕێگاوە بوون... ئێستا بڕیارە تا کاتی پێویست پشووبدەن، هەندێکیشیان گووتوویانە تا کاتی نانخواردن بەئاگایان نەهێنینەوە». چووینە ژوورێکی دیکەی پڕ لە ژنی سەنگین و سەلار کە هەموویان لەبەردەم چەندەها ئاوێنەدا قژیان شانەدەکرد، کچێکی بچکۆلانە، کە هەر بەو کچەی پێشوو دەچوو، گووتی: «ئەم خاتوونە بەڕێزانە، خۆیان بۆ تۆڵەسەندنەوە دەڕازێننەوە». چووینە ژوورێکی تر، دوو تاقم ژنی سەرسپی بەسەر دوو پارچە قوماشی سپییدا نووشتابوونەوە، خانمێکی گچکەڵە خەبەری پێدایین، کە ئەم پیرێژنانە، چەندەها ساڵە خەریکی ئامادەکردنی ئەم دوو کفنەن بۆ ئەمڕۆ. لە ژوورێکی تاریکتردا، چەندەها

ژنمان بینی بە تەزبێحەکانیانەوە، بە بێدەنگی دۆعایان دەخوێند و بە چواردەوری خۆیان و دونیادا کووفیاندەکرد، یەکێک پێیگووتین: «خانمانم، ئەمانە شەیتان لە خۆمان و لە گوندەکە دووردەخەنەوە».
دواجار گەیشتینە ژوورێکی خاڵی، تەنها یەک پەنجەرەی تیابوو کە بەسەر ژوورێکی دیکەدا دەیڕوانی، خانمێکی مامناوەندی لە تەمەندا، بە سەرولاگیرەیەکی ڕازاوەوە، بە جووتێ چاوی ڕەشکراوەوە، بە هاڕەی هەیاسەیەکی بریسکەدارەوە هات و گووتی: «ئەو دوو کچە لەو ژوورەدان، دەتوانن لە پەنجەرەکەوە تەماشایانبکەن». من و فەتانە دوای چەندین مانگی دوور و درێژ لەو دەلاقەیەوە خوشکەکانمان بینییەوە، پەروانە لەوێ لەسەر بەستێکی بچکۆلانە دانیشتبوو و سەیری پەنجەرەکەی دەکرد، چەندین جار لە جاران لاوازتر و برونزیتر بوو، نێوچاوانی ڕوونتر و ئاویتر دەینواند بە جۆرێک وام هەستدەکرد خەونەکانی بەئاسانی لە نێوچاوانییەوە دیارن، ئەو سەیری پەنجەرەکەی دەکرد و هیچی نەدەگووت، لەپێشدا منی نەبینی، یاخود پێدەچوو ئەویش لە ناو ئەو هەموو دەموچاوانەدا کە لە ماوەی ئەو دوو ڕۆژەدا بینیبووی، بە ئاسانی نەتوانێت سیماکان لەیەکدی جیابکاتەوە، بەڵام کە تێرتر و ڕوونتر تەماشایکردم، وەکو حەپەساوێک هەستا و لە پەنجەرەکە نزیکبووەوە، باڵای وەکو هەمیشە بەرز و نیگاکانی وەکو جاران پڕبوون لە جوانی و بۆشناخی، وەکو ئەوەی بینینی من، شتێکی یان یەکێکی سەیری بیرخستبێتەوە، یەکێک کە لە مێژە نەیبینیوە، سەرسام و دەستەپاچە هات و گووتی: «خەندان، تۆش لێرەیت... چۆنیت... ها... خوشکی بچکۆلانەم تۆ چۆنیت؟». هەردووکمان چاومان پڕبوو لە گریان، بەڵام من بە ئەسپایی گووتم: «پەروانە، باشم، من باشم... خراپ نیم، لە تۆبەخانەیەک دەژیم». نازانم گوێی لێم بوو یاخود نا، کەمێکی تر سەیری یەکترمان کرد و ئەو ژنە چاوڕەشە بە خۆی و هەیاسەکەیەوە

بە ئارامی شانی منی گرت و گووتی: «کچم، بەسە، ئیدی تەواو... با پوریشت چاوێکی پێبکەوێت». من لەو چەند ساتە کورتەدا بۆ ئێستێکی زۆر کورتیش چییە چاوم لە پەروانە نەتروکاند و بە نیگایەکیش چییە سەیری میدیای غەمگینم نەکرد.

ساڵانێکی زۆر ئەوەبوو بە مەراقی فەتانە کە بەردەوام دەیگووت: «من بە مەحەبەت و سۆزەوە سەیری پەروانەشم کرد، من چۆن لە خوشکەکەی خۆمم ڕوانی بە هەمان جۆر ڕوانیمە خوشکەکەی تۆش».

من ئەو ڕۆژە کە دەبایە لەبەر ئەو پەنجەرەیەدا دەرفەتبهێنم و سەیری میدیای غەمگینیش بکەم، کە بە دڵنیاییەوە لە قووڵایی دونیا بێدەنگەکەی خۆیدا و بەر لە مردن چاوەڕوانی نیگایەکی کەمێک سۆزدار و مەحەبەتاوی کردوە، فەتانە هەمیشە لە سەعاتەکانی زویری و تورەییدا دەڵێت: «ئەو چەند ڕۆژە هەر چییەک و هەر کەسێک تەماشایکردون، بە دڵنیاییەوە بە چاوی ڕق و سوکایەتی سەیریکردون، تەنها من و تۆ... من و تۆ خوشکی ئەوان بووین و دەبایە بە ڕەحم و بەزەییەوە نیگایانبکەین. تۆش ئەو نیگایەت لە خوشکەکەی من نەگرت». ئێستا حەسرەتێکی زۆری ئەو ڕۆژە لە دڵمدایە، حەسرەتی ئەوەی نیگای میدیام نەکرد، نەمتوانی چی لە دڵمدایە بۆ پەروانەی هەڵڕێژم، نەمتوانی باوەشی پیابکەم و پێیبڵێم: دەمەوێت لەگەڵتدا بمرم. کە پورم پەنجەرەکەی جێهێشت، من سەیری چاویم کرد، ئەو نیگایەم بینی، نیگای دڵنیایی و ئاسودەییەکی قووڵ. ئەو بە جۆرێک ئاسودەبوو، تا ماوەیەک گوێی لە هیچ نەبوو، تەنها لە ئاسمانی ئەو ئاسودەییە ڕۆحیەی خۆیدا دەسوڕایەوە، من لەوباوەڕەدانەبووم ئافرەتێک لە چەشنی ئەو، کە تەنها لە ساتی گرژی و کینەدا بینیبووم، بەو جۆرە خۆشییەکی هێمن و ساف ڕووخساری بگەشێنێتەوە، ئاشکرابوو لەزەتێکی قووڵی دەچەشت، لەزەتێک کە وەکو لە ترۆپکی خۆشیدا بێت

دەیشکۆفاند و زیندوویدەکردەوە. کە لە ژوورەکە چووینە دەرەوە، من سەرنجمدا، فەتانە تەواو ڕەنگی زەرد بووبوو، خۆی بە منەوە نووساند و گووتی: «هەردووکیان دەترسن، هەردووکیان زۆر دەترسن». بەڵام ئاشکرابوو من و ئەو زیاتر دەترسین. لە دەرگایەکی زۆر زۆر نزمەوە چووینە ناو حەوشێکی دی کە پڕبوو لە قەساب و بزنی سەربڕاو، دەیەها بزن سەرەوخوار بە چەندەها داردا هەڵواسرابوون، سەرتاپای حەوشەکە بووبوو بە بە خوێن، قەسابەکان هەموو خەریکی گورییین و داماڵینی پێستەی بزنەکان بوون، چەندەها کەللەسەریش لە تەشتێکی گەورەدا لە سوچێکی حەوشەکەدا دانرابوون، هاڵاوی گەرمی ئەو خوێنە لە دەستوپلی ئەو منداڵانە هەڵدەستا کە بەدەوری قەسابەکاندا دەسوڕانەوە و بەدیار تەشتی کەللە بزنەکانەوە دانیشتبوون و سەیری چاوی بزنەکانیان دەکرد.

لە حەوشەکەوە، ئەسپەژنێکی شۆخ و بە هەوا پێشمانکەوت، بە پورمی گووت: «ئەم دوو کیژە دەبەینە بەر ئەو هەیوانە بەرزە با لەوێ پشوویدەن و تەماشای دیمەنەکانیش بکەن، پێم باشە تێکەڵاوی کەژاوەکە نەبن... من زۆر دڵم بە کچان دەسووتێت، بەتایبەت لەم تەمەنەدا».

گوندەکە بریتیبوو لە زنجیرەیەکی شێواو لە ماڵ و ژوور و دەرگا و کۆڵان، کە بە جۆرێکی تێکەڵاو بەسەریەکدا دەکرانەوە، هەموو شتەکان بە جۆرێک پێکەوە گرێدرابوو هەستم نەدەکرد لە جێگایەکەوە دەچمە جێگایەکی دیکە، سەرجەمی گوندەکەش لە ڕێوێڵکەیەک دەچوو کە دیوارەکانی بەفر و بەرد و مرۆڤ دروستیانکردبێت. لە هەندێ جێگادا هەستمدەکرد کە مرۆڤەکان لەبری دیوارەکان وەستاون، لە هەندێ شوێنی تریشدا بە پێچەوانەوە دیوارەکان لەبری مرۆڤەکان ئابڵوقیاندەداین. من سەرەتا گوندەکەم وەکو کوێرە دێیەکی دووردەست و بچکۆلانە هاتە

پێشچاو، بەڵام ئێستا کە دەرگاکان دەکرانەوە، هەر دەرگایەک دەچووە سەر ڕێگایەکی بەردین و هەر ڕێگایەکیش بەناو چەندەها ماڵ و ژوور و گوزەر و دیوەخاندا تێدەپەڕی. تا زیاتر سەردەکەوتین، هەستمدەکرد ئەم گوندە زیاتر و زیاتر خۆیدەکاتەوە، بەڵام دیوارەکان و ماڵەکان و کوچەکان هەموو خاڵیبوون، جگە لە بەفر هیچی دیکە دیار نەبوو... بەفر و بەرد... سەرنجام گەیشتینە ماڵێکی بچکۆلانە، کە لە هەموو ماڵەکان خۆشتر بوو. ماڵێک بوو بەسەر دەشتاییەکی گەورەدا دەکرایەوە، ئاشکرابوو ئەوە دواهەمین ماڵی گوندەکەیە و لەپشتییەوە ئیدی کێڵگە و لەوەڕگا و خاکە بەیارەکان دەست پێدەکەن. بە پەیژەیەکدا کە یەک پارچە نەخش و نیگاری کۆن بوو سەرکەوتینە سەر بۆ بەر بەرۆچکەیەکی ڕازاوە، بۆ بەرهەیوانێک دیمەنی خانوییەکی شارستانی هەبوو، لەوێشەوە هەموو ئەو ڕێگایانەمان دەبینی کە پیا هاتووین و کۆی ئاسۆ نزیک و دوورەکانیشمان چاولێبوو. لەو بەرهەیوانەدا هەستم بە بۆشاییەکی گەورە کرد، هەستمدەکرد من جگە لە ڕۆحێکی ڕەش و خاڵی و بێقەرار زیاتر هیچی دیکە نیم، تازە بە ئومێدی هیچ موعجیزەیەک نەبووم، لە دوور و نزیکیشەوە لە سپێتی بەفر زیاتر هیچی دیکەم چاونەدەکرد، هەستمدەکرد جگە لە سەرماش هیچی دیکە لە دونیادا نییە... سەرما و هیچی دیکە... هێندەی گەیشتینە بەر ئەو بەربەرۆچکە ساردە، پورم کە شاهانەترین ساتەکانی ژیانی دەژیا، بۆئەوەی خۆی لە گونددا نیشانبدات و توانا و دەسەڵاتی خۆی دەربخات، ئێمەی بە تەنها جێهێشت و گەڕایەوە. لەو کاتەشەوە کە لای میدیا هاتبووینە دەرێ، فەتانە کزەڵە و مەلوول دەینواند، هەردووکمان هەستماندەکرد، بە شێوەیەکی توند فڕێدراوینەتە دەرەوەی کات و شوێنە ئاساییەکان، بۆ یەکەمجار دونیامان بە هەموو غوربەتە سارد و سپی و بۆشەکەیەوە دەبینی، بۆ یەکەمجار ئەو پەیوەندییە سەیرەمان لەنێوان خوێن و سەرمادا دەدۆزییەوە، تا

ساڵانێکی دواتریش بەردەوام ڕەنگی بەفر بەرەو ڕەنگی خوێن دەیبردم، بەردەوام ئەو سپێتییە درێژەی ڕەنگەکانی ژیانی دەشاردەوە، ئەو سپێتییەی کە ڕەنگەکانی سروشتی لەیەک وەهمدا دادەپۆشی، بەرەو ئەو هەموو سورێتییە ترسناکەی پارچەپارچەبوون و زامداربوونی مرۆڤی ڕادەکێشام، هەستمدەکرد پەروانە بەهۆی ئەم بەفرەوە دەمرێت و ئێمە بەهۆی ئەم سپێتییە بێئەندازەیەوە لێرەین. لەو ئێوارەیەوە ئیدی ڕقم لە هەموو شتە سپییەکان بوو، هەموو سپێتییەکی سەرتاسەریم بە کوشندە دەزانی. من لە ناو بەحری خولیاکانمدا بووم کە لە دوورەوە ئەو کەژاوەیە دەرکەوت. ئەو کەژاوەیەی ژنە سپی پۆشەکان بە خۆیان و دەفەکانیانەوە پێشیکەوتبوون. کە فەتانە گوێی لە دەنگی دەفەکان بوو بەر لە من چووە بەر گوێسەبانەکە و سەیری ڕێگاکانی کرد. فەتانەش بەر لە من پەروانە و میدیای لە ناو حەشاماتەکاندا دۆزییەوە، هەردووکیان بە تەوقێکی گەورەی سپی داپۆشرابوون. هەردووکیان بە ئارامی لەپشتی چەندەها دەفبەدەست و چەکبەدەست و خەڵکی ئاساییەوە دەڕۆیشتن، لە دوورەوە گوێمان لە دەنگی بەسۆزی ئەو سڵاوات خوێنە زوڵاڵە بوو کە دەیگووت: «فق×ـع دابر القوم الذین ×لموا و الحمد اللە رب العالمین». چەندەها دەنگی گەرمیش لە دوایەوە دەیانگووت: «الحمد اللە رب العالمین.» پەروانە بە ئارامی دەڕۆیشت و سەیری کەسی نەدەکرد، بە هێمنی دەستی میدیای غەمگینی گرتبوو و پێکەوە هەنگاویاندەنا. لە دوای دەفژەنەکانەوە، ڕیزی یەکەم هەموویان یەک بە تەک یەکەوە باوک و براکانی من و فەتانە بوون، فەتانە بە ئەسپایی و بە ترسێکی زۆرەوە لێمنزیکبووەوە و دەستی گرتم، بە دەنگێکی بریندار دەیگووت: «ئەوە براکانمن». من ئەو کات ڕوونتر و تیژتر دەمڕوانی، سەیری ئەو پیاوە توڕانەم دەکرد کە هەموو گیانیان لە فیشەکدا زەرد دەچووەوە.

شەبەنگێکی گەورە لە گەردی ئاوریشمین، بەدەوری پەروانەوە بوو. کە لەو بەربەرۆچکەیەی ئێمە نزیکبوونەوە، فەتانە توند دەستی گووشیم و گووتی: «خەندانی چکۆلە، سەیری ئەو پەپولانە بکە لەدەوریان، سەیری ئەو پەروانانە بکە». تا ئەوان زیاتر نزیک بکەوتبانایەوە پەپولەکان زیاتر دەبینران، هەستمدەکرد لەگەڵ تێپەڕینی کەژاوەکەدا هەندێ لە پەروانەکان لە هەوای سافی ئەو ئێوارەیەدا دەمانەوە و بەرەو لای ئێمە دەفڕین... ئێمە لەو بەربەرۆچکەیەدا و لە حیجابە درێژەکانماندا و بەو لەچکە ڕەشانەوە، جگە لە پەپولەکان سەرنجی کەسی دیکەمان ڕانەدەکێشا، پەروانە و میدیاش لەپێش کەژاوەی مردنی خۆیانەوە بەتەکماندا ڕابوردن و ئێمەیان نەبینی، من سەیرمدەکرد و پەروانەم وەک قۆزاخەیەکی نەرمی کەتان دەهاتەپێشچاو. من لە ناو ئەو دونیا بێسنوورەدا دەمتوانی خۆنەگری و پەرشبوونەوەی ئەو ببینم، دەمتوانی تێکەڵاوبوون و تواندنەوەی ئەو ببینم لە ناو ئەو مەخلوقانەدا، لە ناو بەفردا، لە ناو چیا مەزن و حەکیم و سەبوورەکانی دەوروبەردا، بۆنی پێستەکەیم دەکرد، ئەو پێستە نازکەی ساڵەهای ساڵ دەمبینی لەنزیک ئینجانەکانەوە گەردێکی سیحراوی جێدەهێڵێت... دەمتوانی هەستە ژاکاوەکانی بخوێنمەوە، دەمتوانی ڕۆحە پەشموردەکەی ببینم، هەستمدەکرد کە داخ لەدڵ نییە، تووڕە نییە، خەم لەو مردنە ناوەختە ناخوات کە بە هێمنی لە دوایەوە دەڕوات، ڕۆیشتنە ئارام و خەیاڵیاوییەکەی دەیگووت: «بابڕۆین»، من گوێم لە دەنگە قووڵەکانی ناو گیانی بوو کە دەیگووت: «بابڕۆین». پێدەچوو خۆی ئەو خەڵکەی داوەتی مردنی خۆی کردبێت، کەمێک پەلە دەهاتە بەرچاوم، وەلێ هەرگیز هەڵەشە و نائارام دیارنەبوو، هەروەکو ئەو ڕۆژانە هەنگاویدەنا کە پێکەوە بە شەقامی سەرەکی شاردا سەردەکەوتین، ئەو ڕۆژانەی هێندە جوانییەکی درەوشەداری هەبوو بەردەوام بەو شەوق و ڕەونەقە

کچانەیەی خۆی، کەساسی و لاوازی منی دادەپۆشی. من دەمڕوانی و هەستمدەکرد ئێستاش وەکو ئەو ئێوارە دوورانەی بەهاری جاران بە جوانی خۆی هەموو ساردی و بێمانایی و دڵڕەقی ئەم ئێوارەیەی داپۆشیووە.

لەساتێکدا ویستم هاواربکەم «مەیکوژن»، فەتانە وەکو ناو ڕۆحم بخوێنێتەوە، جارێکی تر دەستی گوشیم و گووتی: «خەندانی چکۆلە بێدەنگ بە، تازە هیچ سوودی نییە، ئاسودەیی مردنیان لێمەشێوێنە». دواتر من و فەتانە ڕۆژەهای ڕۆژ باسمان لە ئاسودەیی ئەو مردنە کرد، من هەمیشە دەمگووت: «پەپولەکان نەبێت هەمووشتێک ئاسودەبوون، بەفری خەوتووی ناو کێڵگەکان، پورم کە لە ناوەڕاستی دەفژەنەکاندا دەڕۆیشت، باوکم کە سەری دانەواندبوو و بە ئارامی و ئاسودەیی هەنگاویدەنا، سڵاوات خوێنەکان، کوڕانی تینووی خوێن، خزمە داخ لەدڵەکان، هەموویان ئاسودەبوون». کە کەژاوەی مردنەکە گەیشتە قەراغ گوند، چەند سەد مەترێک بەر لە گەیشتن بە گۆڕستانی ئاواییەکە وەستا، فەتانە بە ترسەوە دەیگووت: «لە گۆڕستانەکەدا نایانکوژن، یەکێک هەیە کە ناهێڵێت لە گۆڕستانەکەدا بیاننێژن، نەبا مردووەکانی دیکە پیسبکەن». پاش ئێستێک هەمووان لەبن درەختێکی گەورەدا کە لە ئێمەوە زۆر دوور نەبوو وەستان، من گووتم: «فەتانە ئەوە درەختی مردنی پەروانەیە». ئاشکرابوو بڕیاریانداوە لە ژێر ئەو درەختەدا بیانکوژن، فەتانە سەیری شتەکانی دەکرد و تا دەهات ڕەنگی زیاتر زەرد هەڵدەگەڕا، تا دەهات زیاتر دەلەرزی، ماوەیەک بە بێدەنگی سەیری دیمەنەکانی کرد و ئینجا لەسەرەخۆ گووتی: «بەڵێ خەندان، ئەوە درەختی مردنیانە... ئەوە درەختی مردنی خوشکەکانمانە». بینیمان، پورم و دوو خاتوونی دیکە کە ئاشکرابوو لە ژنە سەلارەکانی ئەم ناوچەیەن، دەستیان گرتن و بەرەو ژێر درەختەکە بردیانن،

درەختێکی ئێجگار زەبەلاح و ئێجگار ڕووتەڵ بوو، بە ئەندازەیەک بەرزبوو، من هەستمدەکرد هەندێ لە چڵەکانی لە ئاسمانەوە هاتوونەتە خوار، هەستمدەکرد لە شەبەقە شینەکانی ئەو سایەقە ساردەوە دابەزیوونەتە ئەو زەوییە سپییە، کە سەیری قەد و بنکی ئەستووری ئەو درەختەشم دەکرد بە پێچەوانەوە، دەستکردێکی گەورەی زەمینم دەبینی، هونەرێکی ئەو خاکە سەیرەم دەهاتە بەرچاو کە جەستەیەکی وەها بڵند، بەڵام ترسناکی دروستکردوە، وەکو تریش لەو درەختەدا تێکەڵاوبوونێکی گەورە و ئاڵۆز و تەلیسماویی زەوی و ئاسمانم دەبینی، دەست تێکەڵاوکردنێکی ئەهریمەنانەی بەرزاییە بێسنوورەکانی جیهان و قووڵاییە تاریکەکانی خاکم هەست پێدەکرد... ساڵانێک دواتریش زۆر بیرم لەو درەختە دەکردەوە، زۆر شەو لە خەوە ترسناک و پڕ مۆتەکەکانمدا دەمبینییەوە، زۆرجاریش لە زیندە خەوەکانمدا خۆم دەبینی لە ژێریدا دەمرم، دەمبینی لە نابەینی پەلوپۆکانیدا دەخنکێم، لەنێوان سەرکەوتن و دابەزیندا وێڵدەبم و خۆم بۆ نادۆزرێتەوە. ئەو ئێوارەیە من لە هەرکەس پتر سەرنجی ئەو درەختەم دەدا، کە پەروانە و میدیا لەبەردەمیدا گەلێک بچکۆلانە و بێهێز دەردەکەوتن، بەڵام پێدەچوو پەپولەکان لەگەڵ ئەو دارەدا شەریکەن، پەپولەکان تادەهات زیاتر و زیاتر کۆدەبوونەوە، وادیاربوو هیچ کەس سەرنجی ئەو پەپولانە نادات، بۆ ساتێک وا هاتە خەیاڵم کە پەروانە و میدیاش لە ژێر ئەو درەختەدا سەیری پەپولەکان دەکەن، بینیم بە شێوەیەکی سەیر سەریان بەرەو ئەو پەپولانە بەرزکردۆتەوە، بەڵام کەس سەرنجی ئەو رامانە لە ناکاوەی پەروانە و میدیای نەدەدا لە پەپولەکان، کەس نەیدەبینی چۆن چۆنی نیگاکانی ئێمە و ئەوان لە ڕێگای ئەو گیاندارە چکۆلانانەوەیە لە گیانی یەکتر دەڕوانن. خەڵکی لەو ساتەدا هەموو سەیری ئەو گروپی تیربارانەیان دەکرد کە کەمە کەمە خەڵکەکەیان

لە درەختەکە دووردەخستەوە و فاسیلەیەکیان لە ناوەڕاستی یەکەم ڕیزی بینەران و خۆیاندا دروستدەکرد، گروپی تیربارانەکە براکانی من و فەتانە و هەندێ دوورە خزمی دیکەی هەردوو خێزانەکەمان بوون، هەندێ گەنجی نەناسراو پەرتەوازەش بەئاشکرا داوایاندەکرد کە بەشداریبکەن، دیاربوو هەندێکیان لە ڕێگای زۆر دوور و لە هەرێمی نەناسراوەوە هاتوون تا لەم مەراسیمەدا چالاکبن، ئێستاش بەئاسانی ئامادەنەبوون، ئەو ساتە پیرۆزانە، تەنها وەکو بینەرێک بژین، بەڵام یەکێ لە مامۆستاکان هاتەپێش و بە چەند فەرمانێک هەموانی ئاگادارکردەوە کە جگە لە برا و کەسی کیژەکان کەسی دیکە هەقی بەشداریکردنی نییە، هەر ئەو مامۆستایەش بە هێمنی و دوای ئارامبوونەوەیەکی ناوەخت دەستیکردە خوێندنەوەی سوورەتێکی درێژ. کە مامۆستا سوورەتەکەی خۆی تەواوکرد گەڕایەوە جێگای خۆی و ئەوسا براکانم لەگەڵ سەرجەمی گروپی تیربارانەکەدا چەکەکانیان بەرزکردەوە. لەو ساتەدا کە پەروانە ڕووبەڕوو تەماشای مردنی دەکرد، کە ئێوارەی مردنی ئەو لە ئاسۆکانەوە هەڵدەهات، کە هەمووان چاوەڕوانی دەنگی ترسناکی تفەنگەکان بووین، بێدەنگییەکی سەیر باڵی بەسەر دونیادا گرت. من هەستمدەکرد هەموو گەردون چۆتە دۆخی خاوبوونەوەیەکی شاعیرانەوە، هەموو گەردون وەستاوە و بە چاوێکی خەواڵووەوە دەڕوانێت، درەخت و چیا و بەفر لە کونجی بێدەنگی خۆیانەوە سەیریاندەکەن، کە دەنگی تفەنگەکان بەرزبووەوە، دونیا لە چاوتروکانێکدا پڕبوو لە گەرد، من دڵنیابووم کە پەروانە دەبێتە گەرد، دەبێتە ئەو تۆزە ئاوریشمییە بریقەدار و نەرمە، تفەنگەکان بێدەنگ دەبوون و پەروانە هەر بە پێوەبوو، میدیا دەکەوت و پەروانە بە پێوەدەمایەوە، پێنەدەچوو بکەوێت، بەڵام بەشێوەیەکی سەیر پەخشدەبووەوە... ئەو گەردەی پەروانە، لەسەر سیما و لەش و درەختەکان دەنیشت، لەو ساتەوەی کە پەروانە وەکو نەسیمێک بەسەر

هەموو وجوددا هەڵیدەکرد، پەپولەکان زیاتر دەبوون، هەندێکیان لە هەوادا دەردەکەوتن و سورێکیان دەخوارد و دەمردن، بەڵام هەندێکیان زیاتر و زیاتر دەمانەوە و وەک شاهیدێکی سیحراوی نهێنی ئەو ئێوارەیەیان لە قووڵایی ژیانە تەلیسماویی و ئاڵۆزەکەی خۆیاندا هەڵدەگرت. پەروانە دەکەوت... من دەمبینی پەروانە بە هێمنی بەچۆکدا دێت، بە هێمنی دەنوشتێتەوە، بە هێمنی سەر دەخاتە سەر زەویەکە و بەلادا دێت، لەگەڵ کەوتنی پەروانەدا پەپولەکان بە شەپۆلێکی گەورە بەرەو قووڵایی ئاسمان بەرزدەبوونەوە، لەگەڵ ترسی پەپولەکاندا، چەندین پیرێژن لە پەروانە و میدیا نزیکدەبوونەوە و دەیانخستنە سەر بەتانییەکی سەوز، ئەو دوو کفنە سپییەیان تێوەدەپێچان کە پێشتر لە بوخچەیەکی رەشدا هەڵیانگرتبوون، ئێمە لە دوورەوە هەموو دیمەنەکانمان دەبینی، تا چەند دەقیقەیەکیش تەواو حاڵی نەدەبووین کە چی ڕوودەدات، نەماندەتوانی ئەو ڕاستییە بەڕوونی ببینین کە لەبەرچاوماندا بوو... تەنها دوای حەپەسانێکی درێژ، دوای تێڕامانێکی قووڵ تێدەگەیشتین کە ئەمە تەنها ئێوارەی مۆتەکە و ترس نییە، بەڵکو ئێوارەی ڕاستەقینەی مردنی خوشکەکانمانە... لەگەڵ فەتانەدا تەماشای یەکدیمان دەکرد و تێدەگەیشتین کە پەروانە و میدیا مردوون... چاوماندەتروکاند و ئەوان مردبوون، دەمانڕوانی و مردنی ئەوانمان لە ئاسمان و لە بەفر و لەسەر ڕێگاکان دەبینی، جیهان لە دوای ئەو پێزانینە گەرمتر و داختر و دۆزەخیانەتر دەینواند. دەمبینی گەرمای مردنی ئەو دوو گیانە لە بازنەیەکی گەورەدا هەموو ئەو بەفرە سپییە دەتوێنێتەوە و ڕەقەن و چڵو چێوی ئەو سروشتە ئاشکرادەکات، یەکێک لە مامۆستاکان دەچووە سەر دوو تەرمە کفنکراوەکە و کۆمەڵێ گەنجی ڕادەسپارد گۆڕیان بۆ ئامادەبکەن، من لە دڵەوە دەمویست بڕۆم و سەیری ئەو گیانە پەشموردە و ژاکاوەی پەروانە بکەم، دوا نیگا لە ئارامگای ژیانێک بگرم کە لەو گەردەلوولانەدا کەوتبوو. من کەوتبوومە

بۆشاییەکی بەرینەوە، بۆشاییەکی بێسنوور، هەستمدەکرد نائومێدییەکی گەورە هەموو ئەو تورەیی و یاخیبوونەی ناو دڵم دەکوژێت، دەمزانی کە ئیدی دەبێت ژیانێکی بێئیلهام بژیم. فەتانە بە قورگێکی پڕ لە گریانەوە دەیگووت: «لە شەودا بیانکوژتبایە چاکتربوو، لە شەودا لایەنی کەم، میدیا دەیتوانی تەماشای مانگ بکات...» کە فەتانە وای دەگووت، من بە جۆرێکی سەیر باوەشم پیادەکرد و دەگریاین، هێندە توند باوەشم پیادەکرد، هەستمدەکرد لەو ساتەوە بۆ هەتاهەتایە خوشکایەتییەکی ئەبەدی بەیەکەوە گرێیداوین، پێموابوو ئەو ساتە هەردووکمانی کردوە بە شاهیدی ساتێک، کە دەشێت لە ناو ئەو ئەو گێژەڵووکەیەدا کە بەسەر وڵات و سروشت و گیانلەبەرەکاندا هەڵیدەکرد بەکەم بگیرێت و لەیادبچێتەوە، یان تەنیا وەکو ڕۆژێک لە ڕۆژە ئاساییەکان تۆماربکرێت.

من ئەو ڕۆژە تا شەوێکی درەنگ کە جارێکی دی لەبەر دەرگای تۆبەخانەکەدا دابەزینەوە، دەستی فەتانەم بەرنەدا، پێکەوە موچوڕکە ساردەکانی ئەو نێوارەیە ژیاین، پێکەوە تەزووەکانی مردنمان بەشکرد، ڕاچەنینەکانی هەناومان بەخشی بەیەک. ئەو گریانە بە کوڵە، زۆر شتی لەکیسداین، ئەو بورانەوە سەیرە لە ئامێزی یەکتردا لە بەربەرۆچکەیەکی دووری گوندێکدا نەیهێشت ئەو دەستانە ببینین کە پەروانە و میدیایان وەکو دوو شەیتان فڕێدایە ناو چاڵێکەوە و گڵەبانیانکردن. ئێمە دەگریاین و ئاگامان لە کات و شوێن نەمابوو، بە جۆرێکیش باوەشمان بەیەکدیدا کردبوو لە یەکدی جوێنەدەکراینەوە، ئاگادارنەبووین ئەوان چیدەکەن، ئاگادارنەبووین چۆن ئەو درەختی مەرگە جێدەهێڵن و دەگەڕێنەوە. کاتێک وریابووینەوە پورم و چەندین ژنی دیکە بە هینجەتێکی زۆر دەیانویست لەیەکمان جیابکەنەوە، دوای هەوڵێکی زۆر توانیان لەیەکمان دووربخەنەوە، بەڵام هەرگیز نەیانتوانی دەستمان لە دەستی یەکتری دەربهێنن. چۆن ئەو دوو مردووە کەوتبوونە ئامێزی یەک، ئێمەش ئاوەها

باوەشمان بەیەکدا کردبوو. کە لە ناو فیغان و گریاندا ئێمەیان سوار ماشێنەکە کردەوە و دەرگاکانیان لەسەر داخستین، بینیمان چۆن ئەو ڕەوە گەورەیە لە خەڵکان و پیاوکوژان، لە باوک و برای دەست خوێناوی دەگەڕانەوە سەر چەند خوانێکی درێژ و ڕازاوە کە لە دەیەها دیوەخانی گەورە گەورەدا ڕاخرابوون. من و فەتانە بەردەوام، وەکو دوو منداڵ دەگریاین، جگە لە ئێمە کەسی دیکە نەدەگریا، جگە لە هاوارەکانی ئێمە دەنگی هاوارێکی تر نەبوو، هەموو گوند بۆنی ڕەزامەندی ئەو ڕۆحانەی لێدەهات کە فەرمانی خۆیان لەبەردەم خودادا ئەنجامدابوو و ئێستاش بە دەرونێکی ئاسودەوە دەڕژانە سەر سفرەکان. لەو ئارامی و ئاسودەییەدا، شێوەنی من و فەتانە، ئیقاعی ئەو خۆشبەختییەی دەشێواند، کەزانیشیان هیچ شتێ ئێمە ئارام ناکاتەوە، یەکێ لە مامۆستاکان گووتی: «بیانبەنەوە ناو ماشێنەکە و دەرگاکانیان لەسەر داخەن...».

لە پەنجەرەی ماشێنەکەوە، ئەو هەزاران هەزار پەپولەیەمان بینی دەفڕین و ژیانی خۆیان لەسەر ئەو ڕوویەرە بێکۆتاییانەی بەفر دەوەراند، نەماندەزانی بۆ کوێ دەچن، بەڵام ئاشکرابوو ئەو پەپولانەی بە جۆرێکی سەیر سوڕی ژیانی خۆیان تێکدابوو، بە بێ تەفسیرێکی شیاو، لەو زستانە ساردەدا دەرکەوتبوون... هاتبوون گیانی پەروانە لەمبەرەوبەری دوو دەریای بێسنووری عەدەمدا بپەڕێننەوە. هاتبوون لەگەڵ پەروانەدا بمرن. فەتانە دواتر بیریدەکردەوە دەیگووت: «خەندان، کێ دەڵێت ئەو پەپولانە هەر ڕۆحیانەتی پەروانە خۆی نەبوون؟ کێ دەڵێت ڕۆحیانەتی ئەو نەبوون کە مردن گوڕیویێتی بۆ باغچەیەکی گەورە گەورەی پەپولە، ئاە... خەندان... هیچ کەس... هیچ کەس ناتوانێت وەڵامی ئەو پرسیارە بداتەوە». ئەو شەوە تا دونیاش بووە زوڵمەت و شەوەزەنگێکی بێمەودا، من هەر پەپولەکانم دەبینی دەفڕین

و دەمردن... دەمبینی لە ناو بازنەیەکی گەورە و ئاڵۆزدا دەسوڕانەوە و دەکەوتن. من تا ساڵانێکی دوور و درێژیش، تا لە قوتابخانەی خوشکە تۆبەکارەکانیش هاتمەدەرێ، هەر پێموابوو ئەو پەپولانە، خەیاڵ و خولیای من و فەتانە بوون... هەر پێموابوو درێژکراوەی ئەو هەموو فەنتازیا کوژرا و کپکراوەی ناو گیانی ئێمە بوون، بەڵام کە دواتر سات بە سات یادەوەری ئەو ڕۆژەم زیندووکردەوە، بینیم کە تەنها ئێمە نەبووین لەو ڕۆژە غەمگینەدا پەپولەکانمان بینیوە... هەر ئێمە نەبووین لە ئێوارەی پەپولە غەمگینەکاندا ئەو گەردە وەریو و باچووەی جوانیمان سەرنجدابوو، بەڵکو هەزاران کچ و کوڕی دیکە، کە زۆربەیان لە تەمەنی ئێمەدا بوون، بە جۆرێک لە جۆرەکان ترس و ئەشکەنجەی ئەو ئێوارەیە ژیابوون، ئەوانیش ئەو لەشکری پەپولە ژاکاوانەیان بینی بوو. ئەو ئێوارەیە پەپولەکان لە هەموو هەرێم و زەوییەکاندا، لە هەموو شارەکاندا، بەشێوەیەکی سەیر بەسەر حەوش و ماڵ و ڕێگا و شەقامەکاندا باریبوون... تا نیوەڕۆی ڕۆژی دواتریش گەردی پەپولەکان دونیای گرتبوو، حەوشی هەموو قوتابخانەکان، ژووری هەموو بەندیخانەکان، قاووشی توتناوی کارگەکان، مەیدانەکانی پاس، فولکە غەمگینەکان، خەرەند و لێرەوارە دوورەکان، گۆڕەپانە کپەکانی شەڕ... هەموویان سەرتاپا گەردی پەپولەکان بوون، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا تەنها من و فەتانە، ئەو ئێوارەیەمان ناونا «ئێوارەی پەروانە». من و ئەو ساڵەهای ساڵ ئەو وشەیەمان وەکو شفرەیەکی نهێنی بەکاردەهێنا... شفرەیەک کە تەنها ئێمە لە مانا سامناکەکانی تێدەگەیشتین، شفرەیەک بۆ قسەکردن لەسەر مەرگ و ناکامی، هەرکاتێک بمانویستایە باس لە دونیایەک بکەین کە سەرتاپای ڕێگاکانی گیراوە و سەرتاپای دەرگاکانی داخراوە، باسمان لە ئێوارەی پەروانە دەکرد، باسمان لە چیرۆکی ئەو پەپولانە دەکرد کە لە ئێوارەی زستاندا، ڕێگاکانیان وێڵکرد و

بواریشیان بۆ جیهانێکی دیکە نەدۆزییەوە، هەرکاتێک چیرۆکی ئەو مەملەکەتانەمان بگێڕابایەتەوە کە لە ناو شورا داخراوەکانی خۆیاندا ژەنگدەهێنن، چیرۆکی کەڕوی ئەو شارانەمان باسبکردبایە کە هەوا ناگاتە گۆڕەپانە غەمگینەکانیان، باسمان لەو شوێنانە بکردبایە کە کەس ئاودیوی دیوارەکانی نابێت، بەسەرهاتی ئەو دەریاچانەمان ببێژایە کە خۆیان لە ناو خۆیاندا لێخندەبن، بەبێهۆ، بێمەبەست، بێخواستی خۆمان دەگەڕاینەوە سەر ئێوارەی پەروانە.

من و فەتانە ساڵانێکی دوور و درێژ، لەگەڵ جێبەجێکردنی فەرزە ئاینییەکاندا، پەراوێزێکی گەورەمان بۆ دروستکردن و گێڕانەوەی حکایەتەکان تەرخانکرد، چیرۆکەکان تەنها دەرفەتی ئێمە بوون بۆ لەیەکدی نزیکبوونەوە، من و ئەو پەیتاپەیتا چیرۆکی قەڵای داخراومان دادەتاشی، چیرۆکمان لەسەر ئەو شارانە دروستکرد کە زەمەن تیایدا وەستاوە، دەربارەی ئەو کیژانەی کە ویستوویانە لە پەنجەرەی بەندیخانەکەیانەوە بفڕن، ئەو خاتوونانەی خواستوویانە لە شەتاوێکی گەورە بدەن و نەیانتوانیوە، هەموو چیرۆکەکانیش بەڕێگای جۆرا و جۆردا دەچوونەوە سەر ئێوارەی پەروانە. پاڵەوانەکانمان هەمیشە نیوەیان مرۆڤ و نیوەیان گیاندارێکی دیکە بوو. فەتانە کە سیحربازترین حکایەتخوان بوو، مەخلوقاتی دروستدەکرد نیوەیان لە گوڵ و نیوەیان ئینسان بوو، نیوەیان ماسی و نیوەیان ئادەمی، نیوەیان کوکوختی و نیوەیان مرۆڤ، هەمیشەش ئێوارەی مەرگیانی ناودەنا ئێوارەی گوڵ، یان ئێوارەی ماسییەکان، یاخود ئێوارەی کوکوختی، لە کۆتایی هەموو چیرۆکێکیشدا من و فەتانە دەگریاین، ئێوارەی پەروانە کلیلی ئێمە بوو بۆ دووبارە بونیادنانەوەی بەسەرهاتی دونیا. هەڵبەت وەکو دوو عەقڵی پچوک لەسەرەتای سەرەتاوە لە شتەکان ڕادەماین، دەگەڕاینەوە بۆ ڕۆژەکانی دەستپێکردنی دونیا، بۆ مانای حکایەتە جۆرا و جۆرەکانی

دروستبوونی گەردون و مرۆڤ، هەمیشەش چیرۆکەکانمان دەکەوتە نێوان دوو دونیا، دونیایەک کە دەوەستێت و بۆ هەتاهەتایە خۆی دووبارەدەکاتەوە، دونیایەکیش مەخلوقاتەکانی دەفڕن و هەریەکەیان لە ئێوارەیەکی مردندا، بەر ئاسۆ ئاسنینەکانی کۆتایی خۆیان دەکەون. من زۆرجار لە شەوە دوور و درێژەکانی ئەو تۆبەخانەیەدا لە فەتانەم دەپرسی: «فەتانە ئێمە سەر بە چ دونیایەکین، سەر بە چ بەشێکی ئەم گەردونەین، ئەو بەشەی کە یاساکانی بۆ هەتاهەتایە دانراوە، یان ئەو بەشەی کە مرۆڤەکانی پڕن لە خولیای شێتانە بۆ فڕین...». فەتانە دوای کەمێک بیرکردنەوە دەیگووت: «ئێمە لەنێوان ئەو دوو جیهانەدا وەستاوین و دەڕوانین، چیرۆکەکان دەگێڕینەوە، حکایەتخوانەکان سەر بە هیچ دونیایەک نین».

ساڵانێکی دوور و درێژ من و فەتانە، پێچکردنەوەیەکی هێمن، بە دەوری ترس و تەنهایی و تاریکیدا پێچماندەکردەوە، ژیان و ئازادی خۆمان لە چیرۆکدا دەژیاین، هەر ئەو شەوە سەیرانەش کە درێژکراوەیەکی نادیاری ئێوارەی پەروانە بوون، بەرەو دووبارە خۆدزینەوە و خۆناسین و گەردونناسین بردینی، بەرەو خوێندنەوەی قووڵ لە کتێبخانەی تۆبەخانەکەدا. من زۆر جار بیرمدەکردەوە و دەمگووت: «دوورنییە کە ئێوارەی پەروانە، تەنها ئێوارەی قەدەری هەندێ کەس بێت و هیچی تر... ڕەنگە ڕۆژگارێک بێت ژیان بەو جۆرە نەبێت، ڕەنگە ساڵانێک بەڕێوەبێت، لە تەقویمەکانیدا ئێوارەی پەروانەی تیا نەبێت».

فەتانە خۆی کە لەزەتێکی سەیری دەبینی لەوەی چیرۆکەکان بەشێوەی جۆرا و جۆر بگێڕێتەوە، یەک ڕووداوی بە چەندەها ڕێگا و شێوەی هەمەڕەنگ دەستکاریدەکرد، گەر ئەمشەو چیرۆکێکی بگێڕایەوە، سبەی شەو بەشێوەیەکی دیکە دەیگۆڕی، شەوی دوا ئەوەش بە ڕەنگێکی تر وشە و حکایەتەکانی ڕەنگدەکرد، دەشیگووت: «لەزەتی

حکایەت گێڕانەوە، لەزەتێکە لە کتێبی نوسراودا نییە، کە بەسەرهاتێک دەگێڕیتەوە، دەتوانیت بە ویستی خۆت دەستکاری هەموو شتەکانی بکەیت، بێئەوەی ئاسەواری تاوانێک بەجێبهێڵیت، کەسیش ناتوانێت بە بەڵگە بیسەلمێنێ کە تۆ دەستکاری دونیات کردوە...».

دوای ماوەیەک لە جێهێشتنی قوتابخانەی خوشکە تۆبەکارەکان، ئێوارەیەک هاتم و گووتم: «فەتانە، دواجار بڕیارمداوە، چیرۆکی خۆمان، چیرۆکی ڕاستەقینەی ئێوارەی پەروانە بنوسمەوە... بەبێدرۆ... بە بێخەیاڵ». فەتانە دەیگووت: «ئاه، خەندان، خەندانی هاوڕێم، دروستکردنی کتێبێک مانای دروستکردنی دونیایەکی داخراو، دونیایەک کە کەس ناتوانێت شتێکی لێبگۆڕێت... تۆ جارێکی تر پەروانە دەبەیتەوە ناو شوێنە داخراوەکان، دەیبەیتەوە بۆ جیهانێک کە ئەو نایەوێت تیا بژێ... من دڵنیام هیچ مرۆڤێکی ڕاستەقینە نایەوێت لە ناو کتێبێکدا بژی». من دەمگووت: «دروستکردنی کتێبێک، مانای بە ئەبەدیکردن، مانای ڕزگارکردنی پەروانە لە کۆڵانە بێکۆتاییەکانی مەرگ و ڕزگارکردنی لە شوێنە تاریکەکان. فەتانە، من دەبێت پەروانە لە یادچوونەوە و فەرامۆشی دەربهێنم. دەبێت خۆشم لە زوڵمەتی ئەو هەموو پوچییە بێمەدەرێ، دەبێت ئیلهامێکی ترم بۆ ژیان هەبێت و دووبارە ئەو کچە بدۆزمەوە کە ناوی «خەندان» بوو... ئەو کچەی لە ساڵانی دوور و درێژدی غەمخواردندا ونمکرد».

فەتانە خۆیشی نەیدەزانی من لە دوای ئەو ئێوارەیەوە چۆن دەژیم، چۆن لەبەردەم هەموو پەپولەیەکدا دەگریم، بە چ حەسرەتێکەوە لەبەردەم مەرگی پەروانەکاندا دەوەستم، دواجاریش هەستمدەکرد کە تەمەنم، خەیاڵەکانم، ترسەکانم... هەموویان درێژکراوەی ئەو ئێوارە سارد و بەفراوییەن. هەرکاتێک شەرمێکی ناوەخت دایدەگرتم، دەمگووت گوناهی مردنی پەروانەیە، هێندەی چاوتروکانی یادگارێکیش دەیخستمە

بەحری بێبنی خەیاڵەوە، دەمگووت گوناهی ئەو ئێوارەیەیە، کاتێکیش ئارەزووەکانم دەبوون بەژێر هەرەسی ئەو گیانە خەجاڵەتەی تۆبەکارێکی پڕ گومانەوە، دیسانەوە دەمگووت: «ئاه... هەمووی گوناهی ئێوەیە، ئەی پەپولەکان». ساڵەهای ساڵ، هەر شتێک بۆنی ژیانی لێبهاتایە، هەر شتێک بۆنی ترسی لێبهاتایە، منی بەرەو ئێوارەی پەروانە ڕادەکێشا، من بۆ هەر کوێیەک دەچووم دەکەوتمە ناو تۆڕەکانی ئەو دونیایەوە، کە هەرگیز لەگەڵ ئەو ژیانە ناکۆکەمدا نەدەگونجا، کە لە ڕۆژانی تۆبەخانەکەوە ژیابووم... بەڵام دواجار لەپشت هەموو ترسەکانەوە، لەودیو فرمێسکەکانمەوە، دەبووایە بۆ دەروازەیەک بگەڕێم لەڕێگایەوە دووبارە وێنەی ئەو دونیایە دروستبکەمەوە کە لە خەیاڵمدا پارچەپارچە بووبوو، شێوەیەک ببەخشمەوە بە گەردونێک کە لە ساڵانی درێژی منداڵی و هەرزەکاریدا تەنها وەکو مەعمایەکی خۆڵەمێشی بینیبووم، هەمیشەش لەپشت ئەو خەونەوە بۆ دەستی پەروانە دەگەڕام... دەمویست ئەو لە ژێر وێرانە و کڵکۆی سەردەمەکانەوە ڕاکێشم و دووبارە هەست بە ئامادەبوونی بکەمەوە، دەمویست بگەمە ڕۆژێک، جیهانێک، ڕاستییەک، کە تیایدا خودا و پەروانەکان تەبابن و دۆستبن، جیهانێک ئەوان... بە مەحەبەتەوە دان بە یەکدا بێنن و بە سۆزەوە لە یەکتر بڕوانن و ئامێز بۆ یەک بکەنەوە.

# کۆتایی

هەفتەیەک دوای «ئێوارەی پەروانە». «مەعسوم» بە خۆی و لەچکێکی ڕەش و مانتۆیەکی قاوەیی درێژەوە گەیشتە قوتابخانە. ئەو دوای گەیشتنی و تا چەندین ڕۆژیش قسەی لەگەڵ کەس نەکرد، لە تەنهاییەکی تەواوەتیدا دەژیا، بەڵام دواتر لە شەوە درێژەکانی تەنهایی و خەڵوەتی ئەو تۆبەخانەیەدا، هێدی هێدی من و فەتانە لێی نزیکبووینەوە. ئەو ڕاستییەی کە ئێمە خوشکی پەروانە و میدیاین، مەعسومی تووشی ترس و سڵۆکییەکی گەورە کرد، هەر لە سەرەتاوە گومانێکی قووڵی بەرابەرمان هەبوو، زۆر درەنگ توانیمان لەو دوودڵی و ترسەی خۆی پاکیبکەینەوە. بە ئاشکرا وەسواسێکی ڕەش باڵی بەسەر گیانیدا کێشابوو، لەو باوەڕەدا بوو کە ئێمە دەمانەوێت تۆڵەی لێبکەینەوە. زۆر شەو قوتابخانە لەسەر هاوار و قریشکەکانی ئەو بەئاگادەهاتەوە. من و فەتانە لە سەرەتادا خۆشماننەدەویست، بەڵام کە لەگەڵیدا کەوتینە دوان، کە گوێمان لە حکایەتە درێژ و نائاساییەکانی گرت دەربارەی شەو و ڕۆژە سەیرەکانی «عەشقستان»، کە لە زاری ئەوەوە چیرۆکی دواهەمین هەفتەکانی ژیانی پەروانە و میدیامان بیست، کە فرمێسکە ڕاستگۆکانی پەشیمان و حەسرەتمان بینی، لێوگەستنەکانی نامورادییمان بینی، هیچ لە دڵماندا نەما... بەڵام تا ئەو ڕۆژەش کە مرد دەبایە پێی بڵێین: «تۆ کەست نەکوشتووە... تۆ بێگوناهی... تۆ خەتات نییە». بێئەوەی

هیچ هێزێک ئەو پەشیمانی و هەست بە دەستخەرۆی و غەمگینییەی ناو دڵی بسڕێتەوە، گومانێک وایدەکرد زەینەبی کوێستانی، باوەڕ بە تۆبە و نوێژکردنەکانی نەکات.

ئەو شەوە دوای ئێوارەی پەروانە، کە بەناو گەردی مردنی پەپولەکاندا گەڕاینەوە بۆ قوتابخانە، زەینەب هیچی نەگووت، کەمێ سەیری چاوە سوور هەڵگراو و فرمێسکە بە کوڵەکانی ئێمەی کرد و دووبارە دەرگای ژوورەکەی لەسەر خۆی داخستەوە، تا چەندین ڕۆژ دوای ئەوەش ئاسەواری ڕەشەباکان هەر بە قوتابخانەوە دیاربوو، من و فەتانە دوای گەڕانەوەمان چووینەوە ژوورەکەی خۆمان، چەند ڕۆژێکیش نەچووینە وانەکانەوە، زەینەب بە هێمنی لێگەڕا ئێمە پرسەی خوشکەکانمان بژین، لەوە زیاتریش، دەرفەتی بەخشییە هەندێک قوتابی، تا سەرەخۆشی خۆیانمان پێبڵێن، ئیدی دوای ئەوە هێدی هێدی لەگەڵ تێپەڕینی ڕۆژەکان و هەفتەکان و مانگەکاندا... هەمووشتێ ئاسایی بووەوە و ژیانمان لە تۆبەخانە گەڕایەوە دۆخی جارانی خۆی.

چیرۆکی ژیانی من لەو ساڵە دوور و درێژانەدا، بەسەرهاتێکی سەیر و سەریەخۆیە، حکایەتێکی جودا و قووڵ، کە دەشێت ڕۆژێک لە ڕۆژان لە شوێنێکی دیکەدا بیگێڕمەوە... لەگەڵ ئەوەشدا بەرلەوەی ئەم دنیایە جێبهێڵم، دەمەوێت ئاوڕێک لەو گۆڕانکارییە سەیرانەش بدەمەوە کە لەو چەند ساڵەدا بەسەرمداهات، ئەو ساڵانەی کە گەلێک دوور و درێژتر و لەسەرەخۆتر بوو لە هەموو ڕۆژەکانی دیکەی ژیانم... چەند مانگی یەکەم دوای ئێوارەی پەروانە، ڕۆژ دوای ڕۆژ من بۆشاییەک و ترسێکی گەورە لە گیانمدا گەورە دەبوو، هەر دەرەنجامی ئەو بۆشایی و سامکردنەش بوو ملمدایە بەر ئەو ئارەزووە شێتانەیەی فەتانە بۆ دروستکردن و گێڕانەوەی حکایەتەکان، ماوەیەکی زۆر ئەو چیرۆکانەی کە لەسەر دونیا و ژیان و مەخلوقات و شارە جۆرا و جۆرەکان دروستماندەکرد، بە جۆرێکی

سەیر دەیبردین... بەڵام هەموو شەوێک دوای کۆتایی چیرۆکەکانمان، من چەندین سەعات لەسەر جێگاکەم دەمامەوە و بیرم لە دونیا دەکردەوە، ئەو بیرکردنەوانەش وای لێکردم لە جەوهەری خودا ڕابمێنم، چەند مانگێکی ڕەبەق لە عیبادەت و دۆعا منیان بەرەو لاوازییەکی سەیر برد، بەڵام هیچیان لە گومان و پرسیارەکانم نەگۆڕی، هەستمدەکرد ساتە ڕاستەقینەکانی عیبادەتی من ئەو کاتانەیە کە شەوان درەنگ بیر لە دونیا و جوانی و خولقاندن و نهێنییەکانی مرۆڤ دەکەمەوە. بەڵام هەمیشە لەنێوان ڕاستی خودایەکدا کە دەمبینی هەموو ئالۆزییەکانی گەردونی پێکەوەگونجاندووە و هەمەڕەنگییەکانی خولقاندووە و یەک لە تەک یەکەوە داینەاون، لەگەڵ خودایەکدا کە سزایەکی خوێناوی بۆ ئارەزووە پچوک و سادەکانی مرۆڤ ئامادە دەکات، سەرم لێدەشێوا. زۆر شەو گومان و دوودڵی دەیکوشتم، پێموابوو من لە زوڵمەتێکی بەریندا نوقمم و لە هیچ تێناگەم، کەسیش نەبوو دوودڵییەکانی خۆمی لا ئاشکرابکەم. لەو ڕۆژە تاڵانەدا فەتانە بیری لە هیچ نەدەکردەوە، خولیای هەمیشەیی ئەو هەمەڕەنگکردنی حکایەتەکان بوو، دەیویست هەموو ڕاستییەکانی دونیا «کە بە ڕاستی ژەهراوی و ئاگرینی دەزانین» لە ڕێگای حکایەتی خەیاڵییەوە بگێڕێتەوە. ماوەیەکی درێژ من بێهاوڕێ و هاودەم، گومانەکان و پرسیارەکانی خۆم دەژیام، بەڵام تا دەهات نیگەرانی و دڵەڕاوکێم گەورەتر و گەورەتر دەبوون، وەک نەخۆشێک لە شەوە درێژەکانی تۆبەخانەدا دەهاتم و دەچووم، وەک شێتێک بۆ شتێک دەگەڕام، بەتەنها نەدەگەیشتمە قووڵاییەکەی... ئیدی چارەم نەما، دەبایە شەوێک ئەو هەموو پرسیارانە بخەمە بەردەستی ئەو، شەوێک بچمە خەڵوەتی زەینەبی کوێستانی... ئەو هەر لە سەرەتاوە بەئارامی گوێی لێگرتم، من لەو شەوە درێژانەدا کە باسی خۆم و باسی پرسیارەکانم بۆ ئەو کرد پتر لەو ئافرەتە تێگەیشتم، هەستمکرد ئەو ژنێکە گەر

خۆت نهێنییەکانی دەروونتی بۆ بدرکێنێت و تەلیسمی خۆتی لەگەڵدا بەشبکەیت، بە قووڵی و ئارامی لەگەڵتدا دەدوێت، وەلی گەر بهاتبایە و خۆی ئەو نهێنیانەی ئاشکرابکردایە وەک شەیتان سەیریدەکردیت.

پرسیارەکانی مَن دەربارەی خودا و خەلیقەت و شەریعەت و یاساکانی سروشت، زۆرجار لە هەمان ئەو وانانەوە وەرگیرابوون کە مامۆستاکانمان پێیان دەگووتین، بەڵام من هەمیشە بە شێوەیەکی دی و بە ڕێگایەکی دیدا تەفسیرمدەکرد. زەینەب زۆرجار دەیگووت: «ئەو بۆشاییە گەورەیەی مردنی پەروانە لە تۆدا خوڵقاندویێتی، تەنها بڕوایەکی بەهێز بە خودا و پێغەمبەران پڕیدەکاتەوە». ئەو دەیزانی من وەکو بوونێکی پچوک ترس و پرسیاری گەورە دەمهێنێت و دەمبات، هەندێ جار بۆ ماوەی درێژ نەمدەتوانی قسە لەگەڵ کەسدا بکەم، زۆر شەو فەتانە درێژەیدەدا بە حکایەتە عاجباتییەکانی لەسەر ئەو ڕوحلەبەرانەی نیوەیان مرۆڤە و نیوەکەی دیان بایە یان هەور، بەڵام من نەمدەتوانی گوێی لێبگرم. گوێشم لە گێڕانەوەکانی مەعسومە نەدەگرت، بۆ ئەو شەوە تاریکانەی لەگەڵ پەروانەدا ژیابوو. وەک دەروێشێک زیکرە قووڵەکان وڕیانکردبێت بە تۆبەخانەکەدا دەگەڕام، زۆرجار زەینەب بە وردی چاوەدێری سوڕاندنەوە و پەرێشانییەکانی منی دەکرد، بەڵام ڕۆژان تێدەپەڕی و من سەوداسەر و مەستتر و خەیاڵاویتر بیرم لە خودا دەکردەوە، ساڵان دەڕۆیشت و زیاتر و زیاتر دەگەیشتمە بینینی یەزدان بەو جۆرەی کە لەگەڵ ڕاستی مرۆڤ و سروشتدا بگونجێت. من وەکو تۆبەکارەکانی دیکە تەنها لە عیبادەت و نوێژ و خوێندنەوە و لەبەرکردنی ئایەتەکاندا بۆ خودا نەدەگەڕام، من دەمویست لە جێگایەکی تردا خوا بدۆزمەوە، خواستمبوو ڕێگایەکی قووڵتر بگرمەبەر بەرەو ئەو، دەمویست بە جۆرێکی دیکە بیبینم، هەرگیز لەو نوسراو و تێکستانەدا خودام بۆ نەدەدۆزرایەوە، بەڵکو پێمابوو خوا لە مانای کۆی گەردوندا و لە جەوهەری هەمەڕەنگی دونیادا خۆی

بەرجەستەدەکات، لە شەوێک لە شەوەکانی سکالاّ و گفتوگۆدا لەگەڵ زەینەبی کوێستانیدا، پێمگووت: «مامۆستا، شەریعەتی خودا پێچەوانە و دوژمنی ئەو جەوهەرە نییە کە خودا وەکو یاسا لە ناو گیان و ئارەزو و بیرکردنەوە و غەریزەکانماندا جێیدەهێڵێت... جەوهەری خودا لە ناو ئەو یاسا ژێرەوانکێ و نادیار و بەهێزانەدایە کە وادەکات مەخلوقاتەکان ژیانیان خۆشبوێت، هەر شتێک بمانباتەوە سەر خۆشەویستی ژیان خوداییە».

هەستمدەکرد سالاّن دەڕوات و تێڕامانی بەردەوام، بیرکردنەوەی زیاتر و زیاتر، تێفکرینی هەمەچەشن، دەمگۆڕێت ... هەندێجار بیرکردنەوەکانم دەیبردم بۆ جیهانێکی زۆر دوور لە جیهانی زەینەب، کە وردە وەکو مامۆستایەکی توندوتیژ و ڕەق لەگەڵمدا مامەڵەی نەدەکرد، زۆرجار بە ڕێزێکی قووڵ و گومانێکی ڕاستەقینەوە لەگەڵمدا بیریدەکردەوە. هەندێ شەو کە من لە تێفکرین ماندوودەبووم، دەچوومە پاڵ فەتانە و دەمگووت: «فەتانە با حکایەتی ئێوارەی پەروانە بگێڕینەوە». ئەو هەمیشە لە چیرۆکی عەشقی میدیای غەمگینەوە بۆ مانگ دەستی پێدەکرد، هەندێجار لەو سەرەتایەوە دەگەڕایەوە بۆ پرسیارکردن لە ئادەم و بەسەرهاتی دەرکردنی لە بەهەشت، ئەو هەمیشە لە «میدیا و مانگ»ـەوە دەگەڕایەوە بۆ پرسیارکردن لە خەلیقەت، بەلاّم شتەکانی بە سادەییەکی بێمانا وەردەگرت، من هەمیشە قسەکانم لە دەمی دەستەند و بۆ دوورتر ڕامدەکێشا. دەمگووت: «ئادەم و حەوا لە بەهەشت شتێک فێربوون، دیوارێکیان شکاند، نهێنییەکیان دۆزییەوە، دەرکردنی ئادەم و حەوا لە بەهەشت نەفرەت لێکردن نەبوو، بە نەحلەتکردن نەبوو، چونکە خودا هەرگیز مرۆڤی وەکو شەیتان تەماشانەکردوە... سەیرکە، فەتانە، سەیری ئەم زەوییە گەورەیە بکە، ئەم زەوییە بۆ ئادەم ئەو جێگایە بوو کە دەبایە تیایدا درێژە بە ئەزموونەکانی خۆی بدات، درێژە بە دۆزینەوەکانی بدات، زەوی لابۆرێکی گەورەیە، تێیدا خودا تواناکانی مرۆڤ

لەسەر ئەزمونکردن و دۆزینەوەی تاقیدەکاتەوە، بەهەشت ئەو شوێنەیە کە وجود تیایدا یەک ڕەنگ بووە، بەڵام زەوی شوێنی تینوێتییە، شوێنی ئارەزووییەکە مرۆڤ زیاتر و زیاتر بەرەو پێشدەبات، فەتانە، بڕوانە... من ئێستا، دوای ئەم چەند ساڵە مردنی پەروانە و میدیا وەکو مردنی کەسانێک دەبینم کە ڕێگایەکی دیکەیان تاقیدەکردەوە، ڕێگایەک لەبەر هەر هۆیەک بێت نەگەیشتۆتە هیچ، بەڵام دڵنیام لای یەزدان ئەوان درێژەیان بەو ئارەزووە ڕەسەنەداوە کە بە جەوهەر ئادەم لە بەهەشتەوە لەگەڵ خۆیدا هێناویەتی. ئاە... فەتانە، هاوڕێم، من وادەبینم کە خودا لەو کاتەوەی مرۆڤی دروستکردوە، گیانی گەڕانی بۆ ڕێگایەکی تر، جێگایەکی تر، ژیانێکی تر تیا چاندووە... ببینە، فەتانە، ببینە، من ئارەزووی فڕین، ئارەزووی ئازادی بە ویستێکی خودایانە دەبینم».

فەتانە هەندێجار بە ترسەوە دەیگووت: «ئەمە مانای ئەوەی، هەزاران هەزار کەس، هەزاران ئیماندار، نەیانتوانیوە بە وردی لە جەوهەری خودا تێبگەن» من بە گەرمییەوە دەمگووت: «بێگومان ... بێگومان، بینینی جەوهەری خودا و مانا گەورەکانی، لە توانای مرۆڤە پچوکەکاندا نییە».

من زۆرجار هەموو ئەو قسانەم بۆ زەینەبی کوێستانی دووبارەدەکردەوە، هەندێجار ئەو خراپ دەشڵەژا، بەڵام بێدەنگ دەمایەوە و هیچی نەدەدرکاند. زەینەب جودا لە پەشێوییە ڕۆحییەکانی خۆی کە زۆرجار پرسیار و بیرکردنەوەکانی من دەیهەژاند، نەیدەهێشت بە هیچ شێوەیەک ئەو تەفسیر و لێکدانەوانە لەگەڵ کیژەکانی دیکەدا بخەمە ڕاوێژەوە. شەوێک پێیگوتم: «ئەو ڕێگایەی مرۆڤێک بەرەو خودا دەبات، لەوانەیە یەکێکی دی بەرەو شەیتان بەرێت».

شەوێکیان پێدەچوو زۆر بیریکردبێتەوە، هات و لەسەرەخۆ بانگیکردم و گووتی: «خەندان، خەندانی چکۆلە، تۆ دووبارە دەبێت بگەڕێیتەوە ئەو کتێبخانەیە... بگەڕێوە بۆ ئەوێ». من هەرگیز زەینەبم بەو جۆرە

نەبینیبوو، گەرم و گوڕ و پڕ لە تین و تاووی ژیان. ویستم تێبگەم بۆ من ڕەوانەی ئەو کتێبخانەیەم دەکاتەوە؟ تەنها گووتی: «بڕۆ، بڕۆ و هیچی تر». پاش ماوەیەکی درێژ دووبارە کەوتمەوە ناو جیهانی کتێبەکان، بەڵام ئەمجارەیان بە گیانی خوێندەوارێکی پڕ لە پرسیارەوە، هەر لەو ڕۆژانەشدا مامۆستایەکی بچکۆلانە و شەرمنی دیکە هاتە قوتابخانە ناوی «شەوگار» بوو، چەندێ شەرمن بوو، هێندەش پڕ لە نهێنی و تەلیسم بوو، ئەویش زۆربەی کاتەکانی لە کتێبخانە دەبردەسەر. ئەو دواتر چەندەها کتێبی جۆرا و جۆری بۆ هێنام کە لەو کتێبخانەیەدا نەبوون، هەرکاتێک لە سەفەر و مۆڵەتەکانی بگەڕابایەتەوە بە دزی زەینەبەوە بەستەیەک کتێبی نوێی دەهێنا کە تەنها من و ئەو دەمانخوێندەوە، کە زانیشی من و فەتانە نوقمی دەریای حکایەتەکانین، بۆ یەکەمجار لە ژیانمدا چەندەها کتێبی چیرۆکی بۆ هێنام. من لەو کتێبخانەیەدا درێژەم بە خولیا و بیرکردنەوەکانی خۆمدەدا، هەر لەو کتێبخانە و لە ناو دێڕی کتێبەکاندا هەستمکرد وردە وردە دەبمە شتێکی دیکە، هەستمکرد ساڵانی ژیانی نێو تۆبەخانە لەشی منی کوشتووە، ئارەزووەکانم لە ژێر خەفەت و ترس و گوماندا مردوون، ئەو پیاوەی کە شەوان دەهات ئیدی کەمتر دەردەکەوت، زۆر شەو دەمویست بانگیبکەم، دەمویست پێبڵێم: «بۆ وەکو جاران دەرناکەویت؟» بەڵام بیرکردنەوەی زۆر لەشی لاوازکردبووم، شەهوەتەکانمی مراندبوو، گومان لە خۆم و لە جیهان و لە خوادا، تینی بۆنکردن و خەیاڵاندنی ئەو پیاوەی لە ناومندا کوشتبوو. بەڵام بە پێچەوانەشەوە هەستمدەکرد ئەو کتێبخانەیە شەهوەتێکی گەورەی ترم تیا دروستدەکات، شەهوەتی بینین و دۆزینەوە و بیرکردنەوەی جیاواز، خوێندنەوەی سەیر سەیر، تێڕامانی بێسنوور، ئەوانە هەموو منیان گەیاندە هەندێ جێگای ترسناک، لەگەڵ شەوگاردا زۆر شەو پیاسەی دوور و درێژم دەکرد، دەمگووت: «مامۆستا، مانای چی خودا کە گەردونی

بەم هەمەڕەنگییە دروستکردوە، هەمەڕەنگی قبوڵنەکات؟ مانای چی خودا خۆی ئەو ئارەزووە مەزنەی هەبووە بۆ خوڵقاندن، ئارەزوویەک ملیۆنەها ئەستێرە و خۆری لێکەوتۆتەوە، ئارەزوویەک لە حیکمەتی غونچەیەکەوە تا هەموو حیکمەتەکانی دیکەی گەردونی لە خۆیدا کۆکردۆتەوە، ئارەزووی خوڵقاندن و دۆزینەوەی مرۆڤی پێقبوڵ نەکرێت؟ مانای چی، خودایەک گەردونی لە جوڵە و نوێبوونەوەیەکی بەردەوامدا دروستکردوە، دژی هێز و توانای فڕین و نوێبوونەوە و گۆڕان بێت لە مرۆڤدا؟ خودا کە مافی بەخشیوەتە هەموو شتەکان بژین و شوێنیان هەبێت و گەشەبکەن، مافی بەخشیوەتە درەختەکان جوانی خۆیان، گەشانەوەی خۆیان، ڕەونەقی زیندووی خۆیان ئاشکرابکەن، مافی بەخشیوەتە گیاندارەکان، لە سنووری بوونی خۆیاندا ئازادبن، بۆ دەبێت ماف نەداتە مرۆڤ کە مەزنترین و قەشەنگترین داهێنانی خۆیەتی، یاخود ماف نەبەخشێتە عەقڵ کە سیحراویترین شتی ئەم گەردونەیە، بیریکاتەوە، شتی نوێ ببینێت، گومانبکات، هەڵەبکات؟ مانای چی، ئەوەی ئەم هەموو شێوە جیاوازەی بوونی خوڵقاندووە، ئەم هەموو مەخلوقاتە دژ و جودایەی لەسەر زەوی کۆکردۆتەوە، هەرگیزیش نەیگووتووە شێرێک لە کەنارییەک پیرۆزترە، کەنارییەک لە مێشهەنگێک مەزنترە، بوار نەدات دیانەتەکان پێکەوە بژین، عەبدایەتی قبوڵبکات، لەسایەیدا تەفسیرە جیاوازەکانی دونیا وەکو یەک مافی خۆیان وەرگرن، سەیرکە مامۆستام، من تا زیاتر دەڕوانم زیاتر تێدەگەم کە گەورەترین عاشقی جیاوازی لەم گەردونە گەورەیەدا خودا خۆیەتی... بۆ ئەوەی ئەو جەوهەرەش ببینین، دەبێت سەیری هەموو گەردون بکەین، بۆ ئەوەی مەزنی خودا ببینین بەسنییە تەنها بە چەند دێڕێکی ناو کتێبەکانییەوە بگیرسێینەوە، من تەنها یەک کوفر دەبینم، ئەو کوفرەش پچووککردنەوەی یەزدانە بۆ یەک واتا و یەک وتە و یەک مانا، خوداپەرستی گەورەش ئەو کەسە نییە کە بەسەر کتێبەکاندا

دەکەوێت، بەڵکو ئەو گیانەیە کە خودا لە گەورەی و لایەنە گەردونی و موعجیزە گشتییەکاندا دەبینێت، گیانێکە کە تەنها لە نێوان دێڕەکاندا بۆ خودا ناگەڕێت، بەڵکو لە هەموو جیگایەکدا بۆ مانا و جەوهەری ئەو دەگەڕێت».

دواجار دەمگووت: «خودا مرۆڤی بە ملیۆنەها شێوە بینیوە. ملیۆنەها سیمای داوەتێ... چۆن دەمانبورێت گەر تەنها بە یەک شێوە ببینین، چۆن دەمانبورێت گەر ئێمە ، ئەو وەکو حاکمێکی بیرتەسک تەماشابکەین، کە کتێبێکی لەبەردەستدایە و پەڕەکانی هەڵدەداتەوە و بەپێی ئەو کتێبە حوکمدەدات... مامۆستام ئەوە سوکایەتییەکی گەورەیە، دابەزاندن و کەمکردنەوەیە لە هێزە بەرین و داهێنەرەکانی خودا».

ڕۆژ دوای ڕۆژ پتر تێدەگەیشتم من خەتایەکم نەکردوە شایستەی ئەو تۆبە دوور و درێژە بێت، هیچ کچێ لەو قوتابخانەیەدا، جگە لە گوناهێکی وەهمی گوناهێکی تری نەکردوە، شەوێک بە تورەییەوە بە زەینەبی کوێستانیم گووت، کە تا دەهات پیرتر و هێمنتر دەینواند: «مامۆستام، تەنها کەسانێک کە دەبێت تۆبەبکەن، ئەوانەن کە خودا بۆ ئەزیەتکردن و بەنەفرەت لێکردنی مرۆڤەکانی دی بەکاردەهێنن، بە بێ جیهانێک نازین مرۆڤەکانی دیکەیان تیادا نەکردبێتە کافر... هەموو شتێکیش دەکەن بۆئەوەی ئەو دونیایە بخولقێنن و خودا بۆ سوکایەتیکردن و زەلیلکردنی کەسانی دیکە بەکاربهێنن، خودا بە جۆرێک تەفسیردەکەن تا بیکەنە دوژمنی مرۆڤ... تەنها بێبڕوا ئەوانەن کە پاکێتییەکی درۆ بە خۆیان دەبەخشن و پیسێتییەک دەبەخشنە ئەوانی دیکە، ئەوانەن کە ناتوانن خودا لەودیو ئەو پاکی و پیسییە وەهمییەوە ببینن کە هەر خۆیان دایانتاشیوە».

سالانێکی زۆر فەتانە و مەعسوم شەوەهای شەو گوێیان لە تەفسیرەکانی من دەگرت و جارێکی دیکە سەرسامانە بیریان لە جیهان

دەکردەوە، فەتانە دەیگووت: «من هەمیشە دڵنیابووم کە بێخەتام... هیچ کات گومانم لە بێخەتایی خۆم نەبووە». مەعسوم زۆر شەو دەگریا و دەیگووت: «بەڵام ئەوەی لەبەردەم مرۆڤدا خەتابارییێت، لەبەردەم خوداشدا خەتابارە». من دەمگووت: «خودا پێوانەی خۆی هەیە، بۆ هەر شتێکیش کێشانەیەکی هەیە وەکو کێشانەکانی تر نییە». ئەگەرچی من بە شێوەیەکی تر سەیری خودام دەکرد، بەڵام هێشتا وەکو مەعسوم ترسەکانم لە خودا وەک خۆی بوو، هەستیشمدەکرد ئەو ڕوانینە سامدارە بۆ خودا بە ئاسانی لە دەروونمدا پاک نابێتەوە، بەڵام دەمگووت ئەو سامە لە خودا مرۆڤەکان چاندوویانە و پەیوەندی بە جەوهەری خوداوە نییە. مەعسومەش هێندەی بیری لە سزا و دۆزەخ دەکردەوە، ترسەکانی دەیان جار گەورەتر دەبوون، بە جۆرێ بە هیچ شێوەیەک توانای نەبوو خودا، وەکو مەحەبەت و عەشق ببینێت. کە لە قوتابخانەی خوشکە تۆبەکارەکانیش چووینە دەرەوە، مەعسوم هەمیشە ترسێکی گەورەی بەرامبەر یەزدان هەبوو، یەزدانی وەکو چاوێکی بەدنیاز سەیردەکرد کە بەردەوام لە پشتەوە لە بۆسەیدایە، خودای وەکو پیاوێک دەبینی کە قامچی کووتیدەکات، وەک پاسەوانی بەر بەردێک کە مرۆڤەکان لەسەر سەنگە سپییەکەی سزادەدرێن. تا ئەو ڕۆژەش کە لەسەر جێگاکەی خۆی پاڵکەوت، بێ هیچ نیشانەیەکی دیاریکراوی مردن، گیانی سپارد، ئەو ترسە لە خودا و لە باڵندەکان هەر لەگەڵیدا بوو.

ئەو ساڵە دوور و درێژانەی من لەگەڵ زەینەبی کوێستانیدا ژیام، هەستم نەکرد ئەو خاتوونە جورئەتدەکات ڕەفتاری خۆی بگۆڕێت، هەر کیژێکی نوێ دەهاتە تۆبەخانەوە دەبایە بە هەموو قۆناغەکانی تۆبە و ڕامکردندا بڕوات، بەڵام ساڵ دوای ساڵ ئەو دڵڕەقی و توندڕەوییە تیایدا کزتر و کزتر دەبوون، بەرامبەر منیش بەڕەحمتر و بەڕەحمتر دەینواند، بەڵام دەشترسا شتەکانی لەدەست دەربچێت، دەترسا ئەو پیاوانەی

ئەوقاف کە وەرزی جارێک دەهاتن و بڕوا و عەقیدەی ئێمەیان دەپشکنی، لێی ڕازینەبن. دەترسا بە جۆرێکی دی بیر لە تۆبە بکاتەوە، جیاواز لەو شێوەیەی لە دەفتەری ئەو چەند بەڕێوەبەرەدایە کە لە وەزارەتی کاروباری ئایینییەوە سەرپەرشتی دەرونی مەخلوقاتەکانیان دەکرد. دواجار هیچ کات هیچ گۆڕانێکی گەورە لەو دنیایەدا ڕوویندەدا، هەندێ شەو کە پێکەوە پیاسەماندەکرد، کە شەرمی نێوان مامۆستا و قوتابی لەنێوانماندا شکا، دەیگووت: «خەندان، من دەبینم کە تۆ خودا دەبینیت، خودا لە هەموو دەرکەوتەکانیدا، ئەوەش خۆشحاڵمدەکات، بەڵام ئایین لە بەشێکی گەورەیدا تەنها پەیوەندی مرۆڤ و خودا ڕێکناخات، بەڵکو پەیوەندی خەڵکیش ڕێکدەخات، پەیوەندی مرۆڤ بە مرۆڤەوە، ئەگەر ئەو هەمەڕەنگییەی خودا خوڵقاندویێتی بکەوێتە ژیانەوە، مرۆڤەکان ببیینن و ئەزمونیبکەن، دەسەڵاتدارەکان بیکەن بە پەیڕەو، هەموو شیرازەکان دەشێوێت، خەندان، دەبێت تۆ تێبگەیت کە «شیرازە» و دروستکردنی مرۆڤی دەستەمۆ و گوێڕایەڵ، ئەوە جەوهەری ئەم قوتابخانەیەیە، ئێوە بۆیە لێرەن تا شیرازەکانی دونیا تێکنەچێت، جڵەوکردنی ئینسان بۆ ئینسان لەسەر ڕۆشنایی شەریعەت، ئەوە ئەرکی ئێمەیە، ئێمە ناتوانین قووڵتر بۆ خودا بڕوانین، قووڵتر لەوەی ئەم وەزیفەیە بۆمان دیاریدەکات، لەبەرئەوە گەر شتەکان لەیادبکەین و بە پێی ئەو سەیرکردنەی تۆ کاربکەین، دەبێت ئەم قوتابخانەیە هەڵوەشێنینەوە، دەبێت زۆرشت لەم دونیایە بگۆڕین، دەبێت دەرگاکانی ژیان بۆ زۆر شتی تازە بخەینە سەر پشت، کە لە توانای مندا نییە قسەی لەسەر بکەم...».

من و زەینەبی کوێستانی ساڵانێکی زۆر بەو جۆرە پێکەوە ژیاین، بەڵام زۆربەی کیژەکانی تۆبەخانەکە منیان وەکو کچێکی نەخۆش و وڕێنەباز تەماشادەکرد. جگە لە مەعسوم و فەتانە کەسی دیکە بەڕاستی گوێی بۆ نەگرتم، مامۆستاکانیشم جگە لە شەوگار هیچیان دەرفەتی

نزیکبوونەوەیـان پێنــەدام، هەمووشـیان مەحەبـەت و گوێگرتنـی زەینەبیـان بـۆ مـن بـە ئاسـایی وەرگـرت، چونکـە ئـەو کاتێکـی زۆری لەگـەڵ زۆربـەی کیژەکانـدا دەبردەسـەر.

لـەو سالانەدا پـورم و دایکـم و بابـم کۆچیانکـرد و هەمـوو پرسـەکانیش لـە ماڵـی پـورم سازدران... براکانیشـم یـەک لـە دوای یـەک لـە بۆنـەی جیاواز و بـە شـێوەی جیـاواز وڵاتیـان بەجێهێشـت و گەیشـتنە خۆرئـاوا، مـن هەرگیـز ناونیشـانێکم لەوانـەوە بـۆ نەهـات، هەتـا تاقـە نامەیەکیـش چییـە بەدەسـتم نەگەیشـت. دوا دیـاری ئـەوان بـۆ مـن برێکـی زۆر پارە و پسـوڵەیەکی بچوک و رەشـباوی تاپـۆ بـوو کـە هەموویـان پێکـەوە ئیمزایانکردبـوو و ئـەو خانوەیـان وەکـو دوا نیشـتەجێ بـۆ بەجێهێشـتبووم. مـن لـە مێژبـوو بڕیارمدابـوو کـە چیدیکـە ئـەو تۆبەخانەیـە بەجێبهێڵـم و بگەڕێمـەوە و لـەو خانـوە خاڵـی و تاریکـەدا درێـژە بـە ژیـان بدەم و ئـەو پارەیـە بۆ ژیـان تەرخانبکـەم و خـۆم بـۆ گێڕانـەوەی ئـەم چیرۆکـە ئامادەبکـەم. لـەو کاتانەشـدا لەنـاکاو دەوڵـەت لەوپـەڕی هێـزەوە تووشـی نشسـت و نوچدانێکـی گـەورە هـات و هێـدی هێـدی شـیرازەکانی تێکچـوو، نەدارییەکـی ترسـناک ڕوویکـردە وڵات، چەندەهـا هێـز و حیـزب و کۆمەڵـەی سـەیر سـەیر لـە ژێـر زەوییـەوە سـەریاندەرهێنا، مـن لـە تۆبەخانەکـەدا نەمدەتوانـی و نـە ویستیشـم هەبـوو گـوێ لـە چیرۆکـی ئـەو گۆڕانکارییـە سـەیر و خێرایانـەی وڵات بگـرم، تەنهـا پەیوەندیـم بـەو خەراباتـەوە لـە ڕێـگای کوژاندنـەوە بەردەوامـی کارەبـای قوتابخانەکـەوە بـوو. ڕۆژێـک چەنديـن مامۆسـتای ئاینـی هاتـن و گوتیـان کـە هەمـوو ئـەو کچانـەی ژیانـی تۆبەکاریـان تەواوکـردوە دەتوانـن بـڕۆن و لـە شـار و گوندەکانـدا درێـژە بـە پەیامـی خۆیـان بـدەن. نیوەڕۆیەکـی بەهـار مـن و فەتانـە و مەعسـوم هەمـوو شـتەکانمان پێچایـەوە و بێئـەوەی هیـچ خەیاڵێکمـان دەربـارەی چارەنوسـی داهاتـوو لەبەرچاوبێـت، لـە جێبێکـی بچکۆلانـەدا گەڕاینـەوە بـۆ

شار. لە شاریش کەوتینەوە ناو جیهانی سەیری ئەو هەموو گۆڕانکارییە خێرایانەی کە دوور لە ئێمە و بەبێ ئێمە ڕوویاندابوو، مەعسوم لە شار هەمان ئەو جلانەی لەبەردابوو کە بە کۆمەڵ لە قوتابخانەی خوشکە تۆبەکارەکان دەمانپۆشی، من و فەتانە هێدی هێدی جلی دیکە و ڕەنگی دیکەشمان لەبەردەکرد، من لەو ڕۆژەوە ئیدی ئازادتر لەگەڵ پەپولەکاندا دەژیام. لە یەکەم شەوەوە هەموو پەنجەرەکانی ماڵم کردەوە، ئەو ماڵە خاڵییەی تەنها یەک ئینجانەی بەجێماوی تێدابوو کە لە پشتییەوە ئەو پەیکەرە بچکۆلانە و تۆزاوییەی عەشقم دۆزییەوە، ئەو پەیکەرەی چەندین ساڵ لەوەوبەر پەروانە لە شەوێکی تاریکدا لە وەرشەیەکی بێدەنگی ناو دارستانێکی دووردا، دەریهێنابوو و بە دەستی گەنجێکی چاوشیندا ڕەوانەیکردبوو. یەکەم شەو بێ ڕاخەر و بێ باڵیف، لەسەر عەردە ڕەقەکە لە ناو هەموو یادگارەکانی منداڵی خۆم و پەروانەدا خەوتم، لە نیوەشەودا هەستم بە هاتنی پەروانەکان کرد. هەستم بە کۆبوونەوە و فڕینی ئەو گەردە نازکەیان کرد لە هەوای کپ و بێدەنگی ئەو ماڵەدا. هەستمکرد پەپولەکان پێمدەڵێن ئێمە لێرەین و هەمیشەش لێرە دەبین، ئیدی لەو شەوەوە پەپولەکان منیان جێنەهێشت، ئەوان هەمیشە لێرەن... نزیکن لە من، نزیکن لە نوێنەکەم، نزیکن لەو کورسی و مێزە بچکۆلانەیەی ئەم چیرۆکەی لەسەر دەنوسم، نزیکن لە شوشەی مەرەکەبەکەم. لەگەڵ ئەوەشدا ئەو ژیانە دوور و درێژە لەشی بە جۆرێکی ترسناک خەفەکردبووم. من دەمگووت، تا ئەو ڕۆژەی کە چیرۆکی پەروانە دەگێڕمەوە، خۆم بە مردوو دەزانم، کە دەستیشمکرد بە گەڕان لە دوای سەرەتا ڕاستەقینەکانی ئەم چیرۆکە، سەیرم لەوە دەهات کە چەندە خێرا هەموو ئەو شوێنە گرنگانەی شانۆی ڕووداوەکانی ئەو چیرۆکە بوون وێرانبوون و ئاسەواریان نەماوە. لە دوای هاتنە دەرەوەی ئێمە لە قوتابخانەی خوشکە تۆبەکارەکان، ماوەیەکی زۆری نەبرد لەبەر کەمی